چاپی دووەم

عبدالرحمن رأفت الباشا

# شوێنکەوتووان

منتدى إقرأ الثقافي
www.iqra.ahlamontada.com







وەرگێڕانی

م. حسێن مەلا قادر پێنجوێنی

# شوێنکەوتووان

نووسەر

عبدالرحمن رأفت الباشا

وەرگێڕ

م. حسین مەلا قادر پێنجوێنی

٢٠١٤

# شوێنکەوتووان


ناوی کتێب : شوێنکەوتووان ( التابعین )

نووسەر : عبدالرحمن رأفت الباشا

وەرگێرانی : م. حسین مەلا قادر پێنجوێنی

دیزاین : کۆمپیوتەری سارا

تیراژ :١٠٠٠ دانە

نرخ:١٠٠٠٠ دینار

ژمارەی سپاردنی : (١٥٨٤) ٢٠١٠ زاینی پێدراوە.

چاپخانە : چوارچرا





کتێبخانەی سارا

بۆ چاپ و بڵاوکردنەوەی کتێب

سلێمانی - بازاڕی ڕاپەڕین

٠٧٤٨١٢٣٩٩٣٣

**بەناوی خودای بەخشندەو میهرەبان**

خودایە بەڕاستی من کۆمەڵێکی هەڵبژاردم لە شوێنکەوتووانی متمانە پێکراوم بە جۆرێک خۆشویستوە کە هیچ خۆشەویستیەک لەسەرو ئەو خۆشەویستیەوە نیە جگە لە خۆشەویستیم بۆ هاوڕێیانی پێغەمبەری شکۆمەند درودی خودا لەسەر ئەویش و هەموو ئەوانیش بێت دەی خودایە لە ڕۆژی ڕاچڵەکانی گەورەدا (القیامە)، بمبەخشە بە خۆشەویستی یەکێک لەو دوو کۆمەڵە، چونکە خۆت دەزانیت تەنها لەبەر خاتری تۆ خۆشم ویستوون، ئەی بەخشندەترینی بەخشندەکان.

**عبدالرحمان رافت الباشا**

پێشکەشە بە

- پێغەمبەری خوداو (ﷺ) هاوەڵ و شوێنکەوتوانی خوا لێیان ڕازی بێت.
- بە دایک و باوکم کە هەردەم لە خەمی پەروەردە کردنماندا بوون.
- بە براکانم و خوشکەکانم و جگەرگۆشەکانم و هاوسەری بە ئەمەک و دڵسۆزم حاجی محبوبە.
- بە هەموو قوتابیەکانم کە لە دنیادا ڕوناکی دیدەکانمن و بە نزای خێریان ئومێدی دوارۆژمن .

م. حسین ملا قادر پێنجوێنی

## پێشەکی وەرگێڕ:

ڕۆژێك لەگەڵ برای بەڕێزو زێدە خۆشەویست مامۆستا (مەلا محەمەد حسین عبد الله وێنەیی) پێش نوێژ و ووتاربێژی مزگەوتی (ستارە خانم) لە سلێمانی بەیەك گەیشتین، ئەو بەڕێزە داوای لێکردم پەڕاوی (صور من حیاة التابعین) دانراوی دکتۆر (عبد الرحمن رأفت الباشا)، وەربگێڕمە سەر زمانی کوردی شیرین. منیش پەڕاوەکەم لێ وەرگرت، وەکە سەرنجم دا لە ڕاستیدا زۆر خۆم بەبەختەوەر زانی کە پشت بەخوا وەریبگێڕمە سەر زمانی کوردی ئەویش تەنها لەبەر خودا و بەئومێدی ئەوەی کە (إن شاء الله) خوێنەری کوردی موسڵمان سوود مەندبێت لێ و بەندەش بەشداری نزاکانیان بکەن. وە بەخۆشەویستی ئەوانەو شوێن پێ هەڵگرتنیان، دڵشاد دەبین بەگوێبیستنی فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ) کە فەرمویەتی: (يَحْشَرُ العبدُ يوم القيامةِ معَ مَنْ أحَبَّ) واتە: لەڕۆژی ڕەستاخێزدا بەندە لەگەڵ ئەوەدا حەشر دەکرێت کە خۆشی دەوێت. لەخودا دەخوازم لەگەڵ ئەو خۆشەویستانەدا حەشرمان بکات وە کارەکەمان بۆ خۆی پەسەند بکات.

م. حسین ملا قادر پێنجوێنی

منتدى اقرأ الثقافي



پێشەکی/

بسم الله الرحمن الرحيم

جوانترین سوپاس و پێزانین بۆ پەروەردگار و سڵاو سەلام لە گیانی پێغەمبەر و هاوەڵان .

زۆر گرنگە ئێمەی مسوڵمان چێژ وەرگرین لە ژیانی پێغەمبەران و پێغەمبەری ئیسلام سەلامی خودا لە هەموویان بێت وە هاوەڵانی و ئەوانەی بەدوای هاوەڵانیدا ڕۆشتوون کە (تابعین) ن چونکە خوای گەورە باسی سەربەرزی سێ گروپ دەکات لە دوای پێغەمبەرەوە ﷺ و بە دۆستی خۆی حسابیان دەکات و لێیان ڕازی بووە : وەك دەفەرمووێ :

﴿وَٱلسَّـٰبِقُونَ ٱلْأَوَّلُونَ مِنَ ٱلْمُهَـٰجِرِينَ وَٱلْأَنصَارِ وَٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُم بِإِحْسَـٰنٍ رَّضِىَ ٱللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا۟ عَنْهُ وَأَعَدَّ لَهُمْ جَنَّـٰتٍ تَجْرِى تَحْتَهَا ٱلْأَنْهَـٰرُ خَـٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًا ۚ ذَٰلِكَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ ﴿١٠٠﴾﴾ التوبه ١٠٠ .

واتە : گروپی یەکەم کۆچکردوانی مەککە لە هاوەڵان ، دووەم پشتیوانانی مەدینە پاشان ئەوانەی شوێن ئەوان کەوتوون بە چاکە واتە (تابعین) دەگرێتەوە ، وە خوای گەورە دەفەرمووێ : ﴿وَٱلَّذِينَ جَآءُو مِنۢ بَعْدِهِمْ﴾ الحشر ١٠

﴿وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مِنۢ بَعْدُ﴾ الانفال ٧٥

کە ئیشارەتە بۆ تابعین بەرەو خوار .

بۆیە پێویستە و پڕ سودە ئاشنابوون بە ژیاننامەیان تا ببێتە پەند و ئامۆژگاری بۆ ئێمەی دوای ئەوان ، وە بابەتێکی ئاوا زۆرم پێخۆش بوو کە دۆستێکی وەك مامۆستا حسێن پڕ پاداشت بێت (ان شاء الله )وە حەقی خۆی پێ بەخشیوە لە ڕونکردنەوەی ڕیزی تابعین .



ئەنەس دەفەرمووێت : "ڕەزای خودای لەسەر بێت" {من پێغەمبەر و ئەبو بەکر و عومەرم خۆشدەوێت وەڕجام وایە لە خودا لەگەڵیاندا بم بە خۆشەویستم بۆ ئەوان وە

ئەگەر کردەوەکانی ئەوانم پێ نەکرێت ئێمەش ئەوانمان خۆشدەوێت هەرچەندە هەرگیز وەك ئەوانمان پێ ناکرێ ، وە بابەتێکی زۆر گرنگە ئەم شێوازە نوسینە بۆ کۆمەڵگای کوردی و تاکی مسوڵمانی ڕۆشنبیری کوردی پێ سودمەند بکرێت داواکارم لە خوای گەورە ئەم بابەتە جوانە بخاتە تەرازوی حەسەناتی مامۆستا حسێن و ئەو کەسەی هاوکاری دەکات بۆ بلاۆوکردنەوەی .

وآخر دعوانا الحمدلله و الصلاة والسلام على رسول الله

د. محمد حسێن پێنجوێنی
پێش نوێژو وتار خوێنی
مزگەوتی ستارە خانم چوێسە
مامۆستای کۆلێژی زانستە ئیسلامیەکان
زانکۆی سلێمانی

٩ رمضان ١٤٣١ ە
شەوی پێنج شەمە



# ١ عەطای کوڕی ئەبی ڕەبباح

**هیچ کەسێکم نەدیووە جگە لە عەطا و طاووس و موجاهید کە بەزانست و زانیاری یەکەیان تەنها مەبەستیان خودای بالآدەست بوویێت .**

**(سەلەمەی کوڕی کوهەیل)**

وا ئێمە لە دەیەمی کۆتایی داین لە مانگی (ذول حجە)ی ساڵی ٩٧ ی کۆچی داو، ئەوەش ئەو ماڵە دێرینەیە کە بە میوانانی خودا شەپۆل ئەدات .. لە هەموو ڕێگایەکەوە ..

بە پیادەو بە سواری ..

بە ساڵآچوان و لاوان، پیاوان و ئافرەتان ..

ڕەش پێست و سپی پێستیان لەناودایە ...

عەرەب و غەیری عەرەب ..

گەورەپیاوان و، فەرمانڕەوایان و، مسکێنان ..

هەموو هاتوون مێوانی پادشای مەزنن، مل کەچ و تکاکار و ئومێدەوارن .

ئەوەش سولەیمانی کوڕی عەبدولمەلیکی خەلیفەی موسڵمانان و، گەورە پاشاهی سەر ڕووی زەوی یە، کە ئەسووڕێتەوە بە دەوری ماڵی خودادا، بە سەری ڕووت و، پێ خاوس هیچ شتێکی لەبەردانی یە جگە لەبەرگی ئیحرام .

شان و شکۆی ئەو لەوکارەدا وەك شان و شکۆی برا موسڵمانەکانیەتی، کەلەبەر خودابران ..

دوو کوڕەکەشی وان لە دوایەوە، کە دوو لاوی جوانی، وەك مانگی چواردە دەدرەوشێنەوەو، وەك خونچەی گوڵ دڵڕفێن و بۆنخۆشن .

لە سووڕانەوە لێ بوویەوە لای کردەوە بەلای یەکێك لە پیاوە تایبەتمەندەکانی یەوە ووتی :

هاوڕێکەتان لە کوێ یە ؟

پیاوەکە گوتی: ئا لەوێدایە وەستاوە نوێژ دەکات ..

ئامارژەشی بۆ لای ڕۆژئاوای مزگەوتی حەرام کرد .

جا ئەوسا خەلیفە ڕووی لەوێ کردو، دوو کوڕەکەش لە دوایەوە بەرەو ئەو شوێنە کە پیاوەکە ئامارژەی بۆ کرد، کەوتنەرێ .

ئەوجا پیاوەکان ویستیان شوێنی بکەون تا لەناو قەرەباڵغی یەکەدا ڕێگەی بۆ بکەنەوە و، ئازاری قەرەباڵغی لێ بەدووربگرن بەڵام ئەو لەوە قەدەغەی کردن ووتی : ئەوە شوێنێکە پادشا و خەڵکی ئاسایی تێیدا لە ئاستێکدان و، هیچ کەسێك لەوێ دا گەورەیی و بەهای بەسەر کەسێکی دیدا نی یە مەگەر بەهۆی پەسەندیدەی و خۆپارێزی و خواناس یەوە .

چونکە وا دەبێت کەسێکی هیلاکی دەم و چاوخۆڵاوی قژهەڵچو دەبێتە میوانی خودا، خوداش پەسەندی دەکات و پێشوازی لێدەکات کەبەو شێوەیە پادشاهان پەسەندناکات و ڕووبەڕوویان نابێتەوە .

پاشان بەرەو ڕووی پیاوەکە ڕۆشت و دیتی بەردەوام ڕۆچووە لە نوێژەکەیدا، نوقوم بووە لە چەمینەوە و کوڕنوشیداو، خەڵکیش لە پشتەوەو لای ڕاست و چەپیەوە دانیشتوون ..

ئەویش لەوێدا کە کۆتایی کۆڕەکە بوو دانیشت .

دوو کوڕەکەش لەگەڵی دا دانیشتن .

دوو لاوە قوڕەیشیە کەوتنە سەرنجدانی ئەو پیاوەی کە خەلیفەی موسڵمانان مەبەستی بوو لەگەڵ خەڵکیدا دانیشت و چاوەڕوانی ئەوەی دەکرد کە نوێژەکەی تەواو بکات ..

ئەو پیاوە زانایەکی حەبەشی بوو، ڕەش پێست، قژ هەڵچوو، لوت شۆڕ و چەماوە، کە دادەنیشت وەك قەلەڕەش وابوو .

کاتێ ئەو پیاوە نوێژەکەی تەواوکرد، لای کردەوە بەولایەدا کە خەلیفەی لێ بوو.. خەلیفە سلێمانی کوڕی عەبدولمەلیك سڵاوی لێ کرد ئەویش بە هەمان شێوە وەڵامی سەلامەکەی دایەوە .

ئا لەوێدا خەلیفە ڕووی تێکرد و، دەستی کرد بە پرسیار لێکردنی دەربارەی خواپەرستی یەکانی حەج (مناسك الحج) یەك بە یەك ئەویش وەڵامی هەر پرسیارێکی

بە چڕی دەدایەوەو، بە شێوەیەك درێژەی بە وەڵامەکە دەدا ماوەی نەدەهێشتەوە بۆ زیاتر.

هەموو وەڵامێکی دەدایە پاڵ فەرموودەیەکی پێغەمبەر (ﷺ) کاتێك کە خەلیفە پرسیاری تەواو بوو، نزای پاداشتی خێری بۆ کردو، بە کوڕەکانی فەرموو :

هەستن، ئەوانیش هەستان ... هەرسێکیان بەرەو سەعی بەڕێکەوتن. لەو کاتەدا کە ئەوان لە هاتووچۆی نێوان (سەفاو مەروە) دا بوون، دوولاوەکە گوێیان لە بانگکەران بوو بانگیان دەکرد :

ئەی جەماوەری موسڵمانان ...

لەم مەقامەدا کەس فتوا نادات بۆ خەڵکی جگە لە (عە طای کوڕی ئەبی ڕەبباح)..

جا ئەگەر ئەو ئامادەنەبوو، ئەوجا (عەبدوڵڵای کوڕی نەجیح)..

ئەوجا یەکێك لە دوو کوڕەکە لای کردەوە بەلای باوکیدا و ووتی: چۆن فەرمانبەری فەرمانڕەوای ئیمان داران فەرمان دەداتە موسڵمانان کە فتوای کەس وەرنەگرن جگە لە هی عە طای کوڕی ئەبی ڕەبباح و هاوڕێکەی ؟

ئێمە هاتین فەتوای ئەو پیاوە وەربگرین کە هیچ گرنگی بە خەلیفەی موسڵمانان نەداو، ئەوەی شایانی شان وشکۆی گەورەی ئەوبوو گویٚ ی پیٚ نەدا!!

سلێمان بە کوڕەکەی گوت :

کوڕی خۆم ! ئەوەی کە بینیت و، بینیت چۆن ئێمە لەبەردەمی دا مل کەچ بووین، ئەوە عە طای کوڕی ئەبی ڕەبباح بوو کە ڕادەربڕ (فەتوادەر) بوو لە مزگەوتی حەرام داو، میراتگری عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس بوو لەو پلەو پایە گەورەیەدا .

پاشان بەردەوام بوو دەیگوت: ئەی کوڕە شیرینەکەم ! ....زانست و زانیاری فێر ببن ،

چونکە بە زانست و زانیاری کەس بیٚ بەها و بیٚ نرخ بەهادار و شەرەفمەند دەکات و بیٚ ئاگا بە ئاگادێنێتەوە و، بەندەکان بەرز دەکاتەوە بەسەر پلەوپایەی پادشاهاندا ...

سلێمانی کوڕی عەبدولمەلیك زیادەڕەوی نەکرد لەوەدا کە بە کوڕەکەی وت، دەربارەی شان و شکۆی زانست و زانیاری .



چونکە(عە طای کوڕی ئەبی ڕەبباح) لە منداڵیدا بەندەیەکی ئەڵقە لە گوێ ی ئافرەتێکی خەڵکی مەککە بوو، بەڵام خودای باڵادەست ئەو لاوە حەبەشی یەی ڕێزدار کردو ڕووی کەرەم بەخشندەیی خۆی تێکرد، بەوەی کە هەر لەسەرەتای منداڵی یەوە، ڕێ ی خستە دەرگای فێربوونی زانست و زانیاری و، ئەویش هات کاتەکانی دابەش کرد بۆ سێ بەش :

بەشێکی بۆ خانمەکەی.... لەوکاتەدا باشترین خزمەتی دەکرد، وە هەرچی مافی بەسەریەوە بوو، بە باشترین و تەواوترین شێوە بۆی ئەنجام دەدا .

بەشێکی دیکەی کاتەکەی تایبەت کردبوو بە پەروەردگاریەوە .....

کە تیایدا خۆی یەکلا دەکردەوە بۆ پەرستن و ئەنجامدانی خواپەرستی یەکانی زۆر بەبێ گەردی و دڵسۆزی بۆ خودای باڵادەست، دوور لە هەموو کەمتەرخەمی و روپامایيەك.

بەشی سێ یەمی کاتەکەی تایبەت کردبوو بە فێربوونی زانست و زانیاریەوە.... کە تیایدا دەچووە خزمەتی ئەو هاوڕێیانەی پێغەمبەر (ﷺ) کە لە ژیاندا مابوون، وە لە زانست و زانیاری یە زۆر و خاوێنەی کە لایان بوو، لێ ی وەردەگرتن و فێری دەبوو .

جا زانست و زانیاری وەردەگرت لە ئەبووهورەیرە، وە عەبدوڵڵای کوڕی عومەر، وە عەبدوللای کوڕی عەبباس، وە لە عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیر، وە کۆمەڵێکی دی لە هاوڕێیانی بەڕێزی پێغەمبەر(ﷺ) خوایان لێ ڕازی بێت. تا وای لێ هات سنگی پڕ بوو لە زانست و زانیاری و شەرع و، گێڕاوەکان لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) جا کاتێك کە ئەو ئافرەتەی کە خاوەنی سەرنجی دا کە ئەم لاوە خۆی فرۆشتووە بە خودا و، ژیانی تەرخان کردووە بۆ فێربوونی زانست و زانیاری، دەستی لە ماف خۆی هەڵ گرت وتەنها لەبەر خودای باڵادەست ئازادی کرد، بەڵکو خودای بە توانا ئیسلام و موسڵمانانی پێ سوودمەند بکات ..

جا لەو ساتە ڕۆژەوە کە تیایدا ئازادکرا (عە طای کوڕی ئەبی ڕەبباح) مزگەوتی حەرامی کردە شوێنی جێنشینی خۆی و، کردیە ئەو ماڵەی کە تیایدا دەحەوایەوەو، کردیە ئەو قوتابخانەیەی کە تیایدا فێری زانست و زانیاری دەبوو.

کردیە ئەو سوجدەگایەی کە تیایدا بە خواپەرستی و خۆپارێزی لە خودا نزیك دەبوویەوە ....



هەتا مێژوو نووسان و وتویانە: مزگەوتی حەرام مەنزڵی (عە طای کوڕی ئەبی ڕەبباح) بووە نزیکەی ٢٠ ساڵ ...

تا شوێنکەوتووی پایە بەرز (عە طای کوڕی ئەبی ڕەبباح)، گەشتۆتە پلەو پایەیەکی وەها لە زانست و زانیاری دا کە هەموو ئەندازەیەکی تێ پەڕاندووە و، بۆ ئاستێکیش کە مەگەر کەمێك لە هاوچەرخانی ئەو ئاست و پلەیەیان بەدەست هێنابێت ...

گێڕدراوەتەوە کە (عەبدوڵلاَ ی کوڕی عومەر) ڕەزای خودا لە خۆی وباوکی بێت، هاتبووە مەککە بۆ عەمرە ...

خەڵکی دەچنە خزمەتی پرسیاری لێ دەر کەن و، ڕای وەردەگرن لەسەر پرسە شەرعیەکان. ئەویش دەفەرمووێت :

بەراستی من سەرم سوڕدەمێنێ لێتان ئەی دانیشتوانی مەککە کە پرسیارەکانتان کۆ دەکەنەوە تا دەربارەیان پرسیار لە من بکەن لە کاتێك دا کە وان لە خزمەتی (عە طای کوڕی ئەبی ڕەبباح) دا !!

عە طای کوڕی ئەبی ڕەبباح گەیشتە پلەوپایەیەك لە دین و زانست و زانیاری دا کەکەم وێنە بوو ئەویش بە هۆی دوو سیفەتەوە :

یەکەمیان: بەڕاستی ئەو دەسەلاَتی خۆی بە تەواوی سەپاندبوو بەسەر نەفسی دا بە هیچ ڕێگایەکی بۆ نەهێشتبووەوە تا لەزەت وەربگرێت لە شتێك کە سوودبەخش نەبێت

دووەمیان: هەروەها دەسەلاَتی خۆی سەپاندبوو بەسەر کاتدا، هیچی لێ بە فیڕۆ نەدەدا لە زیادەڕەوی لە قسەو کاردا .

واتە بە پێ ی پێویست بەکاری دەهێنا ....

موحەمەدی کوڕی سوقە [١] قسەی بۆ کۆمەڵێك لە میوانەکانی دەکرد گووتی :

ئەتانەوێ گوێبیستی ووتەیەك بن بەڵکو وەك من لێی سوودمەند بن ؟!

ووتیان : بەڵێ ...

ووتی : (عە طای کوڕی ئەبی ڕەبباح) ڕۆژێکیان ئامۆژگاریی کردم .

گوتی : ئەی برازام ....

بەڕاستی پێشینانی ئێمە بێزیان هاتۆتەوە لە قسەی زیادە .

[١]/ یەکێك بووە لە زانایانی کوخە .



پێم ووت : ئایا قسەی زیادە لای ئەوان چی بوو ؟
ووتی: ئەوان هەموو قسەیەكیان بەزیادە داناوە جگە لە پەڕاوی خودای بالأدەست كە بخوێنرێتەوە و لێی تێ بگەن ...
هەروەها فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ) كە بگێڕرێتەوەو تێبگەیەنرێت .
یان فەرماندان بە چاكەو، وازهێنان لە خراپە .
یان زانست و زانیارییەك كە مایەی نزیك بوونەوە بێت لە خودای بالأدەست یاخود قسەیەكی پێویست بێت بۆ بەدەستهێنانی پێویستی و بژێوی ڕۆژانەت، كە بەبێ ئەوە نابێت .پاشان چاوی بڕی یە ناوچاوانم و ووتی :

ئایا ملە جیڕێ ی ئەوە دەكەن( وَإِنَّ عَلَيْكُمْ لَحَٰفِظِينَ ﴿١٠﴾ كِرَامًا كَٰتِبِينَ ﴿١١﴾ )

(إنفطار / ئایەتی ١٠- ١١) .

واتە : چاك بزانن كە ئێوە چەند فریشتەیەكی بەڕێزو قەدرگرانتان بەسەرەوەیە هەموو قسەو كردەوەیەكتان چاكە بێت، یان خراپە ئەوان دەینوسن .

وە هەروەها لەگەڵ هەریەكێكتان دوو مەلائیكەت هەیە إِذْ يَتَلَقَّى ٱلْمُتَلَقِّيَانِ عَنِ ٱلْيَمِينِ وَعَنِ ٱلشِّمَالِ قَعِيدٌ ﴿١٧﴾ مَّا يَلْفِظُ مِن قَوْلٍ إِلَّا لَدَيْهِ رَقِيبٌ عَتِيدٌ ﴿١٨﴾ (ق / ١٧- ١٨).

واتە: ئەو كاتەی لەلای ڕاست و چەپیشەوە جووتێ مەلائیكە دانیشتوون بۆی دەنووسن، هەر ووتەیەك لە دەم دەربچێت، چاودێرێكی هەیە .

پاشان ووتی: ئایا شەرمەندە نابێت هەریەكێك لە ئێمە كاتێك كە دەبینێت، نامەی كردارەكانی لەسەرەتای ڕۆژەوە پڕ كردووە بە كۆمەڵە قسەو كردارێك كە زۆربەی پەیوەندی بە كاروباری دین و دنیاوە نیە ..... واتە لە خزمەتی دین و دنیادا نی یە ...
خودای بالأدەست زۆرێك لە خەڵكی هەمەجۆری سوودمەندكردوە لە زانست و زانیاری عە طای كوڕی ئەبی ڕەبباح :
لەوانە زانایانی تایبەتمەند (العلماء المتخصصون) و، پیشەكاران و هونەرمەندان و، هی تریش.

پێشەوا ئەبو حەنیفەی نوعمان دەربارەی خۆی فەرمایشتی کرد: لە پێنج بابەتی خواپەرستی حەج دا لە مەککەدا هەڵەم کرد، سەرتاشێك ئەوانەی فێرکردم، ئەوەش کاتێ کە ویستم تەراش بکەم بۆ ئەوەی ئیحرام بشکێنم، چوومە لای سەرتاشێك و، پێم ووت :–

بەچەند سەرم بۆ دەتاشی ؟

سەرتاشەکە ووتی: خودا هیدایەتت بدات ....

خوداپەرستی مەرجی تیا دیاری ناکرێت، دانیشە، هەر چەندت بۆ دەگونجێ ئەوەندەم بەرێ .

شەرمەزاربووم و دانیشتم .

بەلأم من دانیشتبووم رووم لە قیبلە لادابوو .

ئاماژەی دامێ کە روو لە قیبلە بکەم، منیش وام کرد و،شەرمەزاریەکەم زیادی کرد .

دوای ئەوە لای چەپی سەرم خستە بەردەستی بۆ ئەوەی بیتاشێ، ئەوجا ووتی: لای ڕاست بخە بەردەستم، منیش بە شەرمەزاریەوە وام کرد .

ئەوجا دەستی کرد بەتاشینی سەرم و، منیش بەبێ دەنگی بۆم دەڕوانی ولێ ی ڕامام ئەوەبوو پێ ی وتم:

بۆچی دەبینم بێ دەنگی؟

وتی: (الله اکبر) بکە ........

بەردەوام بووم لە (اللهُ أكْبَرْ) هەتا هەستام کەبڕۆم .

ئەوجا وتی: مەبەستت کوێ یە؟

وتم: ئەمەوێت بڕۆم بۆلای کاروانەکەم .

وتی: دوو ڕکات نوێژبکەو ئەوجا بۆکوێ دەتەوێت بچۆ .

ئەوجا دووڕکات نوێژم کردو، لەدڵی خۆمدا گوتم: ناگونجێت ئەمە لەسەرتاشێك ڕووبدات ئەگەر خاوەن زانست نەبێت .

پێم ووت: ئەوەی کەفەرمانت بەمن کرد لەخوداپەرستی حەج لەکوێت بوو؟

وتی: تۆوخودا (عەتای کوڕی ئەبی ڕەبباح) م بینی ئەوانەی دەکرد، منیش لەوم وەرگرت و لێوەی فێربووم و، خەڵکیشم بۆڕێنمایی کرد.

دونیا ڕووبەڕووی (عەتای كوڕی ئەبی ڕەبباح) بوویەوەو ڕووی تێكرد، بەڵام ئەو بەتەواویی پشتی تێكردو، وازیشی لەدونیا هێنا بەڵام چۆن وازهێنانێك، هەموو تەمەنیشی بردە سەر، كراسێكی لەبەردەكرد كە نرخەكەی لەپێنج درهەم زیاتر نەبوو .

خەلیفەكان داوەتیان دەكرد بۆ هاوەڕێ یەتیان ........ بەڵام ئەو نەئەچوو بەدەم داوەتەكەیانەوە، لەترسی دینەكەی نەبوایە لەكەداربێت بەهۆی دونیایی ئەوانەوە...

لەگەڵ ئەوەشدا سەردانی دەكردن، ئەگەر لەوسەردانەدا سوودی موسڵمانان هەبوایە، یان چاكەیەكی بۆئیسلام لێ چاوەڕوان بكرایە .

ئەوەی كە (عوسمانی كوڕی عەطای خوراسانی) دەربارەی ووتی:

لەگەڵ باوكم بەمەبەستی دیدەنی هیشامی كوڕی عەبدولمەلیك بەڕێ كەوتین، لەدیمەشق تووشی پیاوێكی بەتەمەن بوین كەسواری گوێدرێژێكی ڕەش بوو بوو، كراسێكی زبری چرچاوی لەبەردابوولەگەڵ جوبەیەكی كۆن و مێزەرێكی دڕاو بەسەری یەوە و، ئاو زەنگی ولاخەكەشی لەداربوو.

من پێ ی پێكەنیم و، بەباوكم وت:

ئەوە كێ یە؟

باوكم فەرمووی بێ دەنگ بە، ئەوە گەورەی شارەزایان و زانایانی حیجازە: عەتای كوڕی ڕەبباح ...

كاتێك لێمان نزیك بوویەوە، باوكم لەهێسترەكەی دابەزی و، ئەویش لە گوێ درێژەكەی دابەزی و، باوەشیان بەیەكدا كردو وەهەواڵی یەكتریان پرسی و، پاشان سواربوونەوەو، بەڕێكەوتن هەتا لەبەردەرگای هیشامی كوڕی عەبدولمەلیكدا ڕاوەستان هەرئەوەندەبوو تادانیشتن، ئیتر لەلایەن خەلیفەوە ڕووخسەتیان درا، جا كە باوكم هاتە دەرەوە پێم ووت: دەربارەی ئەوەی لێ ی ڕوودان باسم بۆبكە، فەرمووی: كاتێك هیشام زانی كە عەتای كوڕی ئەبی ڕەبباح لەدەرگای دا، خێرا ڕووخسەتی دا ..... سوێند بەخوا من بەهۆی ئەوەوە چوومە خزمەتی هیشام .

جاكاتێك كە هیشام ئەوی بینی وتی:

بەخێربێیت ... بەخێربێیت ....

ئالێرەدا، ئالێرەدا .... بەردەوام پێ ی دەوت: ئالێرەدا ئالێرەدا ....

هەتا لەگەڵ خۆی لەسەر قەرەوێڵەكەی دای نیشاندو، ئەژنۆی نابە ئەژنۆیەوە ..

لەکۆڕەکەش دا گەورەپیاوانی لێ بوون، کەقسەیان دەکرد، هەموو بیدەنگ بوون.

پاشان هیشام ڕووی تێکردو گوتی: پێویستیت چی یە ئەی ئەبا موحەممەد؟ .

ووتی: ئەی ئەمیری ئیمان داران !، خەڵکی حەرەمەین ..... بەندەی خوداو هاوسێی پێغەمبەرەکەین، بەشە ڕۆزی و بەخششەکانیان بەسەردا دابەش بکە ....

خەلیفە ووتی: بەڵێ .....

ئەی نووسەر بنووسە بۆ دانیشتوانی مەککە و مەدینە ڕۆزی و بەشە بەخششی ساڵێکیان ....

پاشان وتی: ئایا هیچ پێویستی یەکی دیت هەیە ئەی ئەبا موحەممەد؟

وتی: بەڵێ ئەی ئەمیری بڕواداران، خەڵکی حیجازو نەجد لەپێشەوایانی ئیسلام و عەرەبی ڕەسەنن، زیادە سەدەقات و زەکاتیان بۆ بگێڕەرەوە .

وتی: بەڵێ ....... ئەی نووسەر، بنووسە، بەگێڕانەوەی زیادەی سەدەقە و زەکاتیان بۆخۆیان .

ئایا هیچ داواو پێویستی یەکی دیت هەیە ئەی ئەبا موحەممەد؟

ووتی: بەڵێ ئەی ئەمیری بڕواداران .

پاسەوانان، لەسەنگەردان ڕووبەڕووی دوژمنانتان و، لەگەڵ ئەوانەی کە دەیانەوێ خراپە بەرامبەر موسڵمان ئەنجام بدەن ئەجەنگن، ڕۆزییان بۆ دابین بکە و بەسەریاندا دابەش بکە .....

چونکە ئەگەر ئەوان تیابچن پاسەوانی نامێنێ دوژمنان ئێوەو موسڵمانان لەناو دەبەن .

ووتی: بەڵێ ....... فەرمانی دا بەنووسەر ،بنووسە ڕۆزییان بۆبەرن .

ئایا هیچ داواو پێویستی یەکی دیت هەیە ئەی ئەبا موحەممەد ؟

فەرمووی: بەڵێ ئەی ئەمیری بڕواداران :

ئەهلی ذیممە واتە یەهوودو گاوران وان لەژێرچاودێری و پارێزگاری ئێوەدا، باداوایەکیان لێنەکرێت کەلە توانایاندا نەبێ، چونکە ئەوەی لەوانی وەردەگرن، یارمەتی دەری ئێوەیە بۆسەرکەوتن بەسەر نەیارەکانتانا.

ووتی: ئەی نووسەر، بنووسە بۆئەهلی ذیممە کە بەهیچ جۆرێك نابێت داوایەکیان لێبکرێت کەلەتوانایاندا نەبێت .

دیسان وتی: ئەی ئەبا موحەممەد هیچ داوایەکی دیت هەیە؟

ووتی: بەڵێ ..... لەخودا بترسە لەناخی خۆتا ئەی ئەمیری بڕواداران ......

چاك بزانە کەتۆ بەتەنیا بەدیهێنرایت و..... بەتەنهاش دەمریت و .....

بەتەنهاش حەشردەکرێیت و .......بەتەنهاش حسابت لەگەڵ دەکرێت .....

سوێندش بەخودا ئەوانەی کە ئێستا ئەیانبینیت هیچ کامیان لەگەڵت نابن ....

پاشان هیشام سەری نایە سەرزەوی و، دەستی بەگریان کرد ........

ئەوسا عەطا هەستاو، منیش لەگەڵیدا هەستام .

کاتێك گەیشتینە لای دەرگاکە، بینیم پیاوێك بەکیسەیەکەوە شوێنی (عەطا) کەوتووە کە نەم دەزانی چی تیایە پیّ ی وت:

ئەمیری بڕواداران ئەم کیسەی بۆناردوین ......

عەطا فەرمووی : ئەی هاوار (وَمَآ أَسۡـَٔلُكُمۡ عَلَيۡهِ مِنۡ أَجۡرٍۖ إِنۡ أَجۡرِيَ إِلَّا عَلَىٰ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿١٠٩﴾ (الشعراء: ١٠٩))

واتە: خۆمن بەرانبەر ڕێنمایی کردن و ئامۆژگاری کردنتان داوای پاداشت و کرێتان لیّ ناکەم، پاداشتی من هەر لای خوایە کە پەروەردگاری گشتی جیهانیانە.

سوێند بەخودا عەطا چووە لای خەلیفە و.... لەدوای مانەوەی بەجیّ ی هێشت و یەك دڵۆپ ئاویشی لەلای نەخواردەوە .

پاشان عەطای کوڕی ئەبی رەبباح تەمەنی درێژبوویەوە تاگەیشتە (١٠٠) ساڵ، ئەو تەمەنەی پڕاوپڕکرد لە زانست و زانیاری و کردار .........

ڕازاندی یەوەو بەچاکەو خواپەرستی و خۆپارێزی گەشەی پێداو بەخۆلادان لەوەی کەلە دەستی خەڵکی دابوو جوان و گەشەداری کردو، تەنهائارەزوومەندی ئەوەبوو

کەلەلای خودابوو........کاتێکیش مەرگ بوویە میوانی، سەیری کرد لە قورسایی یە دنیایی یەکان کۆڵی سووکە .

بەڵام توێشوویەکی باشی لەخودا پەرستی و کارکردنی بۆ دواڕۆژی یە و، لەسەروو ئەوەشەوە (٧٠) حەفتا حەج و، لەوحەجانەشدا (٧٠) حەفتا جار لەسەر کێوی عەرەفە ڕاوەستاوەو، داواشی لەخودای بالأدەست تەنها ڕەزامەندی ئەوو بەهەشتەکەی بووە و، پەناشی گرتووە پێ ی لەتوڕبوونی و لە ئاگری دۆزەخ .

*　　　　*　　　　*

دەی خودایە منیش وەك عەتای کوڕی ئەبی ڕەبباح... داوات لێدەکەم لێم ڕازی بیت و بەبەهەشتەکەتم بسپێری و،پەناشت پێ دەگرم لەتووڕەبوونت و لە ئاگری دۆزەخەکەت .سوپاس بۆخودا .　　　　(وەرگێر)

# ٢ ) عامیری کوڕی عەبدوڵای تەمیمی

**((پشت کردنە دونیا (الزهد) دەگەڕێتەوە بۆ هەشت کەس کەلە پێشەنگیان دا عامیری کوڕی عەبدوڵای تەمیمی یە)).**

**(عەلقەمەی کوڕی مەرسید)**

ئێمە ئێستا واین لەساڵی چواردەهەمی کۆچیدا .

ئائەوانە کۆمەڵێکن لەڕێنمایی کاران و بونیادنەران لەڕێزدارانی هاوەڵان و گەورە شوێنکەوتووان، کەبەفەرمانی خەلیفەی موسڵمانان (عومەری کوڕی خەتتاب) سنووری شاری (بەسرە) دیاری دەکەن و نەخشەی بۆ دادەنێن، وەپشت بەست بوون لەسەر ئەوەی، کە ئەوشارەتازە بکەنە پایەگایەك بۆسوپای موسڵمانان، بەرەو ووڵاتی فارس هەروەها بنەمایەکی بانگەشەکردن بۆلای خودای بالاْ دەست و، بیشی کەنە تیشك بەخشێك بۆبەرزکردنەوەی فەرمایشتی خودا لەسەر ڕووی زەوی دا .........

ئا ئاوا کۆمەڵی موسڵمانان، کە لەهەموو شوێنێکەوە لە دۆرگەی عەرەبەوە کۆچ دەکەن بۆ ئەوشارەتازە ...

لە نەجدەوە ........... لە حیجازەوە .......... لەیەمەنەوە .........

بۆ ئەوەی ببنە پاسەوانی دەروازەی موسڵمانان، ئەو دەروازانەی کە جێگەی ئەوەن دوژمن لێیانەوە هێرش بهێنێ .

یەکێکیش لەو کۆچەرانەی کە لەنەجدەوە کۆچیان کرد بۆبەسرە، گەنجێك بوو لە هۆزی بەنی (تەمیم)

پیێ ی دەوترا عامیری کوڕی عەبدوڵای تەمیمی عەنبەری .

عامیری كوڕی عەبدوڵای تەمیمی لەو ڕۆژگارەدا، لەسەرەتای لاویەتی دابوو، پێست نەرم، شۆخ و شەنگ، ڕووگەش، ناخ خاوێن، دڵ وابەست بەخواوەو خۆپارێز .....

بەسرەش لەگەڵ ئەوەدا شارێكی تازە بونیادبوو، بەڵام لە دەوڵەمەنترین وڵاتی موسڵمانان بوو، زۆرترین سامانی تیاكۆبوو بوەوە .

لەبەرئەوەی داهاتی جەنگ و زێڕو زیوی خالص دەڕژایە ئەوێ .........

بەڵام لاوی تەمیمی عامیری كوڕی عەبدوڵا هیچ مەبەست و ویستێكی لە هەموو ئەوە دا نەبوو............

ئەوبێ باك بوو لەوەی لە دەستی خەڵك دابوو، تەنها چاوی بڕیبووە ئەوەی كەلەلای خودای باڵادەست بوو........

پشتی لە دونیاو جوانی یەكانی هەڵكردبوو، ڕووبەڕووی خوداو ڕەزامەندی ئەو بوو بوویەوە .....

پیاوی بەسرە و پێشەنگی ئەو ڕۆژەی، هاوەڵی پایەبەرز و ڕێزدار ئەبو موسای ئەشعەری بوو (خوا لێی ڕازی بێت).

ئەو والی ئەو شارە گەشەدارەبوو ...

هەروەها پێشەوای سوپاكانی موسڵمانان بوو كە لە (بەسرە) وە بەرەو هەموو لایەك بەڕێ دەكران.

پێشەوا و مامۆستا و ڕێ نیشاندەری دانیشتوانی شارەكە بوو بۆلای خودای باڵادەست ....

عامیری كوڕی عبدالله هەمیشە لەگەڵ ئەبو موسای ئەشعەری دابوو لە ئاشتی وجەنگ دا هاوڕێ یەتی دەكرد، لە مانەوەو سەفەری داو هەمیشە گوێگر و لێوەرگری قورئان بوو لێ ی، بە تەڕ و تازەیی، بەو شێوەیەی كە دابەزیبووە سەر دڵی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ...

لەوەوە فەرموودەی پێغەمبەری گێڕاوەتەوە، بەدروستیەوە ڕاستەوخۆ لەسەر دەستی ئەو هاوەڵە ڕێزدارە دا لە دینی خودای باڵادەستدا شارەزابوو .

جا كاتێك ئەوەی كە ویستی لە زانست و زانیاری تەواوی كرد، ژیانی دابەش كرد بۆ سێ بەش :-

بەشی یەكەم: زیكر كردن لە مزگەوتی بەسرەدا تیایدا قورئانی فێری خەڵكی دەكرد .

**بەشی دووەم** : بۆ گۆشەگیری و خوداپەرستی، کە لە نێوان دوو دەستی خودای پەروەردگاردا بە پێوە رادەوەستا هەتا قاچەکانی دەچەمانەوە .
**بەشی سێیەم**: لە گۆڕەپانەکانی جیهاد و کۆششکاریدا، کە تیایدا شیرەکەی ئاوێزانی دڕان و بەربەستانی ئایینی خودا دەکرد لە ڕێگەی خودادا و لە ژیانیدا هەرگیز

شوێنگەیەکی واز لێ نەهێناوە و بەجێ ی نەهێشتووە بۆ جیهاد نەبووبێ ... هەتا ناسراوە بە خوداپەرستەکەی (بەسرە) و بێ باکەکە لە دونیا و دونیایی یەکان ..
لە هەواڵەکانی (عامیری کوڕی عەبدوالله) ئەوەی کە یەکێك لە ڕۆڵەکانی شاری (بەسرە) لە بارەیەوە دواو ووتی :
لەگەڵ کاروانێکدا کە (عامیری کوڕی عەبدوالله)ی تێدابوو سەفەرم کرد، کاتێك شەومان بەسەرداهات، لە مێرگێکدا لامان دا ....
(عامیر) کەلوپەلەکەی کۆکردەوە و، ئەسپەکەی بە درەختێکەوە بەستەوەو لەغاوەکەی بۆ شۆڕکرد و، ئەوەندەی تێری پێ بخوات لە گژوگیای بۆ کۆکردەوە و، خستی یە بەردەمی .... پاشان چووە ناو مێرگەکەو، دوورکەوتەوە تا لەچاو گوم بوو

کوڕە لاوەکە ووتی : لە دڵی خۆمدا ووتم :
سوێند بەخوا شوێنی دەکەوم و، سەرنجی دەدەم بزانم بەم شەوە لەناو ئەم مێرگەدا چی ئەکات :
سەرنجم دا ڕۆیشت هەتا گەیشتە گردۆڵکەیەکی پڕ لە دارودرەخت، پەردەپۆشی لە چاوی خەڵکی....
ڕووی لە قیبلە کردو، بە پێوە وەستا دەستی بە نوێژکرد ....
هێشتا نوێژی چاکتر و تەواوتر و بە خشووع تری وەك ئەو نوێژەی ئەوم نەدی بوو .
چەندی وویست نوێژی کرد پاشان دەستی کرد بە نزاو پاڕانەوە لە خودا لەوە کە گوتی :
خودایە ! تۆ بە فەرمان ویستی خۆت منت بەدی هێناو، بەویستی خۆت خستمتە ناو بەڵاو چەرمەسەرێکانی ئەم دونیایەوە، پاشان پێمت فەرموو: خۆڕاگربە ...
ئەی خودایە ! چۆن لەناو ئەو هەموو بەڵا دونیایی یەدا خۆم ڕابگرم ئەگەر تۆ بەلوتف و بەزەیی خۆت ڕام نەگری، ئەی بەهێزی بە توانا ؟!

خودایە ! خۆت ئەزانی ، بێ گومان ئەگەر ئەم دونیایە و ئەوەی کە تیایەتی هی من بێت، پاشان بۆ ڕەزامەندی تۆ داوام لێبکرێت لیٚ ی کەل ناکەم دەیبەخشم بەوەی کە داوای دەکات ...

جا کەوابوو خودایە ناخی (نفس) خۆم پێ ببەخشە ئەی بەبەزەیی ترینی بەبەزەیی یەکان ....

خودایە ! بەڕاستی من خۆشم دەوێیت خۆشەویستی یەکی وەها کە هەموو بەلاٚو تووشبونێکی لەسەر ئاسان کردووم و، بەهەموو بڕیارێکیشت ڕازیی کردووم .

ئیتر لەگەلٚ خۆشەویستی تۆدا بە خەیالٚیدا نایەت ئەوەی ڕۆژی تێدا دەکەمەوە، یان ئەوەی ئێوارەی تێدا دەهێنم.......

پیاوە بەسرەیی یەکە گوتی :-

وەنەوز زۆری بۆ هێنام، هەتا ناچار بووم چاوەکانم نوقاند و خەوتم پاشان بەردەوام ئەنووستم و خەبەرم دەبوویەوە، دەمبینی (عامیر) لەسەر هەلٚوێستی خۆی بەردەوامە، لە نوێژەکان و پاڕانەوەیدا، هەتا بەرەبەیان هەناسەی دا .

کاتیٚ نوێژی بەیانی بوو، نوێژەکەی بەیانی کردو، پاشان ڕوو بە ڕووگە نزای دەکردو دەیووت :

خودایە ئەوە بەرەبەیان داهات و، خەلٚکی دەستیان بەهاتوچۆ کرد داوای یارمەتی و بەخشندەیی تۆ دەکەن ....

بیٚ گومان هەریەکەیان پێویستی یەکیان هەیە ...

بەڕاستی پێویستی (عامِر) لەلای جەنابت ئەوەیەکە لیٚ ی خۆش بێت ..

دەی خودایە پێویستی منیش و ئەوانەیشی جیٚ بە جیٚ بکە ئەی بەخشەندەترینی بەخشندەکان....

خودایە خۆت دەزانی من سیٚ داوام ئاراستە کردی، دوانیانت پیٚ بەخشیم، وە یەکێکیانت لێم قەدەغە کرد .....

خودایە ئەوەشیانم پیٚ ببەخشە، هەتا وەك خۆم پێم خۆشەو دەمەوێت بت پەرستم .

پاشان لە شوێنەکەی هەستا، چاوی بەمن کەوت ... زانی لە شوێنێکدابووم لەو شەوەدا کە ئاگام لەو بووە، بۆیە بەوە زۆر بێتاقەت بوو، وە لەگەلٚ داخێکی گران دا پیٚ ی ووتم :

وات ئەبینم ئەی برای (بەسرە)یی ئەمشەو چاودێری منت کردووە ؟!



ووتم : بەڵێ

ووتی: ئەوەی کە بینیت داپۆشە خودا داتپۆشێت .

ووتم : سوێند بەخوا یان دەبێت ئەو سێ داوایەی لە پەروەردگارتت داواکرد بۆم ئاشکرا بکەیت، یان ئەوەی کە لێم بینیوی خەڵکی لێ ئاگادار دەکەم .

ووتی: دەستم بە دامانت وا مەکە .

ووتم: هەر ئەوەیە کە پێت دەڵێم ...

کە سووربوونی منی بینی ووتی :

قسەت بۆ دەکەم بە مەرجێك لەسەر دەستی خودادا پەیمانم پێبدەیت کە لەلای کەس باسی نەکەیت.

ووتم: لەسەر دەستی خودادا پەیمان بێت ئەو نهێنی یە ئاشکرا ناکەم هەتا زیندووبم

ووتی : هیچ شتێك نەبووە مەترسی دارتر بووبێت لە ئافرەتان لەسەر دینەکەم و دینداریم، بۆیە داوام لە پەروەردگارم کرد.کە خۆشەویستیان لە دڵمدا داماڵێت، خودا داواکەی قبووڵ کردم، هەتا وام لێهاتووە بە خەیاڵمدا نایەت ئافرەتێك ببینم یان دیوارێك .

ووتم: ئەوە یەکەم، ئەی دووەم چی یە ؟

ووتی: دووەمیان ئەوەیە کە من بە ڕاستی داوام لە خودا کرد کە جگە لەو لە کەسێکی تر نەترسم، خودا داواکەی قبووڵ کردم، سوێند بەخوا لە ئاسمان و لە زەوی دا جگە لەزاتی ئەو بیم وترسم لە هیچ شتێك نی یە .

پاشان ووتم : ئەی سێ یەم چی یە ؟

ووتی: داوام لە پەروەردگاری خۆم کرد کە خەو لە چاوەکانم وەدەرنێ، هەتا پەرستشی بکەم بەشەو وبە ڕۆژ، هەروەك دەمەوێت ... بەڵام ئەو لەم سێ یەمە قەدەغەی کردم .

جا کە ئەوەم لێ بیست پێم ووت :

بەزەییت بە خۆتا بێتەوە، تۆ شەوت بە خواپەرستی و بێداری بەسەر دەبەیت، وە ڕۆژت بە ڕۆژ تێ دەپەڕێنیت ...

وە بە ڕاست بەهەشت بە کەمتر لەوەی کە تۆ دەیکەیت بەدەست دێ و، بە کەمتریش لەوەی، دەی چێژیت لە ئاگر دەپارێزرێیت .



پاشان ووتی : بەڕاستی لەوە دەترسم کە پەشیمان بم، ئەو کاتیش پەشیمانی سوود نابەخشێت......

سوێند بەخوا بەبێ هیچ کەمتەرخەمی یەك خۆم هیلاك دەکەم لە خوداپەرستن دا، تا ئەوەندەی ڕێگایەك نەمێنێ بەدی بکەم بۆ هەوڵدان و خۆ هیلاك کردن ..

جا ئەگەر ڕزگارم بوو، ئەوە بە میهرەبانی خودایە ....

خۆ ئەگەر چوومە ئاگر ئەوە بە کەمتەرخەمی خۆمە ...

لەگەڵ ئەوەدا وە نەبێ کە (عامیری کوڕی عەبدوڵلاّ) تەنها بێدارێکی شەو بووبێت کە شەوی بە خوداپەرستی ڕۆژ کردبێتەوە، بەڵکو لە ڕۆژیشدا ئەو سوارچاکێك لە سوارچاکەکانی خوپەرستی بووە .

کاتێك کە بانگ درابێت لەلایەن بانگدەرەوە بۆ جیهاد لە ڕێگای خوادا، ئەو لە پێشەنگی ئەوانەدا بووە کە وەڵامی بانگەکەی داوەتەوە .

بەخێرایی بەڕێ کەوتووە بۆ یەکێك لە غەزاکانی لەگەڵ کۆششکاران دا هەڵوێستەیەکی وەرگرتووە بۆ هەڵبژاردنی هاوڕێکانی جا کەڕێ ی کەوتبێتە کۆمەڵێك بە گونجاوی زانیبێت لەگەڵ خۆی، پێی ووتوون :ئەی برایان، بەڕاستی من دەمەوێت هاوڕێیەتیتان بکەم بەمەرجێ ئەم سێ مەرجەم پەسەند بکەن ....

ووتیان: مەرجەکانت کامانەن ؟

ئەوسا ئەویش ووتی: یەکەمیان ئەوەیە کە من خزمەتکارتان بم، وە کەستان بە هیچ جۆرێك لەوەدا ململانێم لەگەڵدا نەکات .

وە دووەمیان: ئەوەیە کە من بانگدەرتان بم، وە کەستان بۆ نوێژەکان لەوەدا ململانێم لەگەڵدا نەکات .

وە سێ یەمیان: ئەوەیە کە ڕێگەم بدەن بە پێ ی توانای خۆم خەرجتان بۆ بکەم..

جا ئەگەر بیان ووتایە بەڵێ، ئەوا دەچوو لەگەڵیان ....

خۆ ئەگەر یەکێکیان لە یەکێك لەوانەدا ململانێ ی بکردایە ئەوا بەجێ ی دەهێشتن بۆ لای کۆمەڵێکی دی.

(عامیر) لە زۆربەی ئەو موجاهیدانە بووە کە لەکاتی پێویستدا بەهانەوەچوون. وە لە کاتی دابەشکردنی داهاتی جەنگدا لە کەمترین تەماکاران بووە .

ئەو لەڕیزبەندی یەکەم دابووە کە ئامادەی گۆڕەپانی جەنگ بووە بەدەگمەن کەسێك پێشی کەوتبێ.......

وە هەروەها ئەو لەپێشەنگی ئەوانەدابوو کەوازی هێناوە لەداهاتی جەنگ، کەسێك لەوەدا پێشی نەکەوتووە ....... واتە لەوەرگرتنی غەنیمە دوورکەوتووەتەوە .

*    *    *

جائەوە (سەعدی کوڕی ئەبی وەقاسە) لەدوای جەنگی (قادسیە) دەچێتە ناو(کاخی کیسرا):

وەفەرمان دەداتە (عەمرۆی کوڕی موقەڕین) بەکۆکردنەوەی داهاتی جەنگ وژماردنی، بۆئەوەی (پێنج یەکی ١/٥) بنێرێت بۆ(ماڵی دارایی موسڵمانان)، وەماوەکەشی دابەش بکات بەسەر(کۆششکاران) دا (المجاهیدین)،

ئەوەندەی لەبەردەستدا لەسامان وشتی بەنرخ و نایاب لەزێڕوزیوو عەنتیکە، کۆبوو بوەوە کەوەسف نەدەکرا، وەلەتوانای بژاردن دانەبوو..........

بەرچینەی گەورە، گەورەی تیابوو کەمۆرکرابوو بە (ڕەساس) کەپڕبوون لەقاپ و قاچاغی دروستکراو لەزێڕو زیو، کەپادشایانی فارس خواردنیان تیادەخوارد.

وەهەروەها سندوقی هەمەجۆرە کەلە داری بەنرخ دروست کرابوون، پڕبوو لەجل وبەرگی(کیسرا)، و لەملوانکە و سنگ پۆش(درع) کەزاخاو کرابوو بەزێڕ.........

وەئەوەش یەغدانە پڕە لەبۆنی هەمەجۆرو خشڵ و شتومەکی خۆڕازاندنەوە...

وەئەوانەش کێلانن کەشیری پادشاهانی تێدایە، پادشا لەدوای پادشا ماوەتەوە.

وەهەروەها شیری ئەوپادشاهانەی تیاپارێزراوە کەلەقۆناغەکانی مێژوودا مل کەچی فارس بوون .........

جالەکاتێکدا فەرمانبەران ئەوداهاتانەیان ژماردەدەکرد لەبەرچاوی موسڵمانان دا وەبەدەنگی بیسراو .....

پیاوێکی دەم وچاوخۆڵاوی قژهەڵچوپەیدابوو، یەغدانێکی گەورەی قورسی پێ بوو، کەبەهەردوو دەستی هەڵیگرتبوو .........

خەڵکەکە سەرنجیان دا، یەغدانێك (سندوق) بوو، هەرگیز چاویان بەوێنەی ئەوەنەکەوتبوو، وەهیچ شتێکیان کۆنەکردبووەوەو نەدیبووەوەکە وەك ئەوەوابێت، یان بەهای ئەوەی هەبێت ...........

سەیری ناوەکەیان کرد، بینیان پڕە لەنموونەی زێڕوزیوو خشڵی نایاب...........

ووتیان بەپیاوەکە:

لەکوێ ئەم گەنجینە بەنرخەت دی یەوە؟!

ئەویش ووتی: بەدەستم هێنا لەفلأن جەنگدا........... لەفلأن شوێن .........

جاووتیان: ئایاهیچت لێهەڵگرتووە؟

فەرمووی: خودا ڕێنماییتان بکات ........

سوێند بەخودا ئەم یەغدانەو، هەموو ئەوەی کەپادشاهانی فارس هەیانە لەلای من بەهای سەرنینۆکێکی نی یە ........

وەئەگەر ئەوە مافی ماڵی دارایی موسڵمانانی تیانەبووایە لەسەرزەوی بەرزم نەدەکردەوە ........

وەنەم دەهێنا بۆلای ئێوە .

ئەوجا ووتیان: تۆکێیت ئەی خودا ڕێزت بگرێت؟!

ووتی: سوێند بەخوا پێتان ناڵێم تاسوپاسم بکەن، وەبەکەسانی تریش ناڵێم تالەسەری سوپاس وسەنام بکەن .

بەلأم سوپاسی خودای بالأدەست دەکەم وتکای پاداشتی ئەو دەکەم .

ئینجا بەجێ ی هێشتن و، ڕۆشت .........

ئەوجا ئەوان فەرمانیان دا بەپیاوێك لەخۆیان کەشوێنی بکەوێت، وەئەوجا لەبارەیەوە ئاگاداریان بکاتەوە.

بەردەوام پیاوەکە دورونزیك شوێنی کەوت، بەبێ ئەوەی ئەوپێ بزانێ ........ هەتا گەیشتە لای هاوڕێکانی، جاکە پیاوەکە پرسیاری ئەو پیاوەی لێکردن ووتیان:

ئایا نایناسی؟!

ئەوە دونیا نەویستەکەی (بەسرە) یە .... (عامیر کوڕی عەبدولأی تەمیمی) یە...

* * *

بەلاَم ژيانى (عاميرى كورِى عەبدوڵلاَ) ..... لەگەڵ ئەوەى كەزانيت دەربارەى .........
بىَ بەش نەبووە لەترش وتاڵى و، وەبىَ وەى نەبوو لە ئازارى خەڵكى ..
جاهەروەك بێژەرانى حەق بەڕاشكاوانەو بەرگرانى خراپەو، كاركەران بۆنەهێشتنى خراپە تووشى دەبن، ئەويش ئاوەها تووشى بووە ..............
جاهۆكارى ڕاستەوخۆ كەبەهۆيەوە تووشى ئەزيەت و ئازاربووە .........

ئەوەبوو كەپياوێكى بينى لەياريدەدەرانى بەڕێوەبەرى پۆليسى (بەسرە) گەردنى پياوێكى گرتبووله پارێزراوان (ئەهلىَ ذيمە[1]) و ڕاى ئەكێشا چۆن ڕاكێشانىَ

ئەوجا (عامير) لاى كرد بەلاى پياوەكە وەوتى : وازى لىَ بێنە..
پياوەكە گوتى: وازى لێنا هێنم..
هەرئەوەندە زانرا (عامير) كراسەكەى دابەسەر(زمى يەكە داو) ووتى:
سوێند بەخوا، پەيمانى محمد(د.خ) بۆ پاراستنى (زمى يەكان) ناشكێت و بەتاڵ نابێتەوە، وە من زيندووبم....
ئينجا خەڵكى كۆبونەوە و ، كەوتنە يارمەتى (عامير)، پياوەكەيان (زمى يەكايان) بەزۆر ڕزگاركرد......
ئەوەندە زانرا پياوانى بەڕێوبەرى پۆليس (عاميريان) تۆمەتباركرد بەلادان لە گوێڕايەڵى خەليفە....
وەدايان گرێتەوە بە دەرچوون لەڕێگەوڕێبازى سوننەت و جەماعەت..
ئەوجا ووتيان:
ئەوە پياوێكە كەژن ناهێنێت..
وە گۆشت و شيرەمەنى ئاژەڵان ناخوات..
وە خۆى بەبەرز ڕادەگرێت لەوەى كە ئامادەى كۆڕى واليەكان بێت.
وە ئەو تۆمەتانەيان بەرزكردەوە بۆ فەرمانڕەواى بڕواداران(عثمانى كورِى عەففان): تالەبارەى (عاميرەوە) فەرمان بدات..

---

[1] / ذمي / واتە كەسێك لە (كيتابى يەكانى – يەهودى يان گاور) كە بەدانى باج هەموو مافێكيان لە دەوڵەتى ئيسلاميدا پارێزراوە . (وەرگێڕ)

خەلیفە فەرمانی دەرکرد بۆ (والی یەکەی) لە (بەسرە) کە(عامیری کوڕی عەبدوڵلا) ئامادەی لای خۆی بکات، وەپرسیاری لێ بکات دەربارەی ئەو تۆمەتانەی کە دراوەتە پاڵی: تالەو بارەوە خەلیفە ئاگاداربکات....

جا والی(بەسرە) (عامیری) بانگ کرد و ووتی:

بەڕاستی خەلیفەی موسڵمانانی _ خودا بەرەکەت بخاتە تەمەن و پایەیەوە_فەرمانی بەمن کردووە کە پرسیارت لێ بکەم دەربارەی ئەو تۆمەتانەی کە دراونەتە پاڵت...

ئینجا(عامیر) گوتی: فەرموو پرسیار بکە لەوەی کە خەلیفەی موسڵمانان فەرمانی داوە پێ ی:

پاشان والی ووتی: بۆچی لادەدەی لە سوننەتی پێغەمبەر (ﷺ) ، وە ژن هێنانت لە خۆت قەدەغەکردوە؟

عامیر ووتی: وازم لە هاوسەرگیرێتی نەهێناوە بەلادان لە سونەتی پێغەمبەر (ﷺ) وە من گەواهی دەدەم کە خۆگرتنەوە لە هاوسەرگیرێتی لە ئیسلامدا نی‌یە..

بەڵام ئەوەندە هەیە من ئادەمی یەکم ئەبینم کەتەنها یەك نەفسم هەیە، تایبەتم کردوە بە خوای باڵادەستەوە، جالەوە دەترسم کە هاوسەرەکەم زاڵبێت بەسەریا....... ئالەبەر ئەوە هاوسەرگیریەتی ناکەم.

والی ووتە: ئەی بۆچی گۆشت ناخۆی ؟!

عامیر ووتی: بەڵێ دەیخۆم ئەگەر ئارەزوی بکەم و دەستم بکەوێت..بەڵام ئەگەر حەزی لێ نەکەم ، یاخود حەزی لێ بکەم بەڵام دەستم نەکەوێت ئەوجا نایخۆم...

والی ووتی: ئەی بۆچی پەنیر ناخۆیت؟!

عامیر ووتی: لەڕاستی دا من لەناوچەیەکدام کە (ئاگر پەرستی) تێدایە پەنیر دروست دەکەن... ئەوانیش گەلێکن کە جیاوازی ناکەن لە نێوان مردارەوە بوو سەربڕاودا....

وەبەڕاستی من لەوە دەترسم کە ئەو (هەوێنەی) کە پەنیری پێ دروست دەکەن لەمەڕی مردارەوە بوو بێ، جائەگەر دوو گەواهی دەر گەواهیان دا کە ئەو پەنیرە لە مەڕێکی سەربڕاو دروست کراوە، ئەوە دەیخۆم..

والی ووتی: ئەی چی وای لێکردوویت کەسەردانی والیەکان نەکەیت و ئامادەی کۆڕەکانیان نەبیت؟!

عامیری ووتی: بەڕاستی لەدەرگای ئێوەدا زۆرێك هەن کە دەستیان بۆ پێویستیەکانیان گرتۆتەوە، جا من وازیان لێ دەهێنم بۆ ئێوە، ئێوەش پێویستی و داواکانیان بۆ جێ بەجێ بکەن و .... وە واز لەکەسێك بهێنی کە پێویستی و داوای لای ئێوەنی یە ...

وتەکانی (عامیری کوڕی عەبدڵلا) بەرزکرایەوە بۆلای خەلیفەی موسڵمانان (عثمانی کوڕی عە ففان) کەسەرنجی دا هیچ شتێکی تیابەدی نەکرد کەلادان بێت لە گوێڕایەڵی .....یان دەرچون بێت لەڕێچکەو ڕێبازی سوننەت و جەماعەت....

لەسەر ئەوە شەوە ئەمە ئاگری شەڕی نەکوژاندەوە...

واتو ویت دەربارەی (عامیری کوڕ عەبدڵلا) زۆر زۆر تربوو...

تاوای لێ هات خەریك بوو ببێتە ئاژاوەیەك لەنێوان هاوکارانی پیاوەکە و نەیارەکانی دا.. واتە هاوکارانی (عامیر) نەیارانی. جا (عثمان) (خوا لێی ڕازی بێت) فەرمانی دا بە کۆچ کردنی بۆ وولاّتی شام.وە ئەوی دەستنیشان کرد بۆ جێگە نشینی بوونی... وە ئامۆژگاری والی شام (موعاوییەی کوڕی ئەبوو سوفیان) کە بەجوانی پێشوازی لێ بکات و، چاودێری ڕێز و حورمەتی بکات.

جا لەو ڕۆژەدا (کەعامیری کوڕی عەبدڵلا) بڕیاریدا لەسەر کۆچکردن لە (بەسرە) خەڵکێکی زۆر لە دەستە برایان و قوتابیانی وە دەرچوونە دەرەوە بۆ خوا حافیزی.

ڕێیان بەڕێ کرد لەگەڵیدا هەتا گەیشتنە (ئەلمەربە) کە گەڕەکێکی دەرەوەی بەسرە بوو....... جالەوێدا (عامیر) پێی ووتن :

بەڕاستی من دووعا خوازم لەخودای پەروەردگار دەی ئێوەش داوای گیرا بوونی دووعاکانم بکەن بە ئامین .........جاخەڵکی گەردنیان بەرزکردەوە و، جوڵەیان لێ براو، چاویان تێ بڕی بوو.

پاشان بەڕێزی دەستەکانی هەڵبڕی و ووتی:

خودایە ئەوە تۆمەتی دایە پاڵم و درۆی بەدەممەوە کرد، وە بوویە هۆی دەرکردنم لە وڵاتەکەم (شارەکەم) و، جیابوونەوەم لە هاوڕێکانم ........ئەوا من لێی بووردم دەی تۆش لێی ببورە ........

وە خودایە لێ خۆشبون و تەندروستی پێ ببەخشە لە دین و دونیای دا ........

وەمن یش لەگەڵ ئەو و باقی موسڵمانان‌دا بە میهر ولێبوردن و چاکەی خۆت دا بپۆشە ئەی بەبەزەی ترینی هەموو بەبەزەیەکان .

پاشان ڕووی کردە وڵاخەکەی و بەرەو وڵاتی شام، ڕێگەی گرتە بەر .

(عامیری کوڕی عەبدوڵا) ئەوەی کەمابووی لەژیان لە وڵاتی شام بەسەری برد.

وە(بەیتی لمەقدیسی) هەڵبژارد بۆ جێگەنشینی....

وە (والی شام) یش (موعاوی یەی کوڕی ئەبوو سوفیان) ئەوەندەی شایانی ئەوبێت چاکە و ڕێز و میهر و کەرەمی لەگەڵ کرد و، زۆر میهرەبانی لەگەڵ نوواند.

جاکەنەخۆش کەوت، نەخۆشی مەرگ، هاوڕێکانی چوونە خزمەتی، بینیان دەگری .

جاووتیان:چی وات لێدەکات کەبگریت، لەگەڵ ئەوەدا، تۆ ئاواو ئاوابوویت ؟!

فەرمووی: سوێندبەخوا بۆدونیاو لەزەتە دونیایی یەکان ناگریم ....

وەلە ترسی مردنیش ناگریم بەڵکو دەگریم بۆ دووروردرێژی سەفەرو کەمی تێشوم...

وائێوارەم هێنا لەنێوان بەرزبوونەوە دابەزیندا ........جایابۆ بەهەشت ...........

وەیابۆناوئاگر........ئیتر نازانم بۆکامیان دەچم ..........

پاشان دواهەناسەی داو، زمانیشی تەڕو پاراوبوو بەیادی خودا ........

ئالەوێدا ........... ئالەوێدا .......... لەلای یەکەم ڕووگەی موسڵمان ........ لەلای(بەیتی لمەقدیسدا).....ڕێڕەوی ڕەوانەکراوی خودا محمد (ﷺ) بۆخزمەتی خودا .........(عامیری کوڕی عەبدوڵای تەمیمی) بەخاك سپێررا .

خودا ڕووناکی ببەخشە بە (عامیر) لە گۆڕەکەیدا .........وە ڕووگەشی بکە لەبەهەشتی هەمیشەییدا .........

خودایە ئێمەش تەوفیق بدە لەسەر ڕەوی یەی (عامیری کوڕی عەبدوڵا) و لەگەڵ ئەودا لەخزمەت پێغەمبەردا(ﷺ) لە سەرئاوی (کوثر) کۆمانبکەرەوە .﴿وەرگێڕ﴾

# ٣ )عوروەی کوڕی زوبەیر

**(کێ دڵی بەوە خۆش بێت کەبڕوانێت بۆپیاوێك لەبەهەشتی یەکان بابڕوانێت بۆ(عوروەی کوڕی زوبەیر)**

**(عەبدولمەلیکی کوڕی مەڕوان)**

واخەریکە خۆری ئێوارە وەخت بەتاڵە ئاڵتونی یەکانی یەوە لە(کەعبە) ی بەڕێز ماڵ ئاوای دەکات، وەڕێ دەدات بەئاوازی دڵڕەوێن کە دەنگ بداتەوە لەچواردەوری (کەعبەی) پیرۆز ......... هەتا گەڕیدەکان دەستیان کردە گەڕان بەدەورە (کەعبەی پیرۆزدا)، لەمەننەنەندەی هاوڕێیانی پێغەمبەر(ﷺ) و گەورە شوێنکەووتوان، ئاسمانیان بۆنخۆش کردبە (لاإلهَ إلاَّ اللهُ، اللهُ أكبَرْ )، وەهەموو لایەکیان پڕکرد لەنزای چاك .

وەخەڵکی دەستیان کرد بە کۆڕبەستن، کۆمەڵ کۆمەڵ بەدەوری (کەعبەی) پیرۆز خاوەن بەهاوبەرزی جێگیرلە ناوەندی ماڵەکەدا ...

وەچاوەکانیان پڕو تێردەکرد لەبەهاونرخی (کەعبەی) پیرۆز، وەلەنێوانی خۆیاندا گفتوگۆیان ئاڵوگۆڕدەکرد.

دوور لەقسەی هیچ وپووچ وگوناهئامێز .

وەلە نزیك (رووکنی یەمانی یە) وە، چوار لاوی ڕووگەش، بنەما ڕەسەن، گەردن کەش و بۆنخۆش......

که هەروەك زۆربەی کۆترەکانی مزگەوت، بەرگ ڕازاوەو بریقەدار دڵ وابەستبەیەکەوە کە(عەبدوڵلاّی کوڕی زوبەیرو، براکەی (موسعەب) ی کوڕی زوبەیرو براکەی تریان (عورووەی کوڕی زوبەیر) و(عەبدولمەلیکی کوڕی مەڕوان) بوون گفتوگۆ بەنەرم ونیانی لەنێوانی ئەولاوەچاکانەدا ئاڵوگۆڕدەکرا،

پاشان زۆری پێ نەچوو یەکێکیان ووتی:

باهەریەکە لەئێمە ئەوەی کە حەزی لێدەکات لەخوای بخوازێ ..........

خەیاڵیان ڕۆیشت باڵی گرتەوە لە جیهانی نادیاری فراوان دا، وە خەو خەیاڵەکانیان کەوتە گەڕان لەباخچەی ئاواتە سەوزەکاندا .

پاشان (عەبدوڵلاّی کوڕی زوبەیر) ووتی:

(ئاواتی من ئەویە کە ببمە خاوەنی (حیجاز) وە خەلافەت بەدەست بهێنم)......

وەبراکەی (موسعەب) ووتی:

بەلاّم ئاواتەخوازم کەببمە خاوەنی دوو عیراقەکە واتە:کوفە وبەسرە، وەکەس تیایاندا ململانێم نەکات.

وە(عەبدولمەلیکی کوڕی مەڕوان) ووتی:

ئەگەر ئێوە هەردووکتان بەوەڕازین، من ڕازینابم جگە بەوەنەبێ کەببمە خاوەنی هەموو سەرزەوی ....... وەخەلافەت بەدەست بخەم لەپاش (موعاویەی کوڕی ئەبی سوفیان) .......وە (عورووەی کوڕی زوبەیر) بێدەنگ بوو وەهیچی نەووت.........

جائ ی کۆبوونەوەو، ووتیان: ئەی تۆچی بەئاوات دەخوازی ئەی (عورووە)؟ .

ووتی: خودا پیرۆزی کات لێتان، ئەوەی کە ئاواتتان خواستووە لەکاروباری دونیاتان ........

بەلاّم من ئاواتە خوازم کەببمە زانایەکی خاوەن کردار، خەڵکی (پەڕاوی پەروەردگارەکەیان و، سوونەتی پێغەمبەرەکەیان وئەحکامی(بنەماوبڕیاری) دینەکەیان لێمەوە فێربن ........

وە لەو دونیاش سەرکەوتووبم بەبەدەست هێنانی ڕەزامەندی خوداو، شادببم بەبەهەشتەکەی .......

ئینجاڕۆژگارهات و ڕۆژگارچوو، ڕۆژگاربوویە بەختی(عەبدڵڵای کوڕی زوبەیر) و بوویە (خەلیفە) و پەیمانی پێدرا لەدوای مردنی (یەزیدی کوڕی موعاویە)، وەبوو بەفەرمانڕەوای (حیجازو میسرو یەمەن و خۆراسان وعیراق).....

لەپاشدا لەلای (کەعبە) دا کوژرا کە دوور نەبوو لەوشوێنەوە کەئاواتی تیاخواستبوو، وەئاواتی بوو.

ئەوەش (موسعەبی کوڕی زوبەیرە) فەرمانڕەوایەتی(عیراق) دەگرێتە دەست لەلایەن (عەبدوڵڵای) برایەوە، وەئەویش دەکوژرێت لەکاتی پارێزگاری کردن لە فەرمانڕەوایی یەتەکەی .

وە ئەوەش (عەبدولمەلیکی کوڕی مەڕوانە) کەلە دوای مردنی باوکی فەرمانڕەوایەتی(خیلافەی) دەگرێتە دەست، وەدەنگی هەموو موسڵمانان دەچێتە پاڵی لەدوای کوشتنی (عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیرو موسعەبی برای) لەسەردەستی سەربازەکانی ئەودا ......... پاشان دەبێتە گەورەترینی پادشاهانی جیهان لە دەورانی خۆیدا .

ئەی کارو ئاواتی (عورووەی کوڕی زوبەیر) چی بەسەرهات؟ ...

فەرمووی بالەسەرەتاوە دەست بە چیرۆکەکە بکەین .

* * *

(عورووەی کوڕی زوبەیر) لەدایك بووە ساڵێك پێش تەواوبوونی خیلافەتی (فەرمانڕەوایەتی) (عومەری فاروق)، لە ماڵێك لەبەڕێزترین ماڵەکانی موسڵمانان دا لە پلەوپایەدا .

باوکی، ئەو(زوبەیری کوڕی عەوامە) کەلەهاوڕێ تایبەتیەکانی پێغەمبەری خودا(ﷺ) بوو، وەیەکەم کەس بوو کە شیری ڕادا لەئیسلام دا، وەیەکێك بوو لەو دەکەسەی کە مژدەی بەهەشتیان پێدرابوو.

وەدایکی، (ئەسمای کچی ئەبوبەکر) بوو کەناسرابوویە خاوەنی دوو پشتێن [1] .

وەباپیری لەدایکی یەوە، ئەوە (ئەبوبەکری صدیقە) جێ نشینی پێغەمبەر(ﷺ) و هاوڕێ ی بوو لە ئەشکەوتدا .

---

[1] لە پەراوی (صورٌ حیاة الصحابة) هی دانەر بەدرێژی باسەکەی هەیە .

وەنەنکی لەباوکی یەوە...ئەوە (سەفییەی کچی عەبدولموتەلیبە) کەپووری پێغەمبەرە (ﷺ) ،وەپوری لەدایکیەوە... ئەوە دایکی بڕوادارانە (عائیشە) (ڕەزای خوای لێ بێت).

ئەو خۆی دابەزی یە گۆڕەکەی کاتێ نێژرا، وەخۆی بەدەستی خۆی ئەلحەدەکەی بۆدانا. ئایا گومان دەبەیت لەدوای ئەو (بنەما ڕەسەنە) بنەمایەکی ڕەسەنی دی هەبێت ......

وەیان لەسەرو ئەو بەهاو ڕێزەوە بەهایەکی دی هەبێت جگە لە ڕێزو بەهای بڕواو عیزەتی ئیسلام ؟

* * *

وەبۆ ئەوەی (عوروە) ئەو ئاواتەی کەلەخودای خواست لەلای (کەعبەی) پیرۆزدا بەئەنجامی بگەیەنێت و جێ بەجێ بکات، خۆی ئاراستەی وەرگرتن و فێربوونی زانست و زانیاری کرد وخۆی بۆیەکلاکردەوە، وەئەوەندەی کەمابوون لە هاوڕێیانی پێغەمبەر(ﷺ) بەفرسەتی زانی سەردانی ماڵەکانیانی دەکردو، نوێژی لەپشتەوە دەکردن و، بەردەوام ئامادەی کۆڕەکانیان دەبوو، هەتا وای لێهات کەفەرموودەی دەگێڕایەوە لە (عەلی کوڕی ئەبی تالب و، عەبدولڕەحمانی کوڕی عەوف و، زەیدی کوڕی سابت و، ئەبو ئەیوبی ئەنصاری یەوە) .........

وەهەروەها لە (ئوسامەی کوڕی زەیدو، سەعیدی کوڕی زەیدو، ئەبی هورەیرەو، عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس و، نوعمانی کوڕی بەشیرەوە...........

وەزۆرێکی لە پووری یەوە (عائیشە) دایکی بڕوادارانەوە وەرگرتووە، هەتا بووە تە یەکێك لە حەوت زانایانی شاری (مەدینە) کە مووسڵمانان پەنایان بۆدەبردن لەکاروباری ئاینەکەیاندا .

وەفەرمانڕەواچاکەکان هانایان بۆدەبردن بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری بڕواداران وە وولاٌتیان، کە خودا ئەوانی کردبووە فەرمانڕەوایان جالەوانە (عومەری کوڕی عەبدولعەزیز) کاتێك بوویە والی ئەوێ ، خەڵکی شاری (مەدینە) هاتن بۆلای تاسلاٌوی بەخێرهاتنی لێبکەن ...... کاتێك کەنوێژی نیوەڕۆی کرد، دەکەس لەزانایانی (مەدینەی) بانگهێشت کرد، لەسەرو هەموویانەوە(عوروەی کوڕی زوبەیر)...

کاتێك گەیشتنە لای، بەگەرم بەخێری هێنان، وەڕێزی لە کۆڕەکەیان گرت، پاشان سوپاس و ستایشی خودای کرد بەوەی کە شایانی شان و شکۆ بوو، ئینجا گوتی:

بەڕاستی من بانگهێشتی ئێوەم کردووە بۆ کارێك کەلەسەری پاداشت وەردەگرن وە بۆ منیش لەو کارەدا دەبنە یاریدەدەر لەسەر حەق ...

جا من نامەوێت هیچ بڕیارێك بدەم بەڕای ئێوە نەبێت، یان بەڕای ئەوەتان کە ئامادە دەبێت.

جا ئەگەر یەکێکتان بینی بەسەر یەکێکدا دەچێت بەناحەق، وەیان ئاگادار دەکرێت دەربارەی یەکێك لە فەرمانبەرەکانم ستەم لە کەسێك دەکات.سوێندتان دەدەم بەخودا کە منی لیٰ ئاگادار بکەن و پێم ڕابگەیەنن.

ئەوجا (عوروەی کوڕی زوبەیر) نزای بەخێری بۆ کرد، وەتکای لە خودا کرد کە ڕاوەستاوی بکات و ڕێنمایی بکات .

*　　　　*　　　　*

بیٰ گومان (عوروەی کوڕی زوبەیر) زانست و کرداری بەیەکەوە کۆکردبووەوە، لەزۆربەی ڕۆژدا بەڕۆژوو بوو ... وە لەتاریکی شەواندا بەئاگا بوو، هەمیشە زمان تەڕ و پاراو بوو بەیادی خودای بالآدەست .

وەبۆئەوە هەمیشە دەستلەملانی قورئانی پیرۆز بوو، وە لەسەر خوێندنەوەی بەردەوام بوو، ئەو هەموو ڕۆژێك چواریەکی قورئانی لەسەر لاپەڕەکان دەخوێندەوە ...

پاشان لەشەودا لە دڵدا ئەوەی ڕۆژی دەووتەوە ....

وە نەزانراوە کە وازی لەوە هێنابیٰ لەسەرەتای لاوی یەتی یەوە هەتا ڕۆژی لە دونیا دەرچوونی جگە لەیەکجار نەبێت کەلە پاش تۆزێکی تر لیٰ ی ئاگادار دەبیت ...

*　　　　*　　　　*

وە (عوروەی کوڕی زوبەیر) لە نوێژەکەیدا ئاسوودەیەی یەکی دەروونی دەدیەوە، وە نوێژ گەشەی هەردوو چاوەکەی بوو، وە بەهەشتی بوو لەسەر ڕووی زەوی، لەبەرئەوە بە جوانترین و چاکترین شێوە ئەنجامی دەدا، بەتەواوی گرنگی دەدا بە پوختەی ئامانجەکانی نوێژەکانی و، وە درێژەی پیٰ دەدا، درێژی یەکی تەواو ...

ئەگێڕنەوە لیٰ ی کە پیاوێکی بینی نوێژێکی سادەو سووکی کرد، کاتیٰ کە لیٰ بوویەوە لە نوێژەکەی بانگی کرد بۆ لای خۆی وە ووتی پیٰ ی: ئەی برازام، ئایا هیچ پێویستی یەکت بە خودا نی یە؟! ...

سوێند بە خودا من لە نوێژەکەمدا، داوای هەموو شتێك لە خودا دەکەم هەتا خوێیش بۆ خۆراکی ڕۆژانەم.

وە (عورووەی کوڕی زوبەیر) خوا لیّ ی ڕازی بێت دەستکراوەو سوار چاکبووە لە بەخشندەیدا. وەبەڵگە لەسەر دەستکراوەیی و بەخشندەیی (کوڕی زوبەیر)، ئەوەیە کە ئەو باخێکی بووە لە گەورەترینی باخەکانی مەدینە بووە، و ئاوێکی خۆش و زۆری هەبوو، وەڕازا بووەوە بە سێبەری درەختەکانی و .. هێشووی دارخورماکانی ... وە ئەو بە درێژایی ساڵ باخەکەی پەرژین دەکرد، بۆ پاراستنی درەختەکانی لە ئاژەڵ و، چنگی منداڵان، هەتا کاتی پێگەیشتنی و ئەو کاتەی خەڵکی ئارەزوی بەروبوومەکەیان دەکرد... پاشان دەستی دەکردە شکاندنی پەرژینەکەی لە زیاتر لەلایەکەوە، بۆ ئەوەی ڕووخسەت بدات بەخەڵکی کە بچنە ناوی ....

ئەو جا خەڵکی وەك نەریتێك ئیتر دەیانزانی کە باخەکە پێگەیشتووە ... ئیتر دە چوونە ناوی، هاتوو چۆیان پیادەکردو، هەرچی یەکیان بەلاوە بەلەزەت بوایە نۆشیان دەکردو، هەرچی یەکیشیان بوویستایە هەڵیان دەگرت .

وە ئەویش هەر کاتێك بچوایەتە ناو باخەکەیەوە ئەو ووتەیەی خودای باڵا دەستی دەووتەوە :

وَلَوْلَآ إِذْ دَخَلْتَ جَنَّتَكَ قُلْتَ مَا شَآءَ ٱللَّهُ لَا قُوَّةَ إِلَّا بِٱللَّهِ ۚ إِن تَرَنِ أَنَا۠ أَقَلَّ مِنكَ مَالًا وَوَلَدًا ﴿٣٩﴾ سورەتی (الكهف) ئایەتی ٣٩

واتە: خۆ ئەگەر کاتێك کە دەچوویتە باخەکەت بتووتایە ماشا ئەڵڵا هیچ هێزوو توانایەك نی یە جگە بەلای خوداوە نەبێت .....)

*　　　*　　　*

وە لەساڵێك دا لە ساڵەکانی خەلافەتی (وەلیدی کوڕی عەبدولمەلیکدا) خودای باڵادەست وویستی کە (عورووەی کوڕی زوبەیر) تاقی بکاتەوە تاقیکردنەوەیەك، کەلەئاستیدا ڕاوەستاو و بەرگەگر نابێت مەگەر خاوەنی ئەو دڵانەی کە بیروباوەڕ ئاوەدانی کردۆتەوەو، پڕیکردوە لە دڵنیایی.

خەلیفەی موسڵمانان (عورووەی کوڕی زوبەیر)ی بانگهێشت کرد بۆ سەردانی (دیمەشق)، ئەویش وەڵامی بانگهێشتەکەی دایەوە، لەگەڵ کوڕە گەورەکەی ... وە کاتێك گەیشتە لای خەلیفە، بەخێری هێنا گەورەترین و جوانترین بەخێر هێنان و زۆر

دڵخۆش بوو بە هاتنی، وە زۆر ڕێزی لێگرت و سنووری تێپەڕاند لە ڕێزگرتن بەخێر هێنانیدا .

پاشان ویستی خودا وا بوو کە با بەپێچەوانەی ڕەویەی کەشتی یەکانەوە بێ ئا ئەوە (کوڕەکەی عورووەیە) چووە (تەویلەی وولاخەکانی) وەلید تا سەرنجی ئەو ئەسپە نایابانە بدات کە ڕاهێنراون لەسەر وەستان لەسەر سێ لاف، ئا لەو کاتەدا وولاخێکیان لەقەیەکی کوشندەی هاویشتێ و بوویە هۆی لە دونیا دەرچوونی .

وە هێشتا باوکی دڵ هەڵقرچاو ئەو تەپوتۆزەی گۆڕی جگەر گۆشەکەی لە دوو دەستی نەتەکاند بوو، کاتێکی زانی یەکێك لەقاچەکانی تووشی خۆرە بوو.

لاقی ئاوسا، وە خۆرەکە (وەرەمە سەرەتانیەکە) بەخێراییەکی سەرسوڕهێنەر بەهێز بوو، وەبلاو بوویەوە .

جا خەلیفە بانگهێشتی پزیشکانی کرد لە هەموو لایەکەوە بۆ میوانەکەی .. وە هانی دان بۆ چارەسەرکردنی بەهەرهۆیەك بێت ...

بەلام پزیشکەکان ڕایان کۆبوو لەسەرئەوەی کە هیچ چارەیەك نی یە جگە لە بڕینەوەی لاقی (عورووە)، پێش ئەوەی وەرەمەکە هەموو لەشی بگرێتەوە، وە ببێتە هۆکاری وەفاتی ...

ئیتر هیچ شتێك نەما جگە لە مل کەچ بوون نەبێت بۆ بڕینەوەی لاقی.. جاکاتێك کە نەشتەرگەر (جەڕاح) ئامادە بوو بۆ ئەوەی لاقەکەی ببڕێتەوە، وەنەشتەری ئامادەکرد تا گۆشتی لاقەکەی پێ شەق بکات ...

وە مشاری ئامادەکرد بۆ بڕینەوەی ئێسکەکە، پزیشکەکە گوتی بە (عورووە) :

وای بەباش دەزانم کە پێکێك لەسەر خۆشکەرت بدەینێ تا هەست نەکەیت بەئازاری ئەو بڕینەوە بەئازارە.

(عورووە) ووتی: شتی وا ناکەم ... پەنا نابەمە بەر حەرام گوایە بەهۆیەوە تەندروست بیم .

پاشان پێ ی ووت: کەوابوە بێ هۆشکەرت دەدەینێ ، .

(عورووە) ووتی: پێم خۆش نی یە پارچەیەك لەپارچەکانی لەشم لێوەربگرێتەوە بەبێ ئەوەی کە هەست بەئازارەکەی بکەم، وە ئەوە لەلای خودا بۆ پاداشت بەجێ دەهێڵم .

وەکاتێ پزیشکەکە ویستی لاقە کە ببڕێتەوە، کۆمەڵەت پیاوێك بەرەو ڕووی (عورووە) هاتنە پێشەوە ئەوجا ووتی :

ئەوانە کێن؟ ... ووتیان پێ ی :

ئەوانە هاتووون بۆ ئەوەی بتگرن، نەبایە لەکاتی بڕینەوەی لاقتا ئازار زۆرت بۆ بهێنێت، تۆش قاچت ڕابچڵەکێنێت ڕاچڵەکانێك کە زیانت پێ بکەیەنێت .

ئەویش ووتی: بیانگێڕنەوە ...

پێویستم پێیان نی یە، وە من تکام وایە لەبەردەستانا خۆم بگرم، ئەوەش بەهۆی یادی خودا و تەسبیحاتەوە ...

پاشان پزیشك لێ ی هاتە پێش و، بەنەشتەر گۆشتەکەی بڕی ...

وە کە گەیشتە ئێسکەکە، مشارەکەی خستە سەری، وە ئێسکەکەی پێ دا هێناو بڕیەوە، وە (عورووەش) لەوکاتەدا دەیگووت :

(لا إلهَ إلاَّ اللّهَ ، وَ اللّهُ أكْبَرْ) .

بەو شێوەیە تا پزیشکەکە لەبڕینەوەی لاقی تەواو بوو، (عورووە) هەر (لا إلهَ إلاَّ اللّهَ ، وَ اللّهُ أكْبَرْ) ی دووپات دەکردەوە .

پاشان زەیتیان کوڵاَن لە قاپێکی ئاسندا، وە لاقی (عورووە) یان تێ هەڵکێشا بۆ وەستانی خوێنەکەو برژاندنەوە برینەکە ، ئا لەو کاتەدا (عورووە) لەهۆش خۆی چوو، لە هۆش خۆ چونێکی درێژ وەخت، کە بوویە هۆی ئەوەی نەتوانێت بەشە قورئانی ئەو ڕۆژەی بخوێنێت لە قورئان دا ...

وە ئەوە یەکەم جار بووە لەسەرەتای لاو ێتیەوە کە ئەو خێرەی لە دەست بچێ جا کە (عورووە) گەڕایەوە هۆش خۆی، داوای قاچە بڕدراوەکەی کرد، بۆیان هێنا ... دەستی دایەوە ئەم دیواو دیوی دەکرد و دەیگووت: دە سوێند بێ بەو کەسەی کەلەسەر تۆ قورسایی منی هەڵگرتبوو، وە لەتاریکی شەودا پێت دەچووم بۆ مزگەوت، هەر ئەو دەزانێ کە هەرگیز بەتۆ بۆ قەدەغەکراوەکان هەنگاوم نەناوە .

بەڕاستی ئەوەی کە تووشی میوانی گەورەی (وەلیدی کوڕی عەبدولمەلیك) هات، لەوەفاتی کوڕەکەی و، لەدەست دانی لاقێکی کارێکی زۆر قورسی کردە سەر دەروونی (وەلید)، بۆیە هەر بیری لەوە دەکردەوە کە چۆن دڵنەوایی بکات و ئارامی پێ ببەخشێ لەسەر ئەوەی کە تووشی هاتبوو .

وا ڕێکەوت لەو ڕۆژانەدا کۆمەڵێك لەبەنی (عەبسی) بوونە میوانی (وەلید) کە پیاوێکی کوێریان تیا بوو، جا (وەلید) پرسیاری لێکرد دەربارەی هۆکاری لەدەست دانی چاوی، ئەو جا ئەویش ووتی: ئەی فەرمانڕەوای موسڵمانان بزانە کە لە هۆزی (بەنی عەبسی) دا پیاوێکی دی وەك من نەبووە دەوڵەمەند و خاوەن خێزان و کوڕی زۆر .

کاتێك لەگەڵ ماڵ و خێزانم دا بووینە میوان لە دۆڵێکدا لە لای ماڵی خزمانم، لافاوێك لێ یداین کە هەرگیز وێنەیم نەدیبوو...

ئەو لافاوە هەرچیم هەبوو لە ماڵ و سامان و خاو خێزان و، کوڕ هەمووی ڕاپێچ کرد، بەتەنها حوشترێك و منداڵێکی تازە بووم بۆ مایەوە وە حوشترەکە سەر کەش بوو، ئەویش لە دەستم ڕای کرد ...

منداڵەکەم لەسەر زەوی بە جیێ هێشت و خۆم گەیاندە حوشترەکە ...

جا کەمێك لە شوێنەکەم دوورنەکەوتبوومەوە گوێم لە قیژەیٔ منداڵەکە بوو .. کە لام کردەوە ... دەبینم سەری منداڵەکەم وا لەدەمی گورگێکدا خەریکە دەیخوات..

بەپەلە ڕام کردەوە بۆ لای، بەلاّم نەم توانی ڕزگاری بکەم، کار لە کار ترازا بوو ... ناچار بۆ ئەوەی حوشترەکەم لە دەست نەچیێ، خۆم گەیاندەوە حوشترەکە کە لیێ ی نزیك بوومەوە، لەقەیەکی کێشا بە دەم و چاومدا و تەوێڵی تێکشکاندم و چاوی کوێر کردم ...

ئا بەو شێوەیە خۆم بینی یەوە لەیەك شەودا بەبیێ خێزان و کوڕ و سامان و چاو ... ئەو جا (وەلید) گوتی بەفەرمانبەرەکەی :

بڕۆ ئەو پیاوە بەرە بۆلای میوانەکەمان (عورووەی کوڕی زوبەیر)، بۆ ئەوەی چیرۆکی خۆی بۆ بگێڕێتەوە، تا بزانێت کەلەناو خەڵکیدا هەیە موسیبەتەکەی (تووش بوونەکەی) لەویێ ئەو گەورەترو ناڕەحەت ترە .

* * *

کاتیێ کە(عورووە) گەڕایەوە بۆ (مەدینە) وە چووە ناو خەڵکەکەیەوە، خێرا ڕووی تێکردن و گوتی:

تا ئەوەی كە دەیبینین ناڕەحەتتان نەكات ئاگادارتان دەكەم كە خودای باڵادەست چوار كوڕی پێ بەخشیم، پاشان یەكێكیانی لێ وەرگرتمەوە سێ دانەی بۆ هێشتوومەتەوە ... زۆر سوپاس و ستایشی دەكەم .

وە چوار پەلی پێ بەخشیبووم، لە دوایدا دانەیەكیانی لێ وەرگرتمەوەو .. سێ دانەی بۆ هێشتوومەتەوە .. زۆر سوپاس و ستایشی دەكەم .

وە سوێند دەخۆم بە خودا، ئەوەندەی لێ ی وەرگرتوومەتەوە كەمە، وە زۆری بۆ هێشتوومەوە ...

وەكە جارێك تووشی كردووم، چەندەها جار تەندروستی و خۆشی پێ بەخشیووم

*　　　　*　　　　*

وەكاتێك كە خەڵكی (مەدینە) زانیان بە گەیشتنەوەی پێشەواو زاناكەیان (عورووەی كوڕی زوبەیر)، ڕژانەماڵەكەی بۆ سەرەخۆشی لێكردن و دڵدانەوەی ..

وە جوانترین ووتەیەك كە دڵنەوای ئەوی پێكرا ووتەی (ئیبراهیمی كوڕی موحەمەدی كوڕی تەڵحە)، بوو كەپێ ی ووت:

مژدەبێت. ئەی (ئەباعەبدوڵڵا) وایەكێك لەئەندامەكانت و، یەكێك لەكوڕەكانت پێشت كەوتن بۆبەهەشت.....

وەهەمووانیش شوێن ئەوان دەكەوین بەویستی خودای باڵادەست .... جائەوەی لای ئێمە گرنگە ئەوەیە كەخودای باڵادەست جەنابتی بۆئێمە هێشتۆتەوە كە هەمیشە ئاتاجی زانست و زانیاری و ڕایەكانت بیت ...... خودای گەورە تۆش و ئێمەش پێ سوودمەندبكات .

وەئیتر خودا سەرپەرشتكاری پاداشتە و، دەستە بەركاری جوانترین هەژماركردن وپاداشتدانەوەتە .

*　　　　*　　　　*

(عورووەی كوڕی زوبەیر) مایەوە بۆ موسڵمانان، چرایەكی ڕێپیشاندەرو وەڕێنماكارێكی سەركەوت و...

بانگەوازخوازێكی خێروچاكەبوو بەدرێژایی ژیانی .......

وە گرنگی یەکی تەواوی دەدا بەپەروەردەکردنی منداڵەکانی خۆی بەتایبەتی و، وەپەروەردەی منداڵی موسڵمانان بەگشتی، .... هیچ فرسەتێکی لەکیس نەدەدا بۆڕێنمایی کردنیان ئیللا دەیقۆستەوە، وەهەر چرکەساتێکی بۆبرەخسایە سوودی لێوەردەگرت بۆئامۆژگاری کردنیان ........ نمونە لەسەرئەوە ........

زۆربەگرنگی یەوە سووربوو لەسەر هاندانی جگەرگۆشەکانی لەسەر فێربوونی زانست و زانیاری هەموو جارێك پێ ی دەفەرموون:

ئەی جگەرگۆشەکانم زانست فێربن، وەمافی تەواوی بدەنێ و لەڕێگای فێربووندا هەموو شتێك ببەخشین.

چونکە ئێوە ئەگەر گچکەی هۆزو ونەتەوەبن، بەوەیە خودای باڵادەست بەهۆی زانستەوە بتانکاتە گەورەیان .

پاشان دەیووت: ئەی هاوار هەی .... زۆر بەداخەوە، ئایا هەیە شتێك پیسترو بێزراوتر لەشەوە زەنگی نەزانی و نەفامی؟!!

*                    *                    *

وەبانگهێشتی دەکردن کەبەسەدەقەو خەڵاتێکی بژمێرن کەببەخشرێتە خودای باڵادەست، پاشان دەی فەرموو:

ئەی کوڕەکانم، نابێت هیچ کامێکتان شتێك ببەخشێتە خودای پەروەردگاری کە پێ ی شەرم بێت بیبەخشێتە پیاوماقوڵی هۆزەکەی ........

چونکە خودای باڵادەست بەبەهاترینی هەموو بەهادارەکانە، وەبەرێزترینی هەموو بەرێزەکان و بەخشندەترینی هەموو بەخشندەکانە، لەبەرئەوە لەهەموو کەس شایانترە کەباشترین شتی بۆ هەڵبژێرییەت ....

بێگومان زانست و زانیاریش باشترین بەخششێکە کەتەنها لەبەرخودابێت، وەبۆخودابێت ...

وەبەرچاوی ڕووناکدەکردنەوەو خەڵکی پێ دەناسین، وە وای لێدەکردن کەبچنە ناخیانەوە، جائەیووت .

ئەی جگەرگۆشەکانم ئەگەر کارێکی باشتان لەپیاوێك بینی هیوای خێرتان پێ ی بێ، ئەگەر لەبەرچاوی

خەڵکیشدا پیاوێکی خراپ بێت، چونکە دووبارە دەستەخوشکی ئەوچاکەی لەلاهەیە ولێ ی چاوەڕوان دەکرێت .... وەئەگەر کارێکی خراپتان لەپیاوێك بینی لێی

بەئاگابن، چونکە هەرچەند لەبەرچاوی خەڵکیشدا پیاوێکی چاکەکاربێت، بێگومان دەستە خوشکی ئەوخراپەی پێشووی لێ چاوەڕێ دەکرێتەوە.

وەبزانن کە هەموو چاکەیەك بەڵگەیە لەسەر دەستەخوشکەکانی ..........

وەهەروەها هەموو خراپەیەك بەڵگەیە لەسەردەستە خوشکەکانی ........

وە (عوروە) ئامۆژگاری دەکردن بە نەرم ونیانی لە هەڵسوکەوت دا، وە قسەی خۆش و ڕوخۆشی لە گفتوگۆدا .......وەئەیووت:

ئەی کوڕەکانم، لە (حیکمەت) دا هاتووە (ئەگەر ووتەت شیرین بێت، وەڕووت خۆش و کراوەبێت، لەلای خەڵکی خۆشترە لەوەی کە لەبەخششەکان پێیان دەبەخشیت) .

وەئەگەر خەڵکت بینی لادەدەن بەلای ڕابواردن و خۆڕازاندنەوەو زیادەڕەوی یەوەو، بەفیڕۆدانی بەهرەکانی، ئاگاداریان بکەرەوە بەنەبوونی ئەوکەم وکوڕیانە لەژیانی پێغەمبەری خودادا (ﷺ) لەوبارەیەوە (موحەمەدی کوڕی ئەلمونکەدیر) گێرایەوەووتی:

(عوروەی کوڕی زوبەیر) م پێ گەیشت، دەستی گرتم و ووتی: ئەی (ئەبا عەبدوڵلا)منیش ووتم: بەڵێ فەرموو .

ئەویش ووتی: چوومە خزمەتی دایکم (عائیشە) (ڕەزای خوای لێ بێت) ووتی: ئەی کوڕم .......ووتم: بەڵێ فەرموو .

فەرمووی:سوێند بەخوا ئێمە لەماڵی پێغەمبەردا(ﷺ) چل شەوماوینەتەوە بەبێ ئەوەی ئاگر لەماڵی دابێت نە چراو نەهیچی تر .

منیش پێم ووت: ئەی دایە، ئەی بەچی دەژییان؟!

(عائیشە) فەرمووی: بەدوو ڕەشەکە ......... خورماو ئاو .

لە کۆتاییدا .....!..(عوروەی کوڕی زوبەیر) حەفتاو یەك ساڵی ژیانی پڕ لەخێرو ڕازاوە بەچاکە، وەخواپەرستی و پارێزگاری (التقی) بەرێ کرد . جاکاتێك ئەجەلی بڕیاردراو یەخەی پێ گرت ئەوبەڕۆژوو بوو......... وەخاوخێزانی زۆریان لێکرد کە ڕۆژووەکەی بشکێنێ، بەڵام ڕازی نەبوو....... ڕازی نەبوو، لەبەرئەوەی ئەوتکای وابوو لەلای خودا کەشکاندنی ڕۆژوەکەی بەپێکێك ئاوبێت لە ڕووباری (کوثر) .........

لەپەرداخی زیوی بەهەشت دا ... بەدەستی حوری یە چاو ڕووناککەرەوەکانی ...

دەی خودایە داوات لێدەکەم ئێمەش یارمەتی بفەرموویت هەمان ڕێبازی (عوروە) بگرینە بەر وە وەك ئەو کۆتایی خێربین تەمەنمان .

# ٤) ڕەبیعی کوڕی خوثه یم

**(ئەی ئەبایەزید، ئەگەر پێغەمبەری خودا چاوی پێت بکەوتایە خۆشی دەویستی)**
**(عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود)**

(هیلالی کوڕی ئیساف[1]) گوتی بەمیوانەکەی (مونذیری ثه وری[2]) ئایا نایەیت ئەی (مونذیر) بت بەم بۆخزمەتی شێخ واته (ڕەبیع) تا کاتژمێرێك لەپەندو ئامۆژگاریی وەرگرتن و تازەکردنەوەی ئیمان دا بژین ........

(مونژیر) ووتی: بەڵێ .........

جاووتی سوێند بەخوا هیچ شتێك منی نەهێناوە بۆ (کوفه) جگه له ئارەزوومەندی و خزمەت گەیشتنی شێخەکەت (ڕەبیعی کوڕی خوثه یم) وەبەسەربردنی کاتێك لەسایه و سێبەری ئیمانەکەیدا .

بەڵام ئایا ڕووخسەتت لێ وەرگرتووە کەبچینه خزمەتی؟ ......

چونکه بەمن ووتراوە: کەئەو لەوکاتەوە تووشی (شەلەل) بووە خانەنشینی ماڵەوەبووە، وەخۆی بۆ خودا یەکلایی کردۆتەوەو، وەوازی له دانیشتن لەگەڵ خەڵکیدا هێناوە .

پاشان(هیلال) ووتی: بەڕاستی ئەو ئاوهابووە لەوکاتەوە که (کوفه) ناسیوی یەتی، بەڵام نەخۆشی یەکەی هیچی له هەڵس وکەوتی ئەو نەگۆڕیوە ...

جا(مونزیر) گوتی: دەکەوابێ خراپ نی یه ........

---

[1]/ یەکێکه له پێشەنگ و باوەڕپێکراوە شوێنکەوتووەکانی (التابعین)

[2]/ (مونزیری کوڕی یەعلای سەوری یه یەکێکه له شوێنکەوتووە دواینەکان .

بەڵام تۆ دەزانی ئەو زانایانە سروشتێکی نەرم و نیانیان هەیە، ئایا تۆوا دەبینیت کە ئێمە بتوانین دەستپێکەربین بە پرسیارکردن لە (شێخ) دەربارەی ئەوەی کە دەمانەوێ ؟ .........

یاخود وابەست بین بەبێ دەنگی یەوەو گوێ بیستی ئەوەبین کە ئەو لێی دەوێت و باسی بکات؟ ........

(هیلال) گوتی: ئەگەر یەك ساڵی تەواو لەگەڵ (ڕەبیع) دانیشیت، دڵنیابە ئەو قسەت لەگەڵ ناکات ئەگەر تۆ قسەی لەگەڵ نەکەیت و پرسیاری لێ نەکەیت....

وەئەگەر تۆ پرسیاری لێ نەکەیت ئەو دەستپێشخەرنابێت لەگەڵت .....

چونکە ئەو قسەکردنی یادکردنەوەیە، بێدەنگیشی بیرکردنەوەیە .

پاشان (مونزیر) گوتی: کەوابوو بەیارمەتی خودا دەچینە خزمەتی ....... جابەڕێکەوتن بۆخزمەت (شێخ) کاتێ گەشتنە خزمەتی سەلامیان کردوو گوتیان: (شێخ) چۆن ڕۆژ دەباتە سەر ؟ .

ئەویش فەرمووی: ڕۆژ دەباتە سەر لاوازێکە گوناهبار، ڕۆزی خۆی دەخوات ....... وەچاوەڕێ ی مەرگەکەی دەکات .

جا (هیلال) پێ ی گوت:

وا پزیشکێکی شارەزا هاتووەتە (کوفە)، ئایا ڕوخسەت دەفەرموویت بانگی بکەینە خزمەتت ؟

شێخ فەرمووی: ئەی (هیلال) بێگومان من دەزانم کە دەرمان ڕاستە .........

بەڵام من سەرنجم داوە لە (سەموودو[1]) هاوڕێکانی (ڕەس[2])، وە چەن سەدەیەکی دیکەش زۆر لە نێوانیاندا .......

وەسەیری سووربوونیانم کردووە لەسەر دونیاو، ئارەزوومەندی لەزەت و جوانی یەکانی ......

وە ئەوان لە ئێمە بەهێزترو بە تواناتربوون ...... وە پزیشکی زۆر و هەمە جۆرەشیان هەبوو .

وەنەخۆشیشیان تێدابووە ........جا نەچارەسەرکەر ماوەو نە چارەسەرکراو!!

---

[1] / ثمود: هۆزێك بوون بەناوی باپیرەیانەوە (سەموودی کوڕی عامری کوڕی ئیرەمی کوڕی سام وە ناویان دەرکردبوو لە نێوان (حیجازوشام) دا (صالح) پێغەمبەریان بوو .

[2] الرس: بیرێك بوو لە (ئازربایجان) واتە خەڵکی دەورو بەری ئەو بیرە ئاوە .

ئینجا هەناسەیەکی هەڵکێشا هەناسەیەکی قووڵ و گوتی: جا ئەگەر ئائەوە دەردبێ ئەوا پێویستە چارەسەربکرێ .

(مونزیر) رووخسەتی وەرگرت و ووتی:

دەردەکەت چی یە ئەی گەورەم یا شێخ ؟!

(شێخ) فەرمووی: دەرد تاوانەکانە (گوناهەکانە) ........

جا(مونزیر) ووتی: ئەی دەرمان چی یە ؟! .

(شێخ) فەرمووی: دەرمان (داوای لێبوردن کردنە) (الأستیغفار) .

جا(مونزیر) گوتی: شیفا چۆن دەبێت ؟ .

(شێخ) فەرمووی: بەوەی کە پەشیمان ببیتەوە (بگەڕێیتەوە) وەنەگەڕێیتەوە سەرگوناهەکە .......

پاشان چاوەکانی داخست لەنێوانماندا و ووتی: نهێنی یەکان ....... نهێنی یەکان ....... دەستم بە دامانتان ئاگاتان لە نادیارەکان(نهێنی یەکان) بێت ئەوانەی کەلە خەڵکی دەشارنەوە، ئەوانە لای خودا دیارو ئاشکران ....... هانابەرن بۆ دەرمانەکانیان .

(مونزیر) گوتی: جادەرمانی ئەوانە چی یە ؟ .

شێخ فەرمووی: پەشیمان بوونەوەو گەڕانەوەی ڕاستەقینە (التوبە النَّصوح) لێ ی و بەسووربوون لەسەر نەگەڕانەوە بۆ ئەو گوناهانە ....... ئینجا ئەوەندە گریا هەتا فرمێسکەکانی ڕیشی تەڕکرد .

جا(مونزیر) پێ ی گوت: ئایا تۆدەگریت، لەکاتێکدا تۆ ئاواو ئاوای؟!

جا(شێخ) فەرمووی: ئەی هاوار هەی .

بۆچی و وەچۆن نەگریم؟! کەمن گەلێکم دیووە ئێمە بەلای ئەوانەوە دزین (مەبەستی شێخ و هاوڕێ یانی پێغەمبەر(ﷺ) (ڕەزای خوایان لێ بێت)

ئەوسا (هیلال) گوتی:

ئێمە ئالەو گفتوگۆیەدابووین لە خزمەتی (شێخ) دا، کاتێکمان زانی،

کوڕێکی شێخ هات و سلاوی کردو گوتی:

بابەگیان: دایکم حەڵوایەکی باشی بۆ دروست کردووی .......

وە ئەو بەوە دڵی خۆش دەبێت کە جەنابت لێ ی بخۆیت، ئایا بۆت بهێنم؟

فەرمووی: بیهێنە .

جا کوڕەکە کەهاتە دەرەوە بۆ ئەوەی حەڵواکە ئامادەبکات ....

یەکێك دای لەدرگا، شێخیش فەرمووی بابێتە ژوورەوە.

کاتێك کابرا گەیشتە هەیوانی ماڵەکە، بۆم ڕوانی، بینیم کەپیاوێکی بەتەمەنی شڕو شۆڕ بوو، لیك بەسەر چەناگەیدا هاتبوە خوارەوە.

ئالەو کاتەدا کوڕی (شێخ) بەقاپێك حەڵواوە کە تێر خۆی پێنج کەس دەبوو هاتە ژوورەوە.جاباوکی ئاماژەی بۆکرد کە حەڵواکە لەبەردەستی پیاوەکە دابنێ.

کوڕەکە حەڵواکەی لەبەر دەستی کابرادا دانا ........ کابرا لێی هاتە پێشەوە هەرچی تیابوو هەڵی لوشی چۆن هەڵلوشینێك.....

وەلیکەکەش دەڕژا بەسەریدا........

بەردەوام خەریکی خواردنی بوو تا هەرچی یەکی تیابوو لێسایەوە.

جاکوڕەکەی بەباوکی گوت:

بەزەیی خوات لەسەربێت بابە، دایکم خۆی هیلاك کردوە حەڵوای بۆ تۆ دروست کرد، وە ئێمەش هەموو حەزمان دەکرد کە تۆ لێی بخۆیت..........

کەچی دات بەو پیاوەی کەنازانێ چی دەخوات.

ئینجا شێخ فەرمووی: ئەی کوڕم....... ئەگەر ئەونازانێ دڵنیابە خوادەزانێ.....

پاشان ئەم فەرموودەی خودای بالآدەستی خوێندەوە :

لَن تَنَالُواْ ٱلْبِرَّ حَتَّىٰ تُنفِقُواْ مِمَّا تُحِبُّونَ ۚ وَمَا تُنفِقُواْ مِن شَىْءٍ فَإِنَّ ٱللَّهَ بِهِۦ عَلِيمٌ ﴿٩٢﴾ سورة آل عمران-آية ٩٢

واتە/ چاکەو پاداشت بەدەست ناهێنن هەتا لەوە نەبەخشن کە خۆشتان دەوێت و بەلاتانەوە باشە،وەهەرچی ببەخشن دڵنیابن کە خودا پێ دەزانێت و لێ ی بەئاگایە.

ئالەوکاتەدا، پیاوێك لەخزمانی هاتە خزمەتی(شێخ) و ووتی:

ئەی(ئەبا بایەزید) (حوسەینی کوڕی فاتیمە) کوژرا، سلاوی خودا لەسەر خۆی و دایکی بێت.

(شێخ)فەرمووی :﴿ إنَّالله وَإنَّاإليه راجعون﴾... واتە ئێمە لەلای خواوە هاتووین بۆلای ئەویش دەگەڕێینەوە........ووتنی ئەو ئایەتە ڕازیبوونە بەقەدەری خودا.....

پاشان ئەم فەرموودەیەی خودای خوێندەوە:-

قُلِ ٱللَّهُمَّ فَاطِرَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ عَٰلِمَ ٱلۡغَيۡبِ وَٱلشَّهَٰدَةِ أَنتَ تَحۡكُمُ بَيۡنَ عِبَادِكَ فِي مَا كَانُواْ فِيهِ يَخۡتَلِفُونَ ﴿٤٦﴾ سورة الزمر: آية ٤٦

**واتە / تۆ بڵێ ئەی خودای باڵادەست، ئەی داهێنەری ئاسمانەکان و زەمینی، زانا بە شاراوە و ئاشکراکان.**

**تۆ بەکاری بەندەکانتا ڕادەگەی و فەرمان ڕەواییان لە نێوان دا دەکەی و بۆ کۆتایی هێنان بەکێشەکانیان.**

**بەڵام پیاوەکە قسەکەی نەبڕی و پێی ووت:**

**ئەی(شێخ) ئەی شێخ چی دەفەرموویت لەبارەی کوشتنی یەوە؟**

**(شێخ) فەرمووی: ئەڵێم بۆلای خودایە گەڕانەوەیان، وەلەسەر خوداشە حسابیان.**

**(هیلال) ووتی:**

**ئنجا من سەیرم کرد کاتی نوێژی نیوەڕۆ نزیك بۆتەوە، ووتم بە(شێخ) ئامۆژگاریم بکە....**

**فەرمووی: ئەی(هیلال) زۆر پیا هەڵدانی خەڵکی و، سوپاسگوزاریان و باسی چاکەکانت، لەخشتەیان نەبات چونکە خەڵکی هیچ شتێك لەبارەی تۆوە نازانێ جگە لە ڕواڵەتت......**

**واباش بزانە تۆ دەچیت بەرەو دەستە لەملانی بوونی کردارەکانت.....**

**وەبێ گومان بە هەموو کردارێك کە مەبەست پێ ی ڕەزامەندی خوا نەبێ بەهەدەر دەچێت ئینجا (مونزیر) پێی ووت:- دەی ئامۆژگاری منیش بکە خودا پاداشتت بداتەوە .**

**جا فەرموودەی: ئەی (مونزیر)، شەرم لە خوا بکە لەوەدا کە زانیوتە .......وە لەوەدا کە خودا بە زانستی خۆی لێ ی حەشارداوە، ئەو بیدەرە پاڵ زانایی ئەو ...**

**ئەی (مونزیر)، با هیچ کامێکتان نەڵێ: خودایە بەڕاستی بۆلای تۆ دەگەڕێمەوە، یان بڵێن پەشیمان دەبمەوە، پاشان دوای ئەوە نەشگەڕێتەوە، چونکە ئەوە دەبێتە درۆیەك پاساوی نابێت ..**

**بەڵام با بڵێت: خودایە گەڕانەوەم (تەوبەم) لێ وەربگرە، ئەوە دەبێتە نزایەك .**

**وە باش بزانە ئەی (مونزیر) چاکە لە هیچ قسەیەکدانی یە مەگەر**

**(لا إله إلاَّ الله).....**

یان (الحَمدُ لله)....
وه یان (اللهُ أكبر) ....
وه یان (سُبحان الله ..هتد ..) ....
وه یان (داوای چاکه له خودا)....
وەیان (فەرمان دان به چاکه)....
ودیان (قەدەغەکردن له خراپه)....
وەیان خوێندنەوەی قورئان ....
پاشان (مونزیر) پێ ی گوت: لەخزمەتتا دانیشتین هیچمان لێ نەبینیت به (هۆنراوە) نمونەی بۆ بهێنیتەوە، لەگەڵ ئەوەدا هەندێك له هاوڕێ یانتمان بینیوه نموونه به(هۆنراوە) دەهێننەوە .
فەرمووی:ئەی (مونذیر) دڵنیابه هەر شتێك له (دونیادا) بیڵێیت دەنووسرێت (تۆمار دەکرێت) وەله (قیامەت دا) بەسەرتا دەخوێنرێتەوە .
وەمن پێم ناخۆشه له تۆمارگەکەمدا یەك (دێڕ هەڵبەست) ببینم کەله ڕۆژی قیامەت دا لەکاتی حساب کردندا بەسەرمدا بخوێنرێتەوە .
پاشان لای کردەوە بەلای هەمووماندا و ووتی:
زۆر یادی مردن بکەنەوە، ئەو نادیاری چاوەڕێکراوتانه .....وەدڵنیابن نادیارەکه درێژەی کێشا، نزیکه بگەڕێتەوە، وەخاوەنیشی چاوەڕێ دەکات .
ئینجا دەستی بەگریان کرد، فرمێسکەکانی هەڵڕژاند و ووتی:
چی بکەین سبەینێ﴿ كَلَّآ إِذَا دُكَّتِ ٱلْأَرْضُ دَكًّا دَكًّا ﴾
واته: کاتێك سەرزەوی تووشی شۆك و لەرزین هات و بەسەختی تێکشکێنرا و.

وَجَآءَ رَبُّكَ وَٱلْمَلَكُ صَفًّا صَفًّا ﴿٢٢﴾ وَجِاْىٓءَ يَوْمَئِذٍۭ بِجَهَنَّمَ ۚ يَوْمَئِذٍ يَتَذَكَّرُ ٱلْإِنسَٰنُ وَأَنَّىٰ لَهُ ٱلذِّكْرَىٰ ﴿٢٣﴾ الفجر له ئایەتی ٢١ –٢٣

واته: ئەوجا فەرمانی پەروەردگارت هات و فریشتەکانیش پۆل پۆل ڕیزبەستن ......
وەئەو ڕۆژه دۆزەخ دەهێزێت به ئامادەکراوی ....
(هیلال) ووتی:

لەوەبوو(ڕەبیع) لەقسەکانی تەواوبێت تا بانگی نیوەڕۆ ووترا، ئەوجا ڕوویکردە کوڕەکەی و ووتی:

وەرە با وەلآمی بانگەوازخوازی خودا بدەینەوە .....

جاکوڕەکەی پیٚ ی ووتین:

یارمەتیم بدەن تاهەڵی بگرین بیبەین بۆ مزگەوت، خودا پاداشتی خێرتان بداتەوە .

ئەوجابەرزمان کردەوە، دەستی ڕاستی خستە سەرشانی کوڕەکەی و، چەپیشی خستەسەرشانی من، وەلەنێوانی هەردووکماندا هێدی هێدی هەنگاوی لەسەر زەوی دەنا..........

جا لەوێدا(مونذیر) پیٚ ی ووت: ئەی (ئەبایەزید) بەڕاستی خودا ڕووخسەتی بە تۆداوە ئەگەر لەماڵەکەدا نوێژبکەیت !!.

وەلآمی دایەوەو ووتی: بەڵیٚ بەڕاستی ئەوە وایە کە تۆدەیڵێیت ........

بەلآم من گوێبیست بووم بانگدەر بانگ دەکات: حَيّ عَلى الفَلأح ........ حَيّ عَلى الفلأح .

واتە: وەرن بۆ سەرکەوتن و ڕزگاربوون ........ وەرن بۆسەرکەوتن و ڕزگاربوون .

جاهەرکەس لە ئێوە بیستی بانگدەر بانگی دەکات بۆسەرکەوتن و ڕزگاربوون .

بێگومان وەلآمی دەداتەوە ئەگەر لەسەرسك و دوو دەستیش بووە .

لە کۆتاییدا ......... بابزانین ئا ئەو (ڕەبیعی کوڕی خوثه یمە) کیٚ یە؟!

بەڕاستی ئەو ئالآیە کە لەئالآکانی شوێنکەوتووان ...........

وەیەکێکە لەو هەشت کەسەی کەلەواندا دونیا نەویستی کۆتایی پیٚ هات لە چاخی خۆیاندا .ڕەگەزی عەرەب بوو ....

وە لە بنەڕەتدا دەگەڕێتەوە بۆ (مُضَرّ) کە یەکێکە لە باپیرانی پێغەمبەر(ﷺ) .

لەگەڵ پێغەمبەردا(ﷺ) یەکدەگرێتەوە لە هەردوو باپیرەیدا (ئیلیاس و موضە ر) گەشەو نەشونومای کردوە لە منداڵی یەوە لەسەر گوێڕایەڵی خودا .

وناخی ڕاهێناوە لەسەرەتایی لاوی یەتیەوە لەسەر خۆپارێزی (تقوى) .......

دایکی دەنووست کە لەشەودا خەبەری دەبوەوە، یان ڕۆژی دەکردەوە، هەردەیبینی کە کوڕە لاوەکەی خەریکی خودا پەرستی یە لە میحرابەکەیداو ڕۆچووە لە نزاو پاڕانەوەو نوێژەکانیدا .جابانگی دەکرد و دەیگوت:

ئەی کوڕم ئەی (رەبیع) — ئایا ناخەوی !؟

جائەویش دەیووت: چۆن کەسێك دەتوانێت بنووێت کە شەو بەتاریکی یەکەی دای بپۆشێت و، وەئەویش لەوەبترسێت کە دوژمنەکانی هێرشی بهێننەسەر؟!

جا کەپیرەژنی بەسالاچوو ئەوەی بیست، فرمێسك بەسەر ڕوومەتەکانیدا ڕژایە خوارەوەو، دەستی بەنزای خێرکرد بۆی .

وە لە کاتێکدا (رەبیع) لاویەتی تیَ پەڕاندو گەشەی کرد، لەگەڵیدا خۆپارێزی و ترس و بیمی لە خودا گەشەی کرد .

وەسەرانسەر تاریکی شەوی بەخودا پەرستی و نوێژەوە یادی خوداو نزاو، پاڕانەوە بەسەر دەبردو، زیندوو دەکردەوە، لەکاتێکدا کە خەڵکی نووستبوون جائەوە وای لە دایکی کردکە بەزەیی پێدابێتەوەو کۆمەڵێك گومانی لاپەیدابێت بەرامبەری

تاوای لێهات بانگی دەکردو پیَ ی دەگووت:

کوڕم ئەوە چی یە کە تووشت بووە ؟!

خوا نەخواستە تاوانێکت ئەنجام داوە ........

یان خوانە خواستە کەسێکت کوشتووە ........

ئەویش گووتی: بەڵێ ئەی دایە گیان، بەڕاستی کەسێکم کوشتووە .

ئەوجا دایکی بەترس ولەرزەوە گوتی: ئایا ئەو کوژراوە کیَ یە کوڕم ........ تا هەوڵبدەین خەڵکی بنێرینە لای خانەوادەو ماڵ وخێزانی بەڵکو لیێت ببوورن ؟ ..

سوێند بەخوا ئەگەر خاوخێزانی کوژراو بزانن بەوەی تۆ دەیچێژیت لەناسۆرو گریان و شەونخوونی لێت خۆش دەبن .

جاووتی: دایەگیان لای کەس قسەمەکە:- بەڕاستی من نەفسی خۆمم کوشتووە..

بەڕاستی کوشتوومە بە گوناهەکان ........

* * *

وە(رەبیعی کوڕی خوثەیم) قوتابی(عەبدوڵلای کوڕی مەسعود) بووە، وەوانەکانی لەسەردەستی ئەودا خوێندووە، کەهاوڕیَ ی پێغەمبەر(ﷺ) بووە وەلەنزیکترین

هاوڕێکانی بووەو وەلەشێوەشدا زۆر نزیك بووە لێ یەوە بەڕاستی (ڕەبیع) بەشێوەیەك وابەست بووە بە مامۆستاکەیەوە، وەك وابەست بوونی منداڵ بەدایکی یەوە ........

وەمامۆستاش ئەوەندەی قوتابی یەکەی خۆشدەویست، وەك خۆشەویستی باوکێك بۆ تاقانەکەی .

جا(ڕەبیع) ئەوەندە جێگەی ڕێزبوو لای (ئیبن و مەسعود) کەبەبێ ڕووخسەت وەرگرتن دەچووە خزمەتی، جائەگەر(ڕەبیعی) لەخزمەتا بوایە، ڕێگەی بەکەسێکی ترنەدەدا بچێتەلای هەتا(ڕەبیع) بە جیّ ی نەهێشتایە .

وە (ئیبن ومەسعود) ئەوەندەی بەدیکردبوو لە خاوێنی دەروونی (ڕەبیع) و دڵسۆزی دڵەکەی و، جوانی وچاکی خوا پەرستی یەکەی کە دڵی پڕ کردبوو لە داخ و دەرد لەسەرئەوە کە (ڕەبیع) دواکەوتووی چرکەساتی ژیانی پیّ پێغەمبەر(ﷺ) بووە، وەبێبەش بووە لە هاوڕیّ یەتی .......

وە پیّ ی دەووت:

ئەی (ئەبا یەزید) ئەگەر پێغەمبەر(ﷺ) تۆی ببینیایە خۆشی دەویستی .

هەروەك پیّ ی دەووت:

هیچ جارێك تۆم نەبینیووە مل کەچانم (خاشعین) بیرنەکەوتبێتەوە .

*　　　　　*　　　　　*

وە (عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود) لەوەدا زیارەوی نەکردووە. بەڕاستی (ڕەبیعی کوڕی خوثەیم) لەبیم وترسی و، خۆپارێزی، تەقواوخواپەرستی دا گەشتبووە ئاستێك، بەکەمی کەسێکی دی هەبوبێت لەوچینەی خۆی گەشتبێتە ئەو ئاستە.

وە لەوەی کەلیّ ی دەگێڕرێتەوە لەوبارەوەو، بەردەوام تائێستا لاپەڕەکانی مێژووی پیّ دەدرەوشێتەوە .

لەوە ئەوەی کەیەکێك لە هاوڕێکانی گێڕاوی یەتەوە وە ووتوویەتی:



بیست ساڵ هاوڕێ یەتی (ڕەبیعی كوڕی خوثەیمم كرد، لێم نەبیست كە ووشەیەك بڵێت و بەرزنەبێتەوە.......جا ئەم فەرموودەی خودای باڵادەستی خوێندەوە:

إِلَيْهِ يَصْعَدُ ٱلْكَلِمُ ٱلطَّيِّبُ وَٱلْعَمَلُ ٱلصَّـٰلِحُ يَرْفَعُهُۥ ۚ فاطر اية ١٠ .

واتە: ووتەی باش و چاك هەر بەرەو ئەوبەرزدەبێتەوە، وەهەر خودای باڵادەست كە ووتەی چاك پەسەند دەكات لە یادی خوداو نزاو قورئان خوێندن، وەكرداری باش خودای باڵادەست بەرزی دەكاتەوە بۆلای خۆی و لە بڕواداری وەردەگرێت و پەسەندی دەكات .

وە(عەبدوڕەحمانی كوڕی عەجلان) لەبارەیەوە ووتی:

لای (ڕەبیع) شەوێك مامەوە، كەدڵنیابوو من خەوم لێ كەوتووە، هەستا نوێژی دەكردو، ئەم فەرموودەی خودای باڵادەستی دەخوێندەوە:

أَمْ حَسِبَ ٱلَّذِينَ ٱجْتَرَحُوا۟ ٱلسَّيِّـَٔاتِ أَن نَّجْعَلَهُمْ كَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّـٰلِحَـٰتِ سَوَآءً مَّحْيَاهُمْ وَمَمَاتُهُمْ ۚ سَآءَ مَا يَحْكُمُونَ ﴿٢١﴾ الجاثية اية ٢١ .

واتە: ئاخۆ ئەوانەی كەبەدكارن و بەدكاری دەكەن، وادەزانن لەژیان و مردنیان دا، ئێمە وەك ئەوانە یان دادەنێین، كەبڕواداربوون و كرداری چاكیان ئەنجام داوە:........ زۆرخراپ تێگەیشتوون و بڕیاردەدەن .

شەوەكەی سەرانسەر بە نوێژكردن بردەسەر .......هەردەستی پێ دەكردوو، دووبارەی دەكردەوە هەتا نوێژی بەیانی ........ وەچاوەكانیشی فرمێسكیان هەڵدەڕشت چۆن هەڵڕشتنێك .

وە دەربارەی ترس و بیمی (ڕەبیع) لە خودای باڵادەست گوزارشی زۆر هەیە، لەوانە ئەوەی كە كۆمەڵێك لە هاوڕێكانی گێڕاویانەتەوەو ووتویانە:

ڕۆژێك بەهاوڕیێ یەتی(عەبدوڵلاّی کوڕی مەسعود) چووینە دەرەوە وە (ڕەبیعی کوڕی خوثەیمان) لەگەڵ بوو، کاتێك کە گەیشتینە سەر ڕۆخی ڕووباری فورات ....... بەلای کورەیەکی بەرد سووتاندندا تێپەڕمان کردکە ئاگرەکەی کڵپەی سەندبوو وە ڕووی ئاسمانی گرتبوو، وەگڕو کڵپەی بەرز بوو بووەوە، وەدەنگی دەبیسترا .

وەهەربەردبوو فڕێ دەدرایە کوانووەکە تابسووتێت و ببێتە کل .

کاتێ (ڕەبیع) ئاگرەکەی بینی لە شوێنی خۆیدا ڕاوەستا.........

وەتووشی ڕاچڵەکانێکی بەهێزبوو..........

وەفەرموودەی خودای باڵادەستی خوێندەوە:

إِذَا رَأَتْهُم مِّن مَّكَانٍ بَعِيدٍ سَمِعُواْ لَهَا تَغَيُّظًا وَزَفِيرًا ﴿١٢﴾ وَإِذَآ أُلْقُواْ مِنْهَا مَكَانًا ضَيِّقًا مُّقَرَّنِينَ دَعَوْاْ هُنَالِكَ ثُبُورًا ﴿١٣﴾ الفرقان ایه ١٢-١٣ .

واتە: ئاگری دۆزەخ کەلە دوورەوە بێباوەڕان دەبینێت، گڕوکڵپەی سوتاندنی بەتینتر دەبێت و ئاگرەکەی زیاتربڵێسە دەسێنێت، بەشێوەیەکی وا ئەوخوانەناس و هاوەڵدانەرانە گوێیان لەنرکەو کڵپەی ئاگرەکەیەو هەڵپەی سوتاندن و هاتنە دەرەوەی هەناسەی دەبێت، وەکاتێك ئەو بێباوەڕانە بەشەتەك دراوی فڕێ دەدرێنە شوێنێکی تەسکی دۆزەخەوە لەوێدا هاواردەکەن و داوای تیاچوون و فەوتانی خۆیان دەکەن .

پاش ئەوە (ڕەبیع) کەوت و لەهۆش خۆی چوو .جا لەگەڵی خەریك بووین هەتا هۆشی هاتەوە خۆی، وەبردمانەوە بۆماڵەکەی .

لە کۆتاییدا ..........

بەڕاستی (ڕەبیعی کوڕی خوثەیم) بەدرێژایی هەموو ژیانی چاوەڕێ ی مەرگی دەکرد، وەخۆی ئامادە دەکرد بۆ دەستە ملان بوونی، جا کەکەوتە سەرەمەرگ، کچەکەی بۆی دەگریا، ئەوجا ووتی:

چی وات لێدەکات کە بگریت ئەی کچی من، لەگەڵ ئەوەدا کە خێر ڕووی کردۆتە باوکت ؟! .....ئینجا ڕۆحی پیرۆزی تەسلیم کردو گەڕایەوە بۆلای پەروەردگاری ......

دەی خودایە داوات لێدەکەم ئێمەش وەك (ڕەبیع) (ڕەزای خوای لیٚ بێت) بەڕوو سووری بگەڕێینەوە بۆ خزمەتی خۆت .



# ٥) ئیاسی کوڕی موعاویەی موزنی

**نموونەن: (عەمرو لە ڕاپەڕیندا)، (حاتیم لە لێبوردندا)، (ئەحنەف لە دان بەخۆگرتندا)، (ئیاس لە زیرەكیدا) (ئەبو تەمام)**

فەرمانڕەوای بڕواداران (عومەری کوڕی عەبدولعەزیز) شەوی تێپەڕاند، خەو نەچووە چاوەکانی و، پێڵووەکانی نەنیشتن و، بەردەوام دڵەڕاوكێ، وە هەر ئەم دیوو ئەو دیوی دەکرد .

ئەوەی کە لەو شەوە ساردەی (دیمەشق)دا سەرجەنجاڵی کردبوو؛ وە خەوی لە چاوەکانی تۆراندبوو، هەڵبژاردنی قازی یەك بوو (دادوەر) بۆ (بەسرە) تا لە نێوانی دانیشتوانیدا ترازووی دادپەروەری راوەستاو بکات، وەفەرمانڕەوایی بکات لەنێوانیاندا بەپێ ی ئەوەی کەخودا ڕەوانەی کردووە، وەترس و ئارەزوو لەحەقی لای نەدان .

لەپاش بیرکردنەوەیەکی قوڵ و درێژ دووکەس هەڵبژارد کەهەردووکیان سوارچاك بوون:

لەشارەزایی دین و ئەحکامەکانی دا، وەلە خۆگرتن دا لەئاستی حەق داو جێ بەجێ کردنی:

وەڕووناكبین لەبیرکردنەوەدا ........

وەپێکەر لەبینین دا، ڕۆچوو لە تێگەیشتندا .........

وەکە لە یەکێکیاندا سیفەتێکی بەدی دەکرد کەبەسەرنەوی کەیاندا هەیبێ، زۆری پێ نەدەچوو، لەویشیاندا سیفەتێکی بەدی دەکردەوە کەلەئاستی ئەوی ئەودابووە .



جاکە ڕۆژبوویەوە، ئەو(والی یەی) کەلەسەر(عیراق) دایدنابوو، بانگی کردکە (عەدیی کوڕی ئەرتات) بوو، وەلە ورۆژەدا لە (دیمشق) بوو وە پێ ی ووت:

ئەی عەدیی .....

(ئیاس کوڕی موعاویەی موزینی) و (قاسمی کوڕی ڕەبیعەی حاریپی) بانگ بکە، وە گفتوگۆیان لەگەڵ بکە دەربارەی دادوەری (قَضاء) (بەسرە)، وەبەیەکێکیان بسپێرە .

(عەدیی) گوتی: گوێبست وگوێ ڕایەڵم ئەی فەرمانڕەوای بڕواداران .

* * *

(عەدیی کوڕی ئەرطات) (ئیاس) و(قاسمی) کۆکردەوە وە ووتی: بەڕاستی فەرمانڕەوای بڕواداران، خودا پایەدارتان بکات- فەرمانی بەمن داوە کە دادوەری (قضاء) بەسرە بەیەکێکتان بسپێرم ..........

جاچی دەڵێن؟ .

هەریەکەیان دەربارەی هاوڕێکەی دەیگوت: بەڕاستی ئەو لەپێشترە لەو بۆئەو پایەیە ....وەباسی گەورەیی و، زانست و، شەرع زانینی دەکرد، ئەوەندەی خودا بیویستایە کەباسی بکات .

جا(عَدیی) ووتی: دڵنیابن لەم کۆڕەم ناچنە دەرەوە هەتا ئەم کارە یەکلایی نەکەنەوە

(ئیاس) پێ ی ووت:

ئەی ئەمیر، پرسیاری من و(قاسم) لەزانایانی(عیراق) (حەسەنی بەسری) و (موحەممەدی کوڕی سیرین) بکە ........ چونکە ئەوان بەتواناترینی خەڵکن لەسەر جیاکردنەوەی نێوانمان، یان بڵێن

شایستەیی یەکێکمان دیاری بکەن بۆئەوکارە .

(قاسم) سەردانی ئەوانی دەکردو، ئەوان سەردانی ئەویان دەکرد، بەڵام (ئیاس) هیچ پەیوەندیەکی پێیانەوە نەبوو.

بۆیە (قاسم) زانی کە (ئیاس) ویستی کارەکە بەوبسپێررێت ........

وەدڵنیابوو، کە (ئەمیر) ڕاوێژییان پێ بکات، ئەو دەستنیشان دەکەن ..... جا هیچی بۆنەمایەوە ئەوەنەبێت کەلا بکات بەلای ئەمیرەوە، وە ووتی: ئەی (فەرمانڕەوای) بڕواداران، پرسیار لەکەس مەکە لەبارەی من و ئەوەوە، سوێندبێت بەو خودایەی کەهیچ خودایەك جگە لەونیە، (ئیاس)

لەمن زاناتِرە لەشەرع و ئەحکامەکانی دین ی خودادا ......

وەلەمن زاناترە لە دادوەریدا ..........

جائەگەر درۆزن بم و لەوسوێنەمدا، ئەوە ڕەوانی یە بۆجەنابت کە دادوەریم پێ بسپێری، لەگەڵ ئەوەدا کە درۆیەکم هەڵبەستووە ....

خۆ ئەگەر من ڕاستگۆبم، ئەوا ناگونجێت کە جەنابت واز لەگەورەو زانایەك بهێنی بۆ کەسێك کەلە گەورەیی و زانابیدا لەو کەمتربێت .......

جا(ئیاس) لای کردەوە بەلای (ئەمیر) دا، وە ووتی: ئەی ئەمیر ...... بەڕاستی تۆ پیاوێکت هێناوەو بانگهێشتت کردووە بۆ دادوەری (القضاء)، ئەوجا ڕاتگرتووە لەسەر ڕۆخی دۆزەخ، ئەویش خۆی لێ ڕزگاردەکات، بەسوێندێکی درۆ، وەلێ ناگەڕێ کە خودا لەودرۆیەی ببورێ، وەخۆی ڕزگاردەکات لەوەی کەلێ ی دەترسێت .

(عەدیی) پێ ی ووت:

بەڕاستی ئەوەی کە تێبگات نموونەی ئەوەی کەتۆ تێی گەیشتووی، شایستەیە بەدادوەری(القضاء)، تۆشایانی ئەوەی .

پاشان کردی یە (دادوەری) (قاضی) (بەسرە) .

* * *

جابابزانین ئەو کەسە کێ یە کە(خەلیفە) ی دونیانەویست (عومەری کوڕی عەبدولعەزیز) هەڵبژارد بەدادوەر(قاضی) بۆ(بەسرە)؟ .

کێ یە ئەوکەسەی نموونەی زۆر هێنراوەتەوە دەربارەی بەزیرەکی و پێکان و دانایی لەکارداو، خێرایی تێگەیشتنی دا، وەلەدەست گوشادیدا بەحاتەمی تائی..

وە بەدان بەخۆگرتنیدا (حلم) بە(ئەحنەفی کوڕی قەیس) [1] ....

وەلە ڕاپەڕین و خێرا دەستهاتنیدا بە (عەمرو کوڕی کەریب) [2] ......

هەتا (ئەبو تەمام) لە مەرجی (ئەحمەدی کوڕی موعتەسەمدا) ووتی:ڕاپەڕین و خێرا دەستهاتنی (عەمرو، لە لێ بوردنی حاتیمدا ....... لەخۆخواردنەوەی (ئەحنەف) دا ....... لە زیرەکی (ئیاس) دا

فەرمووباچیرۆکی ژیانی ئەو پیاوە لەسەرەتایەوە دەست پێ بکەین....... ئەوپیاوە ژیاننامەیەکی سەرنج ڕاکێشی ناوازەی هەیە لەنێوان ژیاننامە ناوازەکاندا .

---

[1]/ شوێن کەوتوویەکی بەڕێز، پێشەوایەکی گەورە و ووتاربێژێکی سەرنج ڕاکێش، گەورەی بەنی تەمیم .

[2]/ یەکێك بوو لە ئازاو بەناوبەنگەکانی عەرەب ، لە (قادسیە) دا لە تینویدا مرد .

(ئیاس کوڕی موعاویەی کوڕی قورەی موزەینی) لە دایك بووە سالّی چل و شەشی کۆچی لەناوچەی (یەمامە) لە (نەجد) وەلەگەڵ خێزانەکەیدا کۆچیان کرد بۆ(بەسرە) وەلەوێ گەشەی کردو فێربوو.......

وەلەسەرەتای لاوی یەتیدا سەردانی (دیمەشق) دەکردەوەو، ئەوەی بگونجایە لەزانست وەریدەگرت لەوانەی کەمابوون لەهاوڕێ یانی بەڕێزو گەورە شوێنکەوتووان

وەبەڕاستی لەم (کوڕە موزنی یە) نیشانەو سیماکانی خانەدانی و زیرەکی دەرکەوت هەر لە پەیدابوونی نینۆکەکانی یەوە ....

وەخەڵکی دەنگوباسی کردارە نایاب و گوفتارە ناوازەکانیان دەگێڕایەوە لەکاتێکدا ئەو هێشتا منداڵێکی بچووك بوو.....

* * *

دەگێڕنەوە لێ ی کەکاتێك خەریکی فێربوونی (بیرکاری بوو) لە حوجرەی پیاوێکی (یەهودیدا) واتە لە (ئەهلی ذیمە)[1] ....... کۆمەڵێك لە هاوڕێ جووەکانی لای کۆبوونەوە، وەگفتوگۆیان دەکرد دەربارەی کاروباری ئایین، ئەویش گوێ ی لێگرتبون، بەبێ ئەوەی ئەوان بزانن ....... جاماموستاکە گوتی بەهاوڕێکانی:

ئایاڕانامێنن لە موسڵمانان، کە ئەوان وا دەردەبڕن کەلە بەهەشتدا خواردن دەخۆن بەڵام پیسی ناکەن :

جا(ئیاس) لایکردەوە بەلای مامۆستاکەوەو ووتی:

ئەی مامۆستای بەڕێز ئایا ڕێگەم پێ دەدەیت کە بەقسەکردن و ڕادەربڕین لەو گفتوگۆو ڕادەربڕینەتاندا هاوبەشی بکەم .

مامۆستاکە گووتی: بەڵێ .

جالاوەکە گوتی: ئایا هەموو ئەوەی کەلە دونیادا دەخورێت دەبێتە پیسی و دەردەچێتە دەرەوە .

مامۆستاکە گوتی: نەخێر .

جالاوەکە گوتی: ئەی ئەوەی کە وەك پیسی دەرناچێتە دەرەوە بۆکوێ دەچێ؟.

[1]/ ئە هلی ذیمە . واتە لە یەهودیان و مەسیحی یەکان کەلە ژێر پاراستنی دەوڵەتی ئیسلامیدابوون .

جاماموٚستاکە گوتی: دەبێتە خۆراکی هەموو ئەندامەکانی لەش.واتە دەچێتە ناوخۆراکی پێویستی لەش.

ئینجالاوەکە گوتی: جانکوڵی کردنی ئێوە لەچ ڕوویەکەوەیە، ئەگەر هەندێك لەوەی کەدەیخۆین بچێتە خۆراکی لەشەوە، کە هەمووی لەبەهەشتدا ببێتە خۆراك ؟!

جاماموٚستاکە دەستی بۆڕاکێشا و ووتی پیٚ ی : خودایە چ لاوێکی زیرەکە .

وە (لاوەکە) ساڵ بەساڵ بەرەو پێش دەچوو ........

وە لەگەڵی دا دەنگوباسی زیرەکی پێش دەچوو لەهەر کویٚ یەك بووایە. جابەڕاستی لیٚ ی دەگێڕنەوە کە چووەتە (دیمەشق) وە ئەو ئەوکاتە هەر لاوبووە، دەکەوێتە ناکۆکی لەگەڵ زانایەك (شێخ) لە خەڵکی (دیمەشق) لە مافێك لە مافەکان دا، وەکە ئەو زانایە دەستەوسان دەبێت لە ڕازیکردنی بەبەڵگە، ناچار بانگهێشتی دەکاتە دادگا ........

جا کە ئامادەی بەردەم دادوەر(قاضی) دەبێت، ڕووبەڕووی نەیارەکەی دەبێتەوەو، دەنگی بەسەردا بەرز دەکاتەوە .

جا(قاضی) پیٚ ی ووت: دەنگت نەوی کە ئەی لاو.........

چونکە نەیارەکەی تۆ زانایەکی بەسالأچووی خاوەن ڕێزە .

(ئیاس) وتی: بەڵیٚ بەلأم بیٚ گومان (حەق) لەو گەورەترە .

جا(قازی) تووڕەبوو، وە ووتی: بیٚ دەنگ بە ......

لاوەکە گوتی: کیٚ یە ئەو بەڵگە یەی من دەربڕێت تا لەئاستیدا بێدەنگ ببم؟!

(قازی) زیاتر تووڕەبوو وە ووتی: لەوکاتەوە هاتوویتە ناو کۆڕی دادوەری یەوە جگە لە ناڕەواو قسەی بیٚ بنەما هیچی ترم نەدیت کە ووتووتە .

جا(ئیاس) گوتی: (لاإله إلآالله وَحْدَهُ لاشَرِيكَ لَهُ .....

(أَحُقٌّ هَذا أَمْ باطِلٌ ؟ .

واتە: هیچ خودایەك نی یە جگە لە ئەلأ، کەتاکەو هاوبەشی بۆ ئەو نی یە .

ئایا ئەوە ڕاست و ڕەوایە یان ناڕەوایە ؟ .

جا(قازی) هێمن بوویەوە وە ووتی:

ڕاستەو ڕەوایە ...... سوێند بەپەروەردگاری کەعبە ڕەواو ڕاستە .....

*                    *                    *

(لاوی موزەینی) خۆی یەکلاکردەوە لەسەر فێربوونی زانست، وەلیٚ ی نۆشت ئەوەندەی کەخوداویستی لەسەربوو کەلیٚ ی بنۆشیٚ، هەتا گەیشتە پلەوپایەیەك

کەزانایان مل کەچ دەبوون، وە پەنایان پێ دەبرد، لەسەر دەستیدا زانست فێردەبوون وەك قوتابی یەك، لەگەڵ بچووکی تەمەنیدا.......

ساڵێکیان، (عەبدولمەلیکی کوڕی مەڕوان سەردانی (بەسرە) ی کرد، پێش ئەوەی ببێتە (خەلیفە)، (ئیاس) بینی کەئەو ڕۆژگارە لاوێك بوو لەسەرەتای لاویەتیدا، کەهێشتا بەتەواوی سمێڵی نەکردبوو........

بینی چوارکەس لە خوێنەرانی خاوەن ڕیش و جوبەی سەوز لە دوای (ئیاس)ەوە دەڕۆن و ئەویش پێشیان کەوتووە .......

جا(عەبدولمەلیك) گوتی: داخ بۆ ئەو خاوەن ڕیشانە ....... ئایا زانایەکیان تیانی یە کەپێشیان بکەوێ، ئائەو لاوە یان پێش خستووە؟!

ئینجا لایکردەوە بەلای (ئیاس) داو گوتی: تەمەنت چەندە ئەی لاو؟!

(ئیاس) ووتی: تەمەنم – خودا ئەمیر پایەداربکات– وەك تەمەنی (ئوسامەی کوڕی زەید) [1]

ئەکاتە پێغەمبەر(ﷺ) کردیە سەرکردەی سوپایەك کە(ئەبوبەکر) و (عومەری) تێدابوو.

جا(عەبدولمەلیك) پێ ی گوت: پێشکەوە ئەی لاو...... پێشکەوە........ خودا بەرەکەت خاتە تەمەنتەوە .

* * *

وەلەساڵێك لەساڵەکاندا خەڵکی دەرچوونە دەرەوە لەئێوارە وەخت دا بۆبینینی مانگی ڕەمەزان، لەسەرو هەموویانەوە، (هاوڕێ ی) پایە بەرز (ئەنەسی کوڕی مالیکی ئەنساری).........

کەلەو ڕۆژەدا پیاوێکی بەتەمەن بوو نزیکی (100) ساڵ تەمەنی بوو ........

جا خەڵکی سەیری ئاسمانیان کردو بەڵام هیچمان نەبینی .

بەڵام (ئەنەسی کوڕی مالیك) چاوی لەئاسمان بڕیبوو، وە دەیووت: بەڕاستی مانگم بینیووە ...... ئائەوە ئەوە ........

وەبەدەستی ئاماژەی بۆدەکرد......... بەڵام نەیبینی .

---

[1] / تەمەنی ئەوکاتەی (ئوسامە) لەخوار بیست ساڵەوە بوو .



ئالەوکاتەدا(ئیاس) ڕوانی بۆ(ئەنەس) (ڕەزای خوای لێ بێت)، بینی تاڵە موویەکی درێژ لەبرۆی لاربووەتەوە هەتا بەردەم چاوی .

جاڕووخسەتی بەئەدەبەوە لێ وەرگرت، وەدەستی درێژکرد بۆتاڵە مووەکەو دەستی پیاهێناو ڕێکی کردەوە، ئینجا ووتی پێ ی: ئەی هاوڕێ ی پێغەمبەری خودا ئایا ئێستامانگ دەبینی؟ .

جا(ئەنەس) هەردەیڕوانی وەدەیگوت:

نەوەڵاّ نای بینم، نەوەڵاّ نای بینم .

*　　　　*　　　　*

دەنگوباسی (ئیاس) بڵاّوبوویەوە، دەنگۆی هەموولایەکی گرتەوە، وەخەڵکیش لەهەموو لایەکەوە دەگەیشتنە خزمەتی وەئەوەی، ئەوکەتووشیان دەبوو لە دۆزوکێشە لە زانست و دین دا دەیانخستە بەردەستی بۆچارەسەر......

وەهەندێکیان زانستیان دەویست .........

وەهەندێکی تریان مەبەستیان لەوچوونە لایەی، دەستەوسانکردنی بوو بەمشتومڕی کردن لەگەڵیدایە شتی ناڕەواو بێ بنەما.

لەوانە، ئەوەی کە گێڕراوەتەوە ئەوەیە، کە کوێخایەك هاتە کۆڕەکەی و ووتی:

ئەی (ئەباوائیلە) ......... چی دەڵێیت لەبارەی سەرخۆشکەرەوە(عارەق) ؟.

ووتی: قەدەغەیە .

جاکابرای کوێخاگوتی: لەچ ڕوویەکەوە قەدەغەیە (حرامٌ) لەگەڵ ئەوەدا کە ئەو لەوەزیاترنی یە کەمیوەیەکەو ئاوێکی کوڵاّوە لەسەر ئاگر.

کە هەموو ئەوە حەڵاّڵە و ڕەوایەو هیچی تیانی یە .

جاووتی: ئایا لەقسەکانت تەواو بوویت ئەی کوێخا یان قسەت ماوە بیڵێیت؟

ووتی: بەڵێ تەواو بووم .

(ئیاس) ووتی: ئەگەر مشتێك ئاوبهێنم وە بەومشتە ئاوە لێت بدەم ئەزارت پێدەگەیەنێت؟

ووتی: نەخێر .

(ئیاس) ووتی: ئەگەر خۆڵەکە بهێنم ئینجا کای تێکەڵ بکەم، وەئاوبکەم بەسەریدا ئینجا جوان بیشێلم، ئەوجا لەبەرخۆردا وەك بەرد ووشکی بکەمەوەو، ئینجا بیکێشم پیاتا ئایائێشت پێ دەگەیەنێ ؟

کوێخاووتی: بەڵێ ....... بەڵکو دەمکوژێت پێ ی .

جا(ئیاس) ووتی: ئائەوەش عارەقە، کاتێك بەشەکانی کۆدەکرێتەوە، وەترشێنرێت و دەکرێتە عارەق قەدەغە (حەرام) دەبێت .

وەکاتێ کە(ئیاس) دادوەری(القضاء) گرتە دەست، لەچەند هەڵوێستێکی دا چڕی زیرەکی وفراوانی دەرك کردن و، تواناى بیٚ وێنەی لەئاشکراکردنی کۆمەڵێك لەڕاستی یەکاندا دەرکەوت .

یەکێك لەوانە ئەوەبوو کە دووپیاو چووەلای تادادوەری بکات لەنێوانیاندا، جایەکێکیان داوای ئەوەبوو کەهەندێك پارەی لای هاوڕێکەی داناوە، بەلاٚم کە داوای کردۆتەوە نکولی لێکردوە .

جا(ئیاس) پرسیاری لە پیاوەکە کرد کەداوای لەسەر تۆمارکرابوو، دەربارەی ئەوسپاردەیە، کابرا نکولی لێکردو ووتی:

ئەگەر هاوڕێکەم بەڵگەی هەیە بابیهێنێت .......

خۆئەگەر بەڵگەی نی یە، ئەوەی کەلەسەرمنە جگە لەسوێندخواردن هیچی تر نی یە

جاکە(ئیاس) ئەوەی بیست، ترسا لەوەی کە ئەو پیاوە بەسوێنەکەی پارەکە بخوات، بۆیە لایکردەوە بەلای خاوەن قەرزکەدا و پیٚ ی ووت: لەچ شوێنێك پارەکەی لادانا ؟ .

ووتی: لەفلاٚن شوێن .....

جاووتی: لەوشوێنەدا چی هەبوو؟ .

جاپیاوەکە ووتی: درەختێکی گەورەی لیٚ بوو لەژێری دا دانیشتبووین، وەبەیەکەوە لەژێرسێبەرەکەیدا نانەکەمان خوارد .

وەکاتێك ویستمان ئەویٚ بەجیٚ بهێڵین، پارەکەم دا پیٚ ی .

جا(ئیاس) پیٚ ی ووت: خاوەن قەرز بچۆ بۆئەو شوێنەی کە درەختەکەی لیٚ یە، بەڵکو کاتێك چوویتەوە لای ئەو درەختە، بیرت بکەوێتەوە لە کویٚ دا پارەکەت داناوە، وەبە ئاگابێیتەوە کە چیت لیٚ کردووە ....

ئینجا بگەڕێرەوە بۆلام وەئاگادارم بکە لەوەی کە بینیووتە .

جا پیاوەکە بەپەلە ڕۆشت بۆشوێنەکە، ئەوجا(ئیاس) گوتی بە داوا لەسەرەکە:

دانیشە تا هاوڕێکەت دەگەڕێتەوە ........ ئەویش دانیشت .

ئینجا(ئیاس) لای کردەوە بەلای ئەوانەدا کە دادگاییان هەبوو لەلای، وەدەستی کرد بە دادگایی کردنیان، لەولاشەوە بەکلەی چاوی چاودێری پیاوەکەی دەکرد.....

هەتا کەبینی بەتەواوی ئارام و دڵنیابووە، لای کردبەلایەوە بەکوتووپڕی پیٚ ی ووت:

ئایا ئەندازەی (تەقەیری) ئەوە دەکەیت کە هاوڕێکەت گەیشتبێتە ئەو شوێنەی کەسپاردەکەی لادانایت؟

جا کابراکە بەبیٚ بیرکردنەوە گوتی: نەخێر...... ئەوشوێنە دوورە لێرەوە .

جا(ئیاس) پیٚ ی گوت: ئەی دووژمنی خودا نکولی پارەکە دەکەیت و، دەشزانیت ئەو شوێنەی کەتیاتا وەرگرتووە؟ !

سوێند بەخودا بەڕاستی تۆ ناپاکیت .

پیاوەکە ڕاماو، لەدڵە لەرزێوە بێدەنگ بوو، وەدانی نابەناپاکی یەکەیدا ........

جا(ئیاس) بەرزی کرد هەتا هاوڕێکەی گەڕایەوە، وەفەرمانی دا بە پێدانەوەی سپاردەکەی .

*　　　　*　　　　*

وەهەر لە نموونەی ئەوە، گێڕراوەتەوە لیٚ ی کە دووپیاولێیان دەبێتە کێشە لەسەر دوو پارچە (مەخمەڵ) کە دەدرێت بەسەر سەرداو بەسەرشاندا پەخش دەکرێتەوە

پارچەیەکیان سەوزێکی تازەی بەنرخ بووە، وە ئەوکەیان سوورێکی کۆن .

جاداواکارگوتی: چوومە ناوحەوزێك ئاو کەخۆم بشۆم، وەمەخمەڵە سەوزەکەم لەگەڵ جلەکانم دا لەسەر قەراغی حەوزەکە دانا، جا نەیارەکەم هات، پارچە مەخمەڵە سوورەکەی لەتەنیشت پارچەکەی منەوە دانا، وەئەویش هاتە ناوحەوزەکە، وە لەپێش مندا دەرچووە دەرەوە...... جلەکانی لەبەرکردو، پارچە مەخمەڵەکەی منی هەڵگرت و، دای بەسەر سەروشانیدا لێیدا ڕۆشت و بردی .

منیش لە حەوزەکە هاتمە دەرەوەو، خۆم لەبەرکردو شوێنی کەوتم، وە داوای پارچە مەخمەڵەکەم لێکردەوە، بەڵام ئەو سوربوو لەسەرئەوەی کەهی ئەوە.......

(ئیاس) گوتی بە داوا لیکراو:

تۆچی دەڵێیت ؟! .

ئەویش ووتی: ئەوە هی منە ولەدەستی خۆم دایە .

(ئیاس) گوتی بەداواکار: ئایا بەڵگەت هەیە ؟

داواکار گوتی: نەخێر .

(ئیاس) گوتی بەدەرگاوانەکەی: شانەیەکم بۆئامادەبکە، ئەویش بۆی ئامادەکرد.........

ئەوجا سەری هەردوو پیاوەکەی داهێنا، بینی لەسەری یەکێکیان ووردە تووك و مووی سوور هی خوری مەحمەڵەکە وەری، وەلەسەری ئەوی تریان ووردە تووکی سەوز .........

ئەوجا(ئیاس) بڕیاری دەرکرد بە دانەوەی پارچە سوورەکە بەخاوەنی ووردەتووکە سوورەکەو، وە دانەوەی پارچە سەوزەکە بەخاوەنی ووردە تووکە سەوزەکە .........

* * *

وەهەروەها لە دەنگوباسی ووردبینی و زیرەکی (ئیاس)، لە(کوفە) دا پیاوێك هەبووە، کەلەبەرچاوی خەڵکیدا خۆی بەپیاوچاك و دیندارو خۆپارێز پیشان داوە......... هەتاسوپاس و ستایش و پیاهەڵدانی زۆر بوو بوو، وەهەندێك لە خەڵکی کردبوویانە جێگەی متمانەو، کاتێ سەفەریان بکردایە ماڵ و سامانیان لا دادەنا ........وە دەیانکردە سەرپەرشتیار کاری منداڵەکانیان ئەگەر هەستیان بکردایە بەنزیك بوونەوەی مەرگیان. جاپیاوێك هاتبووە لای و، پارەیەکی پێ سپاردبوو، وەکە پێویستی پێ ی هەبووبوو،

لێ ی داواکردبوەوە، ئەویش نکولی لێ کربوو.

جاپیاوەکە چوو بۆلای (ئیاس) و شکاتی لێ کرد،(ئیاس) گوتی بەشکاتکارەکە.

ئایا کابرا زانی کەتۆ دەتەوێت بیهێنی بۆلای من ؟ .

ووتی: نەخێر .

(ئیاس) پێ ی ووت بڕۆ وەسبەینێ بگەڕێرەوە بۆلام .........

پاشان (ئیاس) ناردی بە شوێن متمانە پێکراوەکە داو، پێ ی گوت:

بەڕاستی پارەیەکی زۆر لام کۆبۆتەوە هینی کۆمەڵە بێ باوکێك کەسەرپەرشتیاریان نی یە، جاوای بەباش دەزانم کە بەتۆی بسپێرم، وەتۆ بکەمە سەرپەرشتیارو دەسی بەسەریانەوە، جائایا خانووەکەت گونجاوە وپارێزراوە، وەکاتت هەیە ؟ .

کابرا گوتی: بەڵێ ئەی جەنابی قازی .

جاقازی گوتی: دووسبەی بێرەوە بۆلام، وەشوێنێك بۆپارەكە ئامادەبكە ......

وەهەروەها لەگەڵ خۆتا چەند حەماڵێك بهێنە تا هەڵی بگرن .......

لە ڕۆژی داهاتوودا پیاوە شكاتكارەكە هاتەوە لای (ئیاس)، (ئیاس) پیٚ ی ووت: بڕۆ بۆلای هاوڕێكەت وەداوای پارەكەتی لێبكەوە، جا ئەگەر نكولی لێكرد پیٚ ی بڵێ: لەلای قازی شكاتت لێدەكەم .

جاشكاتكار هات بۆلای پیاوەكە و داوای پارەكەی لێكردەوە، بەلاٚم پیاوەكە نكولی لیٚ كردو دانی پیانەنا كەبیداتەوە ،

ئەویش پیٚ ی ووت: كەوابوو لەلای قازی شكاتت لیٚ دەكەم .

ئەوجا كە ئەوەی بیست لە كابرا، پارەكەی بۆگێڕایەوە، وەڕێزیشی لێگرت ....

پیاوە گەڕایەوە بۆلای(ئیاس) و ووتی: هاوڕێكەم پارەكەی پیٚ دامەوە خودا پاداشتی بەخێری بداتەوە.

ئینجا پیاوی متمانە پێكراو لەوەختەكەی خۆیدا هات بۆلای (ئیاس) وە كۆمەڵێك كۆڵهەڵگری لەگەڵ دابوو،

جاقازی كەبینی لیٚ ی تووڕەبوو، وەئاشكرای كردوو پیٚ ی ووت:

خراپترین پیاو تۆی ئەی دوژمنی خودا، بەڕاستی دینت كردۆتە داو بۆ دونیا.....

*   *   *

بەلاٚم (ئیاس) لەگەڵ چڕی زیرەكی و، بەهێزی بیركردنەوەی و، خێراپێكانی دا........

جاری واهەبووە ڕێكەوتووە لەكەسێك كەبەبەڵگە پەرچی بەڵگەكەی داوەتەوە، وەڕێگەی قسەی لێبڕیووە و بیٚ دەنگی كردووە .

لەبارەی خۆیەوە دواو گوتی:

هیچ كەسێك بەسەرم دا زاڵ نەبووە لەبەڵگەهێنانەوەدا، جگە لەیەك پیاو، ئەویش من لە كۆڕی دادوەریدابووم لە(بەسرە) پیاوێك هاتە لام، گەواهی(شاهیدی) دا لەلام كەفلاٚن باخ موڵكی فلاٚن كەسە، وە

بۆی دەستنیشان كردم.........

جامن ویستم كە گەواهی یەكەی تاقیبكەمەوە ............

ئەوجا پێم ووت: ژمارەی درەختەکانی باخەکە چەندە ؟

تۆزێك سەری داخست، ئینجا سەری بەرزکردەوەو ووتی:

گەورەمان جەنابی قازی چەندەیە لەم کۆڕەدا دادوەری دەکات ؟

(ئیاس) فەرمووی پێم ووت: لەوەندە ساڵەوەیە .

جاکابرا گوتی: ژمارەی دارەکانی ئەم ژووری دادگایە چەندە ؟

بەڕاستی نایزانم، ئەوجا (ئیاس) فەرمووی، ووتم: ڕاستی لەلای تۆیە ئینجا گەواهی یەکەیم لێوەرگرت.

* * *

وەکاتێك (ئیاس کوڕی موعاویە) تەمەنی گەیشتە حەفتاو شەش (٧٦) ساڵ، خۆی و باوکی لە خەودا بینی سواری دوو ئەسپ بوو بوون، پێکەوە ڕێگەیان بەڕێ دەکرد......... نەئەوپێش باوکی دەکەوت، وەنە باوکی پێش ئەو دەکەوت، وەباوکی وەفاتی کردبوو کاتێك کەتەمەنی حەفتاوشەش ساڵ بوو.

وە لەشەوێکدا(ئیاس) چوو بۆسەرجێگەکەی وە ووتی بەماڵ و خێزانی:

ئایا دەزانن ئەم شەوە چی یە، وەکام شەوە؟

ووتیان: نەخێر .

ووتی: لەم شەوەدا باوکم تەمەنی تەواوکرد.

جاکە ڕۆژیان کردەو، بینیان (ئیاس) وەفاتی کردووە .

خودا بەزەیی بە (ئیاس) ی قازی دابێتەوەوەو، بەڕەحمەتی فراوانی خۆی بخات، بەڕاستی ناوازەیەك بوو لە ناوازەکانی چرکە ساتی خۆی، وەسەرسوڕهێنەرێك بوو لەسەر سوڕهێنەرەکانی زەمان لە ووردبینی و زیرەکی داو، گەڕان بەدوای حەق و ڕاستی داو گەیشتن پیّ ی .

خودایە حەق پێکانی ئیاس

بەئێمەش ببەخشە وەلەخزمەتی

ئەواندا لەبەهەشتا کۆمان بکەوە .

﴿وەرگێڕ﴾

# ٦ )عومەری کوڕی عەبدولعەزیزو عەبدولمەلیکی کوڕی

**ئایا نەتزانیوە کە بۆ هەموو گەلێك خانەدانێك هەیە .... وەبێ گومان (خانەدانی (بەنی ئوممەیەش) (عومەری کوڕی عەبدولعەزیزە، وە بەدڵنیایی یەوە ئەو زیندو دەکرێتەوە ڕۆژی دوایی خۆی بەتەنها ئومەتێکە)**

**(موحەمەدی کوڕی عەلی کوڕی حوسەین)**

شوێنکەوتووی بەڕێز ئەمیری بڕوادارن (عومەری کوڕی عەبدولعەزیزە) لەوە دابوو کەتەپوتۆزی گۆڕی پێشینەکەی لە دەستەکانی بتەکێنێ، کە گوێ بیستی لەرزەیەك بوو لە دەوروبەریدا کە زەوی دەهەژاند.

جا وروتی: ئەوە چی یە ؟!.

ووتیان: ئەوە کەژاوەی جێ نشینی یە (الخلافه) – ئەی ئەمیری بڕواداران. ئامادەکراوە بۆجەنابت کەسواری ببێ ......... (عومەر) بەکلەی چاو بۆی ڕوانی، وە ووتی بەدنگە پچڕپچڕەکەیەوە، کەشەکەتی دایگرتبوو، وەشەونخوونی سیسی کردبوو: چی لەوە بکەم؟!

میهروسۆزی خوداتان لەسەربێ لێم دووربخەنەوە ........

وەتەنها وولآخەکەی خۆمم بۆبهێنن، بەڕاستی من ئەوەم بەسە . لەوەدابوو کە سوار (ولآخەکە) ببێ، کەبەڕێوەبەری پۆلیس هات و ئامادەبوو کەلەنێوان دوو دەستی یەوە، ڕێ بەڕێ بکات..

وەکۆمەڵێك لەپیاوانی پۆلیس لەگەڵدابوو کەلەلای ڕاست و چەپی (ئەمیرەوە) ریزبوون، وەبەدەستیانەوە شیرەکانیان دەدرەوشایەوە .

(ئەمیر) لایکردەوە بەلای بەڕێوەبەری پۆلیس داو ووتی:

من پێویستم نەبەتۆو نەبەئەوان هەیە ........

من هیچ شتێك نیم جگە لە پیاوێك لە موسڵمانان ........

دێم و دەچم هەر وەك و ئەوان .

ئینجا ڕێی بەڕێ کرد و خەڵکیش لەگەڵی دا، تاچووە ناو مزگەوت، وەبانگی دا لەناوخەڵکەکەدا:

(الصَلاةُ جامِعَةٌ ............ الصَلاةُ جامِعَةٌ )

واتە: (نوێژ کۆکەرەوەیە ....... نوێژکۆکەرەوەیە ........)

جا خەڵکی لەهەموو لایەکەوە ڕوویان کردە مزگەوت. کەهەموویان کۆبوونەوە، ئەمیر دەستی کرد بەووتار.

سوپاس و ستایشی خودای کرد لەسەر بەهرەکانی، وەدروودی دا لەسەر پێغەمبەرەکەی، پاشان ووتی:

ئەی خەڵکینە بەڕاستی من تووشکراوم بەم کارە (جێنشینی) بەبێ وەرگرتنی ڕای خۆم ......یان داواکردنی لەلایەن منەوە .......

وەبەبێ ڕاوێژکردن لەلایەن موسڵمانانەوە. یان بڵێین ڕاوەرگرتنیان... جاوا من ئەو پەیمانەی کەلە گەردنتانایە بەرامبەر بەمن، لەگەردنتانم داماڵی ئیتر خاوەنی پەیمان نین بەرامبەر بەمن......

دەی فەرموون (جێ نشینێك) کەلێ ی ڕازین بۆخۆتانی هەڵبژێرن ........

ئەوجا خەڵکی بەیەك دەنگ هاواریان کرد:

بەڕاستی ئێمە تۆمان هەڵبژاردووە ئەی(ئەمیر) ی بڕواداران وەڕازین پێت .....

کاروبارمان بگرە ئەستۆت بەخێرو بەرەکەت .

کە (عومەر) سەرنجی دا دەنگەکان هێوربوونەوە، وەدڵەکان ئارامیان گرت، جارێکی دی سوپاسن و ستایشی خودای کرد، وە درودی لەسەر پێغەمبەردا (ﷺ) .

جا دەستی بەقسەکرد، وەخەڵکی هان دەدا لەسەر خۆپارێزی (التقوی) وەهانی دەدان بۆ دونیانەویستی.

وەهانی دەدان بۆکارکردن بۆ دووا ڕۆژ..........

وەمردنی بیردەخستنەوە بەڕاوێژێك کە دڵە ڕەقەکانی نەرم ونیان دەکردەوە، وەفرمێسکە قەتیس ماوەکانی هەڵدەڕژان و، کە لەدڵی خاوەنەکەی دەردەچوو، جێگیردەبوو لە دڵی گوێگران دا .

ئینجا دەنگە شەکەتەکەی بەرزکردەوە تاخەڵکی هەموو گوێ بیستی بن، وە ووتی:

ئەی خەڵکینە، هەرکەس گوێ ڕایەڵی خودای کرد، گوێ ڕایەڵی پێویستە.....

وەهەرکەس لەخودا یاخی بوو، ئەوە گوێڕایەڵی لەسەر هیچ کەس نی یە ......

ئەی خەڵکینە، گوێ ڕایەڵیم بکەن ئەوەندەی لە ناوتانا گوێ ڕایەڵی خودام کرد........

جائەگەر لەخودا یاخی بووم، ئەوە گوێ ڕایەڵی بۆ من نی یە، وەلەسەریشتان نی یە

ئینجا لەسەر مینبەرەکە هاتە خوارەوە، وەڕووی لەماڵەکەی خۆی کردو، چووە ژوورەکەی خۆی .

دەیوویست کەساتە وەختێك لە پشوودابێت، لەپاش ئەوشەکەتی یە زۆرەی کە تووشی بوو لەکاتی وەفاتی خەلیفەوە تا ئەو چرکە ساتە .

* * *

بەڵام کاتێك کە (عومەری کوڕی عەبدولعەزیز) لە وەدابوو کە لەجێگەکەیدا پاڵبکەوێت، وەسەربنێتەوەو پشوویەك بدات. (عەبدولمەلیکی کوڕی) هاتە خزمەتی، کەلەوکاتەدا تەمەنی بەرەو حەڤدەساڵ دەچوو- وە ووتی:

ئەی ئەمیری بڕواداران دەتەوێت چی بکەیت؟ :

جا ئەمیر فەرمووی: ئەی کوڕم دەمەوێت کەمێك بخەوم، چونکە ووزە لە لەشمدا نەماوە .

کوڕەکەی ووتی: ئەی ئەمیری بڕواداران ئایا دەخەویت پێش ئەوەی مافی ستەملێکراوان بگێڕیتەوە بۆیان؟ :

جا ئەمیر فەرمووی : بەڵێ کوڕم، بەڕاستی من دوێنێ زۆر شەکەت بووم و شەونخونیم چەشت لە بەخاکسپاردنی مامتا........

وەبە دڵنیایی کە کاتی نوێژی نیوەڕۆهات و نوێژم بۆکردن، ئەوجا بەوویستی خودا مافەکانیش دەگێڕمەوە بۆ خاوەنەکانیان.

جا کوڕەکەی ووتی: دەی کێ دەستەبەرت دەکات ئەی ئەمیری بڕواداران بەوەی کەتۆبژیت تانیوەڕۆ؟ !

ئەو ووتەیە توانای (عومەری) هەژاندو نوێ ی کردەوە .....

وەخەو لەچاوەکانی ڕەوی ........

وە هێزوو تواناو وویست گەڕایەوە بۆ لەشە شەکەتەکەی و ووتی:

لێم نزیک بەرەوە ئەی کوڕی من .

جاکوڕەکەی لێ ی نزیک بوویەوە، گرتی یە باوەشی وەنێوانی هەردووچاوی ماچ کرد، وە ووتی:

سوپاس و ستایش بۆ ئەو خودایەی کەلە پشتی من نەوەیەکی پێ بەخشیم کەیامەتیم بدات لەسەر دینەکەم .

ئینجا هەستا، وەفەرمانی دا کە جاڕ بدەن بەناو خەڵکیدا:

کە کێ ستەمێکی لێکراوە، شتێکی لێداگیرکراوە بابەرزی بکاتەوە بۆلای ئەمیر....

*   *   *

جا ئەو (عەبدولمەلیکە کێ یە) ؟ :

چی یە دەنگوباسی ئەو گەنجەی خەڵك لەبارەیەوە ووتی:

ئەو ئەوکەسەیە کەباوکی خستە ناو خوداپەرستی یەوە ........ وەخستیە سەر ڕەوی یەی دونیا نەویستنی ......... فەرموون باشارەزابین لەچیرۆکی ئەو لاوە خوداناس و ساڵحە لە سەرەتایەوە ........

*   *   *

(عومەری کوڕی عەبدولعەزیز) (15) پانزە جگەر گۆشەی هەبوو، کەسیانیان کچ بوون ........



وەهەموویان خاوەنی بەشێکی باش بوون لەخۆپارێزی (التقی)، وەپلەوپایەیەکی گەورە لە چاکی یەتی (الصَّلاح) .

بەڵام (عەبدولمەلیك) هۆکاری هۆنینەوەی ملوانکەی برایەتی یەکەیان بوو، وەئەستێرەی درەوشاوەیان بوو.......

بەڕاستی ئەو قسەکەرێکی (ادیباً) نموونەی و زیرەك بوو..... لە تەمەندا لاوبوو.... بەڵام لەژێری دا پیاوێکی بەتەمەنی ژیربوو......ئەو هەرلە منداڵی یەوە گەشەی کرد لە گوێ ڕایەڵی خودادا، ئەو نزیکترین شێوە بوو لە خانەوادەی خەتابەوە بەگشتی، بەتایبەتی زۆر دەچوو لە (عەبدوڵڵای کوڕی عومەر) خوا لێ ی ڕازی بێت لە خودا پەرستی و خۆپارێزی دا، وە لەترسی بیمیمدا لە خودای باڵادەست ، وەلە نزیك بوونەوەیدا لێ ی و بەگوێ ڕایەڵی فەرمانەکانی .

*		*		*

(عاسمی ئامۆزای) [1] دواو گوتی:

بەڕاسپاردەیی ڕاسپێرام بۆسەردانی (دیمەشق)، بوومە میوانی لەلای ئامۆزاکەم (عەبدولمەلیك) کە ئەو ڕەبەند بوو کەژنی نەهێنابوو.

نوێژی خەوتنمان کردو، هەریەکەمان چووینە سەرجێگەی نووستنمان .

جا(عەبدولمەلیك) هەستاو چراکەی کوژاندەوە .

وە هەریەکەمان بەدەم وەنەوزەوە پێڵووەکانمان نەواندو نووستین. پاشان من لەنیوەی شەودا لەخەو هەستام، سەیرم کرد(عەبدولمەلیك) خەبەرەو نوێژ دەکات لەتاریکیدا، وەئەم فەرموودەی خودای باڵادەست دەخوێنێتەوە .

﴿ أَفَرَأَيْتَ إِنْ مَتَّعْنَاهُمْ سِنِينَ. ثُمَّ جَاءَهُمْ مَاكَانُوا يُوعَدُونَ . مَاأَغْنَى عَنْهُمْ مَاكَانُوا يُمَتَّعُونَ﴾ (شعراء ٢٠٥ -٢٠٧)

واتە:پێم بڵێ ئەگەر وازیان لێ بهێنین چەند ساڵێکی زۆر راببوێرن بە بەهرە دونیایی یەکانەوە، ئینجا ئەو سزایەی کە پەیمانیان درابوو یەخەی گرتن، چ شتێك لەوەی کە رایان بوارد پێ ی و لەزەتیان لێ وەرگرت لە لەزەتە دوونیایی یەکان

---

[1] ئەو (عاسمی) کوڕی ئەبی بەکری کوڕی عەبدولعەزیزی کوڕی حەروانە کە برازای عومەری کوڕی عەبدولعەزیزە .



سوودیان پێ دەگەیەنێ بۆ وەلانانی ئەو سزایە؟ بێگومان ئەو رابواردنە دوور و درێژە هیچ سوودیان پێ ناگەیەنێ .

جا ئەوەی کە سەرنجی منی ڕاکێشا ئەوە بوو کە ئایەتەکەی دووبارە دەکردەوە، دە گریا گریانێکی بە کوڵ بێ هەراوهۆریا، کە بەنی دڵی دەچڕاند.

وە هەر کاتێك لە خوێندنەوەی ئایەتەکە تەواو دەبوو، دیسان دەگەڕایەوە بۆ دووبارەکردنەوەی، تا وام لێهات ووتم: گریانەکە دەیکوژێت .

کە ئەوەم بینی ووتم :

(لا إله إلاّ اللّه، والْحَمدُ لِله)

هەروەك ئەو کەسەی کە لەخەو هەڵدەستێت، بۆ ئەوەی کۆتایی بە گریانەکەی بهێنم

جا کە گوێ ی لێم بوو، بێ دەنگ بوو، ئیتر ئەوەی هەستی پێ بکرێت لێم نەبیست

* * *

لە ڕاستیدا ئەو (لاوە عومەرییە) فێر بوو لەسەر دەستی گەورە زانایانی چاخی خۆیدا، تا بە تەواوی شارەزابوو لە قورئان و لەزەت لێ وەرگرتن ..

وە دڵی ئاوەدان بوو بە فەرموودەکانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) وە زانستی یەکی فراوانیان لێوە فێر بوو ..

هەروەها لە زانستە شەرعییەکاندا بە باشی ڕۆچوو، وە شارەزایی یەکی زۆر فراوانی تێدا پەیداکرد ...

لەگەڵ ئەوەدا کە لەتەمەندا لە سەرەتادا بوو ..؟

بە چڕی دەستلەملانی چینی یەکەمی دەکرد لە زانایانی خەڵکی شام لە چاخی خۆیدا .

گێڕراوەتەوە کە (عومەری کوڕی عبدولعەزیز) خوێنەران و زانایانی شامی کۆکردەوە و ووتی:

بەڕاستی من ئێوەم بانگهێشت کردووە بۆ بڕیاردان لەسەر ئەو ستەمانەی کە کراوە لە ستەملێکراوان لەلایەن خانەوادەو خزمانی منەوە؛ تا بزانم چی دەڵێن؟

ووتمان:

ئەی ئەمیری بڕواداران، ئەوە کارێکە کە کەسانێ ئەنجامیان داوە کە پێش دەستبەکاربوونی تۆ بوون .

وە تاوانی ئەوانە لەسەر ئەو کەسەیە کە تاوانەکەی ئەنجام داوە و دەستی بەسەر ماڵ و سامانیدا گرتووە

بەڵام ئەمیر بە ووتەی ئەوان دڵخۆش نەبوو ...

جا یەکێك لەوانە کەڕای جیاوازی هەبوو لای کرد بەلای ئەمیرەوەو ووتی :

ئەی ئەمیری بڕواداران بنێرە بە دوای (عەبدولمەلیك) دا، چونکە بەڕاستی ئەو لەوانە کەمترنی یە لە زانایی و ژیری دا .

جا کاتێك کە (عەبدولمەلیك)هاتە خزمەتی (عومەر) پیێ ی ووت:

چی دەبینی، یاخود بڵێین چی بڕیاردەدەی دەربارەی ئەو ماڵ وسامانەی کە ئامۆزاکانمان لە خەڵکیان داگیر کردووە بە ستەم ؟ .....

وە وا ئێستا خاوەنەکانیان ئامادەبوون و داوای دەکەنەوە، وە ئێمەش بەدوایدا چووین و دەزانین مافی خۆیانە ؟!..

(عەبدولمەلیك) گوتی: من وای دەبینم کە بیانگێڕیتەوە بۆ خاوەنەکانیان مادام دڵنیابووی لەوەی کە هی ئەوانە .....

وە دڵنیابە ئەگەر وانەکەیت، تۆ هاوبەشی ئەوانە دەبیت کە ستەمەکەیان ئەنجام داوە

جا ئەوجا دڵی (عومەر) کرایەوە و ئارام بوو، وە ئاخی پشووی دا، وە ئەوەی کە بوو بوە هەموو غەمی نەما .

وە (لاوی عومەری) ئەوەی بەلاوە باشتربوو کە پاسەوانێکی ڕاوەستاوو چاوکراوە بێت لەسەر سنوور، بە تایبەتی لەو شوێنەدا کە ڕێگای هێرشهێنانی نەیاران بوو، بۆیە بڕیاری دا بە جێگیربوون لە یەکێك لە شارە نزیکەکانی ئەو شوێنەداو، مانەوە تیایدا لە ووڵاتی شام.

بۆیە ڕێ ی بەڕێکرد بۆ ئەوێ .... وە (دیمەشق)ی بەجێهێشت کە پڕبوو لە باخ و باخاتی دڵڕفێن و سێبەری خۆش و، ڕووباری پڕ لە ئاو .

باوکی – لەسەروو هەموو ئەوەی کە دەیزانی لە بارەی چاکی و خۆپارێزی و خوداپەرستیەوە، بەڵام هەر زۆر دەترسا لە دڵراوکێ ی شەیتان بۆی، وە زۆر دەترسا و

بەزەی پیایدا دەهاتەوە کە گیرۆدەی ئارەزووەکانی لاوی یەتی بێت، لەبەر ئەوە سووربوو لەسەر ئەوەی کە هەموو شتێك بزانێ دەربارەی، هەموو ئەوەی کە دەگونجێ و شایانی ئەوە کە دەربارەی بیزانێ .

بۆیە هەرگیز لەوە بێ ئاگانەدەبوو، وە پشت گوێ ی نەدەخست .

*　　*　　*

(مەیموونی کوڕی مەهران) کە وەزیری (عومەری کوڕی عەبدولعەزیز) و دادوەرو ڕاوێژکاری بوو ووتی:

چوومە خزمەتی (عومەری کوڕی عەبدولعەزیز) بینیم نامەیەك دەنووسێت بۆ جگەرگۆشەکەی (عەبدولمەلیك) تیایدا ئامۆژگاری دەکردوو، بەرچاوی روون دەکردەوە، وە ئاگاداری دەکردەوە، وەدەی ترساند و مژدەی دەدایە ..

لەوەی کە لەو نامەیاندا هاتبوو فەرموو بووی :

لە پاش دا .... بەڕاستی کەسێك کە لە هەموو کەس شایانتر بێت کە لەمن تێ بگات و، ووتەکانم تێ بگات تۆی .

وە بەڕاستی و بێ گومان سوپاس و ستایش هەر شایستەی ئەو خودایەیە کە لە هەموو کارێکی گچکەو گەورەدا چاکەی لەگەڵ ئێمە کردووە .

جا ئەی کوڕی من یادی گەورەیی و بەخشندەیی خودا بکەرەوە بەسەر خۆت و باوك و دایکتەوە .

دەستم بە دامانت، توشی لووت بەرزی و خۆ بەزلزانینی نەبی، چونکە ئەوە لە کاری شەیتانە .

وە شەیتانیش بۆ بڕواداران دوژمنێکی ئاشکرایە ..

وە ئەوەش بزانە، بەڕاستی من ئەم نامەیەم بۆ تۆ نەناردووە کە گوایە خوانەخواستە دەنگوباسێکی خراپم دەربارەی تۆ پێ گەیشتبێ . دڵنیابە هیچ شتێك لە چاکە زیاتر دەربارەی کاروبارت نازانم و ئاگادارنیم ..

تەنها ئەوەی کە پێم گەیشتووە ئەوەیە کە تۆ کەمێك لە خۆت ڕادەمێنی .....

جائەگەر ئەو ڕامانە (إعجاب) بت بات بۆ ئەوەی کەمن خەشمم لێ یەتی، ئەوجا لەمن دەبینی ئەوەی کە تۆ ڕقت لێ یەتی .

(مەیموون) ووتی:

پاشان (عومەر) لایکردەوە بەلامدا ووتی:

ئەی (مەیموون)، بەڕاستی(عەبدولمەلیك) ی کوڕم جوان بووە لەبەرچاوم دا، بەڕاستی من ناخی خۆم لەوەدا تۆمەتباردەکەم، وەدەترسم کەخۆشەویستیم بۆی زاڵ ببێت بەسەرشارەزاییم لێ ی ........

وەتوشم ببێت ئەوەی کەتووشی باوکیان دەبێت لەنەبینینی عەیب و ناتەواوی جگەر گۆشەکانیان ....

جابچۆبۆلای، هەوڵبدە بگەیتە نهێنی یەکانی و، ڕاستەقینەیی ئەو تاقی بکەیتەوە، وەسەرنج بدە ئایا تیایدا دەبینیت شتێك کەنیشانە بێت لەسەرخۆ بەزل زانین وشانازیکردن بەخۆوە .

چونکە بەڕاستی ئەولاوێکی تازەپێگەیشتووە، وەلە فرت و فێڵی شەیتان لەسەری دڵنیانیم .

(مەیموونە) ووتی:

ڕێم بەرێ کرد بۆلای (عەبدولمەلیك) تاگەیشتمە خزمەتی، جا ڕووخسەتم خواستوو، چوومە ژوورەوە، کەبینم لاوێك بوو لەسەرتای تەمەندا........ لاوێکی خۆش ڕوو، شێوە جوان، زۆربێ دەمار، دانیشتبوو لەسەر دۆشەکەڵە سپی یەکەی داخرابوو لەسەر بەڕەیەکی خوری. بەخێرهاتنی کردم، پاشان ووتی:

گوێبیستی باوکم بووم کەباسی کردویت بەوەی کەتۆشایانی خێروچاکەیت، جامنیش لەخودا تکاکارم کە بەتۆ سوودببەخشیێ بەمن وخەڵکانی دی و ئاینەکەی.

جاپێم ووت: چۆن خۆت دەبینی، یان بڵێین چۆنی؟ .

ووتی: چاکم لەخودای باڵادەست بەزیادبێت ........

جگە لەوەی بەڕاستی کە من دەترسم گومانی خێری باوکم بەمن لەخشتەم ببات، چونکە من نەگەشتوومە هەموو ئەوەی کە ئەو گومانی خێرم پێ دەبات ...

وەبەڕاستی من لەوە دەترسم کەخۆشەویستی باوکم بۆمن لەئاستێکدابێت کە زاڵ ببێت بەسەرناسینی مندا لەلایەن ئەوەوە ......وەبەهۆی ئەوەوە ببمە بەلاّ بەسەریەوە .

(مەیموونە) گوتی ڕامام (عجبتُ) لەهاوڕایی هەردووکیان ..........

پاشان پێم ووت:

پێم بڵێ بژێویت لەکوێ وەیە ؟ .

ئەویش ووتی: لەبەرهەمی پارچە زەوی یەکە کەلەکەسێکم کڕیووە، کەلەباوکی یەوە بەمیرات بۆی بەجێماوە، منیش لێم کڕیووە بەپارەیەك کە گومانی تێدانی یە، جاپەنام بەوەبردووە بۆبژێویم، وەبەخۆم پاراستووە لە باج وەرگرتنی موسڵمانان .

پێم ووت: خۆراکت چی یە؟

گوتی: شەوێك گۆشت ........ وەشەوێك نیسك وزەیت ....... وەشەوێك سرکەوزەیت ....... ئیتر ئەوە بەسە بۆژیان .

پێم ووت: ئایا هیچ لەناختا هەیە کەسەرت بە خۆت سڕبمێنێ ؟.

ووتی: دوورنی یە شتێك لەوە هەبێ تیامدا .

کاتێ کەباوکم ئامۆژگاری کردم، شارەزای کردم بەڕاستەقینەیی ناخی خۆم، وەبچووکی کردەوە لەلام، وەبەهای ناخمی(نفسی) لەبەرچاوخستم خودای بالاّدەست بەو ئامۆژگاری یەی ئەو سوودی پێ گەیاندم، خودا پاداشتی خێری بداتەوە ......

(مەیموونە) گوتی، دانیشتم کاتژمێرێك قسەم لەگەڵ دەکرد، وەکاتێکی خۆشم لەگەڵی دا بەسەربرد، نەم دیووە لاوێك هەرگیز لەو ڕوو جوانتر...... وەلەوتەواوتر لەژێریدا...... وەچاکترلەو لەڕەووشت بەرزی دا لەگەڵ سەرەتایی تەمەنیدا و کەمی تەجرەبەی ژیانیدا .

کە ئێوارە داهات، لاوێك هاتە خزمەتی و ووتی:

خودا چاکت بۆبکات، لێ بووینەوە لێی .....جابێدەنگ بوو......

ئەوجا من ووتم: ئەوەچی بوو لێ بوونەوە لێی؟!

(عەبدولمەلیك) ووتی: حەممام ........

ووتم: ئەوە چۆن؟ .

ووتی: خەڵکی چۆڵی دەکەن بۆم .

ووتم: بەڕاستی تۆ لەناخی مندا شوێنەوارێکی گەورەت هەبوو هەتا ئەوەم بیست.

جاترساو بەخۆیدا چوویەوە گوتی:﴿ إِنَّالله وَإِنَّاإِلَيْهِ راجِعونَ ﴾ هەروەها ووتی:ئەوە چی تیادایە ئەی مام خودا بەزەیی پێتدا بێتەوە ؟!

منیش ووتم: حەممامەکە هی تۆیە ؟! .

(عەبدولمەلیك) ووتی: نەخێر .

ووتم ئەی ئەوە چی یە داوات لێ دەکات کە خەڵکی لە حەممامەکە وەدەرنێ ی؟!

ئەوەیە کەتۆ دەتەوێت خۆت بەباڵادەست بەسەریاندا بنوێنی، وەڕێزی خۆت بەسەرڕێزی ئەواندا بەرزتررا بگەی .........

پاشان بەوە تۆ بەڕاستی زیان دەدەیت لەخاوەن حەممامەکە لە دەستهاتی ڕۆژانەدا، چونکە ئەوەی کە دێت بۆحەممام کردن، بەهەناسە ساردی دەگەڕێتەوە.

ئەوسا(عەبدولمەلیك) گوتی: دەربارەی خاوەنەکەی من ڕازی دەکەم وەدەستهاتی ڕۆژانەی دەدەمێ .

ووتم: ئەوە خەرجی یەکی زیادەیە کە لووت بەرزی تێکەڵە .....دەی چی یە ئەوەی کەنایەڵێ لەگەڵ خەڵکیدا بچێتە حەممام، وەتۆش وەك هەریەکێکی ئەوان بیت ؟!

ووتی:

ئەوەی کەنایەڵێ ئەوەیە کە کۆمەڵێك لەخەڵکی دەچنە حەممام بەبێ پەشتەماڵ، جامنیش پێم ناخۆشە بینینی عەورەتیان .........

وەپێشم ناخۆشەکە ناچاریان بکەم بەبەکارهێنانی پەشتەماڵ، چونکە ئەگەر وابکەم، ئەوان وای لێکدەدەنەوە کەئەوە خۆسەپاندنی توانای منە بەسەریاندا بەهۆی ئەو دەسەڵاتەی کەلە خودا ئەخوازم ڕزگارمان بکات لێ ی بەس بێت، نەك لەسەرمان

بكەوێت وببێتە بەلاَ بۆمان....دەی خودا بەزەیی پێتا بێتەوە، ئامۆژگاریم بكە ئامۆژگاری یەك لێ ی سوودمەندبیم... وەدەرگایەكم لێ بكەرەوە تا لەو كارە ڕزگارم بێت

منیش ووتم: چاوەڕێ بكە تا خەڵكی لەحمام دێنە دەرەوە لەشەوداو، دەگەڕێنەوە بۆخانەكانی خۆیان، پاشان تۆبچۆرە حەممامەوە ........

(عەبدولمەلیك) گوتی: سوێند دەخۆم و پەیمان دەدەم .

كەهەرگیز لەمڕۆبەدواوە بەڕۆژدا ناچمە حەممام، خۆ ئەگەر سەرمای بەهێزی ئەم وولاَتە نەبوایە، هەرگیز نەچوومە حەممامەوە...جاكەمێك سەری داخست وەك ئەوەی كەبیربكاتەوە لەوكارە ، ئینجا سەری هەڵبڕی و لای كرد بەلامەوەو ووتی: سوێندت دەدەم كەئەم باسە لەلای باوكم ئاشكرا نەكەی، چونكە بەڕاستی من پێم ناخۆشە كەلێم بەقین بێت ..........

وەبەڕاستی لەوە دەترسم كەمەرگ بكەوێتە نێوان منو ئەوەوەو، لەو هەڵەیەم گەردنم ئازاد نەكات.

(مەیموونە) ووتی:

وویستم ئالەوێدا ژیری ئەو تاقی بكەمەوە، جاپێم ووت:

ئەی ئەگەر ئەمیری بڕواداران پرسیاری لێ كردم: ئایا هیچم لەتۆ بینیووە؟.......ئەوجا ئایا تۆڕازی دەبی لەمن كە درۆی بۆبكەم ؟!

(عەبدولمەلیك) ووتی: نەخێر....... پەنا بەخوا........ بەڵكو پیێ ی بڵێ :

شتێكم لێ بینی و ئامۆژگاریم كرد دەربارەی و، لەبەرچاویدا گەورەم كرد، ئەوجا ئەویش خێرا لێ ی گەڕایەوەو پەشیمان بوویەوە، چونكە باوكم پرسیارت لێ ناكات بۆئاشكراكردنی شتێك كەخۆت بۆی ئاشكرانەكەیت .

لەبەرئەوەی خودای بالاَدەست پەنای داوە لەگەڕان بەدوای ئەوەدا كەشاردراوەتەوە .

(مەیموونە) ووتی: نەم بینیووە هەرگیز باوك و كوڕێك وێنەی ئەو دووانەبێت، خودا بەزەیی پێیاندا بێتەوە .

* * *

خودای باڵادەست ڕازی بێت لەپێنجەم خەلیفەکانی ڕاشیدین (عومەری کوڕی عەبدولعەزیز) وە لە کوڕەکەشی ..... وەخودا گۆڕی خۆی وجگەرگۆشەکەی (عەبدولمەلیک) ڕووناك بکاتەوە .

وەسڵاوی خودا لەسەر هەردووکیان بێت ئەو ڕۆژەی کەبەخزمەتی ڕەفیقی ئەعلا دەگەن .......

وەسڵاوی خودایان لەسەربێ ئەو ڕۆژەی زیندوو دەکرێنەوە لەگەڵ پیاوچاکان و خوداناساندا .

خودایە ئێمەش لەڕۆژی زیندوو بوونەوە دا بکەرە هاوڕێ ی(عومەری کوڕی عەبدولعەزیز) و جگەرگۆشەکەی (عەبدولمەلیك) .



# ٧ ) حەسەنی بەصری

**(چۆن گەلێك گومڕا دەبێت كە نمونەی (حەسەنی بەصری) تێدابێت.**
**(مەسلەمەی كوڕی عەبدولمەلیك)**

مژدەدەر هات، مژدەی دایە(ئومم و سەلەمە)ی هاوسەری پێغەمبەر (ﷺ)، بەوەی كە بەندەكەی (خەیرە) كوڕێكی بووە.

جاخۆشی و شادی دڵی دایكی بڕوادارانی پڕكرد، وە خۆش نودی لەسەر دەم و چاوە بەڕێزەكەی دەركەوت.

وەخێرا ڕەوانەكراوێك نارد تا (خەیرە) جگەر گۆشەكەی بۆ بهێنێ، تا (خەیرە) لە ماڵەكەی ئەودا ماوەی پاشینەی منداڵبوونەكەی (النّفاس) بباتە سەر.

بەڕاستی (خەیرە) لای (ئوممو سەلەمە) زۆر جێگەی ڕێزبوو، وە خۆشی دەویست لەدڵیدا.........

جائەوە وایلێكردبوو كە زۆر ئارەزوومەند و ئاواتە خواز بوو، بۆ بینینی كوڕە تازە لەدایكبوەكەی.

*　　　　*　　　　*

زۆری نەخایاند تا(خەیرە) پەیدا بوو هات و كۆرپەكەی لەسەر دەستیدا بوو..........

كاتێك كە چاوەكانی (ئومو سەلەمە) ئاڕاستەی منداڵەكە بوو، ناخی پڕبوو لە خۆشی و خۆگری پیٚ یەوە.

بەڕاستی كۆرپە بچكۆلەكە جوان و ڕووگەش و، درەوشاوەو، ڕێك و پێك بوو،بینەرەكەی دڵخۆش دەكرد،وەناخی سەرنج دەری بەلای خۆیدا ڕادەكێشا.

پاشان (ئومم سەلەمە) لای كردەوە بەلای (خەیرە) دا و ووتی:

ئایا ناوی کوڕەکەت ناوە ئەی (خەیرە)؟

(خەیرە) ووتی:نەخێر ئەی دایە.......

بەڕاستی ئەوەم بەجێ هێشتوە بۆ بەڕێزت،تا ناوێك کەدەتەوێت بۆی دەست نیشان بکەیت .........

جا(ئومم سەلەمە) فەرمووی،لەسەر بەرەکەتی خوا ناوی دەنێین(حەسەن) ئینجا دەستەکانی بڵند کردەوە و بەچاکترین نزا نزای بۆ کرد.

*            *            *

بەڵام ئەبێت ئەوە بزانین کە دڵخۆش و خۆشنودی بەلەدایك بوونی(حەسەن)،تەنها یەکلانەبوو بووە وە لەسەر ماڵی دایکی بڕواداران (ئومم سەلەمە) ڕەزای خودای لەسەر بێ، بەڵکو ماڵێکی دی کەی گرتبوە وە لەماڵەکانی شاری (مەدینە).........

کە ئەویش ماڵی (هاوڕێی بەڕێز و پایەداری) (زەیدی کوڕی سابت) بوو، نووسەری نیگای پێغەمبەریخود (ﷺ).........

ئەویش لەبەر ئەوەی (یەسار) کە باوکی(حەسەن) بووبەندەی (زەید) بوو، وەجێگەی ڕێزی بوو لەنێوان خەڵکیدا، وە لەهەموو خەڵکی خۆشەویستربوو لەلای..........

*            *            *

(حەسەنی کوڕی یەسار) نەش و نمای کرد لەیەکێك لە ماڵەکانی پێغەمبەری خوادا(ﷺ) ، وەلەدوایدا ناسرابە(حەسەنی بەسری) وەپەروەردەکرا لە باوەشی هاوسەرێك لە هاوسەرەکانی پێغەمبەردا (ﷺ)کە

(هندی کچی سوهەیل) بووکە ناسراوە بە (ئوممو سەلەمە).وە (ئوممو سەلەمە).ئەگەر تۆ نایناسی، یان بڵێین هیچ لە بارەیەوە نازانی، لەتەواترینی ئافرەتانی عەرەبە لە ژیریدا ، وەلەزۆرترینیانە لە ڕێز و گەورەیدا، وەلەبەهێز ترینیانە لە خۆگری و وویستیدا.هەروەك لەزانست و زانیاریدا لەناوهاوسەرەکانی پێغەمبەردا(ﷺ) لەدیارترینیان بوو، وە لە زۆربەیان زیاتر گێڕەرەوەی فەرمودەبووە لە پێغەمبەرەوە(ﷺ)

سێ سەد و هەشتا و حەوت(٣٨٧) فەرموودەی لە پێغەمبەرەوە(ﷺ)گێڕاوەتەوە.......

زیاد لەوە یەکێك بوو لەو ئافرەتە کەمە ناوازانەی کەلەسەر دەمی نەفامیدا نوسینیان دەنوسی...

وەپەیوەندی ئەم منالە خۆش بەختە بە (دایکی بڕوادارانەوە) لەو سنورەدا ڕانەوەستا.......

بەڵکو درێژەی کێشا بۆ زیاتر لەوە......

زۆر جاران وا دەبوو(خەیرە)ی دایکی (حەسەن) لەماڵ دەردەچوو بۆ جێ بەجێ کردنی هەندێك لە پێویستیەکانی (دایکی بڕواداران)، جامنداڵە شیرە خۆرەکە لەبرسا دەگریا، وەگریانەکەی چڕ دەبوویە،(ئومموسەلەمە)ئەیگرتە باوەشی، وە مەمکەکانی دەخستە سەردەمی، بۆ ئەوەی ئارام بگرێت، وە دایکی لە بیر بباتەوە.....

جا لەئەنجامی زۆر خۆشویستنی، مەمکەکانی شیرێکی خاوێنی بەلەزەتی تکانە دەمی،منداڵەکەش دەیمژی و پێی بێ دەنگ دەبوو.بەهۆی ئەوە وە (ئوممو سەلەمە) بووە دایکی (حەسەن) لەدوو لاوە:١- ئەو دایکیەتی بەوەی کە (حەسەن) یەکێکە لەبڕواداران.

٢- دایکیەتی لە ڕێگەی شیر پێ دانەوە.

وە پەیوەندی بە هێز لە نێوان دایکانی بڕواداراندا و، نزیکی ماڵەکانیان لەیەکەوە، زەمینەیەکی باشی ڕەخساندبوو، بۆ ئەوە منداڵە بەختیارە، کەبەئاسانی سەردانی هەموو ماڵەکان بکات و لە هەموو دایکانەوە پەروەردەی جوان وەربگرێت، وە بەپێ ی ڕێنمای ئەوان ڕێگەیڕاست وەربگرێتە بەر....

وەکو خۆی دەیگێڕێتەوە ئەو ماڵانە پڕ بوو بوون لە جمو جۆڵی ئەو و، ئاوەدانی کردبونەوە بەیاریەکانی..

هەتا زۆر جار بەدەستەکانی دەستی گیر دەکرد لەداری بنمیچی خانوەکان و باز بازێنی دەکرد

*   *   *

(حەسەن) بەردەوام بوو لەگەڕان و ئەم دیوو ئەو دیووکردندا لەو زەمینە خۆشە بۆندارەدا کە بەبۆنی پێغەمبەرایەتی بۆندارکرابوو، وەلە ژێرسایەو سێبەرەدا دەدرەوشایەوە.....

وەبەردەوام هەڵی ئەهێنجا و لەو سەرچاوە شیرین و بێگەردانەی کەماڵی دایکانی بڕوادارانی پێ ئاوەدان بوو،تێر ئاوو دەبوووە هەروەها فێر دەبوو لەسەر دەستی گەورە هاوڕێیانی پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە مزگەوتەکەیدا........

بۆیە گێرەرەوە بوو لە (عوسمانی کوڕی عەففان) و(عەلی کوڕی ئەبی تالیب)و(ئەبی موسای ئەشعەری)و(عەبدڵای کوڕی عومەرە)وە. هەروەهالە(عەبدڵای کوڕی عەباس)و،(ئەنەسی کوڕی مالیك)و،(جابری کوڕی عەبدڵا)و، وەلەچەندانی تر لە هاوەڵانی بەڕێز.......

بەڵام زیاتر ڕامابوو وە بە(عەلی کوڕی ئەبی تالیبە)وە ڕەزای خودای لەسەر بێ،وە هۆگری بووە.

وە لەوە وە دامەزراوی لەسەر دینەکەیدا و، جوانی و چاکی خودا پەرستی و دونیا نەویستی و پشت کردنە جوانی و لەزەتە دونیایی یەکانی فێربوو.......

وزۆر ڕامابوو (معجب)بە دەربڕینە تیشك بەخشەکەی و،دانایی یە سنور پەڕێنەکەی و، ووتە گشتگیرەکانی و،ئەو ئامۆژگاریانەی کە دڵەکانی دەهەژاند چۆن هەژانێك .

لە ڕەوشت داربوو بە ڕەوشتەکانی یەوە لە خۆپارێزی وخوا پەرستی دا...

وە لەسەر زەوی ئەوڕێ ی بەڕێ کرد لەدەربڕین و ڕاوێژو ڕەوان بێژیدا.جا کاتێك (حسن)لە تەمەنیدا گەیشتە چواردە ساڵ،وە پێی نایە ناوکۆڕی پیاوانەوە ،کۆچی کرد لە خزمەتی باوکی ودایکی دا بۆ(بصرە)،وە لەوێ جێگیر لەگەڵ خێزانەکەیدا....

وەلەوێ درایە پاڵ (بەصرە).......

وەلەنێو خەڵکیدا ناسرابە (حەسەن) ی بەسری........

(بەسرە) ئەو ڕۆژگارەی کە(حەسەن)تیایدا جێگیر بوو، قەڵایەك بوو لەگەورەترینی قەڵاکانی زانست لەدەوڵەتی ئیسلام دا.......

وە(مزگەوتە گەورەکەی)، شەپۆلی دەدا بەگەورە هاوڕێیان و کۆمەڵێکی بەڕێز لەشوێنکەوتان کە کۆچیان دەکرد بۆی.......

وەبازنە و کۆڕەکانی زانست بەهەموو شێوە جیاجیا کانیەوە، سەران سەر بەشەکانی مزگەوتی ئاوەدان کردبووەوە،هەتا شوێنی نوێژکردنیش.

جا(حەسەن) وابەست بوو بەمزگەوتەوە، وەخۆی یەکلاکردەوە بۆئامادەبوون لە کۆڕی (عەبدوڵای کوڕی عەبباس) دا، کەناسرابوو بە زانا و خودا ناسی ئوممەتی (موحەممەد)(ص)،وەلێکدانەوە و (تەفسیر) فەرموودە و (الحدیث)خوێندنەوەکان(القراءات)ی لێوە فێربوو.........

هەروەك لەوە زیاتریش، فێری زانستە شەرعیەکان و،زمان و، ئەدەب و، هی تریش بوو...

هەتا بوویە زانایەکی گشتگیرو شەرع زانی باوەڕ پێکراو.....

جا خەڵکی ڕوویان تێکردو، هاتنە خزمەتی تالە زانستە فراوان و زۆرەکەی هەڵبهێنجن و فێربن...

وەلە دەوری کۆبوونەوە و دەوریان داو، گوێیان دەگرت بۆ ئەو ئامۆژگاریانەی کە دڵە ڕقەکەی نەرم و نیان دەکردەوە و فرمێسکە قەتیس ماوەکانی هەڵدەڕژاند.

وە ئەو پەندانەی ئەویان لەبەر دەکردوو لێ ی ڕادەمان کە ژیریان سەرسام دەکرد....

وەلاسای ئەو هەڵسوکەوتەی ئەویان دەکردەوەکە بۆن خۆشتربوو لە بۆنی میسك جادەنگوباسی(حەسەنی بەسری) لەووڵاتدا بڵاوبوویەوە، وناوی کەوتە نێو بەندەکانی خودا...

جا ئەوە وایکرد کە خەلیفەکان و ئەمیرەکان پرسیاریان لێ دەکردو، بەشوێن دەنگوباسی دەکەوتن.

*　　　*　　　*

(خالیدی کوڕی سەفوان)[1] گێڕایەوە ووتی:

بەخزمەتی (مەسلەمەی کوڕی عەبدولمە لیك)[2]

گەیشتم لە(حیرە)[3]

وەپێ ی ووتم:

(ئەیخالید) هەواڵم بدەرێ دەربارەی(حەسەنی بەسری) چونکە من واگومان دەبەم،ئەوەی کە تۆ دەربارەی ئەو دەیزانی، کەسێکی دی جگە لە تۆ ئەوە نازانێ.

جا پێم ووت: خوا چاکە بۆ ئەمیر بکات........

من باشترین کەسێکم لەوانەیکە هەواڵت بداتێ لەبارەیەوە بەهۆی شارەزاییەمە وە لێ ی. من دراوسێ ی ماڵەکەی بووم، وەیەکێك بووم لە هاوبەشانی کۆڕەکانی، وەشارەزاترین خەڵکی بەسرەم پێ ی.

---

[1]/ خالیدی کوڕی سەفوان: لەزمانڕەوانی عەرەب بوو، ئامادەی کۆڕی (عومەری کوڕی عەبدولعەزیز) و (هیشامی کوڕی (عەبدولمەلیك) بووەو ژیاوە تارۆژگاری (سەفاحی عەبباسی) .

[2]/ ئەمیر قائیدێکی بە توانابوو لە پاڵەوانەکانی (بەنی ئومەیە) (قوستەنتنیەی) گرت و(مزگەوتی مەسلەمە ی) تیا دروست کرد.

[3]/ شارێکی کۆنە لە(عێراق) بەدووری ٣ میل لە کوفەوە ئێستا نەماوە.

جا(مەسلەمە) ووتی:چیت لایە پێم بڵێ و بۆم باس بکە.
منیش ووتم: بەڕاستی ئەو کەسێکە نهێنیەکانی وەك وەك ئاشکراکانی وایە .
وە ووتەکانی وەك کردارەکانی دابوو.
وەکاتێك فەرمانی بکردایە بەچاکەیەك، خۆی کردارترین کەس بوو پێ ی .....
وە ئەگەر قەدەغەی لە خراپەیەك بکردایە، خۆی وازهێنەرترین خەڵك بوو لێی..
وەبەڕاستی کە بینیومە بێ باك بووە لە خەڵکی، خۆپارێز بووە لەوەی لەلایان بووە، یان بڵێین لە دەستیاندا بووە....
بەڵام خەڵکیم دەبینی ئاتاجی ئەو بوون، داواکاری ئەوە بوونکە لەلایان بوو، وەهەییبوو.
جا(مەسلەمە)گوتی: بەسمە ئەی(خالید)، بەسمە ئەی(خالید).
چۆن گەلێك گومڕاوو سەر لێشێوا و دەبێت، وێنەی ئەو پیاوەی تیابێ؟!.

* * *

وەکاتێك(حەجاجی کوڕی یوسفی سەقەفی) بوویە والی (عێراق)، وەلە وویلایەتیەکەیدا یاخی بوو، وە دەستی دایە ستەم کاری و زۆرداری.........
(حەسەنی بەسری) یەکێك بوو لە و کۆمەڵە پیاوەکەمەی کە ڕووبەڕووی بوونەوە لەسەر یاخی بوون و زۆر داریەکەی.
وەکردارە خراپەکانی حەجاجیان لە نێو خەڵکدا ڕاگەییاند و ئاشکرایان کرد، وە بەووشەی (حەق) بەڕوویدا چوونەوە.
لەنموونەی ئەوە،(حەجاج) خانوویەکی بۆ خۆی درووست کردلە (واسط)[1]
جاکە تەواوی کرد، بانگەوازی کرد بەنێو خەڵکیدا تا بێنە سەیر کردنی و، نزای بۆ بکەن.
جا(حەسەن) نەی وویست کە ئەو فرسەتە لەکیس بدات کە ئامادە بوونیەتی لەو کۆبوونەی خەڵکەدا.
چوو بۆلایان تا ئامۆژگاریان بکات.وە ئەوەی پێویستە یادیان بخاتەوە،وەبێ باکیان بکات لە دونیا و جوانی و لەزەت و بەهرەکانی، وە ئارەززمەندیان بکات بەوەی کە لەلای خودای بالادەستە..........

---

[1]/ (واسط) شارێکە لە عێراق دەکەوێتە نێوان (بەسرە) و(کوفە).

جاکە گەیشتە شوێنەکە، وەسەیری جەماوەری خەڵکەکەی کرد، کە دەگەڕان بەدەوری خانووە ڕازاوەکەدا، وەڕامابوون بەجوانی دروستکردنی و، فراوانی بەشەکانی و قەشەنگی ڕازاندنەوەی ........

لەناویاندا ڕاوەستا و، ووتاریدا بۆیان، لەکوێ ئەوەی کە فەرمووی:واسەرنجماندا و بینیمان ئەوەی کەپیسترینی پیسیەکان دروستی کردوە، وەزانیوشمانە کە(فیرعەون) لەوە گەورەتری بنیات نا، وەلەوە بڵنتری هەڵخست........

ئینجا خودای باڵادەست (فیرعەون)ی لەناوبرد،وەئەوەی کە بنیاتی نابوو، وەبڵند هەڵی خستبوو، تێك وپێکی دا.....

جا خۆزگە (حەججاج)بیزانیایە کە خەڵکی ئاسمان(فریشتەکانی عەرش)لێی بەقین و بێزی لێدەکەنەوە، وەخەڵکی سەرزەویش فێڵی لێدەکەن و بەدووڕوویی هەڵیان خەڵەتاند تاگومڕایان کرد.

بەردەوام بەو شێوەیە،ووتەکانی دەدا بەگوێ ی خەڵکیدا، هەتا پیاوێك لەبیسەران بەزەی پیایداهاتەوە نەوەك بەرخەشمی (حەججاج) بکەوێت و سزای بدات ، بۆیە پێی ووت:

بەسە ئەی (ئەباسەعید)........بەسە.

جا(حەسەن) پیّ ی ووت:

خودای باڵا دەست پەیمانی وەرگرتوە لە زانایان، کە ئەوەی دەیزانن بۆ خەڵکی ڕوون بکەنەوەو نەی شارنەوە.....

* * *

وەلە ڕۆژی داهاتودا (حەججاج)چووە کۆڕەکەیەوە، وەلە ڕق و کینی خۆیدا خەریك بوو پارچەکانی لەشی لەیەك دەپچڕا، وە ووتی بە ئامادەبووانی کۆڕەکە: دەك تیا بچن و لەبەر چاودا نەمێنن.......

بەندەیەك لەبەندەکای خەڵکی (بەسرە) ، هەڵدەسێت و پێمان دەڵێت.

ئەوەی کە دەیەوێت بیڵێت، ئینجا لەگەڵ ئەوەشدا، ئێوەیەکێکتان تێدانی یە کەڕووبەڕووی ببێتەوە و وەڵامی بداتەوە و بەگژیدا بچێتەوە!!....

سوێند بەخوا تێرئاوتان دەکەم لە خوێنەکەی ئەی ترسنۆکینە.

ئینجا فەرمانی کرد بە ئامادەکردنی شیر و پارچە پێستی ڕاخەر بۆ ئیعدام کردنی و لەگەردن دانی ...ئەو دوو شتە ئامادەکران..........

وەداوای جەللادی کرد، ئەویش لە نێوان دوو دەستی دا ئامادەبوو.

پاشان هەندێ لە پۆلیسەکانی نارد بەدوای (حەسەن)دا.....

وەفەرمانی پێ دان کە بیهێنن بۆ لای..........

جا زۆری پێ نەچووتا(حەسەن) هات، خەڵکی چاویان تێ بڕیبوو، وە دڵەکانیان بۆی دەلەرزی .

جا کاتێك(حەسەن) شیر و پارچە ڕاخەرەکە کەلەپێست بوو، وەجەللادی بینی، هەردوو لێوی جووڵاند...

پاشان کە ئامادەی بەردەمی (حەجاج) بوو وەك بڕواداریکی بە عیززەت و خاوەن ڕیز و، بانگەوازێکی خۆیەکلاکەرەوەی بەویقار و خاوەن شان و شکۆ تەنها بۆ موسڵمان و، ویقار و ڕێزی بانگەوازکار تەنها بۆلای خودا..........

خودای باڵا دەست....

(حەجاج) کە بەوشێوەیە بینی، شەرمی لێکرد و، ترس و بیمی لە ئاستیدا لێ نیشت چۆن ترس و بیمێك، وە پێ ی ووت:

فەرموو ئالێرە دا(ئەی ئەبا سعید) .........فەرموو ئالێرەدا.....

ئینجا بەردەوام خۆی لە ئاستیدا دەکردەوە و دەیگوت:

فەرموو ئالێرەدا.... وەخەڵکیش بۆیان دەڕوانی بەڕامان و سەر سوڕمانەوە هەتا داینیشاند لەسەر ڕاخەرەکەی خۆی.

وەکە(حەسەن) لەگەڵیدا و لەتەنیشتی یەوە دانیشت، (حەجاج)لای کرد بەلایەوە، وەدەستی کرد بە پرسیارکردن لێ ی لەبارەی هەندێ کار و باری دینیەوە، وە(حەسەنیش)وەڵامی هەموو پرسیارێکی دەدایە، بەزمانێکی جێگیرو، دەربڕینێکی سەرنج ڕاکێشەر و، زانستێکی فراوان.

ئەوجا(حەجاج) پێ ی ووت:

تۆ گەورەی زانایانی ئەی (ئەبا سەعید).

ئینجا داوای بۆنی تایبەتی کرد،وە ڕیشیان بۆ بۆندارکرد پێ ی و، جا خودا حافیزی لێ کرد.

جا کاتێك (حەسەن) چووە دەرەوە و بەجێ ی هێشت، دەرگاوانەکەی (حەجاج) شوێنی کەوت و پێ ی ووت:

ئەی(ئەبا سەعید)، بەڕاستی (حەجاج) بانگت دەکات بۆ شتێکی دی.

جگە لەوەی پێشوو، جا(حەسەن) گەڕایەوە لای،

(حەججاج) پێ ی ووت: بەڕاستی من تۆم بینی کاتێك هاتی، وە شیر و پارچە ڕاخەرەکەت بینی، لێوەکانت دەجولاند، چیت ووت؟

(حەسەن) وەڵامی دایەوە و ووتی:

بەڕاستی ووتم ئەی خاوەن و سەرپەرشتیاری بەهرەکانم و پەناگام لە کاتی تەنگەژە و غەمم دا، قین و خەشمەکەی لێم ساردبکەوە و بیکەرە بێ وەیی بۆم.

هەروەك ئاگرەکەت ساردکردەوە و (ئیبراهیم) ت تیایدا سەلامەت و بێ وەی کرد.

* * *

ئەو هەڵویستانەی (حەسەن) ی بەسری لەگەڵ والی یەکان و ئەمیرەکاندا زۆر و زەبەند نەبووە، وەلەهەموویاندا دەرباز بووە، گەورە لەبەر چاوی دەسەڵاتداراندا، خاوەن عیزەتێکی خودایی، وەپارێزراو بەپاراستنی خودای خاوەن دەسەڵات........

لەوانە ئەوەیە کەپاش ئەوەی(خەلیفەی دونیا نەویست عومەری کوڕی عەبدو لعەزین)گەڕایە بۆلای پەروەردگاری، جێگە نشینی کەوتە دەستی (یەزیدی کوڕی عەبدلمەلیك)، جا ئەویش(عومەری کوڕی هوبەیرەی فەزاری) کردە والی بەسەر(عێراقەوە) .....وەلەپاشدا دەسەڵاتی زیادەی پێدا و(خوراسانیشی) خستە ژێر دەسەڵاتی.

ئەبێ ئەوەش بزانرێ کە (یەزید) لە فەرمان ڕەواییدا. ڕچەو ڕێبازێکی جیاوازی پەیرەو دەکرد لە ڕچە و ڕێبازی پێشینە گەورەکانی......

(یەزید)بەردەوام نامەی ڕەوانە دەکرد بۆ (عومەری کوڕی هوبەیرە)، وەفەرمانی پێ دەدا بۆ جێ بەجێ کردنی داواکانی، ئەگەرچی جارو بار پێچەوانەی حەقیش بووە........

جا(عومەری کوڕی هوبەیرە) هەریەکە لە (حەسەن) بەصری و، (عامری کوڕی شوراحیبیلی) کەناسرابوو بە (ئەششەعبی) بانگکردن، وە پێ ی ووتن:

بێگومان ئێوە ئاگادارن کە ئەمیری بڕواداران(یەزیدی کوڕی عەبدولمەلیك) خودا کردوویەتی بە جێ نشین بەسەر بەندەکانیەوە، وە گوێڕایەڵیشی پێویست کردووە لەسەریان.

وە وەك ئێوە دەزانن و دەبینن منی کردووەتە والی (عێراق) و (فارس).

وەئەو هەندێك جار نامەکانی ئاڕاستەی من دەکات و تیایاندا هەندێ فەرمان دەدات، وەفەرمان بە من دەدات کە جێ بە جێ ی بکەم، کە من دڵنیا نیم لە داد پەروەری ئەو فەرمانانە.

جا ئایا ئێوە بۆ بەدوا چونی من و جێ بە جێ کردنی فەرمانەکانی هیچ ڕوخسەتێك لە دین دا دەبینن؟

(شەعبی)وەڵامێکی دایەوەکە کە دڵڕاگرتنێکی بۆ خەلیفە تێدابێ و، وە گونجاویش بێ بۆ والی.......

وە(حەسەن) بێ دەنگ بوو....

جا(عومەری کوڕی هوبەیرە) لایکرد بەلای (حەسەنەوەو)ووتی:

تۆ چی دەڵێیت ئەی (ئەبا سەعید)؟

ئەوجا ئەویش ووتی:ئەی (کوڕی هوبەیرە) لە خودا بترسە لەوەی کە(یەزید) دەیکات، وە مەترسە لە یەزید لەوەدا کە خودا دەیکات...

وەبزانە بەبێ گومان کە خودای باڵادەست دەتپارێزێت لە (یەزید)، بەڵام (یەزید) ناتپارێزێت لە خودا......

ئەی(کوڕی هوبەیرە) بەڕاستی نزیکە کە فریشتەیەکی توند و تیژ بێتە لات ، کە سەر پێچی خودا ناکات لەوەدا کە فەرمانی پێ دەکات ، جالەسەر ئەو جێگەتە وەلات دەنێ، وەدەتگوێزێتەوە لە کۆشکە فراوانەکەتەوە بۆ ناو گۆڕە تەنگ و تارەکەت.

کەلەوێدا(یەزید) شك نابەیت و نابینیت، بەڵکو ئەوەی کەدەیبینیتەوە ئەو کردارەتە کەسەرپێچی پەروەردگاری(یەزیدت)پێ کرد...

ئەی (کوڕی هوبەیرە) دڵنیابە ئەگەر تۆلەگەڵ خودا دابیت و، گوێڕایەڵی بیت، بەسە کە بتپارێزێت لە ئازار و ئەزیەتی (یەزیدی کوڕی عەبدولمەلیك لە دونیا و دوا ڕۆژدا

خۆئەگەر لەگەڵ (یەزید) دابیت لەسەر پێچی کردنی فەرمانەکانی خوادا و، یاخی بوون لێ ی، دڵنیابە کە خودا وازت لێ دەهێنێت و دەکەویتە بەر خەشم و ئەزیەت و ئازاری (یەزید).

وەباشی بزانە ئەی (کوڕی هوبەیرە) کە گوێڕایەڵی بۆ هیچ بەدیهێنراوێکی خودا نی یە هەرچۆن بێت لەسەرپێچی کردنی فەرمانەکانی خودای بالأدەستدا.

(عومەری کوڕی هوبەیرە) گریا گریا هەتا فرمێسکەکانی ریشەکەی تەڕ کرد .

وە ڕووی لە (شەعبی) وەرگێڕا بەرەو (حەسەن) ....

وە زێدە ڕەوی کرد لە ڕێزگرتن و بەگەورەگرتنی دا ...

جا کە هەردووکیان لەلای (یەزید) چوونە دەردوە، بەرەو مزگەوت چوون، خەڵکیان لێ کۆبوونەوەو پرسیاریان لێدەکردن دەربارەی دەنگوباسیان لەگەڵ ئەمیری (دوو عیراق) دا مەبەست کوفەو بەسرەیە.

(شەعبی) لایکرد بەلایانەوەو ووتی:

ئەی خەڵکینە کێ لە ئێوە دەتوانێت کە فەزڵی خودا بدات بەسەر بەدیهێنراوەکانیدا، لەهەرشتێکدا بابیکات ...

بەو کەسەی ناخی (نفسی) منی بەدەستە ئەوەی (حەسەن) ووتی بە (عومەری کوڕی هوبەیر) ووتەیەك بوو منیش دەمزانی ... یاخود بڵێین دەمفاماند ...

بەلأم من لەوەدا کە ووتم مەبەستم خاتری (کوڕی هوبەیرە) بوو. بەلأم ئەوەی ئەو ووتی لەبەرخاتری خودا بوو ...

جا خودای بالأدەست ڕووی (کوڕی هوبەیرە) ی لە من وەرگێڕا، وە (حەسەن)ی لەو نزیك خستەوەو، خۆشەویستی کرد لەلای .

* * *

بەڕاستی (حەسەنی بەسر)ی نزیکەی هەشتا (٨٠) ساڵ ژیا کە تیایدا هەموو دونیای پڕ کرد لە زانیاری و دانایی و پەندو ئامۆژگاریو شەرع زانی. وە لەگرنگترینی ئەوەی کە وەك میراتێك بەجێ ی هێشتووە بۆ نەوەکانی داهاتوو (رقائیقەُ) واتە (نەرم و نیانەکانی) مەبەست ئەو کۆمەڵە ئامۆژگاری و بەندایەتی کە بەدرێژایی ڕۆژگار بەهاری دڵەکانە ....

وە ئەو ئامۆژگاریانەیەتی کە هەژێنەر بوو، وە بەردەوام دڵەکانی دەهەژێنێت، وە فرمێسکە قەتیس ماوەکانی دەرژێنێت، وەرێنمایی سەرلێشێواوان دەکات بۆ گێڕانەوە بۆ لای خودا، وە کەمتەرخەمان بەئاگادێنێتەوە بۆ ناسینی ڕاستەقینەیی دونیاو حاڵی خەڵکی لەگەڵیدا ...

لە نموونەی ئەوە، ووتەکەی کە وەڵام بوو بۆ کەسێك کە پرسیاری لێ کرد دەربارەی دونیاو حاڵی دونیا:

پرسیارم لێ دەکەن دەربارەی دونیاو دواڕۆژ !! ...

بەڕاستی نموونەی دونیاو دواڕۆژ وەك نموونەی خۆرهەڵات و خۆرئاوا وایە ...

هەر کاتێك لە یەکێکیان زیاتر نزیك بوویتەوە، لەوی تریان زیاتر دووردەکەویتەوە .

وە پێم دەڵێیت وەسفی ئەم ماڵەم بۆ بکە !! ...

جا چیت بۆ وەسف بکەم لە بارەی ماڵێکەوە کە سەرەتاکەی چەرمەسەری و شەکەتی یە، وە کۆتایی یەکەی تیا چوون و نەمانە ...

وەلە پەیڕەوی حەڵاڵ و ڕەواکانی دا حساب و پاداش هەیە و لەئەنجامدانیحەرام و قەدەغە کراوەکانیدا سزا هەیە ...

هەرکەس تیایدا دەوڵەمەند ببێ پێ ی تاقی کرێتەوە، دەتوانین بڵێین تووشی بەلا دەبێت پێوەی وە هەرکەس تیایدا هەژار ببێت دڵتەنگ دەبێت ....

وە هەر لەو نموونانە هەروەها، ووتەیەکی تری بۆ کەسێك کە پرسیاری لێکرد دەربارەی حاڵی خۆی و حاڵی خەڵکی:

فەرمووی: ئەی هاوار هەی چیمانکرد بە خۆمان !! ....

بەڕاستی دینەکەمانمان لاواز کرد بەلام دونیامانمان چاك کرد ...

ڕەووشتەکانمان کۆن و کەنەفت کرد، بەلام ڕاخەرو بەرگەکانمان نوێ کردەوە..

یەکێکیان دەبینی لەسەر شانی پاڵی داوەتەوە، وەلەماڵ و سامانێك دەخوات کە هی خۆی نی یە، بەڵکو ڕەنجی خەڵکی ترە ...

خۆراکەکەی داگیرکراوە ...

وە خزمەتکردنی بە زۆرە ....

داوای شیرینی دەکات بە دوای ترشدا ...

وە گەرم بە دوای سارددا ...

وە بە تەڕوو تازە بە دوای ووشك دا ...

هەتا هەناسە بڕکێ یەخەی دەگرێ، وە لەئەنجامی تێر خواردن ئێق دەداتەوەو ئینجا دەڵێت:

ئەی ڕۆڵە فریا کەوە ....

هازیمەیەك بهێنە کە خواردن هەزم بکات ...

ئەی نەفام .. سوێند بێت بە خوا ... هیچ شتێك هەزم ناکەیت جگە لە دینەکەت..

لە کوێ یە دراوسێ ئاتاجەکەت ؟!!

لە كوێ یە بێ باوكانی برسی گەلەكەت ؟ !!.

لە كوێ یە ئەو هەژارەی كە بۆت دەڕوانێت ؟ !! .

لە كوێ یە ئەوەی لە خودای بالادەست ئامۆژگاری كردی پێ ی ؟!!

خۆزگە تۆ بتزانیایە كە تۆ ژمارەیەكی لە ڕۆژی دیاریكراو ...

هەركاتێك خۆری ڕۆژێكت لێ ئاوا دەبێت شتێك لە ژمارەكانت كەم دەبێتەوە، وە هەندێكت لەگەڵیدا دەڕوات ...

وە لە شەوی هەینی دا لەسەرەتای مانگی (ڕەجەب) دا ساڵی سەدو دە (١١٠)كۆچیدا، (حەسەنی بەصری) وەڵامی بانگی پەروەردگاری دایەوە ...

جا كە ڕۆژ بوویەوە، وە لەناو خەڵكی دا دەنگوباسی وەفاتی بڵاو بوویەوە، (بەصرە) بەوەفاتی هاتە لەرزە چۆن لەرزەیەك ...

جا شۆراو كفن كراو لە دوای نوێژی هەینی نوێژی لەسەركرا لەو مزگەوتەدا كە زۆربەی ژیانی تیادا بردەسەر، وەك: زاناو مامۆستاو بانگەوازكار بۆ لای خودا .

ئینجا هەموو خەڵكی شوێن تەرمەكەی كەوتن ...

جا نوێژی عەسری لەو ڕۆژەدا لە مزگەوتی (بەصرە) دا نەكرا ...

لەبەرئەوەی یەك كەس نەما بوو كە نوێژی تیا بكات ...

وە هەرگیز نەبووە نوێژ لە مزگەوتی (بەصرە) دا نەكرابێ لەو ڕۆژەوە كە دروست كراوە، جگە لەو ڕۆژەی كە (حەسەنی بەصری) تیایدا گەڕایەوە بۆ لای پەروەردگاری

خودایە لەگەڵ (حەسەنی بەصری) دا لەبەهەشتا كۆمان بكەوە .

* بۆ زیاتر شارەزابوون لە ژیانی (حەسەنی بەصری) بڕوانە :

١- الطبقات الكبرى لابن سعد : ٧/ ١٥٦، ١٩٧، ١٨٢، ١٨٨، ١٩٥، ١٩٧، ٢٠٠٢...

٢- سفة الصَّفوة لابن الجوزي ٢/ ٢٣٣- ٢٧٧ (طبعة صلب)

٣- حلية الآولياء للأصْفهاني ٢/ ١٣١، ...١٦١

٤- تأريخ خليفة بن خياط ١٢٣، ١٨٩، ٢٨٧، ٣٣١، ٣٥٤

٥- ونيات الآعيان لآبن خلتان ١/ ٣٥٤... ٣٥٦

٦- شذرات الذهب: ١/ ١٣٨- ١٣٩٠

٧- ميزان الاعتدال: ١/ ٢٥٤ وما بعدها

٨- آسالي المرتضى : ١/ ١٥٢، ١٥٣، ١٥٨، ١٦٠

٩- البيان و التبين: ٢/ ١٧٣، ٣/ ١٤٤٠ .



# ٨ )شورەیحی قازی

(ووترا بە (شورەیح) بەهۆی چی یەوە ئەو زانستە فێربوویت ؟ ...
ووتی : بەهۆی گفتوگۆی بەردەوام لەگەڵ زانایان دا : لێم وەردەگرتن و پێم دەبەخشین) (سوفیانی ئەوس)

خەلیفەی بڕواداران (عومەری کوڕی خەتاب) ڕەزای خودای لەسەر بێ (ئەسپێکی کڕی لە پیاوێك ی دەشتەکی، وە پارەکەی پێدا و، پاشان سواری زینەکەی بوو، لێداڕۆی و بردی ......
بەلاّم ئەو زۆر دوورنەکەوتەوە بە ئەسپەکەوە، کە شەلی یەکی لێ پەیدابوو کە بوویە هۆی ئەوەی کە نەتوانی بەباشی ڕێ بە ڕێ بکات، بۆیە (ئەمیر) ڕووی ئەسپەکەی وەرگێڕایەو بەرەو ئەو شوێنەی کە لێوەیەوە هاتبوو، وە ووتی بە پیاوەکە :
ئەسپەکەت وەربگرەوە چونکە شەلی پێوە دیارە .
پیاوەکە ووتی: ئەی (ئەمیر)ی بڕوداران من وەریناگرمەوە چونکە من کە پێم فرۆشتی ساغ وسەلیم بوو.
(عومەر) فەرمووی : بڕیار بدە لەسەر بڕیاری دادوەرێك لە نێوانمان دا .
پیاوەکە ووتی: با (شورەیحی کوڕی حاریسی کندی) بڕیاردەربێت لە نێوانمان دا .
(عومەریش) فەرمووی : ڕازیم .

* * *

(ئەمیری بڕواداران عومەری کوڕی خەتاب) و خاوەنی ئەسپەکە بڕیاردانیان بردە لای (شورەیح).

کە (شورەیح) گوێبیستی ووتەی (ئەعرابی یەکە) بوو، لای کردەوە بەلای (عومەری کوڕی خەتاب) داو ووتی :

ئایا ئەسپەکەت بە ساغی وەرگرت لێ ی ئەی (ئەمیری بڕواداران)؟

(عومەر) فەرمووی : بەڵێ .

ئەوجا (شورەیح) فەرمووی: ئەی (ئەمیری بڕواداران) ئەوەی کە کڕیووتە بی پارێزە ... یان بیگێڕەوە بۆی وەك وەرتگرتووە (عومەر) (ڕەزای خوای لێ بێت) بە سەرسوڕمانەوە ڕووانی بۆ (شورەیح) و ووتی :

ئایا دادوەری ئەگەر ئاوا نەبێ چۆن دەبێ ؟!...

ووتەیەکی ڕاست بێ پێچ و پەنا، بڕیارێکی دادپەروەرانە .

بڕۆ ئەی (شورەیح) بۆ (کووفە) دادوەری (قضاء) ئەوێم خستە ئەستۆی تۆ واتە تۆم کردە قازی (کووفە).

* * *

(شورەیحی کوڕی حاریس) لەو ڕۆژگارەدا کە عومەر کردی بە لێپرسراوی دادوەری ، وە نەبووبێ پیاوێکی شکۆ نەناسراو بووبێ لە کۆمەڵگای شارستانیدا، یان مرۆڤێکی بێ ناونیشان بووبێ لە نێو زانایان و خاوەن ڕاکان دا لە هاوڕێیانی بەڕێزو پایە بەرز وو، گەورە شوێنکەوتووان .

بە ڕاستی گەورە پیاوان لە زانایان و پێشەوایان، بۆ چوون تیژبێکان، زیرەکی ناوازە و، ڕەووشتە بەرزەکان و، تەجروبەی دوور و درێژ و ڕۆچوونی (شورەیحیان) لە ژیاندا دەنرخاند .

(شورەیح) پیاوێکی (یەمەنی) بوو واتە خەڵکی یەمەن بوو سەر بە هۆزی (کیندیی)[1] بوو، بەشێکی لەبەرچاوی لە ژیانی لە ڕۆژگارەکانی نەفامی دا (الجاهلیە) بەسەر بردووە .

---

١/ دەدرێتە پاڵ (کیندە) کە هۆزێکی عەرەبی گەورەیە، کە ژمارەیەکی زۆریان لە زانایان و فەرموو دەگێڕەرەوان لێ دەرکەوتووە .

جا کاتێك نیوە دورگەی عەرەبی خۆری ڕێنومایی لێهەڵهات، وە تیشکی (ئیسلام) سەر زەمینی (یەمەنی) گرتووە، (شورەیح) لە پێشەنگی بڕوادارەکان بوو بەخودا و پێغەمبەرەکەی، وە لە وەڵامدەرەوان بوو بۆ بانگێشتی ڕێنومایی و ڕاستی (الهدی والحق) وە ئەوانەی کە گەورەیی و ڕەووشتە بەرزەکان و، کارو ڕەفتارە نموونەیی یەکانی ئەویان دەزانی و شارەزای بوون، غەمیان بۆ دەخوارد چۆن غەمخواردنێك، وە ئاواتیان دەخواست، کە بۆی بگونجایە زووتر سەردانی شاری (مەدینە)ی بکردایە، تا بەخزمەتی(پێغەمبەری خوا) (ﷺ) بگەشتایە پێش ئەوەی کە وەفات بفەرمووێ و، بگەڕێتەوە بۆلای پەروەردگاری، تا لەسەر چاوە خاوێنە بێ گەردەکانی یەوە ڕاستەوخۆ تێراو ببوایە و وەلێ هەڵبهێنجایە .

وە بۆ ئەوەی شکۆمەند ببوایە بە شان و شکۆی هاوڕێ یەتی ئەو زاتە گەورەو بەڕێزە، پاش ئەوەی دەستلەملانی بەهرەی بڕوابوو .... وە بەوە خێری لە هەموو لایەکەوە کۆبکردایەتەوە ....

بەڵام ئەبێ ئەوە بزانین تەنها ئەوە دەبێت کە لەلایەن خوداوە بڕیار دراوە ......

*　　*　　*

(فاروق) ڕەزاو ڕەحمەتی خودای لەسەر بێ، بە پەلە نەبووە لەو کاتەدا کە پایەیەك لە پایە گەورەکانی دادوەری خستۆتە ئەستۆی پیاوێك کە شوێنکەوتووان (التابعین) لەگەڵ ئەوەدا کە ئاسمانی ئیسلام لەو ڕۆژگارەدا بەردەوام دەدرەوشایەوە بە ئەستێرە درەوشاوەکان لە هاوڕێیانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ...

جا بەڕاستی ئەوە بوو ڕۆژگار ڕاستی بۆ چوون و تەکبیری (عومەر) ی سەلماند.

(شورەیح) نزیکەی (شەست ساڵی بەردەوام مایەوە، کە دادوەری دەکرد لەنێوان موسڵمانان دا، بەبێ دابڕان ..........

وەهەریەکە لە(عومەر) و(عوسمان)ە، (عەلی) و(موعاویە) ڕەزاو ڕەحمەتی خودایان لەسەربێ، بەدوایەکدا بڕیاردەربوون لەسەر مانەوەی (شورەیح) لەپایەکەیدا .........

هەروەها هەرکەس لەدوای (موعاویە) هاتبێ لەخەلیفەکانی بەنی(ئوممەیە) بڕیاردەربووە لەسەرمانەوەی (شورەیح) لەپایەکەیدا ........

هەتا گەشتە ئەوەی کەپیاوێك داوای کردلە (حەججاج) لەکاتی ویلایەتیدا کە لەپایەکەی لای بەرێ .

(شورەیح) گەیشتە ساڵی حەوتەم لە دووای سەد لەتەمەنە دووورودرێژە بە بەرەكەتەكەی كەڕازاوەو پڕبوو لەشانازی یەكان و كردارە جوانەكان و شوێنەوارە كاریگەرو بەرزەكانی........

جابەڕاستی مێژووی دادوەری لەئیسلام دا ڕازاوەو جوان بوو بوو بە ئاوازەكان لە هەڵوێستەكانی (شورەیح)، وەڕازاندیەوە بەنموونەی جوان لە شوێن كەوتن و پەیرەوكردنی تایبەتمەندان و گشت گەلی موسڵمانان ئەو شەرعەی خودایەی كە (شورەیح) ڕای گەیاند، وەملكەچیان لەكاتی ڕاگەیاندنی بڕیارەكانیدا .............

جالاپەڕەی پەڕاوەكانی پڕبوو لەجوانی یەكانی ئەو پیاوە ناوازە، دەنگوباسەكانی، وەگوفتارەكانی و كردارەكانی .........

لەنموونەی ئەوە (عەلی كوڕی ئەبی تالب) ڕەزای خودای لەسەربێ، (زنجیرێكی) (درع) لێ گوم بوو كەزۆری لاخۆشەویست و بەنرخ بوو ......

لەپاش ئەوە لێ ی گوم بوو، زۆری پێ نەچوو، بینیەوە بەدەستی پیاوێكەوە لە (زیمی یەكان)[1] (أهلِ الذمَّة)، ئەیفرۆشتِ لەبازاڕی (كوفە) دا ........

جاكە (عەلی) (ڕەزای خوای لێ بێت) بینی ناسی یەوەو ووتی:

ئەوە (زنجیری) منە، لەحوشترەكەم كەوتۆتە خوارەوە لەفلاَن شوێندا ..... وەلە فلاَن شەودا .

جا پیاوە(زمی یەكە) گوتی: نەخێر بەڵكو ئەوە زنجیری منەو لەدەستی خۆمدایە .

ئەی (ئەمیری بڕواداران) .........

ئەوجا(عەلی) (ڕەزای خوای لێ بێت) ووتی: دڵنیابە ئەوە زنجیری منە، بەكەسم نەفرۆشتووە، وەبەكەسیشم نەبەخشیووە، هەتا گەشتبێتە دەستی تۆ ..

جا(زمی یەكە) ووتی: بابڕیاردەری نێوانی من وتۆ دادوەری موسڵمانان بێت .

ئەوسا(عەلی) ش فەرمووی: ویژدانت بەكارهێنا، ڕازیم فەرموو بۆلای .......

پاشان هەردووكیان ڕۆشتن بۆلای (شورەیحی) دادوەر (القاضی)، جاكاتێك چوونە خزمەتی لەكۆڕی دادوەریدا، واتە ئامادەبوون لەخزمەتیا، (شورەیح) فەرمووی بە (عەلی)(ڕەزای خوای لێ بێ)

---

[1] / زمی یەكان ئەوانە بوون لە گاورو جوولەكە كەلە ژێرسایەی دەوڵەتی ئیسلامیدا دەژیان وەسەرانەیان دەدا .

تۆچی دەڵێیت ئەی (ئەمیری بڕواداران) ؟ .

(عەلی) فەرمووی: بەڕاستی من ئەو زنجیرەی خۆم دیووەتەوە لای ئەوپیاوە، کەلێم کەوتووە لەفلاَن شەودا، وەلە فلاَن شوێن دا، وەئەوە دەست ئەونەکەوتووە لەڕێگەی فرۆشتنەوە وەنەلەڕێگەی بەخشینەوە.

ئەوجا(شورەیج) فەرمووی بە (زمی یەکە): ئەی تۆچی دەڵێیت ؟

ئەویش ووتی: زنجیرەکە زنجیری منەو، لەدەستی خۆمدایە ..........

ومن (ئەمیری بڕواداران) تۆمەتبارناکەم بەدرۆ .........

جا(شورەیح) لای کردەوە بەلای (عەلی) داو فەرمووی :

من گومانم لەوەدانی یە کەتۆ ڕاست دەڵێیت لەوەدا کەدەیڵێیت ئەی (ئەمیری بڕواداران)، وەزنجیری تۆیە، بەلاَم تۆپێویستت بەدوو گەواهیدەر هەیە کەگەواهی بدەن لەسەر دروستی ئەوەی داوای دەکەیت .

جا(عەلی) فەرمووی: بەڵێ ...

بەندەکەم (قەنبەر) وکوڕەکەم (حەسەن) گەواهیم بۆ دەدەن .......

(شورەیح) فەرمووی: ئەی (ئەمیری بڕواداران) گەواهی کوڕ بۆباوك ڕوخسەتی پێ نادرێ، واتە وەرناگیرێ .

ئەوسا (عەلی) فەرمووی: ئەی (سُبحانَ الله) .........

پیاوێك لەئەهلی بەهەشت گەواهی وەرناگیرێت !! ..... ئایا نەت بیستووە کە پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرموویەتی: (حەسەن وحوسەین گەورەی لاوەکانی ئەهلی بەهەشتن) .

(شورەیح) فەرمووی: بەری وەڵلاَ ئەی (ئەمیری بڕواداران) ..........

لەگەڵ ئەوەشدا من ڕووخسەت نادەم بەگەواهی کوڕبۆباوکی .

ئالەوێدا (عەلی) (ڕەزای خوای لێ بێت) لایکردەوە بەلای (زمی یەکە)داو گوتی: بیگرەو بیبە، من جگە لەو دووانە گەواهی دەرم نی یە .........

جا(زمی یەکە) گوتی:

بەلاَم من بەڕاستی گەواهی دەدەم کەزنجیرەکە هی تۆیە ئەی (ئەمیری بڕواداران)...

پاشان لەوە زیاتر گوتی: یائەڵلاَ .......

(ئەمیری بڕواداران) دادگاییم دەکات لەبەردەم دادوەرەکەیدا!! ...... کەچی دادوەرەکەی بڕیار بۆمن دەدات بەسەر ئەودا !! .....گەواهی دەدەم کە ئەو دینە

فەرمان بەوە دەدات حەققە (ڕاستە) وە گەواهی دەدەم: (کەهیچ خودایەك نی یە جگە لە ئەڵلاّ، وەموحەممەد بەندەو ڕەوانەکراوی ئەوە) .....

جابزانەو دڵنیابە ئەی جەنابی (دادوەر) کە زنجیرەکە زنجیری (ئەمیری بڕواداران) ە، وەمن شوێنی سوپاکە کەوتبووم، کە دەچوو بۆ (سیفیین) [1] ، کە (زنجیرەکە) کەوتە خوارەوە لە حوشترە خۆڵە مێشی یەکەی و منیش هەڵمگرت.

جا(عەلی) پیێ ی ووت :

مادام تۆ بەڕاستی دانت پیانا ئەوا من بەخشیم بە تۆ ....

وە لەگەڵیشیدا هەروەها ئەم ئەسپەشم پیێ بەخشیت .

جا کاتێکی دوورو درێژ تیێ نەپەڕی بەسەر ئەم ڕووداوەدا، هەتا کابرا بینرا کە جەنگی (خەواریجی) [2] دەکرد لە ژێر ئالأی (عەلی) دا لە ڕۆژی ڕووبە ڕووبوونەوەی (نەهرەوان) [3] دا، وە لە کوشتاردا دڵسۆزانە بەردەوام بوو تا شەهیدی بۆ تۆمارکرا.

* * *

وە لە ڕووداوە ناوازەو نموونەیی یەکانی (شورەیح) هەروەها، ڕۆژێکیان کوڕەکەی پیێ ی ووت :

ئەی بابە گیان بەڕاستی لە نێوانی من و کۆمەڵێکدا نەیاری یەك ڕوویداوە، جا سەرنجی تیا بدە ... ئەگەر ماڤ منە ئەوا داواکە ڕووبەڕووی دادگایی دەکەمەوە، خۆ ئەگەر مافی ئەوانە ئەوا سوڵحیان لەگەڵ دەکەم...

ئینجا ڕووداوەکەی بۆ گێڕایەوە ...

(شورەیح) پیێ ی ووت: بڕۆ ڕووبەڕووی دادگایان بکەوە ...

کوڕە ڕۆیشت بۆ لای نەیارەکانی وە بانگهێشتی کردن بۆ دادگایی، ئەوانیش بەدەم داواکەیەوە هاتن .

وەکاتێك لە نێوان دوو دەست (شورەیح) دا ڕاوەستان، (شورەیح) بڕیاری بۆ دان بەسەر کوڕەکەیدا... شەرمەندەت کردم بابە ...

سوێند بە خوا ئەگەر ڕاوێژم پیێ نەکردیتایە ڕەخنەم لیێ نەدەگرتی.

---

[1] (صفین) شوێنێکە نزیکی (ریققە) لەسوریا کە ڕووداوی گەورەی نێوان (عەلی) و(موعاویەی) تیادا ڕوودا . ڕەزای خودایان لەسەربیێ .

[2] – (الخوارج) شوێن کەوتووی (عەلی) بوون بە هۆی جیاوازی ڕاوە لە فەرمانی دەرچوو بوون .

[3] – (نەهرەوان) ئەو ڕووبەڕوو بوونەوە بوو کە ڕووی دا لە نێوان (عەلی) و خوواریجدا .



(شورەیح) ووتی:

ئەی کوڕی من: سوێند بەخوا تۆ لە هەموو ئەوەی کەسەر زەمینی پڕ کردووە خۆشەویستتری، بەلاّم خودای بالاّدەست خۆشەویستترە لەلای من لە تۆ ...

بەڕاستی لەوە ترسام ئەگەر ئاگادارت بکەم کە مافی ئەوانە ، ئاشتەوایی و سوڵحیان لەگەڵ بکەیت و، لەوەدا هەندێك لەمافەکانیان لە دەست بچێت، بۆیە ئەوەم پێ ووتیت کە ووتم ...

*　　　　　　*　　　　　　*

کوڕێکی (شورەیح) بوویە کە فیلی پیاوێك، لەلای باوکی، (شوەیحیش) کە فالەتەکەی پەسەند کرد، ئەوەندەی پێ نەچوە کە پیاوەکە لە دەست دادگا هەڵهات .

جا (شورەیح) کوڕەکەی بەند کرد لە جیاتی پیاوە هەڵهاتووەکە ...

وەبە دەستی خۆی هەموو ڕۆژێك خواردنی بۆ دەبرد بۆ بەندینخانە .

وەهەندێك جار کۆمەڵە گومانێك بیرو هۆشی (شورەیحی) داگیر دەکرد لەبارەی هەندێك لە گەواهی دەرەکانەوە .. لەگەڵ ئەوەدا کە ئەو هیچ ڕێگایەکی شك نەدەبرد بۆ وەلانانی گەواهی یەکانیان، لەبەربوونی مەرجەکانی دادپەروەری لەگەواهیە کانیان دا

بۆیە پێش ئەوەی گەواهی یەکانیان بدەن پێ ی دەووتن :

گوێ بیستی بن خودا ڕێنماییتان بکات .

بێ گومان ئەوەی کە بڕیار دەدات لەسەر ئەو پیاوە ئێوەن ....

بەدڵنیاییەوە من بە هۆی ئێوەوە خۆم لە ئاگر دەپارێزم، وە ئێوەش بە خۆپاراستن لێ ی لە پێش منەوەن ....

وە ئێستا لە تواناتانایە کە گەواهی یەکتان وازلێ بهێنن و بڕۆن جا کە سوور بوون لەسەر گەواهی دان، (شورەیح) لایکردەوە بەلای ئەو کەسەوە کە گەواهی یان بۆ دەدا وە ووتی:

بزانە ئەی کابرا من بڕیار دەدەم بۆ تۆ بە گەواهی ئەوان ...وە بەبێ گومان من وا دەبینم کە تۆ ستەمکاری ....بەلاّم من بێ گومان بڕیار نادەم ، بەڵکو بڕیار دەدەم بە گەواهی گەواهی دەران..وەدڵنیابە بڕیاری من هیچ شتێك بۆ تۆ حەلاڵ ناکات، کە خودا لەسەرتی حەرام کردبێت .

*　　　　　　*　　　　　　*



ئەو دروشمەی کە (شورەیح) هەمیشە دووپاتی دەکردەوە لە کۆڕەکانی دادگایی کردنیدا ئەم ووتەیەی بوو:

سبەینێ ستەمکار دەزانێت کێ یە زەرەرۆمەند ؟.

بەبێ گومان ستەمکار چاوەڕێ ی سزا دەکات ...

وە بەدڵنیای یەوە ستەملێکراویش چاوەڕێ ی دادپەروەری دەکات ...

وە منیش بەڕاستی سوێند دەخۆم بە خودا، هیچ کەسێك نی یە واز لەشتێك بهێنێ لەبەر خودای بالآدەست، پاشان دوای ئەوە هەست بەلەدەستدانی بکات ..

*　　　*　　　*

وە نەبووبێ (شورەیح) ئامۆژگاریکار بووبێ بۆ گوێڕایەڵی خودا و بەندایەتی کردنی و شوێن پێ هەڵگرتنی پێغەمبەرەکەی و، پەیڕەوی کردنی قورئانەکەی، بەڵکو ئەو هەروەها ئامۆژگار بووە بۆ موسڵمانانە ئاساییەکان و تایبەتمەندانیان.

یەکێکیان گێڕایەوە ووتی:

(شورەیح) گوێی لێم بوو کە لەلای یەکێك لە هاوڕێکانم من سکالآی هەندێك لەو شتانەم دەکرد کە غەمباریان کردبووم، جا دەستی گرتم و بردمی یە لاوەو ووتی:

ئەی برازای خۆم ... دەستم بەدامانت، ئامان سکالآ جگە لەلای خودا لای کەسی دی مەکە .

چونکە ئەو کەسەی کە تۆ سکالآی لا دەکەیت لەم دووانە بەدەر نی یە، یان دۆستە یان نەیار ....

جا ئەگەر دۆست بێت ئەوە دڵمەندی دەکەیت ...

خۆ ئەگەر نەیاریش بێتَ پێی دڵخۆش دەبێت و زیاتر غەمبارت دەکات پێی ...

پاشان ووتی:

بڕوانە بۆ ئەو چاوەم – جا ئامارژەی کرد بۆ یەکێك لە چاوەکانی .

وە ووتی سوێند بە خوا ماوەی پانزە ساڵە نە مرۆڤێك و نە ڕێگایەکم پێ نەبینیوە......

وە کەسیشم هەتا ئەم چرکە ساتە جگە لە تۆ لێ ئاگادار نەکردووە ......



ئەی فەرموودەی بەندە چاکەکەت [1](یەعقوب) نەبیستووە: إِنَّمَآ أَشۡكُواْ بَثِّي وَحُزۡنِيٓ إِلَى ٱللَّهِ ....... واتە : بەڕاستیسکالای گەورەترین غەم و ناڕەحەتترین پەژارەم تەنها ئاراستەی خودای بالادەست دەکەم.

جا تۆش خودای بالا دەست بکە جێگەی سکالات، واتە تووشی هەر تووشهات و غەمێك بوویت، تەنها سکالات ئاراستەی ئەو بکە .....

چونکە بە ڕاستی ئەو بەخشندەترین لێپرسراو و، نزیکترین وەلام دەرە ........

*　　　*　　　*

(ڕەشە ڕشانەوە) (الطاعون) لە (کوفە) ڕووی دا و بلاوبوویەوە، جا هاوڕێیەکی (شورەیح)، (کوفەی) بەجێ هێشت و ڕوویکردە (نەجەف) بە مەبەستی خۆپەنادان لەو پەتایە، جا (شورەیح) نامەیەکی بۆ نووسی :

لەپاش پێشەکی ........ دڵنیا بە ئەو شوێنەی کە تۆ وازتلێهێناوەو بەجێت هێشتووە مەرگت نزیك ناکاتەوە، ڕۆژانت لێ زەوت ناکات ......

وە بێ گومان ئەو جێگایەش کە بۆی چووی لە دەستی یەکێکدایە داوای وەلا نانرێت ، وە راکردوو لەدەستی دەرناچێ ........

وە بە دڵنیاییەوە منیش و تۆش لەسەر بەڕەی یەك پادشاین ......

وە بێ گومان (نەجەف)یش لە خاوەن دەسەلات و تواناوە نزیکە ......

وە (شورەیح) لەگەڵ هەموو ئەوانەدا شاعیرێکی کراوەو، ڕاوێژشیرین و بابەت جوان ناوازە بوو .

لێ ی دەگێڕنەوە کە منداڵێکی هەبووە، تەمەنی نزیکەی دە ساڵان بوو ، وە منداڵەکە حەزی لە گاڵتەوگەمەبووە .

جا ڕۆژێکیان دیارنەما، کاتێك زانرا حوجرەکەی بەجێ هێشتبو، وە ڕۆشتبوو بۆ سەیری شەڕەسەگ .

جا کاتێك گەڕایەوە بۆ ماڵەوە، (شورەیح) پرسیاری لێکرد: ئایا نوێژت کردووە؟

ووتی : نەخێر .

---

[1]/ بەندە چاکەکە : (یەعقوب) ی باوکی (یوسف)ە سەلامی خودایان لێ بێت .



جا داوای لاپەڕەیەك كاغەز و پێنووسی كرد، وە نوسی بۆ پەروەردەكارەكەی ئەیووت :

| | |
|---|---|
| تَرَكَ الصَّلاةَ لأَكْلُبٍ يُسْعى لَها | يَبْغي الهِراشَ مَعَ الغُواةِ الرُّجَّسِ |
| فلْيَأْتِيَنَّكَ غُدْوَةً بِصَحيفَةٍ | كُتِبَتْ لَهُ كَصَحيفَةِ المُتَلمِّسِ |
| فَأذا أتاكَ فَداوِهِ بِمَلامَةٍ | اوْ عِظْهُ مَوْعِظَةَ الأديبِ الكَيِّسِ |
| وَ إذا هَمَمْتَ بِضَرْبِهِ فيدِرَّةٍ | وَ إذا بَلَغْتَ ثَلاثَةً لَكَ فاحْبِسِ |
| وَ اُعْلَمْ بأَنَّكَ ماأتَيْتَ فَنَفْسُهُ | مَعَ مَا يَجَرَّعُني – أعَزُّ الأنْفُسَ |

خودا لە (فاروق) رازی بێت، بەڕاستی رازاندی یەوە رووی دیاری دادوەری لە ئیسلام دا بە پیرۆزی ڕەسەن .....

ناخێکی بیٚ گەرد ........

رووالەتێکی جوان و درەوشاوە ......

وە بەخشی یە موسلمانان چرایەکی رووناك، کە هەتا ئەمڕۆکەش بەردەوام بە تیشکی زانستە شەرعی یەکانی ئەو ریٚ بەریٚ دەکەن بۆ زانینی شەرعی خودا...

وە بە ڕووناکی تیٚ گەیشتنی ئەو شوێن ئاکار و ڕەفتارە (سُنَّە)کانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەکەون.

وە بەوەوە خۆیان دەنووێنن بەسەر ئوممەتەکانی تردا لە ڕۆژی ڕەست خێزدا .

بەر بەزەیی فراوانی خودا بکەویٚ (شورەیحی) دادوەر ...

بەڕاستی دادوەری چەسپاند و راوەستاوی کرد لە نێوانی خەڵکی دا ماوەی شەست سالٚ .

جا نەلەکەس ترسا .

وە نە لەڕاستی (الحق)لای دا .

وە نەجیاوازی کرد لە نێوان پادشایەك و بازاریەك دا .



بۆ زیاتر شارەزابوون لە ژیاننامەو دەنگوباسی (شورەیح) سەیری ئەمانە بکە:

١- الطبقات الكبرى لإبن سعد : ١١/٦، ٣٤، ٩٤، ١٠٨، ١٠٩، ١٧٠، ٢٠٦، ٢٦٨ و ٧/١٩٤،١٥١، ٤٥٣ ،و ٨/ ٤٩٤ .

٢- صِفة الصَّفوة لآبن الجوزى : ٣/ ٣٨ (طبعة حلبا).

٣- حُلية الأَولياء للآبن صٰفهانى: ٤/ ٢٥٦ - ٢٥٨ .

٤- تأريخ الطبري لآبن جرير طبري : الآجزاء الرابع والخامس و السادس.

٥- تأريخ خليفة بن خياط : ١٢٩، ١٥٨، ١٨٤، ٢١٧، ٢٥١، ٢٦٦، ٢٩٨، ٣٠٤.

٦-شذرات الذهب : ١/ ٨٥ - ٨٦.

٧-فوات الوفيات : ٢/ ١٦٧ - ١٦٩ .

٨- كتاب الوفيات لاحمدبن حسن بن علي بن الخطيب : ٨٠ -٨١ .

٩-المجرً لمحمد بن حبيب : ٣٠٥، ٣٨٧ .

١٠- دائرة المعارف لِفريد وَجْدى : ٥/ ٢٧٣، ٤٧٣ .

# ٩) موحەممەدی کوڕی سیرین

**پیاوێکم نەبینیوە زاناترو شارەزاتر بووبێت لە خۆپارێزییدا ، وە خۆپارێزتر بووبێت لە زانستی دا لە (موحەممەدی کوڕی سیرین)**

**(موریقی عیجلی)**

(سیرین) بڕیاری دا لەسەر ئەوەی کە بەشەکەی تری دینەکەی تەواو بکات واتە ژن بهێنێت، پاش ئەوەی کە (ئەنەسی کوڕی مالیك)[1] (ڕەزای خودای لەسەر بێت) گەردنی ئازادکرد ، سەربەستی کرد، وە هەروەها بە پشتی پیشکەی کە قازانجێکی زۆر و خێر و بەرەکەتێکی زۆری بەسەریدا دەڕشت ...

چونکە ئەو مزگەرێکی دەستڕەنگین و پوختەکار بوو لە پیشەسازی مەنجەڵ دا.

جا دڵی چووە سەر ئافرەتێك کە ناوی (سەفییە) (صفیّە) بوو، کە بەندەی ئەمیری بڕواداران (ئەبوبەکری صدیق) بوو، بۆ ئەوەی بیکاتە هاوسەری .

(صەفییە) ئافرەتێکی بەندە بوو لە سەرەتای لاوێتیدا، دەم و چاو درەوشاوە، دڵ وریا، پیرۆز سیما، ڕەوشت بەرز، خۆشەویست لە دڵی هەر ئافرەتێکی شاری (مەدینە) دا کە ناسی بێتی و شارەزای بووبێ .

جیاوازی لەوەدا نەبوو لە نێوانی ئەو گەورە کچانەی کە بەهۆی گەورە کچی یەوە وابەست بوون لە گەڵیداو، ئەو ئافرەتە بە تەمانانەی کە وەك نموونەیەك لە بەندەی

---

١/ بڕوانە کتێبی (صوره حیاه الصحابه) للمؤلف .

ژیر ی و ڕەوشت دامەزراویدا دەیان بینی و سەیریان دەکرد .وە خێزانە بەڕێزەکانی پێغەمبەر(ﷺ) دایکانی موسڵمانان لە هەموو ئافرەتانی دی کە زیاتر (صەفییە)یان خۆشدەوویست، بە تایبەتی (عائیشە) (ڕەزای خودای لەسەر بیٚ) .

*　　　　*　　　　*

جا (سیرین) چووە خزمەتی (ئەمیری بڕواداران) و داوای (صەفییە) بەندەی لێکرد .

ئەوجا (ئەبوبەکری صدیق) (ڕەزاو رەحمەتی خودای لەسەر بێت) دەستیکرد بە پرسیارکردن دەربارەی ئاستی دینداری و ڕەوشتی داواخواز، هەروەك چۆن باوكێكی بەبەزەیی و سۆز پرسیار دەكات دەربارەی حاڵی داواخوازی كیژەكەی..

وە ئەوەی کە شایانی باسە کە بیڵێین ئەوەیە کە (سەفییە) لە ناخی (أبوبكر)دا لە ئاستی پلەوپایەی جگەر گۆشەدا بووە لەناخی باوكیدا ... پاشان ئەو لەسەر هەموو ئەوەشەوە سپاردەیەكی بوو كە خودا خستبوویە گەردنی ئەوەوە .

جا بۆیە ڕۆشت بە دوای پشكنین و بەدواداچوونی (سیرین)دا تا ئەوپەڕی بەدوواداچوون و پرسیاركردن دەربارەی،وە شوێن ژیاننامە و هەڵس و كەوتی كەوت، بە ووردترین شوین کەوتن .

وە لە پێشەنگی ئەوانەی كە پرسیاری لێكردن دەربارەی، (ئەنەسی كوڕی مالیك) بوو (ڕەزاو ڕەحمەتی خودای لەسەر بیٚ) .

جا (ئەنەس) فەرمووی پیٚ ی :

ئەی (ئەمیری بڕواداران) مارەیكە لیٚ ی، وە هیچ لێی مەترسە، من كە ناسیومە مرۆڤێكی دین دروست بووە، وە ڕەوشتی جێگەی ڕەزامەندی خەڵكی بووە، وە پیاوێكی پیاوانە ماقوڵی تەواو بووە .

وە بەڕاستی دەستی وا بە دەستمەوە لەو كاتەوە كە (خالیدی كوڕی وەلید) لە جەنگی (عَيْنِ التمر)[1]

لەگەڵ چل كوڕی تردا دەستگیری كردن و، هێنانی بۆ شاری (مەدینە).

جا (سیرین) بەر من كەوت، وە من بەو بەختیار بووم .......

*　　　　*　　　　*

---

١/ شارێكە لە ڕۆژئاوای (كوفە) كە (خالیدی كوڕی وەلید) لە حیلافەتی (اسدایق) دا گرتی .

(صدیق) (ڕەزا و ڕەحمەتی خودای لەسەر بێت) بڕیاری دا لەسەر مارەکردنی (صەفییە) لە (سیرین) .

وە بڕیاری دا بەرێ ی بکات هەر وەك چۆن باوکێکی بەسۆز کچە خۆشەویستەکەی بەرێ دەکات، جا بۆ گواستنەوەی ئاهەنگێکی بۆ گێڕا نموونەی کەم بوو لەناو ئاهەنگی کچانی مەدینەدا ....

وە لە ئاهەنگە هاوسەرگەری یەتی یەکەیدا کۆمەڵێکی زۆر لە هاوڕێیانی بەڕێز و پایە بەرز ئامادەبوون .

کە لە ناویاندا هەژدە جەنگاوەری (بەدر) هەبوون .......

وە نووسەری نیگای پێغەمبەری خوا (ﷺ) (ئوبەی کوڕی کەعب) نزای بۆ کرد، وە ئامادەبووان ئامینیان دەکرد بۆ گیرابوونی نزاکە بۆی ......

وە سیان لە دایکانی بڕواداران (ڕەزاو ڕەحمەتی خودایان لەسەر بێت) ڕازاندیانەوە و بۆنخۆشیان کرد کاتێك کەناردیانە ژووری هاوسەرگەرێیەتی بۆلای هاوسەرەکەی

وە لەبەرهەمی هاوسەرگەریەتی یە پیرۆزەکەیان، ئەوە بوو کە خودا کوڕێکی پێ بەخشین کە لەدوای بیست ساڵ بووبە ئاڵایەك لە ئاڵاکانی شوێنکەوتووان، وە بوویە پیاوێك لە ناوازەکانی موسڵمانان (موحەمەدی کوڕی سیرین) بوو .

جا بفەرموون با دەست بەکاربین لەگەڵ چیرۆکی ژیاننامەی ئەو شوێنکەوتووە پایەبەرزەدا لەسەرەتایەوە . ....

* * *

جێ نشینی یەتی ئەمیری بڕواداران (عوسمانی کوڕی عەففان) (ڕەزای خوای لەسەر بێت) دوو ساڵی مابوو کە (موحەمەدی کوڕی سیرین) لەدایك بوو .

وە پەروەردەکرا لە ماڵێکدا کە لە هەموو سوچێکی یەوە خۆپارێزی و خوداپەرستی وەك بۆنی (میسك) بۆنی پەخش دەبوویەوە .

جا کاتێك لاوی ژیری بەسەلیقە گەشەی کردو نزیك پێ گەیشتن (بلوغ) بوویەوە، مزگەوتی پێغەمبەری خودای (ﷺ) دیەوە، کەپڕ بوو لەوەی کە مابوو بوە وە لە

هاوڕێیانی پایەبەرز و بەڕێز و، گەورە شوێنکەوتووان لە نموونەی
( زەیدی کوڕی سابت) و(ئەنەسی کوڕی مالیك) و(عومرانی کوڕی حوصەین) وە (عەبدوالله ی کوڕی عومەر) و (عەبدوالله ی کوڕی عەبباس) و (عەبدوالله ی کوڕی زوبەیر) و (ئەبی هورەیرە).

جا هاتە خزمەتیان و ئامادەبوو، وەك ئامادەبوونی کەسێکی تینوو لەسەر چاوەیەکی سازگار ......

وە هەڵی هێنجا و فێربوو وە لەو زانست و زانیاری یە کە هەیان بوو لە قورئان دا، وە لەو زانستەی کە هەیان بوو لە دینی خودادا، وە لەو فەرموودانەی کە گێڕابوویانەوەو شارەزای بوون، ئەوەندە فێربوو کە ژیری (عقل) خۆی پێ پڕکرد لە دانایی و زانست، وە گەشەی پێ دا بە ناخی چاکە و بەدیکردنی ڕێگای ڕەوان ئینجا دوای ئەوە لەگەڵ خانەوادەکەیدا (أُسرتە) هات بۆ (بەصرە) وە لەگەڵ خانەوادەکەیدا لەوێ نیشتەجێ بوون .......

*   *   *

(بەصرە) لەو ڕۆژگارەدا شارێکی تازە پێ گەیشتوو بوو ..........

کە موسڵمانان نەخشەکێشیان بۆ کردبوو لە کۆتایی یەکانی جێ نشینی یەتی (عومەری کوڕی خەتابدا) ڕەزاو ڕەحمەتی خودای لەسەر بێت .

وە (بەصرە) نموونە و نواندەری زۆربەی تایبەتمەندی یەکانی ئوممەتی ئیسلامی بوو لەوچاخەدا ....وە بنکەیەکی سەربازی بوو بۆ سوپاکانی موسڵمانان کە دەجەنگان لەڕێگای خوادا ....

وە مەڵبەندێك بوو لە مەڵبەندەکانی فێرکردن و، ڕێنمایی کردنی ئەوانەی کە تازە هاتبوونە ناو ئاینی پیرۆزی ئیسلامە وە لە خەڵکی (عیراق) و (فارس)....

وە (بەصرە) وێنەیەك بوو بۆ پیشاندانی ئەو کۆمەڵگا ئیسلامی یە ی کە تێ دەکۆشاوکاری دەکرد بۆ دونیای وەك ئەوەی هەمیشە دەژی، وەکاری دەکرد بۆ دواڕۆژی (قیامەت) وەك ئەوەی بەیانی دەمرێت..

*   *   *



(موحەممەدی کوڕی سیرین) لەژیانی تازەیدا لە (بەصرە) دووڕێگای شان بەشانی یەك گرتبووە بەر لە ڕۆژدا :

بەشێك لەڕۆژی تەرخان کردبوو بۆزانست و خوداپەرستی .... وەبەشەکەی تری بۆبازرگانی وکاسبی کردن .

جاکەبەرەبەیان هەڵدەهات و دونیا ڕووناك دەبوو بەڕووناکی پەروەردگاری، دەچوو بۆمزگەوتی(بەصرە) خەڵکانی فێردەکردو خۆشی خەریکی فێربوون دەبوو. هەتا ئەوکاتەی خۆر بەتەواوی بەرزدەبوویەوە، ئەوجا مزگەوتی بەجێ دەهێشت و دەڕۆشت بۆبازاڕوو کڕین و فرۆشتنی دەکرد ......

جاکاتێك شەودادەهات و، بەتاریکایی یەکەی بوونەوەری دادەپۆشی دەچووە میحرابیماڵەکەی و، وەدەچەمیەوە بەسەر بەشەکانی قورئان دا .

بەهەموو گیانی یەوە، وەدەگریا بەهەڵڕشتنی فرمێسکی چاوەکانی و زیزە زیزی دڵەکەی لەترسی خودای میهرەبان .

هەتا دەگەشتە ئاستێك کەخاوخێزانی و ئەو دراوسێ یانە کە لێ ی نزیك بوون بە زەییان پێدا دەهاتەوە، کاتێ کە گوێبیستی کڵپەی گریان و هاواری دەبوون ....... کەبەنی دڵان دەپچڕاند .

وە ئەوکاتێك کەلە ڕۆژدا بەبازاڕدا دەگەڕا بۆ کڕین و فرۆشتن، کەمتەرخەمی نەدەکرد لەوەی کەخەڵکی بەئاگابهێنێتەوەو ئامۆژگاریان بکات دەربارەی کارکردن بۆ دووا ڕۆژ ...... وەبەرچاوڕوونیان بکاتەوە بەرامبەر بە دونیای و جوانی و لەزەتەکانی ......... وەڕێنوومایی کردنیان بۆنزیك بوون لە خودای باڵادەست .......

وەهەروەها ئاشتەوایی دەخستە نێوان ئەوانەی کەلەبازاڕدا ناکۆکی دەکەوتە نێوانیان .

وەبیناوبەین قسەیەکی خۆشی وای بۆدەکردن کەئەو شەکەتی و غەم وپەژارەیەی کەناخی داگرتبوون بسڕێتەوەو لەبیریان بباتەوە، بەبێ ئەوەی کە ئەوسوعبەت و قسەخۆشانە لەڕێزی کەمبکاتەوە لەلایان .



بەڕاستی خودای بالادەست عیززەت و سیمایەکی پڕخێرو ڕێنماکاری پێ بەخشیبوو، کەپەسەندەو کاریگەربوو ..........جاکەخەڵکی کاتێك کەئەویان لەبازاڕدا بینی وەخۆیان ڕۆچووبوون .

لەکاروباری بازاڕدا و بێ ئاگابوون – بەبینینی ئەو بەئاگادەهاتنەوە، جایادی خودایان دەکردەوەو،(لاإلهَ إلاَّ الله، اللهُ أَكْبَر) یان دەکرد ......

وەهەڵسوکەوتی ڕۆژانەی باشترین ڕێنمایی کاری بوو بۆخەڵکی ........هەرکاتێك لەبازرگانی یەکەیدا دوو موعامەلەی تووشببوایە، ئەوەیانی دەکرد لە دینی دا جێگەی دڵنیایی بوو .......ئەگەر لەوەشدا تووشی زەرەرێکی دونیایی ببوایە ......

وە ووردبینی و تێ گەیشتنی بۆنهێنی یەکانی ئایین، وەدروستی بۆچوونی بۆئەوەی کەڕەوادەبێت وە ئەوەی کەڕەوانابێت، هەندێك جار تووشی هەندێك هەڵوێستی وای دەکرد کەبەنامۆیی دەکەوتە بەرچاوی خەڵك .........

لەنموونەی ئەوە، پیاوێك داوای لەسەر تۆمارکرد (بەدرۆ) کەگوایە دوو درهەمی لایەتی ......... ئەویش ملی نەدا کە دوو درهەمەکەی بداتێ .

جاپیاوەکە پێ ی ووت: ئایا سوێند دەخۆی کەلات نی یە ؟ ....

وە ئەو گومانی وا دەبرد کە (موحەممەد) لەبەرخاتری دوو درهەم سوێند ناخوات .

ئەوجا(موحەممەد) گوتی: بەڵێ، وەسوێندی بۆخوارد .

جاخەڵکی پێیان ووت: ئەی (ئەبابەکر) ئایا سوێند دەخۆی لەبەرخاتری دوو درهەم؟! ..... لەکاتێك دا تۆ ئەوکەسەی (دوێنێ) وازت لە چل هەزار درهەم هێنا لەشتێکدا کە گومانت تێیدا بوو، کەجگە لەتۆ کەسێکی دی گومانی لەوەدا نەبوو ......ووتی: بەڵێ سوێند دەخۆم .

چونکە بەڕاستی من نامەوێ حەرامی دەرخوارد بدەم، وەمن باش دەزانم کە ئەوە حەرامە .

*                    *                    *



وەکوڕی (ئیبن و سیرین)، کوڕی خێرو چاکەو ئامۆژگاری بوو...... جائەگەر کەسێك لەلای بەخراپە بدوایە، خێرا بەئاگای دەهێنایەوە بەچاکتر لەوەی کەدەیزانی دەربارەی و قسەی بۆ دەکرد .

بەڵێ ئەو گوێبیستی یەکێکیان بوو قسەی بە(حەججاج)[1] دەووت لەپاش لەدونیا دەرچوونی، جاڕووی تێکردوو ووتی:

بیّ دەنگ بە، ئەی برازام .........

(حەججاج) گەڕاوەتەوە بۆلای پەروەردگاری .......

وەدڵنیابە تۆش کاتێك کە ئامادەی بەردەمی خودای باڵادەست دەبیت، ئەوسا دەبینیت کەبچووکترین گوناهێك کەئەنجامت داوە لەدونیادا لەسەرناخی تۆ قورسترو گەورەتر دەکەوێت، لەگەورەترین گوناهێك کە (حەججاج) ئەنجامی داوە ..........

جائەوجا لەڕۆژەدا هەریەکەتان کێشەی خۆی هەیە، واتە وابەستە بەخۆیەوە، وەبزانە ئەی برازام بەبیّ گومان کە خودای باڵادەست لەڕۆژی دواییدا مافی ئەوانەی کە (حەججاج) ستەمی لێکردوون لە (حەججاج) وەردەگرێتەوە .

هەروەك مافی (حەججاج) یش لە وانە وەرگرێتەوە کەستەمیان لێکردووە ..... جاناخی خۆت لەئەمڕۆ بەدواوە بەقسە ووتن بەهیچ کەسێکەوە خەریك مەکە .... وەئەگەر کەسێك بهاتایەتە خزمەتی بۆخوا حافیزی لەسەفرێکدا بۆبازرگانی یەك، پیّ ی دەووت:

ئەی برازام، شەرم لەخوای باڵادەست بکەولەبەرئەوخۆت بپارێزە .......

وە داوای ئەوەبکەو یاخود بەدوای ئەوەدا هەوڵ بدە، کەلەڕێگای ڕەواوە بۆت دەستنیشان کراوە ......

وەبزانە بەبیّ گومان ئەوەی کەتۆ دەتەوێت دەستی بخەیت جگە لەڕێگای حەڵاڵەوە، زیاترنەبێت لەوەی کەبۆت دەسنیشان کراوە .

*    *    *

---

[1]/ ئەوە (حەججاجی) کوڕی یوسف سەقەفی یە کەیەکێك بوو لەوالیەکانی بەنی ئومەییە، کەزۆر ستەمکارو توندوتیژبوو .



(موحەممەدی کوڕی سیرین) لەگەڵ والی یەکانی بەنی (ئوممەیە) دا کۆمەڵێك هەڵوێستی دیاری هەبووە کەتیایدا ووشەی حەق و ڕاستی ڕاگەیاندەوە، و دڵسۆزی نوواندوە لەئامۆژگاری کردن دا بۆلای خودا و پێغەمبەرەکەی و پەیڕەوی کردنیان و گوێڕایەڵی زانایانی موسڵمانان .

لەنموونەی ئەوە (عومەری کوڕی هوبەیرەی فەزاری) کەپیاوێکی گەورەی بەنی (ئوممەیە) و والییان بوو لەسەر (کوفەو بەصرە) ناردی بەدوایدا تاسەردانی بکات، جائەویش لەگەڵ برازایەکیدا چوو بۆ سەردانی.

کاتێك کە (موحەممەدی کوڕی سیرین) گەیشت، والی زۆر بەگەرمی بەخێری هێناو ڕێزی لەسەردانەکەی گرت و دانیشتنەکەی لەگەڵی دا بەرز ڕاگرت، وەکۆمەڵێك پرسیاری زۆری دەربارەی کاروباری دین و دونیا ئاڕاستە کرد، ئینجا پێ ی ووت: چۆن خەڵکی شارەکەتت وازلێهێنا ئەی (ئەبابەکر) ؟

ووتی: وازم لێهێنان چونکە ستەم تیایاندا بلاوبوو وەتۆش، گوێت پێ نە دەدان....

جابرازاکەی شانێکی لێ دا، وەکو پێ ی بڵێ چیت ووت، چیت کرد.........

جالای کردەوە بەلایدا ووتی:

تۆ ئەوکەسەنیت کەلەلایەن ئەوانەوە پرسیارت لێ دەکرێت، بەڵکو ئەوە منم کە پرسیارم لێ دەکرێت....وە بە ڕاستی ئەوە گەواهی دانە ....... وَمَن يَكْتُمْهَا فَإِنَّهُۥٓ ءَاثِمٌ قَلْبُهُۥ . سورة (البقرة) آية : ٢٨٣ .

واتە : هەرکەسێك گەواهی بشارێتەوە و وەك خۆی نەیدات ئەوە تاوانبارە جا کاتێك کوڕەکەی چۆڵکرد و بەجێ ی هێشت، (عومەری کوڕی هوبەیر) بەو شێوەیەی کە بەخێرهاتنی کردبوو بە گەرموگوڕی، خوا حافیزی لێ کردو، بەڕێزەوە بەڕێیکرد ......

وە کیسەیەکی بۆ نارد کە سی هەزار (٣٠٠٠٠) دیناری تێدابوو، بەڵام ئەو وەری نەگرت و گەڕاندیەوە.

جا برازاکەی پێ ی گوت: چی وای لێکردی کە خەڵاتی (ئەمیری وەرنەگریت)؟!

ئەویش ووتی: بێ گومان ئەو، ئەو خەڵاتەم پێ دەبەخشێ بەهۆی ئەوەوە کە گومانی چاکەیەکی پێم هەیە .

جا ئەگەر من لە خاوەن چاکەکان بم وەك ئەو گومان دەبات، ئەوە پێویست ناکات کە پەسەندی بکەم، واتە وەریبگرم .

خۆ ئەگەر واش نەبم کە ئەو گومان دەبات، ئەوە پێویستترە کەمن وەرگرتنی ئەوە بەڕەوا نەبینم .....

وە بە ڕاستی خودای بالأدەست ویستی وابوو کە ڕاستی و ڕاستگۆی و ئارامشی (موحەمەدی کوڕی سیرین) بنوێنێ و ئاشکرای بکات، بۆیە تووشی تەنگو چەڵەمەیەك بوو، هەروەك بڕواداران چۆن تووشی دەبن ...

لە نموونەی ئەوە، جارێکیان (موحەمەدی کوڕی سیرین) ڕۆنی کڕی بای چل هەزار دیناری قەرز ...

جا کاتێك کە یەکێك لە خیگە ڕۆنەکانی کردەوە، مشکێکی مردارۆبووی بۆگەنکردووی تیا بەدی کرد.

جا لەدڵی خۆیدا ووتی : بێ گومان ڕۆنەکە هەمووی لەیەك شوێندا توێنراوەتەوە، کەوابوو ئەو پیسی یە تایبەت نیە بە خیگەیەکەوە جگە لە خیگەیەکی دی ......

جا بەڕاست من ئەگەر هاتوو بەهۆی عەیبەکەوە گێڕامەوە بۆ خاوەنەکەی، دوورنی یە بیفرۆشێتەوە بە خەڵکی تر ....

بۆیە هاتە سەر ئەوەی کە هەمووی ڕشت ....... تالەو دڵەڕاوکێ یە ڕزگاری ببێت.

ئەوەش کاتێك لیَ ی ڕوویدا کە (موحەمەد) سکالأی لە دەست زەرەرێکی زۆر دەکرد کە تووش بوو بوو، ئەوە بوو بوە ژێر قەرزەوە، وە لەو کاتەشدا خاوەن ڕۆنەکە داوای پارەکەی دەکرد، ئەویش لە توانایدا نەبوو کە قەرزەکەی بداتەوە..

بۆیە خاوەن ڕۆن سکالأی لەسەر تۆمار کرد لەلای والی، والیش فەرمانی دا بە بەندکردنی (موحەمەدی کوڕی سیرین) هەتا ئەو قەرزە دەداتەوە کە لەسەر سەریەتی .

جا کەچووە بەندیخانە و مانەوەی تیایدا درێژەی کێشا، پاسەوانی بەندیخانەکە بەزەیی پیایدا هاتەوە، پاش ئەوەی کە شارەزای دینداری و خۆپارێزی و چڕی و زۆری خوداپەرستی بوو، پیَ ی ووت :

ئەی (شێخ) کاتێك کە شەو داهات بڕۆرەوە بۆ ناو ماڵ و منداڵەکانت و لەگەڵیاندا بمێنەوە هەتا بەرەبەیانی و ئەوجا بگەڕێوە بۆلای من ....

وە بەردەوام بە لەسەر ئەوە هەتا لە بەندی ڕزگارت دەبێ .

ئەویش پیٚ ی ووت: نە وەڵلاٚ ئەوە ناکەم ....

پاسەوانەکە بەسەر سوڕمانەوە ووتی: لەبەرچی، خودا ڕێنماییت بکات ؟!

(موحەمەد) ووتی یەوە بە پاسەوانەکە: تا نەبمە یارمەتی دەرت لەسەر ناپاکی کردن لەگەڵ فەرمانڕەواکەت .......

*　　　*　　　*

کاتێك کە (ئەنەسی کوڕی مالیك) (ڕەزاو ڕەحمەتی خودای لەسەر بێت) لە گیانکێشاندا بوو، داوای کرد کە وەفاتی کرد (موحەمەدی کوڕی سیرین) بیشوات و نوێژی لەسەر بکات، لەوکاتەشدا (موحەمەد) هەر بەند بوو .

جا کاتێك کە (ئەنەس)(ڕەزای خوای لیٚ بێت) وەفاتی کرد، خەڵکی هاتنە خزمەتی (والی)، وە ئاگاداریان کرد کە دەربارەی داواکەی هاوڕێکەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) و خزمەتکارەکەی، وە داوایان لێکرد کە ڕووخسەتی (موحەمەدی کوڕی سیرین) بدات وە بەری بدات تا داواکەی (ئەنەس) جیٚ بەجیٚ بکات، ئەویش ڕوخسەتی دا .

وە فەرمانی دا بە بەردانی .

جا کەهاتن بەری بدەن (موحەمەدی کوڕی سیرین) گوتی پێیان :

ناچمە دەرەوە هەتا ڕووخسەت لە خاوەن قەرزەکە وەرنەگرن، چونکە من بەهۆی ئەوەوە بەند کراوم کە مافی ئەوم لەسەرە ......

ئەوجا خاوەن قەرزەکەش ڕووخسەتی دا .

ئەوجا لەبەندیخانەکە هاتە دەرەوە، (ئەنەسی) (ڕەزای خوای لیٚ بێت) شۆرد و، کفنی کردو، نوێژی لەسەر کرد ...

پاشان گەڕایەوە بۆ بەندیخانەکە هەر وەك خۆی .....

وە نەچوو بۆ بینینی ماڵ و منداڵەکەی ......

*　　　*　　　*

(موحەمەدی کوڕی سیرین) تەمەنی بەردەوام بوو، تا گەیشتە ٧٧ساڵ ......

جا کاتێك مەرگ بوو بە میوانی، خۆی دەبینی کە کۆڵی سوکە بە پشت شکێنە دونیایی یەکان ........و توێشوی زۆری هەیە بۆ داوای مردن .....



(حەفصەی کچی راشید) که یەکێك بوو له خودا ناسه دڵسۆزەکان گێڕایەوه و ووتی :

(مەڕوانی مەحمەلی) دراوسێمان بوو، وه ئەو کەسێکی زۆر خوداناس و چڕو کۆششکار بوو له خوداپەرستی دا ......

جا که وەفاتی کرد، زۆر زۆر بۆی غەمبار بووین، ئەوجا لەخەودا بینیم .......

پێم ووت: ئەی (ئەبا عەبدوڵلا)، پەروەردگارت چی لەگەڵ کردی ؟

ئەویش ووتی: خستمی یه بەهەشت

ووتم: دوای ئەوه چی ؟

جا ووتی: پاشان بەرزکرامەوه بۆلای هاوڕێیانی (یەمەن)ڕاست و ڕەوان و خاوەن پەیمانان .

ووتم : پاشان چی ؟

ووتی : دوای ئەوه بەرزکرامەوه بۆلای نزیکەکان (پێشینەکان) (السابقون)

ووتم : جا لەوێ کێت بینی ؟

ووتی : (حەسەنی بەصری) و، (موحەمەدی کوڕی سیرین)........

خودایه دڵسۆزی (موحەمەدی کوڕی سیرین)مان پێ ببەخشه له پەرستندا .

* * *

بۆ زیاتر شارەزابوون له ژیانی (موحەمەدی کوڕی سیرین) سەرنجی ئەم سەرچاوانه بده :

١- الطبقات الکبری لإبن سعد : ٧/ ١٩٣.

٢- صفة الصَّفوة لآبن الجوزی : ٣/ ٢٤١، ١٤٨.

٣- حُلیة الأَولیاء للآبن اصْفهانی: ٢/ ٢٦٣- ٢٨٢ .

٤- تأریخ البغداد للخطیب البغدادی ٥/ ١٣١.

٥-شذرات الذهب : ١/ ١٣٨- ١٣٩ .

٦- وفیات الآعیان لابن خلکان: ٤/ ١٨١ .

٧- تهذیب التهذیب : ٩/ ٢١٤ .

٨- الوافي بالوفیات للصفدي ٣/ ١٤٦ .



# ١٠) رەبیعەی رەئیی

هیچ کەسێکم نەبینیووە کە پارێزگارتر بووبێت لە (ڕەبیعە) بۆ سوونەتی پێغەمبەر (ﷺ) (کوڕی تەلماجەشوون)

## بەشی یەکەم:

وا ئێمە واین لە ساڵی پەنجاویەکی کۆچیدا .

وە ئا ئەوەش بەشەکانی سوپای موسڵمانانە دەشت و دۆڵ بەرزایی چیاکان بەڕێ دەکات بەرەو خۆرهەڵات و خۆرئاوا ......

لەگەڵ خۆیدا بیروباوەڕی جیاکەرەوەی نێوان رەوا و ناڕەوا دەگوێزرێتەوە بۆ مرۆڤایەتی .....

وە دەستی ئاشتەوایی و سۆزی و دڵنەواییان بۆ درێژ دەکات ..

وە لە نێوانیاندا و لە چوار چێوەی زەویدا ئەو یاسایە ڕادەگەیەنێ کە ئادەمی ڕزگار دەکات لە بەندایەتی ئادەمی یەکان .....

وە ملکەچی دەگێڕێتەوە بۆ زاتی (اللە) ی کە تاك و تەنهایە و هاوبەشی نی یە....

وە ئەوەش هاوڕێ ی پایەبەرزە (ڕەبیعی کوڕی حاریس یە)[1] ئەمیری (خۆراسان) وفەتحکەری (سجستان) و پێشەوای سەرکەوتوەو، ڕێ بەڕێ دەکات و سەرکردایەتی سوپای غەزاکەر دەکات لە ڕێگەی خوادا وە لەگەڵیایەتی بەندە ئازاکەی (فەڕووخ).

جا لەپاش ئەوەی کە خودا ڕێزی لێنا بە فەتح کردنی (سجستان) و گەلێك ناوچەی دی کە بڕیاری داو سوور بوو لەسەر ئەوەی کە کۆتایی بهێنێت بەو ژیانەی کە پڕبوو لە سەرکەوتن بهێنێت، بە پەڕینەوە لە ڕووباری (سەیموون)، بەرزکردنەوەی ئاڵای یەکتا پەرستی لەسەر لوتکە بەرزەکانی ئەو ناوچانەی کە پێیان دەووترێت (ماوراءَ النهَر) ئەوەی پشتی ڕووبار.

وە (ڕەبیعی کوڕی زیاد) خۆی ئامادەکرد بۆ ئەو جەنگە دەستنیشان کراوە خۆ ئامادەکردنێکی تەواو، وە لە ئامادەگی یەکی تەواو دابوو بۆی، وە دەستنیشانی کاتەکەی و شوێنەکەی کرد بۆ سەر دوژمنانی خودا دەستنیشانێکی تەواو...

جا کاتێك جەنگ هەڵگرساو دەستی پێ کرد، (ڕەبیع) و سەربازە بەجەرگەکانی سەرکەوتنێکی بێ وێنەیان تیا تۆمارکرد، کە بەردەوام مێژوو یادی دەکاتەوە بەزمانێك دەنگ دەداتەوە بە سوپاس و ستایشی خودا، وە پاڕایەوە بە (اَللّٰه أكْبَرْ) وە بەندەکەی (فەڕووخ) نموونەی ئازایەتی و ڕاپەڕین، هەڵوێست وەرگرتن بوو لە گۆڕەپانەکانی جەنگ دا، کەبەوانە سەرنجی زیاتری (ڕەبیعی) بەلای خۆیدا ڕاکێشا بەجۆرێك کە ڕێزوو گەورەیی بۆ بڕیار دابوو لەبەر هەڵوێستە مەردانەکانی دا، لە هەموو ڕوویەکەوە لە گۆڕەپانەکانی جەنگ دا.

جا جەنگەکە کۆتایی هات بەسەرکەوتنی تەواوو لەبەرچاوی موسڵمانان وە ئەژنۆی دووژمنەکانیان هێنایە لەرزەو، ڕیزەکانیان شڕو وڕ کردن و، پرش و بڵاویان کردن

پاشان ئەو ڕووبارەیان بڕی و لێ ی پەڕینەوە، کە ڕێگر بوو لە بەردەمیان دا بۆ ناوچەکانی سەرزەمینی (تورك) ....

وەڕێگری لێدەکردن لە هێرش بردن بەرەو سەرزەمینی (سین)، وە دوورتر بەرەو مەملەکەتی (سوغد)[2] (الصُّغد) .

---

١/ بروانە پەڕاوی (صدر من حياة الصحابة) هی دانه ... لە بڵاوکراوەکانی (دار الأدب الأسلامي) .

[2]- (الصُّغد) ناوچەیەکە لە ناوەڕاستی ئاسیادا .

هەرئەوەندە بوو کە پێشەوای پایە بەرز ڕووبارەکەی بڕی و، پەڕییەوە ئەو بەری و پێیان جێگیر بوو لە ڕۆخی دووەمی ڕووبارەکە، خێرا خۆی وسەربازەکانی دەستنوێژیان گرت لەئاوەکەی؛ دەستنوێژێکی زۆرچاك ...

وە ڕوویان لە ڕووگە کردوو؛ دوو ڕکات نوێژیان کرد، نوێژی سوپاسگوزاری بۆ خودا بەخشێنەری سەرکەوتن ...

پاشان پێشەوای پایەبەرز خەلاتی بەندەکەی خۆی (فەڕووخ) کرد لەسەر جوانی کردارو ئازایەتی لە جەنگدا: بەوەی کە سەربەستی پێ بەخشی و ڕزگاری کرد لەبەندایەتی ...

وەلەدەسهاتی زۆری جەنگ بەشی بۆ دانا .

لە دوای ئەوەی لەلای خۆشی یەوە شتێکی زۆرتری بۆ زیاد کرد ...

*          *          *

ژیانی (ڕەبیعی کوڕی زیادی حاریسی) لە دوای ئەو ڕۆژە پیرۆزو درەوشاوەو بێ گەردە درێژەی نەکێشا ...

لەدوای دوو ساڵ لە بەدیهێنانی ئاواتە گەورەکەی ... مەرگ بوویە میوانی و ڕێ ی بەڕێ کرد بۆ لای پەروەردگارەکەی، ئەم ڕازی بەدین و قەدەری ئەوو، ئەویش ڕازی لە (ربیع) ...

جا ئەو جا لە دوای ئەو لاوی بەجەرگی ئازا (فەڕووخ) گەڕایەوە بۆ شاری (مەدینەی مونەووەرە) لەگەڵ بەشە زۆرەکەیدا لە داهاتی جەنگ و ئەو خەلاتە ناوازەیەی کە پێشەوای پایەبەرز خەلاتی کردبوو....

وەلە سەرو ئەوەوە سەربەستی یە بەبەهاکەی و...

یادەوەرییە دەوڵەمەندەکانی بە نموونە پاڵەوانی یەتیەکان ...

کە ڕازا بووەوە بەتەپو تۆزی ڕووداوەکان ...

*          *          *

(فەڕووخ) کاتێك کەلە شاری پێغەمبەری خودا (ﷺ) دابەزی، لاوێکی تەواو لاو بوو، گورج و گۆڵی لێ دەتکا، سیما جوان و سوارچاك ....

وە ئەو هەنگاوی بەرەو سی ساڵی دەنا لە تەمەنی ...

جا (فەڕووخ) بڕیاری دا لەسەر ئەوەی کە خانوویەك بۆ خۆی دابین بکات تا تیایدا دابنیشێت. وە هێنانی هاوسەرێك تا لە ژێر سایەو سێبەریدا ئارام بگرێت و بحەوێتەوە ...

جا خانوویەکی کڕی لە ناوەندی ماڵەکانی (مەدینە) دا ...

وە ئافرەتێکی ژیرو تیژو، خاوەن بەهای تەواو، دین دروست، نزیك تەمەنی خۆی دەستبژار کردو ...کردیە هاوسەری .

(فەڕووخ) بەهرەدار بوو لەو خانوویەدا کە خودا تیایە: ڕێزی لێنا.

وە لەهاوڕێ یەتی هاوسەرەکەیدا دەستلەملانی خۆشی ژیان و، خۆشی تێکەڵی و، گەشی ژیان بوو زۆر لەسەرو ئەوەوە کە خۆی ئاواتی دەخواست و تەمەنای دەکرد.

بەلاّم ئەو ساڵە ئاوەدانە لەگەڵ ئەو هەموو ئاوازەییەداو ... ئەو هاوسەرە چاکەی کە خودا هەموو سیفەتێکی باش و ڕەوشتی بەرزی پێ بەخشیبوو، نەیانتوانی زاڵبین بەسەر سۆزی کلّپەداری سوار چاکی بڕواداردا بۆ ئامادەبوون لەگۆڕەپانی جەنگەکاندا ... و ئارەزوو گڕ گرتووی بۆ بیستنی دەنگی دەمی شیر لەسەر دەمی شیر ... وە ئارەزوومەندیی بۆ دەستپێکردنەوەی جیهاد (کۆششکردن) لەڕێگای خوادا....

جا هەرکاتێك لە شاری (مەدینە) دا دەنگوباسی سەرکەوتنەکانی سوپای موسڵمانان لە ڕێگای خوادا بلاّو دەبوویەوەو، دەوترایەوە، ئارەزووی ئەو لاوە گڕی دەگرت بۆ جیهاد، وە سۆزی تینی دەسەند بۆ شەهید بوون .

* * *

جا ڕۆژێك لە ڕۆژەکانی هەینی (فەڕووخ) گوێبیستی ووتاربێژی مزگەوتی پێغەمبەر(ﷺ) بوو مژدەی سەرکەوتنەکانی سوپای ئیسلامی ڕادەگەیاندو دەیدا بە گوێ ی موسڵمانان دا نە زیاتر لە گۆڕەپانێك دا.

وەهانی موسڵمانانی دەدا لەسەر جیهاد (کۆشش) لەڕێگای خوادا ...

وەبەردەوام بوو لە هاندانیان دا بۆ تامەزرۆیی شەهید بوون بۆ سەرخستنی دینی خوداو، بەدەستهێنانی ڕەزامەندی، جا ئەو لاوە بەجەرگە گەڕایەوە بۆ ماڵەوەی، وەبڕیاری دا لەسەر دەستپێکردنەوەی جیهاد لە ژێر ئالاّیەکدا، لەو ئالاّیانەی موسڵمانان کە بلاّوەیان کردبوو لەژێر هەموو ئەستێرەیەکدا، واتە لە هەموولایەك .



وە ئەو بڕیاری ڕاگەیاند بۆ هاوسەرەکەی ...

جا ئەویش پێ ی ووت:

ئەی (ئەبا عەبدی ڕەحمان) (ابا عَبید الرَّحمن)، بۆ کێ من و ئەو کۆرپەیەی کەلە نێوانی پەردەی سکم دایە بەجێ دەهێڵی ؟! ...

ئەوەتا تۆ پیاوێکی نامۆی (غَریب) لە (مەدینە)دا، نەکەس و کارو نەهۆزت هەیە تیایدا .

ئەویش ووتی: وازت لێ دەهێنم (بەجێت دەهێڵم) بۆ خوداو پێغەمبەرەکەی ..

لەپاشدا ووتی ئەوەتا من سی هەزار (٣٠٠٠٠) دینارم بۆ بەجێ هێشتووی کەلە دەستهاتی (نتائج) جەنگ بۆم کۆکردوویتەوە ...

بیپارێزەو بیخەرە بەرهەمهێنانەوە (بازرگانی و هتد ...)، ئەو جا بەباشی لێی ی خەرج بکە بۆ خۆت و بۆ منداڵە لەدایك بووەکەت تا دەگەڕێمەوە بۆ لات بەساغ و سەلامەتی و سەرکەوتوویی ...

وەیان خودای باڵادەست ئەو شەهیدی یەکە ئاواتی دەخوازم پێم ڕەوا دەبینێ.

پاشان خودا حافیزی لێکردوو ڕێی بەڕێ کرد بۆ مەبەستەکەی ....

* * *

ئەو ئافرەتە بەڕێزە دامەزراوە لەپاش چەند مانگێك لە ڕۆیشتنی هاوسەرەکەی منداڵەکەی بوو، کە کوڕێکی ڕوو گەشی، شیرین مەشرەف، چاوو ڕووناککەرەوە بوو

دایکە بەشێوەیەك پێی دڵخۆش بوو لەوە بوو دیار نەمانی باوکی لە بیرببات‌ەوە ... جا ناوی نا (ڕەبیعە).

* * *

لەسەر ڕووی ئەم منداڵە بچکۆلەیە نیشانەکانی خانەدانی و ڕەسەنایەتی دەرکەوت هەر لەبەدیارکەوتنی نینۆکەکانی یەوە ....

وە دیاردەی زیرەکی لە کردارو گفتاریدا ئاشکرا بووز

چاکە گەشەی کردو گەورە بوو، دایکی دایە دەست مامۆستایان، وە داوای لێکردن کەبە جوانی و چاکی فێری بکەن ....

وەهەروەها پەروەردەکاری بانگهێشت کرد بۆی، وەهانی دان کەبەباشی رەووشتی دابدەن .

زۆری پێ نەچوو کەبەباشی نووسین و خوێندنەوە فێر بوو ...

پاشان قورئانی پیرۆزی لەبەر کرد، وای لێهات بەدەنگێکی تەڕوو پاراوەوە دەیخوێندەوە هەروەکو چۆن دابەزیبووە سەر دڵی (موحەممەد) سەلەوات و سەلامی خودای لەسەر بێ ...

وەوەریگرت و تێ گەیی و لەبەری کرد ئەوەندەی کە بۆی گونجا لەفەرموودەی پێغەمبەری خودا (ﷺ) ..

وە هەروەها لە ووتەکانی عەرەب ئەوەی کە باش بێت کەبە نموونە بیهێنێتەوە لەبەری کرد .

وە شارەزا بوو لە کاروباری دین ئەوەندەی کە پێویست بوو بیزانێ .

*　　　　*　　　　*

دایکی (رەبیعە) پارەو خەڵاتی زۆری دەبەخشیە مامۆستا و پەروەردەکاری کوڕەکەی. تازیاتر دڵسۆزی بکەن لە فێرکران و پەروەردەیدا جا هەر کاتێك دەیبینی کوڕەکەی لە زانست و پەروەردە دا بەرەوپێش چووە، خەڵات بەخششەکەی بۆ زیاد دەکردن .

لەگەڵ ئەو کارەی دا چاوەڕێ ی گەڕانەوەی باوکە نادیارەکەی دەکرد، وە کۆششی دەکرد کە وا لەکوڕەکە بکات کە ڕووناککەرەوەی چاوو بێت بۆ خۆی و باوکی .

بەڵام (فەڕووخ) نادیارییەکەی درێژەی کێشا .

تادەنگوباسی جیاواز دەربارەی دەوترا .

هەندێکیان ووتیان بێ گومان ئەو بەبەندی کەوتۆتە دەست دووژمنان وەهەندێکی دی دەیووت:بەدڵنیایی ئەو بەردەوام ماوەو خەریکی جیهادە.

وە کۆمەڵی سێ یەم کەلە گۆڕەپانەکانی جەنگ گەڕا بوونەوە ووتیان: بەڕاستی ئەو دەستگیری ئەو شەهادەتە بوو کە ئاواتە خوازی بوو .

جا ئەو ووتەی دوایی دڵنیایی دروست کرد لای دایکی (ڕەبیعە)، لەبەرنەمانی دەنگوباسی، بۆیە بۆی دڵتەنگ بوو دڵتەنگی یەك ئازاری بەناخی گەیاند و تووشی پەژارەی کرد .

لەپاشدا داوای پاداشتی لەسەر ئەو تووشهاتە ئێش پێگەیەنەرە لە خودا کرد.

* * *

(ڕەبیعە) لەو ڕۆژگارەدا خەریك بوو پێ دەگەیشت (بالغاً)، وە پێ ی دەنایە پێگەی لاوییەتیەوە .

جا ئامۆژگارییکاران ووتیان بەدایکی :

وا(ڕەبیعە) تەواویکرد ئەوەی کە پێویستە بۆ لاوێکی وەك ئەو کە تەواوی بکات لە خوێندنەوەو نووسین ...

وە زیاد لە هاوڕێکانیشی، قورئانی لەبەرکردووەو، فەرموودە دەگێڕێتەوە.

جا ئەگەر سەربەستی بکەیت پیشەیەك لە پیشەسازی یەکان فێر ببێت، خراپ نی یە کەلەدەستهاتەکەی خەرجی تۆش و خۆرشی بکات ،

ئەویش ووتی:

لە خوودا دەخوازم کە دڵی لەسەر شتێك دابمەزرێنێت کە سوودی دین و دونیایی تێدا بێت .

جا لەدوای نزاکەی دایکی، (ڕەبیعە) زانستی (العلم) بۆ خۆی هەڵبژارد ...

وەبڕیاری دا لەسەر ئەوەی کە بژی فێر خوازو فێرکاربێت ئەوەندەی کە ژیانی درێژەی هەبێت .

* * *

(ڕەبیعە) لەو ڕێگەیەدا کە نەخشەسازی بۆ کرد بوو بۆ خۆی ڕێ ی بەڕێ کرد.

بەبێ هەست کردن بەماندووی و کەمتەرخەمی کردن. وەبەتامەزرۆیی یەوە ئامادەی ئەو بازنەی (حاقات) زانستانە دەبوو کە مزگەوتی مەدینەدا شەپۆلی دەدا، هەروەك چۆن تینویەك ئامادەی سەرچاوەیەکی ئاوی سازگار دەبێت .

وە هەمیشە ئامادەی خزمەتی ئەوانە بوو کە مابوونەوە لە هاوڕێیانی بەڕێزو پایەبەرز، لەسەرووی هەموویانەوە (ئەنەسی کوڕی مالیك)[1] خزمەتچی پێغەمبەری خودا (ﷺ) ...

وە زانستی وەردەگرت لە کاروانی یەکەم لە شوێنکەوتووان لە پێشەنگیانەوە:

(سەعیدی کوڕی مەسەییب) و (مەکحولی شامی) و (سەلەمەی کوڕی دینار)

وەشەکەتی شەوی دەگەیاندە بەشەکەتی ڕۆژی، هەتا کۆششی لەپەلوپۆی دەخست.

جا کاتێك ئەگەر یەکێك قسەی بۆ بکردایە و، پێ ی بووتایە کە بەزەیی بەخۆیدا بێتەوە، دەیووت:

گوێبیستی زاناکان و مامۆستاکانمان بووین دەیان فەرموو:

(بەڕاستی زانست (العلم) هەندێکت پێ نابەخشێ ئەگەر هەموو خۆتی پێ نەبەخشی) ...

پاش ئەوە زۆری پێ نەچوو، ناو هێنانی بڵندبوویەوە، ئەستێرەی گەشایەوە، براکانی زۆر بوون و، قوتابیەکانی پێوەی دابەست بوون و، گەلەکەی (قومە) کردیانە گەورەی خۆیان .

ژیانی زانای (مەدینە) ڕێ ی بەڕێکرد لەسەر خۆو بەمتمانەوە ....

جا بەشێکی لە ڕۆژەکەی لە ماڵەوە بۆ ماڵ و خێزان و برادۆستانی ...

وەبەشەکەی تری لە مزگەوتی پێغەمبەری خودادا(ﷺ) بۆ کۆڕەکانی زانست و بازنەکانی ...

جابەو شێوەیە ژیانی بەڕێکرد هەتا کەوتە ناو ڕووداوێکەوەکە لە خەیاڵدا نەبوو.

---

[1]- (انسي بن مالك الأنصاري) بڕوانە پەڕاوی (صور في حياة انصاري) للمؤلف، دار الأدب .

# ڕەبیعەی ڕەئیی
## بەشی دووەم

لە ئێوارە شەوێك لە شەوەکانی مانگە شەوی هاویندا ، سوارچاکێك کەلە کۆتایی ساڵی شەصت هەمی تەمەنیدا بوو، گەیشتە شاری (مەدینەی پیرۆز) وەڕێ ی بەڕێ کرد لە کۆڵانەکانیدا بەسواری ئەسپەکەی بەدوای خانوویەکدا. وە ئەو نەیدەزانی کە ماڵەکەی تا ئێستاش وەکو خۆی ماوە، وەك ئەو کاتەی کە تێیدا بوو، یاخود ڕۆژگار کاریگەری خۆی لەسەر داناوەو کاری تێکردووەو گۆڕانکاری تیا ئەنجام داوە ...

دیار نەمانی ئەو لاوە لەماڵەکەی نزیکەی سی ساڵی تێپەڕاندبوو .

وەپرسیاری لەناخی خۆی دەکرد دەربارەی ئەو هاوسەرە لاوەی کە لەو ماڵەدا بەجێ ی هێشتبوو، چی کردووە ؟ ...

وەهەروەها لەدڵی خۆییدا پرسیاری دەکرد دەربارەی ئەو کۆرپەیەی کە لە دوو توێی سکیدا بوو:

ئایا کە بوویەتی کوڕ بووە یان کچ ؟ ... ئایا ئەو زیندووە یان مردووە ؟.

وە ئایا ئەگەر زیندووە، ئایا چ شان و شکۆیەکی هەیە؟

وەهەروەها پرسیاری لە خۆی دەکرد دەربارەی ئەو پارە زۆرەی کە کۆی کردبووەوە لە دەستکەوتەکانی جیهاد، وە وەك سپاردەیەك لای ئەوبەجێ ی هێشتبوو، ئەوکاتەی کەڕێ ی بەڕێکردبوو وەك کۆششکارێك (مجاهداً) لەڕێگای خوادا لەگەڵ سوپاکانی ئیسلامدا، کەڕووی کردە (بوخارا) و(سەمەرقەندو) و دەورووبەریان بۆ فەتح کردنیان .............

جاکۆڵانەکانی (مەدینە) وشەقامەکانی هێشتا ئاوەدان بوو بەهاتوچۆیان ......

جاخەڵکی تازە تەواوبوون لەنوێژی عیشاو بەرەوماڵ دەچوونەوە، بەڵام هیچ کام لەوانەی کەبەلایاندا تێ پەڕی کرد نەیناسی یەوە، وەگوێی پێ نەداو، لای نەکردەوە بەلای ئەسپە شەکەتەکەیدا و شمشێرە شۆڕبووەوەکەی بەگەردنیدا....



لەگەڵ ئەوەدا کەدانیشتووانی شارە ئیسلامی یەکان ئاشنابوون بەڕواڵەتی ئەو کۆششکارانەی کە دەچوون بۆجیهاد لەڕێگای خوادا، وە ئەوانەی کەلێ ی دەگەڕانەوە

جائەوە هۆکارێك بوو لەئارۆژاندنی دڵتەنگی سوارچاکەکە وزیادکردنی دڵە راوکێکانی .

ئالەو کاتەدا:کەسوارچاکەکە گێژی دەخوارد لەوبیرۆکانەیدا، وەلەگەڵیشیدا رێگەی گرتبووەبەرو دەڕۆشت لەوکۆلانانەدا کە گۆڕانی بەسەرهاتبوو......... کتووپڕخۆی بینیەوە لەبەردەم ماڵەکەیدا .........

وەبینی دەرگاکەی لەت وپەتەو درزی بردووە، جاخۆشی وای لێکرد کە پەلەبکات و رووخسەت وەرنەگرێت لەخاوەن ماڵ ........ وەلە دەرگا چووە ژوورەوەو، چووە هەیوانی ماڵەکە ........

*　　　*　　　*

خاوەن ماڵ جیرەی دەرگاکەی بیست، لەقاتی سەرەوە سەری شۆڕکردەوە، لەبەرڕۆشنایی مانگدا پیاوێکی نامۆی بینی بەشیروڕمەکەیەوە، لەشەودا هاتۆتە سەرماڵەکەی .

وەهاوسەری لاوی خاوەنماڵیش نزیك وەستابوو لەبەرچاوی پیاوە نامۆکەدا، جابەتووڕەییەوە راپەڕی، وەبەپێخاووسی بۆی هاتە خوارەوە و دەیووت:

بەهۆی تاریکی شەوەوە خۆت حەشاردەدەیت ئەی دووژمنی خودا، وەدێیتە سەرماڵەکەم و، هێرش دەکەیتە سەرناموسم؟!

جابۆی راپەڕی هەرچۆن شێری برسی رادەپەڕێت بۆکەسێك کەبەخراپە روو لەماڵ و لانەکەی بکات .......

وەهیچ فرسەتێکی بۆنەهێشتەوە بۆقسەکردن جاهەردووپیاوەکە هاتن بەیەکداو، دەنگەدەنگ و قرەقرپیان بەرزبوویەوەو، لەئەنجامی ئەوە دراوسێیان لەهەموو لایەکەوە ڕژانە سەرماڵەکە .

چواردەوری پیاوە نامۆکەیان دا، هەروەك چۆن دەستێك زنجیر دەکرێت، وەیارمەتی دراوسێ کەیان داو بوونە یارمەتی دەری .........

جاخاوەن ماڵ گرتی و دەستی لەگەردنی توندکرد وە ووتی: سوێند بەخوا بەرت نادەم – ئەی دووژمنی خودا– لای والی نەبێت .

ئەوجا پیاوەکە ووتی: دڵنیابن من دووژمنی خودانیم ........ وەهیچ تاوانێکم ئەنجام نەداوە .........

بەڵکو ئەوە ماڵی منە، خاوەنی ڕاستەقینەیم، وەکەبینیم دەرگاکەی کرابوویە چوومە ناوی یەوە .......

ئینجا لایکردەوە بۆلای خەڵکەکەوەو ووتی:

ئەی خەڵکینە ...... گوێ بیستی من بن ..........

ئەوماڵە ماڵی منە ......... بەپارەی خۆم کڕیوومە .........

ئەی برایان .......... من (فەڕووخم) .

ئایا کەس نەماوە لەژیاندا لەدراوسێکان کە ئەو (فەڕووخە) بناسێتەوە .

کەماوەی سی ساڵە ڕۆشتووە بۆجیهاد لەڕێگای خوادا ؟ !

وەدایکی خاوەن ماڵ نووستبوو، بەدەم ئەو دەنگە دەنگ و قرەقرەوە بەخەبەربوویەوە، وەلە پەنجەرەکەوە سەری شۆڕکردەوەو سەیریکردن، جاهاوسەرەکەی بینی بەهەموو دڵنیایی یەکەوە .

بۆیە لەوەدا بوو کەسەرسوڕمان زمانی ببەستێ .....بەڵام زۆری پێ نەچوو کە ووتی:

وازی لێ بهێنن .......

بەریبدە ئەی ڕەبیعە ........

وازی لێ بهێنە ئەی کوڕم ......... دڵنیابە ئەوە باوکتە .

ئێوەش ئەی خزمان و دۆستان بەجێ ی بهێڵن خواتان لەگەڵ ........ خودا پایەدارتان بکات .

تۆش ئەی (ئەباعەبدلڕەحمان) ئاگاداربە. بێ گومان ئەوەی کەڕوو بەڕووی بویتەوە کوڕەکەتەوجگەرگۆشەکەتە .

جاهەرکە (فەڕووخ) گوێ بیستی ووشەکانی هاوسەرەکەی بوو خێرا خۆی هاویشتە سەر(ڕەبیعە) و گرتی یە باوەشی و ماچی دەکردو، دەیگوشی بەخۆیەوە ......

وە (ڕەبیعە) ش باوکی لەباوەش گرت و دەستی کرد بەماچکردنی .

دەستەکانی و گەردن و سەری ..........

وەخەڵکیش لێیان کۆبوونەوە ...........

ئەوجا دایکی (ڕەبیعە) لەقاتی سەرەوە هاتە خوارەوەو سڵاویکرد لەوهاوسەرەی کە گومانی نەدەبرد کە ئەو لەسەر ڕووی ئەم زەوی یە ببینێتەوەو پێ ی شادببێتەوە، پاش ئەوەی کەنزیکەی سی ساڵ بوو دەنگوباسی نەمابوو..

*                    *                    *

لەدوای ئەوە (فەروخ) دانیشت لەگەڵ هاوسەرەکەیداو، دەستی کرد بەگفت وگۆ لەگەڵیدا دەربارەی حاڵ و ئەحواڵی و ڕابووردووی خۆی .... وەهۆکارەکانی دابڕان ونەمانی دەنگوباسی خۆی بۆ خستەڕوو.

بەڵام هاوسەرەکەی لە گوێبیستی زۆربەی ئەوەی کە ئەودەیووت، ئەم لەبیرو خەیاڵاتێکدابوو، کەبەڕاستی ئەو خۆش یەی لێتێکدابوو کەبەهۆی بەیەکگەشتنەوەی لەگەڵ هاوسەرەکەیداو، شادبوونەوەی ئەو بە کوڕەکەیەوە پێ ی شادبوو بوو، ئەویش لەترسی ئەوەی کەهاوسەرەکەی لێ ی بڕەنجێت لەسەر لەناوچوونی ئەو پارەیەی کەلەلای ئەودانابوو ........

لەدڵی خۆیدا دەیووت:

چی یە ئەگەر ئێستا پرسیارم لێ بکات دەربارەی ئەو پارەیەی کە وەك سپاردەیەك لەلای من بەجێ ی هێشت و، داوای لێکردم کەبەباشی لێ ی خەرج بکەم؟!

چی دەبێت لەلایەن ئەوەوە ئەگەر ئاگاداری بکەم کەبەڕاستی هیچ شتێك لەوپارەیە نەماوە ؟

ئایا دڵنیا دەبێت و ڕازی دەبێت بەو ووتەی من ...... کەبەڕاستی ئەوەی ئەو لەلای من بەجێ هێشتبوو خەرجم کردووە لە پەروەردەکردن و فێرکردنی منداڵەکەیدا ؟ ........

وەئایا خەرجی منداڵێك دەگاتە (٣٠٠٠٠) سی هەزار دینار ؟ .........

ئایا ئەوە دەسەلمێنی و بەڕاستی دەزانی کە دەست گوشادی کوڕەکەی وەك بارانی پەڵەوابووەو، وەئەو دینارێك و درهەمێکی نەماوەو، بەڕاستی هەموو شاری (مەدینە) ش دەزانن کە ئەو بەهەزارەهای خەرج کردووە بۆ برادەرو دۆستەکانی ؟ .

لەوکاتەدا کە (دایکی ڕەبیعە) ڕۆچووبوو لەو بیرکردنانەوەیدا،هاوسەرەکەی لایکردەوە بەلایەوەو ووتی:

ئەی (دایکی ڕەبیعە) چوارهەزار (٤٠٠٠) دینارم بۆهێناویت ........

جائەوپارەیەی کەلەلات دام نابوو بیهێنە، بائەمەش بخەینە سەر، وەبەکۆی پارەکە باخێك و خانوویەکی پێ بکڕین، ئەوەندەی کەژیانمان ماوە بە دەستهات و بەرهەمەکەی بژین .

جا(دایکی ڕەبیعە) خۆی لە ووتەکەی بێ ئاگاکردو بەهیچ شتێك وەڵامی نەدایەوە .

دیسان (فەڕووخ) داواکەی دووبارە کردەوە لێ ی و ووتی:

دەی خێراکە پارەکە لە کوێیە بیهێنە تائەو پارەیەی کە پێمە بیخەمەسەری ؟ .

جا(دایکی ڕەبیعە) ووتی: بەڕاستی لە شوێنێکادامناوە کە پێویست و گونجاوە تیادابنرێت ........

وەبە ویستی خودا لەپاش چەند ڕۆژێکی کەمی دی بۆت دەهێنم .

ئالەوکاتەدا دەنگی بانگی بەیانی قسەکەی پێ بڕین و .........

(فەڕووخ) دەستی دایە مەسنەی ئاوەکەی و دەستنوێژی گرت و، ئینجا بەخێرایی ڕێ ی بەڕێکرد بەرەو دەرگاکە و ئەیووت: کوا لە کوێ یە (ڕەبیعە) ؟.

ووتیان: پێش تۆکەوتووەو لەگەڵ بانگی یەکەم دا چووە بۆ مزگەوت .

وەئێمە وامان دانەناوە کە بەڕاستی تۆبە نوێژی کۆمەڵ دا بگەیت .

*　　　　*　　　　*

(فەرووخ) گەیشتە مزگەوت، بینی واپێشەوا(إمام) خەریکە لە نوێژەکەی تەواودەبێت، بۆیە خێرا نوێژە فەرزەکەی ئەنجام دا بەکۆمەڵ .

ئینجا ڕۆشت بەرەو ئارامگای پیرۆزو بەڕێزو، سڵاوی لە(پێغەمبەری خودا) کرد (ﷺ) .

دوای ئەوە گەڕایەوە بەرەو (ڕەوزەی بێگەردووپیرۆز)[1] ، کەلەناخی دڵی یەوە ئارەزوومەندی بوو، وەدڵی دەکولا بۆ نوێژکردن تیایدا .

جاشوێنێکی بۆخۆی لەوێدا هەڵبژارد .

ئەوجا ئەوەندەی خوداویستی کە نوێژی تیابکات، نوێژی سوننەتی کرد، لەپاشدا نزای کرد ئەوەندەی بەبیری داهات لەنزاکردن .

---

[1]/ الروضة : نێوان گۆڕی پێغەمبەر(ﷺ)و مینبەرەکەیەتی .

وەکاتێك کەویستی مزگەوت بەجێ بهێڵێت، بینی حەوشەکەی ڕازاوەتەوەوچڕبووەتەوە بەکۆڕێك لەکۆڕەکانی زانست(العلم) کەلەوەپێش نموونەی ئەوەی نەبینی بوو .

وەخەڵکەکەی بینی کەبازنەیان دەبەست بەدەوری (شێخی) کۆڕەکەدا بازنە لەدوای بازنە، هەتا لە گۆڕەپانەکەدا شوێن پێ یەکیان نەهێشتەوە .

وەچاوی دەگێڕا بەناوخەڵکەکەدا، دەیبنی کەلەناویاندا زانایانی مێزەربەسەرو بەتەمەنان و پیاوماقوڵان، کەسیمایان و شێوەیان بەڵگەبوون لەسەر ئەوەی کە ئەوان خاوەن پلەو پایەبوون ........

وەهەروەها لاوانی زۆری دەبینی کەبەسەر ئەژنۆیاندا کەوتبوون، وە پێنووسەکانیان گرتبوو بەدەستیانەوەو، دەیانقۆستەوە ئەوەی کە(شێخ) دەیفەرموو هەروەك چۆن تۆ(دوور) دەقۆزیتەوە .

مەبەست ئەوەیە بەتامەزرۆیی یەوە ووتەکانی شێخیان دەنووسیەوە .

وەلەتیانووسەکانیان دا(دفاترهم) دەیانپاراست هەروەك چۆن گەوهەرەبەنرخەکان دەپارێزرێن .

وەخەڵکەکە چاوییان بڕیبووە ئەو شوێنەی کە (شێخی) تیایدا دانیشتبوو، گوێبیستی هەموو ووشەیەك بوون کەلە زاری دەردەچوو، هەروەك بڵێ ی بەسەر سەریانەوەیە، واتە ئەوەندە بێدەنگ و بێ چرپەو گوێگربوون .

جالەبەر زۆری بازنەکان (حلقات) ڕاگەیانەران بڕگە بڕگەی ئەوەی کەشێخ دەیفەرموو، دەیانووتەوە، بەهۆی ئەوەوە هیچ کەسێك هیچی لەفەرموودەکانی (شێخ)ی لەکیس نەدەچوو هەرچەندیش دووریش بوایە .........

وە (فەڕووخ) هەوڵی دا کە هەرچۆنێك بێت سیمای (شێخ) ببینێت ........ بەڵام بەهۆی شوێنەکەیەوە کە دوور بووڵ یەوە نەیتوانی .

بۆیە ڕۆچوو بوو لە چاودێری کردنی دەربڕینە تیشك بەخشەکانی داو، زانستە چڕو زۆر هەڵقولاوەکەیانداو، لەبەر بووە سەرسوڕهێنەرەکەی .

وەملکەچی خەڵکەکە لەنێوان دەستیدا، واتە لەبەردەستی دا سەری سوڕ هێنابوو. جائەوەبوو زۆری پێ نەچوو کە (شێخ) کۆڕەکەی کۆتایی پێ هێناو هەستایە سەرپێ و بەپێوە وەستا .......

وەخەڵکەکە راپەڕین و ڕوویان تێکردو، قەرەباڵغیان لێکردوو، دەوریان داو، وەلە دوایەوە دەڕۆشتن، خواحافیزیان لێدەکرد بۆدەرەوەی مزگەوت .

ئالەوێدا (فەڕووخ) لایکرد بەلای پیاوێکەوە لەتەنیشتی یەوە دانیشت بوو ووتی:

سوێندت دەدەم بەخودات، پێم بڵێ – ئەو (شێخە) کێ یە ؟

پیاوەکە بەسەرسووڕمانەوە پێ ی ووت: ئایا ئەوە تۆخەڵکی (مەدینە) نیت ؟

(فەڕووخ) ووتی: بەڵێ خەڵکی مەدینەم .

جاپیاوەکە گوتی: ئایا لە(مەدینە) دا پیاوێك هەیە کە (شێخ) نەناسێت ؟ !

(فەڕووخ) ووتی: داوای لێبوردن دەکەم کەمن نایناسم .

چونکە من نزیکەی سی (٣٠) ساڵە ڕۆشتووم و، دووربووم لە (مەدینە)، تادوێنێ کە گەڕاومەتەوە ...

ئەوجا پیاوەکە ووتی:

قەیناکا ......... کەمێك لەلام دانیشە قسەت بۆدەکەم دەربارەی (شێخ) .

ئینجا ووتی:

بێ گومان ئەو (شێخە) ی کەگوێت بۆڕاگرت، گەورەیە کە لە گەورە شوێنکەوتووان (التابعین)، وەئالأیەکە لەئالأکانی موسڵمانان، واتە زانایەکە لە زاناکانی ، وە ئەو فەرموو دەگێڕەڕەوەی (مەدینە یە) وەشەرع زانەکەی و، پێشەوایەتی (إمامها) لەگەڵ ئەوەدا کەلەسەرەتای تەمەنیدایە .

ئەوجا(فەڕووخ) ووتی: (مَاشَاءَاللهُ، لاقُوَّةَ إلآبِالله) ماشائەڵلاّ، لاقوەتتە ئیللا بیللاە

بەدواییدا پیاوەکە گوتی:

وەبێ گومان وەك بینیت کۆڕەکەی (مالیکی کوڕی ئەنەس) و(ئەباحەنیفە ی نوعمانی)و (یەحیای کوڕی سەعیدی ئەنساری) و (سوفیانی سەوری) و(عەبدوڕەحمانی کوڕی عەمریوی ئەو زاعی) و(لەیسی کوڕی سەعد) و، هیترو هیتریشی لەخۆی گرتووە .

جا(فەڕووخ) ووتی:بەلأم تۆ..........

پیاوەکە رێگەی نەدابە (فەرووخ) کەقسەکەی تەواوبکات، تادەستی بەقسەکردەوەو دەیووت:

ئەولەسەرو هەموو ئەوەوە، گەورەیەکی رەووشت پیرۆزو، خەڵك لێ رازی و بێ دەمارو، دەست گوشادە ...

وەخەڵکی(مەدینە) کەسێکی کەیان نەناسیووە کەلەو بەخشندەتربوو‌بێت بۆ دۆست و برادەرەکانی ...

وەبێ باکتربوو‌بێت لەو لەدونیانەویستی داو، لەوتامەزرۆتربوو‌بێت بۆئەوەی کەلەلای خودایە .

جا(فەرووخ) ووتی: بەلاّم تۆبەراستی ناوەکەیت بەمن نەووت .

ئەوجا پیاوەکە ووتی: ئەوە (رەبیعە ی رەئیی یە) .

(فەرووخ) بەسەرسورمانەوە ووتی: (رەبیعەی رەئیی) !! .

پیاوەکە ووتی: بەڵێ بێ گومان ناوی ئەو (رەبیعەیە) ........

بەلاّم زانایانی (مەدینە) و شێخەکانی پێ ی دەڵێن (رەبیعەی رەئیی) (ربیعةُ الرَّأي)، لەبەر ئەوەی ئەوان کاتێك کە بۆ مەسئەلەیەکی شەرعی دەقێکیان لە قورئان و فەرموودەی پێغەمبەری خودا، دروودی خودای لەسەر بێ نەدیوە، پەنایان بۆ دەبرد

ئەوجا ئەویش لەو مەسئەلەیەدا بریاردەدا (فیجتهد فیه)........

وە ئەوەی کە دەقی لەسەر نەهاتبوو دەیکێشا (یقبس) بەوەدا کە دەقی لەسەر هاتبوو :

پاشان بە بریارێك بریاری لەسەر ئەو مەسئەلانەوەدا کە ناخەکانی پێ دڵنیا دەبوون و دڵەکان لەسەری ئارامیان دەگرت .

جا (فەرووخ) بە هەناسە برکەوە ووتی: بەلاّم بەراستی تۆ بنەماڵە و هۆزەکەیت بۆ من باس نەکرد .....

لەدوای ئەوە پیاوەکە ووتی: بێ گومان ئەوە (رەبیعەی کوری فەرووخ) نازناوەکەی ناسرابوو بە (ئەبوعەبدورەحمان).........

وە ئەو لەدایك بووە پاش ئەوە كە باوكی (مەدینەی) بەجێ هێشتووە وەك كۆششكارێك (مُجاهد) لەڕێگای خودادا ........ئەوجا دایكی سەرپەرشتی پەروەردە و پێ گەیاندنی كردووە....

ئا لەوێدا دوو فرمێسكی گەورە لە چاوەكانی (فەڕوخەوە) ڕژانە خوارەوە، كە پیاوەكە نەیزانی هۆكارەكەی چی بوو .....

پاشان (فەڕووخ) ڕۆشت و خێرا خێرا هەنگاوی دەهاویشت بەرەو ماڵەكەی ..

جا كاتێك دایكی (ڕەبیعە) بینی و چاوەكانی پڕبوو بوو لە فرمێسك

ووتی :

چ خێرتە ئەی (ئەبا ڕەبیعە) ؟.

(فەرووخ) وەلاَمی دایەوە و ووتی: هیچ شتێكم نی یە جگە لە خێر ....

بەڕاستی (ڕەبیعە)ی كوڕمانم بینی لە ئاستێكدا لە زانست و ڕێزو بەهادا لەمەوپێش كەسێ:ی ترم لەو ئاستەدا نەبینیووە .

جا لەوێدا (دایكی ڕەبیعە) ئەو فرسەتەی قۆستەوەو ووتی :

ئەی باوكی (رەبیعە) كامیان لات خۆشەویستترە .........

سی هەزار (٣٠ ٠٠٠) دینار، یان ئەو پلەو پایە بەرزەی كە كوڕەكەت پێ ی گەیشتووە لە زانست و ڕێزو بەهاداری دا ؟

ئەوجا باوكی (ڕەبیعە) ووتی: بەڵێ سوێند بەخوا ئەوەیان لام خۆشەویستترەو، كاریگەرو بەبەهاترە لە هەموو ماڵ و سامانی دونیا .

پاشان دایكی (ڕەبیعە) ووتی: دەی ئەو پارەی كە لای من بەجێتهێشتبوو لەودا خەرجم كرد تا گەیشتە ئەو ئاستە .

جا ئایا دڵشاد و ناخ ئاسوودە بوویت بەوەی كە ئەنجامم داوە ؟!.

(فەڕووخ) ووتی: بەڵێ .....

خودا لەجیاتی من و (ڕەبیعە) و موسڵمانان باشترین پاداشت بداتەوە ...

بۆ زیاتر شارەزابوون لە ژیاننامەی (ڕەبیعەی ڕەئیی) سەیر بكە :

١- تذكرة الحُفاظ : ١٤٨/١ .

٢- حلية الأولياء : ٣/٢٥٩ .

٣- صفة الصفوة: ٢/٨٣ .

٤- ذيل الذيل : ١٠١ .

٥- تاريخ البغداد: ٨/ ٤٢٠ .

٦- ميزان الأعتدال : ١/ ١٣٦ .

٧- التاج :١/ ١٤١ .

٨- وفيات الأعيان: ٢/ ٢٨٨ .

٩- تأريخ الطبري .

# ١١) ڕەجائی کوڕی حەیوە

**بەڕاستی لە (کندە)دا سێ پیاو هەیە کە بەهۆیانەوە خودا بارمەتی دەنێرێت ..**
**وە سەرکەوتن بەسەر دووژمناندا بەهۆی ئەوانەوە دەسەپێنی ...... یەکێکیان (ڕەجائی کوڕی حەیوەیە)**
**(مەسلەمەی کوڕی عەبدولمەلیک)**

لەسەدەی (قرن) شوێنکەوتوواندا (التابعین) سێ پیاو هەبوون کە خەڵکی ئەو ڕۆژگارەی ئەوان نموونەی ئەوانەیان نەناسیبوو، وە هاوشانیشیانیان بەچاو نەبینیبوو وەك بڵێت لە کاتێکی دیاریکراودا یەکیان گرتبێتەوە، جا ئامۆژگاریکاربوون بەڕاستی و ئارام گرتن و، پەیمانیان دابوو لەسەر خێر و چاکەکردن .

وە ژیانی خۆیانیان ڕاگرتبوو لەسەر خۆپارێزی (تُقی) و زانست (العلم) .

وە ناخی خۆیانیان خستبووە گەڕ لە خزمەتی خودا و، پێغەمبەرەکەید (ﷺ)، کۆی بڕواداران و، تایبەتمەندانیان، ئەوانەش ئەمانە بوون :

أ – (محمدی کوڕی سیرین) لە (عیراق) .

ب – (قاسمی کوڕی ئەبی بەکر) لە(حیجاز) .

ج – (ڕەجائی کوڕی حەیوە) لە (شام) .

جا بفەرموون چەند چرکە ساتێکی پیرۆز بەسەربەرین لە خزمەت ژیانی سێ یەمی ئەو کۆمەڵە بەڕێزە هەڵبژێرراوانە چاکەکارانە (ڕەجائی کوڕی حەیوە).

* * *

لەدایك بوونی لە کۆتایی جێنشینی (عوسمانی کوڕی عەففان) دا یان نزیك لەوە بووە ...

وە ئەو سەر بە هۆزی (کیندە) ی عەرەبی بوو .

جا لەسەر ئەو بنەمایە (رەجاء) (فەلەستینی یە) وەك نیشتمان .....

وە عەرەبی بنچینەی عەرەبی یە ..وە هۆزی لاکیندی یەی ..وە لاوی کندی گەشەی کردو گەورە بوو ،لە گوێڕایەڵی خودادا لە سەرەتای ژیانی یەوە، جا خودا خۆشی دەویست، وە خۆشەویستی کردبوو لەلای بەندەکانی .

وە هەر لەمنداڵییەوە روویکردۆتە فێربوونی زانست تێ گەیشتنی، جا بۆیە زانست دڵەکەی تەڕو و پاراو کردبووە لە هەموو شتێکی دی بەتاڵی کردبووەو، جێگەی خۆی کردبووە وە تیایدا، تیایدا جێگیر بوو بوو

وە ویست و ئاواتی گەورەی تێرخوارد نەوەبوو لە قورئانی پیرۆزو، زیاتر و زیاتر فێربوون و شارەزابوون لە فەرموودەکانی پێغەمبەر (ﷺ) .

جا بۆیە بیروهۆشی ڕووناك بوو بە قورئانی پیرۆز ....

وە دووربینی چاوکراوەیی روون بوویەوە بە ڕێنمایی پێغەمبەریەتی .....

وە دڵی پڕ بوو لە ئامۆژگاری و دانایی ...... ئەو کەسی دانایی دامێنی گیری ببێت ئەوا خێرو چاکەی زۆر دامێنی گیری دەبێت .......

وە زەمینەی بۆ ڕەخسا کە زانست فێر ببێت و وەریبگرێت لە کۆمەڵێکی گەورە و زۆر لە هاوڕێیانی پایەبەرز لە نموونەی ئەوانە :

(ئەبی سەعیدی خودری)و، (ئەبی دەردا)[1] و، (ئەبی ئوماسە) و، (عوبادەی کوڕی سامت) و، (موعاویەی کوڕی ئەبی سوفیان) و(عەبدوڵڵای کوڕی عەمریو کوڕی عاس) و (نەواسی کوڕی سەمعان) و هی تریش .

کە ئەوانە بۆی بوونە چراکانی ڕێنمایی و کوانووەکانی (مشاعل) زانست .

* * *

وە بەڕاست ئەو لاوە خاوەن بەختە یاسایەکی دانابوو بۆ خۆی کە بەردەوام وابەست بوو پێیەوەو، بەردەوام دەیووتەوە، ئەوەندەی ژیانی درێژەی کێشا، جا دەیووت :

---

١/ بڕوانە کتێبی (صور من حیاة الصحابة) هی نووسەر .

لە ئیسلام چاکتر و جوانترین بە کەباوەڕ بیڕازێنێتەوە .......
وە لە باوەڕ باشترو جوانترنی یە کە خۆپارێزی (التقی) بیڕازێنێتەوە .......
وە لە خۆپارێزی چاکتر و جوانتر نی یە کە زانست (العلم) بیڕازێنێتەوە ....
وە لە زانست چاکتر و جوانترنی یە کە کردار (العمل) بیڕازێنێتەوە .....
وە لە کردار چاکتر و جوانتر نی یە کە سۆز و نەرم و نیانی (الرِّفق) بیڕازێنێتەوە ....

وە (ڕەجائی کوڕی حەیوە) بوو بە (وەزیر) ی کۆمەڵێك لە خەلیفەکانی بەنی (ئومەییە)، کەلە (عەبدولمەلیکی کوڕی مەروانەوە) دەستی پێکرد، وە بە (عومەری کوڕی عەبدولعەزیز) کۆتایی پێ هات .

بەڵام پەیوەندیەکەی بە (سولەیمانی کوڕی عەبدولمەلیك) و (عومەری کوڕی عەبدولعەزیزە)وە، لەسەر و پەیوەندیەکانی وە بوو بەوانەی کە لە پێش ئەو دوانەدا بوون .

*　　　　*　　　　*

وە ئەوەی کە نزیکی خستبومەوە وە لەدڵ و دەروونی خەلیفەکانی بەنی (ئومەییە) وە: خێرایی و پێکان لەڕا دەربڕینی دا ...
وە ڕاستگۆیی لە ڕاوێژی دا ...
هەروەها دڵسۆزی لەنیی یەتیدا ...
وە دانایی لە چارەسەرکردنی کارو بارو کێشەکاندا ...

وە ئەوانەی تاجگوزار کردبووەوە بەبێ باکی و گوێنەدان بەوەی کەلە شتە دونیایی یەکان کەلەژێر دەستی خەڵکیدا بوو، وە خەڵکی لێ ی کۆدەبوونەوەو ملی خۆیان بۆ دەشکان .

جا (خەلیفەکانی) بانگهێشت دەکرد بۆ ئەنجامدانی چاکەو خێر، وە ڕێنمایی دەکردن بۆ ڕێگەکانی ...

وەلایەدان لە شەڕو خراپەو، دەرگای خراپەی بەڕوویاندا دادەخست ... وەڕاستی بۆ ڕووناکدەکردنەوەو، شوێنکەوتنی ڕاستی بۆ دەڕازاندنەوەو جوانی دەکرد لەبەرچاویان .....

هەروەها بەرچاوو ڕوونی دەدانێ دەربارەی ناڕەوایی، وە ئەنجامدانی قێزەوون دەکرد لەلایان ...

جا بەردەوام ئامۆژگاری دەکرد بۆ پەیڕەوی کردن لەفەرمانەکانی خودا شوێن پێ هەڵگرتنی پێغەمبەرو، گوێڕایەڵی فەرمانڕەوایانی ئیسلام و، موسڵمانان بەگشتی ...

بەڕاستی چیرۆکێك (ڕووداوێك) ڕوویدا کە ڕێگای بۆ (ڕەجا) ڕوونکردەوە لەپەیوەندی و تێکەڵاویدا لەگەڵ خەلیفەکانی بەنی (ئومەییە)دا وەگرنگی یەتی ئەوی دەستنیشان کرد لەگەڵیاندا، کە خۆی گێڕایەوەو، ووتی:

بەڕاستی من ڕاوەستابووم لەگەڵ سولەیمانی کوڕی عبدولمەلیك) دا لەناو کۆمەڵێك ی زۆر لە خەڵکیدا، کەبینیم پیاوێك لەناو قەرەباڵغی یەکدا بەرەو ڕوومان هات ...

وە سەیرم کرد سیماو شێوەیەکی جوان بەڕێزی هەبوو، بەردەوام ڕیزبەنی یەکانی دەبڕی، وەمن گومانی ئەوەم نەبوو کە ئەو خەلیفەی مەبەستە، هەتا گەیشتە لای من و لەتەنیشتمەوە ڕاوەستاو ووتی:

ئەی (ڕەجاء) ....

بەڕاست تۆ تووشبوویت بەو پیاوەوە .جا ئاماژەی کرد بۆ خەلیفە .

جا لەنزیکیدا لێوەی خێرو چاکەیێکی زۆر یان خراپەیەکی زۆر هەیە ...

وابکە کە نزیکیت لێوەی خێرو چاکە بێت بۆ خۆت و ئەوو خەڵکیش ...

وە بزانە ئەی (ڕەجا ) بێ گومان ئەو کەسەی کە پلەو پایەیەکی هەیە لەلای خەلیفە، وە پێویستی کەسێکی بێ دەسەڵات و لاوازی بۆ بەرز دەکاتەوە، کە خۆی توانای نی یە بیگەیەنێتە لای، خودای بالآدەست لە ڕۆژی ڕووبەڕوو بوونەوەدا، ڕووبەڕووی دەبێتەوەو ڕاوەستاوی دەکات و، جێگیری دەکات و لەترس و لەرزە دەیپارێزێت لەکاتی حساب لەگەڵ کردنداو، حسابی لەگەڵ ئاسان دەکات ...

وە ئەی (ڕەجاء) ئەوە بیر بێنەرەوە یادی خۆت. بەڕاستی هەرکەس بەدەم پێویستی و ئاتاجی برایەکی موسڵمانە یەوە بێت، خوداش بەدەم پێویستی و ئاتاجی ئەوەوە دەبێت .

وەبزانە ئەی (ڕەجاء) لە خۆشەویستترین کردارەکانی بەندەکان لەلای خودا، دڵخۆش کردنی موسڵمانێکە .

لەکاتێکدا کە من سەرنجی ووتەکانیم دەداو، چاوەڕێی ئەوە بووم کە بۆم زیاتر بکات، خەلیفە بانگی کردوو ووتی:

(ڕەجائی کوڕی حەیوە) لە کوێ یە؟

جا منیش لام کردەوە بەلایەوەو ووتم ؟



ئائەوەتام ئەی (ئەمیری بڕواداران) .

جا دەربارەی شتێك پرسیاری لێکرد، هەرئەوەندەی لە وەلآمەکەی تەواو بووم، لامکردەوە بەلای هاوڕێکەمدا، بەلآم نەمبینی یەوە ...وە شوێنەکەی بەدووادا گەڕام چۆن گەڕانێك، بەلآم لە نێو خەڵکەکەدا شوێنیم هەڵنەگرت و نەمبینی یەوە.

وە (ڕەجائی کوڕی حەیوە) کۆمەڵێك هەڵوێستی ڕاست و ڕەوانی تۆمارکردووە لەگەڵ خەلیفەکانی بەنی (ئومەییە) دا، کەبەردەوام مێژوو لە جوانترین لاپەڕەکانی دا دەیپارێزێت، وەنەوەکانی ڕاهاتوە دەماو دەم لە پێشینیانیانەوە دەیگێڕنەوە .

لە نمونەی ئەوە ڕۆژێکیان ئەو لە کۆڕی (عەبدولمەلیکی کوڕی مەروان) بوو، کە باسی پیاوێکیان بۆ خەلیفە کرد کە گوایە نی یەت و هەڵوێستی خراپە بەرامبەر (بەنی ئومەییە) وە پیێ ی ووترا:

کە ئەو پیاوە نی یەت خراپە پڕو پاگەندە بۆ (ئیبن ی زوبەیری دەکات و، هەوڵی سەرکەوتنی دەدات ... وە تێکدەرەکە ئەوەندەی باسکرد لە کردارو گوفتاری ئەو پیاوە هەتا خەشم و کینی خەلیفەی ووروژاندو جا ووتی: سوێند بێ بە خودا هەر ئەوەندە خودا دەسەلآتم بدات، دەستم لیێ ی گیر ببێت ئەوەو، ئەوەی پیێ دەکەم ...

وەشیر دەخەمە سەر گەردنی .

کات زۆر تێ نەپەڕی تا خودای خاوەن دەسەلآت وویستی وەها بوو کە پیاوەکە بکەوێتە ژێر دەسەلآتی خەلیفە، وەپەلکێش کرا بۆ لای چۆن پەلکێش کردنێك .

جا کاتێك کە چاوەکانی ئاڕاستە کردوو سەرنجی دا، لەوە بوو کەلەڕقدا پارچەپارچە بێت، وەبڕیاریداو سووربوو لەسەر ئەوەی کە ئەو هەڕەشەی لیێ کردبوو جیێ بەجیێ بکات ...

جا ئا لەو کاتەدا (ڕەجائی کوڕی حەیوە) لە خزمەتی خەلیفەدا هەستایە سەرپیێ و ڕاوەستاو، ووتی:

ئەی ئەمیری بڕواداران ...

بەڕاستی خودای بالآدەست ئەوەی کە پێت ناخۆش بوو لەدەسەلآت بۆی ئەنجام دایت و بۆی بەدیهێنایت، دەی جەنابیشت ئەوەی کە خودا پیێ ی خۆشە لەلێ بووردن لەبەرخاتری ئەو جیێ بەجیێ ی بکە ...

ئالەو کاتەدا کە خەلیفە گوێبیستی ووتەکەی (ڕەجا) بوو، ناخی ئارام بوویەوە، وەبێ دەنگ بوو بەرامبەری و ڕقەکەی نیشتەوەو ... لە پیاوەکە بووردو، بەرەلآی کردو، چاکەشی لەگەڵ کرد ....

* * *

وەلەساڵی نەوەدو یەك دا (وەلیدی کوڕی عەبدولمەلیك) حەجی کرد، وە (ڕەجائی کوڕی حەیوە) ی لەگەڵ دا بوو .

کاتێك هەردووکیان گەشتنە (مەدینە) و سەردانی مزگەوتی پیرۆزی پێغەمبەریان کرد، کە (عومەری کوڕی عەبدولعزیز) هاوڕێیەتی دەکردن .

وە (خەلیفە) ئارەزووی ئەوەی هەبوو کە بڕوانێتە (حەرەمی نەبەوی) واتە (گۆڕو مینبەر و ماڵەکەی پێغەمبەر (ﷺ))، سەیرکردنێکی بەسەرنج و پاراوکەر .

کاتێك کە ڕێگەی بۆ فراوان کرا تا دوو سەد باڵێکی مابوو بۆ (حەرەم) .

ئەو جا خەڵکەکە لە مزگەوت وە دەرنران تا (خەلیفە) بتوانێت سەرەنجەکەی بدات .

وە کەس لە مزگەوت دا نەما جگە لە (سەعیدی کوڕی موسەییەب)، کەکەس لەپاسەوانەکان نەیوێرا وەدەریبنێ.

جا (عومەری کوڕی عەبدولعەزین)- کە ئەو کاتە والی (مەدینە) بوو -

کەسێکی نارد بۆ لای (سەعید) و پێ ی ووت:

ئەگەر لە مزگەوت بچیتە دەرەوە باشترە وەك خەڵکی چوونەتە دەرەوە .

(سەعیدی کوڕی مەسەییەب) ووتی: مزگەوت بەجێ ناهێڵم هەتا ئەو کاتەی کەلەسەری ڕاهاتووم بۆ بەجێ هێشتنی هەموو ڕۆژێك .

جا پێی ووترا: ئەگەر هەستیت و ئەو جا سلآو لە (ئەمیری بڕواداران) بکەیت باشترە

(سەعید) لە وەلآمدا ووتی: بەڕاستی من هاتووم بۆ ئێرە تا لەنێوان دوو دەستی پەروەردگار دا ڕابووەستم .

جا کاتێك کە (عومەری کوڕی عەبدولعەزین) ئاگای لەوە بوو کەلە نێوان (سەعید) و ڕەوانەکراوەکەیدا ڕووی دا ...

ناچار وایکرد کە (خەلیفە) لابداو دوور بخاتەوە لەو شوێنەوە کە (سەعیدی) تیایە



وە (ڕەجائی کوڕی حەیوە) بەگفتوگۆ وە خەریکی کرد، چونکە ئەوان هەردووکیان شارەزای لە خۆڕازیبوون و چڕی هەڵچوونی (خەلیفە) بوون ...

ئەوجا (وەلید) پیێ ی ووتن:

ئەو (شێخە) کێ یە ؟ ...

ئایا ئەوە (سەعیدی کوڕی مەسەیەب) نی یە ؟...

ووتیان: بەڵێ ئەی (ئەمیری بڕواداران)

جا دەستیان کرد بە باسکردنی ئاست بەرزی لە دین و زانست و، خۆپارێزیدا.

ئەو جا ووتیان :

ئەگەر (شێخ) شوێنی (ئەمیری بڕواداران) شارەزا بووایە هەڵدەستاو سلاّوی لێدەکرد، بەلاّم لە ڕاستیدا ئەو چاوی کزە ...

جا (وەلید) ووتی: بەڕاستی منیش دەربارەی ئەوە دەزانم کە ئێوە باستانکرد..

وە ئەو شایستەی ئەوەیە کە بچین بۆلای و سلاّوی لێبکەین.

پاشان لەناو مزگەوتەکەدا لای دا هەتا هاتە لای، وەبەسەریەوە وەستاو، سلاّوی لێکردو ووتی:

(شێخ) چۆنە؟

(شێخ) لە شوێنەکەی هەڵنەساو، ووتی:

بەسایەی خوداوە، سوپاس و ستایش بۆ ئەو ...

جا ووتی: چۆنە (ئەمیری بڕواداران)، ووتی: خودا تەوفیق و یارمەتی بدات بۆ جێ بەجێ کردنی ئەوەی کە خۆی پیێ ی خۆشەو پێی ڕازی یە ...

جا (وەلید) ڕووی وەرگێڕا و ڕۆشت و دەیووت:

ئەمەیە ماوەی(بَقِيَّة) خەڵکی ...

ئەمەیە ماوەی پێشینەی ئەم ئوممەتە ...

* * *

وەکاتێك کە جێنشینێ یەتی کەوتە دەستی (سولەیمانی کوڕی عەبدولمەلیك)، (ڕەجائی کوڕی حەیوە) لەلای ئەو پلەیەکی شان و شکۆیەکی هەبوو کەلەسەروی ئەوەوە بوو کە هەیبوو لەلای پێشینەکانی ئەو .

بەڕاستی (سولەیمان) متمانەی تەواوی پیێ ی بوو، زۆر باوەڕی لەسەری بوو، وەسوور بوو لەسەر ڕاوەگرتنی لە هەموو کاروبارێکی بچووك و گەورەدا ...

وەهەلوێستەکانی (ڕەجائی کوڕی حەیوە) لەگەڵ (سولەیمان ی کوڕی عەبدولمەلیك) دا زۆر کاریگەرو هەژێنەر بوو .

بەتایبەتی لەو کارانەدا کە گەورەترین مەترسی هەبوو لەسەر ئیسلام و موسڵمانان، وەك هەڵوێستی لەکاتی دانانی جێ نشین دا (ولِيّ العهد)، وەکاریگەری لەبەرچاوی لە دانانی (عومەری کوڕی عبدولعزیز) و بەیعەت کردنی پێ ی .

(ڕەجائی کوڕی حەیوە) دوواو ووتی :

یەکەم ڕۆژی هەینی بوو لە مانگی (سەفەر) ساڵی نەوەدو نۆ، کەئێمە لەگەڵ ئەمیری بڕواداران دا (سولەیمانی کوڕی عەبدولمەلیك) دا بووین لە (دابیق)[1] .

لەپاشدا ڕۆژ بە ڕۆژ نەخۆشیەکەی قورستر دە بوو بەسەریەوە .

وە ئەو داوای لێکردم کەبەردەوام نزیك بم لیّ یەوە .

جا ڕۆژێك چوومە لای بینیم نامەیەك دەنوسێت .

پێم ووت: چی دەکەیت ئەی (ئەمیری بڕواداران) ؟.

ئەویش ووتی: نامەیەك دەنووسم کە تیایدا جێ نشینی تیا دەستنیشان دەکەم بۆ (ئەییوبی کوڕم)... منیش ووتم: ئەی ئەمیری بڕواداران .

بەڕاستی لەو شتانەی کە (خەلیفە) بپارێزێت لە گۆڕەکەیدا، وەگەردن ئازاد بکات لەلای پەروەردگاری ئەوەیە کە پیاوێکی ساڵح و کار دروست بکاتە جێ نشینی بەسەر خەڵکی یەوە .

وە بەڕاستی (ئەییوبی) کوڕت لاوێکە نەگەیشتۆتە تەمەنی بەرپرسیارییەتی، وەچاکی و خراپی ئەوت بۆ ڕوون نەبووەتەوە، واتە ئایا کەسێکە چاکە یان خراپە ...

جا خەلیفە کە گوێبیستی ئەوە بوو، بەخۆیدا چوویەوەو ووتی : بەڕاستی ئەو تەنها نووسراوێك بوو کە نووسی بووم .....

وە من دەمەوێت لەو کارەدا ڕاگیری خودا بکەم (أستغفر الله فيه) ........

وە من بڕیاری کۆتاییم لەسەر نەداوە .......

پاشان نوسراوەکەی دڕاند .....

وە لەدوای ئەوە ڕۆژێك یان دوو ڕۆژی پیّ چوو، پاشان بانگی کردم وە ووتی :

---

[1]- دیّ یەکە نزیك (حەڵەب) لە سوریا کە (بەنی ئومەمیە) لەویّ دادەبەزین کە بیانویستایە غەزای ولاّتی ڕۆم بکەن ... وەگۆڕی (سولەیمانی کوڕی عەبدولمەلیکی) لیّ یە .



ڕات چی یە دەربارەی (داود)ی کوڕم ئەی (ئەبەلمیقداد)؟.

منیش پێم ووت : ئەو نادیارە لەگەڵ سوپای موسڵمانان لە (قوستەنتینیە یە) .....

وە جەنابیشت نازانیت ئایا ئێستا ئەو زیندووە یان مردووە ؟.

دوای ئەوە ووتی: دەی تۆ کێ بە شایستە دەبینی ئەی (ڕەجاء) ؟.

ووتم: ڕاو بڕیار لای جەنابتە ئەی (ئەمیری بڕواداران).........

وە من ئەم ویست ئەوانە ببینم کە ناویان دەهێنێ بۆ ئەوەی یەکە یەکە وەلایان بنێم، هەتا (خەلیفە) دەگاتە (عومەری کوڕی عەبدولعەزیز).

پاشان ووتی: (عومەری کوڕی عەبدولعەزیز) چۆن دەبینی ؟.

منیش لە وەڵامیدا گوتم: سوێند بەخوا نەم ناسیووە، کە ناسیوومە- کەسایەتی یەکی گەورەو، بەڕێز و، تەواو و، ژیر و، دیندار بووە ......

جا (خەلیفە) ووتی: ڕاستت ووت ......

سوێند بەخوا ئەو وەهایە ...

بەڵام بەڕاستی ئەگەر من ئەوم دانابە جێ نشین و، کوڕانی (عەبدولمەلیکم) پشت گوێ خست بێ گومان دەبێتە ئاژاوەو، هەرگیز وازی لێناهێنن کە جێنشین بێت بەسەریانەوە .........

ئا لەوێدا منیش ووتم : یەکێکیان بکەرە هاوبەش لەگەڵیا و لەدوای ئەو دایبنێ.

جا (خەلیفە) ووتی: بەڕاستی بۆی چوویت، ئەوە لەوەیە دایانبمرکێنی و، وایان لێبکات کە ڕازین پێ ی .......

پاشان تیانووسەکەی وەرگرت و بەدەستی خۆی نووسی :

بِسمِ اللهِ الرّحمانِ الرّحيم (بەناوی خودای ڕۆزیدەر و میهرەبان)

ئەمە نووسراوێکە لە بەندەی خوداوە (سولەیمانی کوڕی عەبدولمەلیکەوە) ئەمیری بڕواداران بۆ (عومەری کوڕی عەبدولعەزیز)، من جێ نشینی یەتیم خستە ئەستۆی ئەو لە دوای خۆم، وە لە دوای ئەو خستمە ئەستۆی (یەزیدی کوڕی عەبدولمەلیك).

جا گوێ بیستی بین و گوێ ڕایەڵی بن، وە شەرم لە خودا بکەن و لێ ی بترسن، وە ناکۆك نەبن تا تەماکاران تەماتان تێ بکەن .....

پاشان نووسراوەکەی مۆرکردوو، دایە دەستم .......

ئەوجا ناردی بە دوای (کەعبی کوڕی حامین) دا بەڕێوبەری پۆلیس و پێ ی ووت : بانگهێشتی ئەندامانی بنەماڵەکەم بکە با کۆببنەوە .......



وە ئاگاداریان بکە کە ئەو نووسراوەی وا لەلای (ڕەجائی کوڕی حەیوە) ئەوە نووسراوی منە .... وە فەرمانیان پێ بدە بەوەی کە بەیعەت بدەن بەو کەسەی کە تیایدایە .

(ڕەجا ) ووتی :-

جا کاتێك کە کۆبوونەوە پێم ووتن: ئەوە نووسراوی (ئەمیری بڕوادارانە) وە تیایدا جێ نشینی دەستنیشان کردووە لە دوای خۆی، وە فەرمانی بەمن کردووە کە بەیعەت وەربگرم لە ئێوە بۆ ئەو کەسەی کە خەلیفە دەستنیشانی کردووە ، ئەوجا ووتیان: گوێبیستین بۆ فەرمانەکانی ئەمیری بڕواداران، وە گوێڕایەڵی بۆ جێ نشینەکەی لەدوای ئەو .....

ئەوجا داوایان کرد کە ڕووخسەتیان بۆ وەربگرم تا بچنە خزمەتی (ئەمیری بڕواداران) و سلاوی لێ بکەن ....

منیش ووتم : بەڵێ

جا کاتێك چوونە خزمەتی، (خەلیفە) پێ ی ووتن :

بێ گومان ئەو نووسراوەی کە لەلای (ڕەجائی کوڕی حەیوەیە) ئەوەی نووسراوی منە، وە تیایدا پەیمان و بڕیاری من بۆ ئەو کەسەی کە دەبێتە جێ نشین (خەلیفە) لەدوای من، جا گوێبیستی بن وە گوێڕایەڵی ئەو کەسە بن کە دەستنیشانم کردووە، وە بەیعەت بدەن بەو کەسەی کە ناوم بردووە لەو نووسراوە دا ...

جا دەستیان پێ کرد بەیعەتیان دەکرد پیاو لەدوای پیاو .......

پاشان چوومە دەرەوە و نووسراوەکەم بە مۆرکراوی پێ بوو ......یەك کەس لە خەڵکی نەیدەزانی کێ ی تیایە جگە لە من و ئەمیری بڕواداران .

جا کە خەڵکی بلاوەیان کرد، (عومەری کوڕی عەبدولعەزیز) هات بۆلام و ووتی: یا (ئەبالمیقدام)...

بێ گومان (ئەمیری بڕواداران پیاوێکە کە گومانی باشی هەیە بەرامبەر بە من، وە لە بەخشندەیی چاك و دۆستایەتی بێ گەردی شتی زۆرم دەداتێ ....

وە من لەوە دەترسم کە لەو کاروبارە شتێکی دابێتە پاڵم، جا سوێندت دەدەم بەخوا و بەوڕێز و دۆستایەتی یەی نێوانمان کە ئاگاداری بکەیت، ئەگەر لە نووسراوەکەی (ئەمیری بڕواداران) دا شتێك هەیە تایبەتمەند بێت بە منەوە، تا داوای لێبوردن بکەم لەوەو وازی لێ بهێنم پێش لە دەستدانی فرسەت.

ووتم پێ ی:

نا سوێند بەخوا من ئاگادارت ناکەم بە یەك پیت لەوەی پرسیارت دەربارەی کردووە ..........

پاشان بە توورەیی یەوە لێم رووی وەرگێڕاو لیٚ یدا ڕۆشت .

پاشان زۆری پیٚ نەچوو کە (هیشامی کوڕی عەبدولمەلیك) هات بۆ لام و، ووتی:

ئەی (ئەبالمیقدام)، بەڕاستی من لەلای تۆ ڕێزوو دۆستایەتیی یەکی لە مێژەم هەیە، وە بەڕاستی تۆش لەلای من شایانی سوپاسێکی بیٚ پایان بوویت، جا تکام وایە ئاگادارم بکەیت لەوەی کە لە نووسراوەکەی (ئەمیری بڕواداران) دایە.

جا ئەگەر ئەو فەرمانە بۆ من بێت ئەوا بیدەنگم .......

خۆ ئەگەر جگە لەمن بۆ کەسێکی دی بێت دێمە گوفتار .... چونکە لە نموونەی من نی یە کە شایستە بێت بۆ ئەو فەرمانە .

وە لەسەر دەستی خودادا پەیمانت دەدەمیٚ کە هەرگیز ناوت نەبەم .

ئەوجا منیش پێم ووت :

نابێت، سوێند بەخودا ئاگادارت ناکەم لەوەی کە (ئەمیری بڕواداران) بەنهێنی لەلایەن من دای ناوەو متمانەی بەمن بووە وە بڕیارم داوە کە نهێنی یەکەی دەپارێزم تاکاتی خۆی .

ئەوجا لێداو ڕۆی و هەر لەپی دەستەکانی دەدا بەیەکدا و دەیووت :

ئەبێت ئەو فەرمانە بۆ کیٚ بێت، ئەگەر من شایستە نەبم بۆی ؟!...

ئایا جیٚ نشینی لە دەستی نەوەکانی (عەبدولمەلیك) دەردەچێت ؟!...

سوێند بەخودا من گەورە و ماقوڵترین کوڕەکانی (عەبدولمەلیکم) .

پاشان چوومەوە خزمەتی (سولەیمانی کوڕی عەبدولمەلیك) کە گیانی دەدا، جا کە ئازارێك لە ئازارەکانی گیانکێشان دایدەگرت، ڕوویم بەرەو ڕووگە (قبلە) وەردەگێڕا، جا ئەویش پیٚ دەووتم بەدەم هەناسەبڕکیٚ وە ئەی (ڕەجاء) هێشتا کاتی نەهاتووە .

هەتا ئەو کردارەم دووجار دووبارەکردەوە، جا کە سیٚ یەم جار وام لێکردەوە ووتی :

ئەی(ڕەجاء) ئا ئێستا .......ئەگەر دەتەوێت شتێك بکەین بیکە ..

(أَشهَدُ أَنْ لا إلهَ إلاَّ اللهُ، وَ أَنَّ مُحَمَّداً رَسُول اللهِ) .

جا بەرەو ڕووگە رووم وەرگێڕاوە، ئەوجا زۆری پیٚ نەچوو، گیانی بەخشی .

* * *



ئا لەوکاتەدا چاوەکانیم نوقاند و، بە پارچە قەیفەیەکی سەوز دام پۆشی، وە دەرگاکەم لەسەر داخست و دەرچووەمە دەرەوە .

ئا لەوکاتەدا هاوسەرەکەی کەسێکی ناردبوو بۆلام کە دەربارەی پرسیارم لێ بکات، وە داوای کردبوو کەبیبینێ .

ئەوجا منیش درزێکی دەرگاکەم بۆ کردەوەو بەرەوانەکراوەکەیم ووت :

فەرموو بۆی بڕوانەو سەرنجی بدە، لەپاش شەونخوونی یەکی دوور و درێژ بۆ خۆی نووستووە،وازی لێ بهێنە .

ئەوجا ئەویش گەڕایەوە و هاوسەرەکەی لەوە ئاگادار کرد، ئەویش ئەوەی پەسەند کردوو، دڵنیابوو کە (ئەمیر) نووستووە .

پاشان بەباشی دەرگاکەم داخست، وە پاسەوانێکم لەلا دانا کە متمانەم پێ ی بوو، وە ئامۆژگاریم کرد کەلە شوێنەکەیدا نەجووڵێ تا من دەگەڕێمەوە، وە نابێت هیچ کەسێك سەردانی (خەلیفە) بکات هەرکەسێك بێت ........

وە ئیتر ڕێم بەڕێ کرد، و خەڵکیم پێ دەگەیشتن و دەیان ووت :

(ئەمیری بڕواداران) چۆنە ؟

منیش لە وەڵامیان دا ووتم: بەڕاستی لەوکاتەوە نەخۆش کەوتووە ئەوەندەی ئێستا ئارام وبێ دەنگ نەبووە .

ئەوانیش ووتیان : سوپاس بۆ خودا .

پاش ئەوە ناردم بۆلای (کەعبی کوڕی حامین) بەڕێوەبەری پۆلیس، ئەویش هەموو ئەندامانی خانەوادەی (ئەمیری بڕوادارانی) کۆکردەوە لە مزگەوتی (دابیق) دا .

پاشان منیش پێم ووتن: بەیعەت بدەن بەو کەسەی کە لە نووسراوی (ئەمیری بڕواداران) دایە .

ئەوانیش ووتیان : جارێك بەیعەتمان داوە وا جارێکی تریش بەیعەت بدەینەوە؟!

منیش ووتم : ئەوە فەرمانی ئەمیری بڕوادارانە ......

جا فەرموون بەیعەت بدەن لەسەر ئەوەی کە ئەمیر فەرمانی پێداوە .

وە بەو کەسەی کە ناویبراوە لەو نووسراوە مۆرکراوەدا .

ئەوجا پیاو لەدوای پیاو بەیعەتیان دا .

جا کەسەیرم کرد بەڕاستی کارەکەم بە تەواوی بنج بەست کردووکێشەی تیا نەما .....ووتم :

دڵنیابن هاوڕێکەتان واتە (ئەمیر) وەفاتی کردووە، وە (إِنَّا للهِ وَ إِنَّا إِلَيْهِ رَاجِعون).

جا نووسراوەکەم بۆ خوێندنەوە، جا کە گەیشتمە سەر ناوهێنانی (عومەری کوڕی عەبدولعەزین)، (هیشامی کوڕی عەبدولمەلیك) بانگی کردو دەنگی بڵند کرد :

ئێمە هەرگیز بەیعەت نادەین ....... منیش ووتم :

کەوابوو سوێند بەخودا – ئەدەم لە گەردنت .....

هەستەو بەیعەت بدە .

جا هەستاو قاچەکانی ڕادەکێشا ....... جا کە گەیشتە لای (عومەر) ووتی:

(إِنَّا للهِ وَ إِنَّا إِلَيْهِ رَاجِعون) واتە خۆی تەسلیمی قەدەری خودا کرد کە جیٚ نشینی یەتی کەوتە ئەستۆی (عومەری کوڕی عەبدولعەزین) نەك ئەوو براکانی لە نەوەکانی (عەبدولمەلیك).

وە (عومەریش) ووتی: (إِنَّا للهِ وَ إِنَّا إِلَيْهِ رَاجِعون) واتە ڕازیبوون بەقەدەری خودا بەوەی کە جیٚ نشینی یەتی کەوتە ئەستۆی ئەو بەبیٚ ئەوەی کە حەزی لیٚ ی بێت بەڵکو بەلاشی یەوە ناخۆش بوو .

جا چۆن بەیعەتێك بوو، بەیعەتێکی وەها کە لاویەتی سەر لە نویٚ کردەوە بە بەری ئیسلامدا و، ڕووناکبینی یەتی بۆ دین بەرز و بڵند کردەوە ...

*　　　　*　　　　*

دەیاخوا بەهەشت و بەختەوەری ناوبەهەشت بۆ (خەلیفەی موسڵمانان) (سولەیمانی کوڕی عەبدولمەلیك) بێت .......

بەڕاستی ئەو لێپرسراوی یەتیەی کە لە گەردنیدا بوو لە بەردەمی (خودا)ی باڵادەستدا لە گەردنی خۆیدا ماڵی بە دانانی پیاوێکی ساڵح و خوداناس و خۆپارێز بۆ جیٚ نشینی یەتی .

پیرۆزبایی و دەستخۆش بۆ وەزیری ڕاستگۆو ڕاست ڕەو (ڕەجائی کوڕی حەیوە).

بەڕاستی ئامۆژگاری ئەنجام دا بۆ گوێڕایەڵی خوداو شوێن پیٚ هەڵگری پێغەمبەر و گوێبیستی زانایان ی موسڵمانان .

خودای باڵادەست پاداشتی تایبەتمەندان و ڕاوێژکارانی چاك و چاك ویستی (خەلیفە) بداتەوە........

وە بە پاداشتی نەبڕاوەی خۆی شادیان بکات .

کە بە ڕووناکی رای ئەوان خاوەن دەسەڵاتان لە خاوەن بەخت و سەرکەوتووان ڕێیان دەردەکرد .

*　　　　*　　　　*

**خودایە ڕاستڕەوی و ڕاستگۆیی و دانایی ڕەجائمان پێ ڕەوا ببینە ئەوەندەی لە دونیادا دەژین .**

**بۆ زیاتر شارەزا بوون لە ژیانی (ڕەجائی کوڕی حەیوە) بڕوانە :**

**١- الطبقات الكبرى لابن سعد : ٥/ ٣٣٥ – ٣٣٩ ، ٣٩٥، ٤٠٧ .**
**٢- صفة الصفوة لابن الجوزي : ٤/ ٢١٣ .**
**٣- حلية الأولياء للأصفهاني : ٥/ ١٧٠ .**
**٤- البيان و التبين للجاحظ : ١/ ٣٩٧، ٢/ ١٠٧، ٣٢٢ .**
**٥- تهذيب التهذيب لابن حجر: ٣/ ٢٦٥ .**
**٦- تأريخ الطبري لابن جرير الطبري : ٦/ ٣٦٥ – ٢٧٠ .**
**٧- وفيات الأعيان لابن خلكان : ١/ ٤٣٠، ٢/ ٣٠١- ٣٠٣ - ٧/ ٣١٦ .**
**٨- العقد الزيد لابن عبد ربه : ٢/ ٥٠، ٨٢، ٢٣٥ و٣/ ٨٦، ١٠٥، ٣٠٦ .**
**٩- تأريخ خليفة بن خياط: ٣٥٧ .**



# ١٢)عامیری کوڕی شورا حەبیل

**(شەعیبی کەسێکی زانست فراوان و زۆر لەسەرخۆ و حەلیم بوو.....**
**وە بەڕاستی ئەو لە ئیسلام دا خاوەن پایە بوو .....)** **(حەسەنی بەصری)**

شەش ساڵ تێ پەڕیبوو بەسەر جێ نشینی (فاروق) دا (ڕەزای خودای لەسەر بێت)، کە خودای بالآدەست کۆرپەیەکی بەخشی یە موسڵمانان، کە کورێکی تەن لاوازی، بچووك بوو .

ئەوەش لەبەر ئەوەی براکەی لە منداڵی دایکی دا تەنگی پێ هەڵچنیبوو، وە ماوەی بۆ گەشەکردنی نەهێشتبووەوە ........

بەڵام لە دوای لە دایك بوونی نە ئەو نەکەسانی دیکەش نەیانتوانی تەنگی پێ هەڵبچنن لە بوارەکانی زانست و، لەسەرخۆی و، لەبەرکردن و، تێ گەیشتن و، هێزی داهێنان دا .

جا ئێوەو ئەو کۆرپەیەتان کە (شورا حەبیلی حەمیرییە کە ناسراوە بە (شەعیبی) .....

هەڵکەوتووی موسڵمانان لە چاخی خۆی دا .

* * *

(شەعیبی) لە(کوفە) لە دایك بووە و هەر لەوێش گەشەی کردووە بەڵام بێ گومان (مەدینەی مونەووەرە) هیوا و خواستی دڵەکەی و، تەماگای ناخی بوو، جا بۆیە بەیناو بەین سەردانی دەکرد، تا لەوێ بە خزمەتی هاوڕێیانی پایەبەرزی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بگات و، ئەوەی کە مەبەستی بوو لە زانست لێیانەوە فێر ببێت، هەر وەك

هاوڕێیانی پایەبەرزیش سەردانی (کوفە) یان دەکرد تا بیکەنە بازگەیەك بۆ جیهاد لە ڕێگای خودادا، یان بیکەنە پێگەیەك بۆ جێ نشینیان .

جا ئەوە کاری بۆ ئاسان کرد تا بە خزمەتی نزیکەی پێنج سەد (٥٠٠)کەس بگات لە هاوڕێیانی پایەبەرز، وە لە ژمارەیەکی زۆریانەوە دەقە قورئانی وفەرموودەکان بگێڕێتەوە لە نموونەی ئەوانە :

(عەلی کوڕی ئەبی تالب) و(سەعدی کوڕی ئەبی وەققاص) و(زەیدی کوڕی سابت)و (عوبادەیکوڕی صامت) و(ئەبی موسای ئەشعەری) و(ئەبی سەعیدی خودری) و (نوعمانی کوڕی بەشیر) و(عەبدوڵڵای کوڕی عومەر) و (عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس) و(عەدیی کوڕی حاتیم) و (ئەبی هورەیرە) و (عائیشەی دایکی بڕواداران)و، هی دیکەیش جگە لەوانە .

* * *

(شەعبی) لاوێکی خاوەن زیرەکی یەکی بێ سنوور و کڵپەدارو، دڵێکی زیندوو بیرێکی وورد، تێ گەیشتنێکی پووخت بوو، نموونەیەکی بێ وێنەبوو لە بەهێزی لەبەرکردن و ووتنەوەدا .

گێڕراوەتەوە لێ ی کە خۆی ووتوویەتی :

هەرگیز ووتەیەکم نەنووسیووە، یان یەکێك قسەیەکی بۆ نەکردووم کە لەبەرم نەکردبێ، وە گوێبیستی ووتەو باسێك نەبووم لە کەسێکەوەو، دوایی حەزم کردبێ کە دیسان بۆم دووبارە بکاتەوە، واتە خێرا لە بەرم کردووە، وە ئەو لاوێك بووە وابەست بە زانستەوە، حەزم کردوو لە زانیاری و رام بوون لەگەڵیدا .

وە لە ڕێگای بە دەست خستنیان دا هەرچی بە نرخ بوو لە گیان و ماڵ دەیبەخشی و خەرجی دەکرد، وە لەبەرخاتری ئەوە هەموو چەرمەسەرێیەکی لاپەسەند بوو ......

لەو بارەوە دەیووت :

خۆ ئەگەر پیاوێك ڕێ بە ڕێ بکات لە کۆتایی (شامە) وە بۆکۆتایی (یەمەن)، ئەوجا یەك ووشەی لەبەرکرد کەلە داهاتووی تەمەنیدا سوودی پێ بگەیەنێ، وادەبینم کەسەفەرەکەی لەکیس نەچووە .

وەلەزانستی دا گەشتبووە ئاستێك کە دەیفەرموو: کەمترین شتێك کەفێری بووم هۆنراوەیە(الشعر)

ئەگەربمەوێت هۆنراوەتان بۆبهۆنمەوە، ماوەی مانگێك هۆنراوەتان بۆ دەهۆنمەوە، بەبێ ئەوەی کەهیچ شتێك دووبارەبکەمەوە لەوەی کەهۆنیومەتەوە .

* * *

وەجارێك کۆڕێکی بەست لەمزگەوتی(کوفە)، خەڵکی بەدەوریدا کۆمەڵ، کۆمەڵ دەوریان دا، وەهاوڕێیانی پێغەمبەری خودا (ﷺ) کەلەوێ زیندوو مابوون، دەهاتن و دەچوون بەنێوان خەڵکەکەدا .

بەڵێ، (عەبدولڵای کوڕی عومەر) ڕەزای خودای لەسەربێ جارێکیان گوێ بیستی بوو کە دەنگوباسی جەنگەکانی ئیسلامی بەهەموو نهێنی و ووردەکارییەکانیانەوە دەگێڕایەوە بۆخەڵکێك .

جا(عەبدوڵڵا) ڕاما لەوەی کەبیستی و ووتی:

زۆربەی ئەوەی ئەو گێڕایەوە من بەچاوی خۆم بینیومەو بەگوێ ی خۆم بیستوومە، لەگەڵ ئەوەدا ئەو لەمن باشتری دەگێڕێتەوە .

بەرهەمی زانست وزانیاری فراوان (شەعبیی) و بیرتیژی و ئامادەگی دەربڕینی، زۆرو زەبەندە .

لەنموونەی ئەوانە، ئەوەی کەلەبارەی خۆیەوە گێڕایەوە، ووتی: دووپیاو هاتن بۆلام کەشانازییان دەکرد، یەکێکیان لەهۆزی (عامیر) بوو، وەئەویکەیان لەهۆزی (ئەسەد) بوو، وە(عامیرییە) کە زاڵ بوو بوو بەسەر هاوڕێ (ئەسەدییەکەیدا) ........

وەجلەکانی گرتبوو بەرەومن ڕایدەکێشا چۆن ڕاکێشانێك، وە (ئەسەدییە)کەش لاوازو ملکەچ بووبوو لەبەردەمیاو پێ ی دەووت:

دەوازم لێ بهێنە — وازم لێ بهێنە .

(عامیریش) پێ ی دەووت:

سوێند بەخوا وازت لێ ناهێنم هەتا(شەعبیر) بڕیارنەدات بۆمن بەسەرتا ........

جامنیش لامکردەوە بەلای (عامیرییەکەدا) و پێم ووت:

واز لەهاوڕێکەت بهێنە تادادوەری دەکەم لەنێوانتانا .

پاشان ڕووانیم بۆ(ئەسەدییەکە) و ووتم:

چی یە وادەبینم بەزیویت وملکەچ بوویت لەبەردەمیا؟ .

لەگەڵ ئەوەدا کە ئێوەش شانازیتان هەیە کەهیچ کەسێك لەعەرەب نەیبووە:

یەکەمیان:– بێ گومان ئێوە ئافرەتێکتان هەبوو کەپێغەمبەری خودا(ﷺ) خواستی و خودای بالأدەست لەسەرووحەوت ئاسمانەکانەوە بڕیاری ئەو هاوسەرگەرێتی یە بۆدا، وە (جبریل) سلاّوی خودا لەسەربێ لەنێوانیاندابوو ...

کەئەو ئافرەتەش دایکی بڕواداران (زەینەبی کچی جەحش) بوو.

جائەوشانازی یە کەبۆ هۆزەکەی تۆبووە، بۆکەسێکی دی نەبووە لە (عەرەب) جگە لەئێوە .

دووەمیان: بێ گومان ئەوەیە کەلە ئێوەدا پیاوێك هەیە لەئەهلی بەهەشت کەبەسەر زەوی دا ئێستا ڕێ دەکات، کە (عوکاشەی کوڕی میحصەنە)[1] .

وەئەوەش بۆئێوەیە ئەی نەوەکانی (ئەسید)، وەجگە لەئێوە بۆکەسی دی نییە لەخەڵکی .

وەسێ یەمیان: یەکەم لیوایەك لەئیسلام دا کە دامەزرا لێ پرسراوەکەی (ئەمیرە) پیاوێك بوو لەئێوە، کەئەویش(عەبدوڵڵای کوڕی جەحش)[2] بوو.

چوارەمیان: یەکەم دەستهاتێکی جەنگ کەدابەش کرا لەئیسلام دا دەستهاتی ئەو بوو .

پێنجەمیان: لەڕاستیدا یەکەم کەس کەپەیمانی دا لە (پەیمانی ڕیزواندا) (بَيْعةُ الرِّضوان)[3] .

لەئێوە بوو، ئەویش هاوڕێتان(ئەبوسینان و، کوڕی وەهەب) بوو، چوو بۆخزمەتی پێغەمبەری خوداو (ﷺ) ووتی: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ)دەستی پیرۆزت بکەوە پەیمانت دەدەمێ .

پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرمووی: لەسەرچی ؟.

ئەویش ووتی: لەسەرئەوەی کەلەناخی جەنابتایە .

پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: چی لەناخی مندایە ؟!

ووتی: سەرکەوتن، یان شەهیدبوون ؟ .

پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (بەڵێ)، ئەوجا ئەویش پەیمانی دایە ......

جاخەڵکی لەسەرپەیمانی (ئەبی سینان)، پەیمانیان دەدا .

---

[1]/ یەکێکە لەهاوڕێیان کەهەموو ڕووداوەکانی بینیووە، لەجەنگی (ڕیددەدا) شەهیدکرا .

[2]/ لەهاوڕێیان بوو، وەلە ئەمیری سریەکان بوو .

[3]/ لەکۆتایی ساڵی شەشەمی کۆچیدابوو .



شەشەمیان: بەڕاستی هۆزەکەت نەوەکانی (ئەسەد) بەچکەشێری کۆچکەران بوون ڕۆژی (بەدر) .

ئالەوێدا (عامیرییەکە) ڕەنگی زەرد هەڵگەڕاوبێ دەنگ بوو.

جائەوەی کەگومانی تێدانەبوو ئەوەبوو کە (شەعبی) دەوویست کە کابرای لاوازی ملکەچ سەرکەوتووبکات بەسەر کابرای بەهێزی گەردن کەشدا .

خۆئەگەر کابرای (عامیری) لاوازی و ملکەچ بووایە، ئەوەندەی لە شانازی یەکانی هۆزەکەی باس دەکرد کەهەست بەملکەچی نەکات و خۆی بەلاوازو ژێردەست نەزانێ .

* * *

کاتێك کە جێ نشینی یەتی کەوتە ئەستۆی (عەبدولمەلیکی کوڕی مەڕوان)، نامەیەکی نووسی بۆ (حەججاج) کە والی ئەو بوو لەسەر (عیراق) نووسیبووی بۆی: پیاوێکم بۆ ڕەوانە بکە کە چاك و گونجاوو کار دروست بێت بۆ دین و دونیا، ئەیکەمە هاوڕێو ڕاوێژکارو، ئامادە بووی کۆڕو دانیشتنم. ئەویش (شەعبیی) بۆ نارد، کە (خەلیفە) کردیە یەکێك لەهەرە نزیکەکانی و کەسە تایبەتمەندانی خۆی، وەلەکاتی ڕوودانی دۆزو کارو بارە ئاڵۆزەکاندا پەنای دەبردە بەر زانست و زانیاریەکەی، وە رای ئەوی وەردەگرت بۆ چارەسەری کێشە ئاڵۆزو ناڕەحەتەکان، وە هەروەها بەڕەوانەکراوی تایبەتی خۆی ڕەوانەی دەکرد بۆلای پاشایان و ڕاسپاردەی پیا ڕادەگەیان بۆیان، متمانەی تەواوی پێ ی بوو.

* * *

جارێکیان (خەلیفە) بەگرنگی یەك ڕەوانەکرد بۆ لای (جیستنیان) پادشای (ڕۆم) ... جا کە گەیشتە خزمەتی، وە ئەویش گوێ ی بۆ ڕادەگرت، سەرسام بوو بەزیرەکی یە بێ سنوورەکەیەوە ڕاما بەفراوانی ئاگایی و شارەزایی و هێزی دەربڕین و سەرنج ڕاکێشانی .

جا بۆیە چەند ڕۆژێکی زۆر لەلای خۆی هێشتی یەوە، لەگەڵ ئەوەدا کەنەریتی وانە بوو لەگەڵ ڕەوانەکراوەکاندا .

کاتێك کە (شەعبیی) زۆری لێکرد کە ڕووخسەتی بدات بەگەڕانەوە بۆ (دیمەشق) پادشای ڕۆمی پرسیاری لێکرد:

ئایا تۆ لە خانەوادەی پادشای ؟

ئەویش وەڵامی دایەوەو ووتی: نەخێر، بەڵکو من پیاوێکم لە کۆی موسڵمانان.

ئەوجا کە ڕووخسەتی دا بەگەڕانەوە پیێ ی ووت :

کە گەڕایتەوە بۆ لای هاوڕێکەت (واتە عەبدولمەلیکی کوڕی مەڕوان) وە هەموو ئەوەی کە ئەو دەیەوێت بیزانێت پێت ڕاگەیاند، ئەوجا ئەو نامەیەی بدەریێ .

جا کاتێك (شەعبی) گەڕایەوە بۆ (دیمەشق) پەلەی کرد بۆ بەخزمەت گەیشتنی (عەبدولمەلیك)، وە هەموو ئەوەی کە بینی بووی و بیستبووی بۆی گێڕایەوەو عەرزی کردوو، وەلأمی هەموو ئەو شتانەی دایەوە کە (خەلیفە) پرسیاری کرد دەربارەیان .

هەستا تا ئەویێ بەجێبهێڵێ نامەکەی بیرکەوتەوە و ووتی:

ئەی (ئەمیری بڕواداران)، بەڕاستی پادشای ڕۆم ئەم نامەیەی پیاڕەوانە کردم بۆ جەنابت ... ئەو جا نامەکەی دایەوەو ڕووی وەرگێڕاو ویستی بڕوات کاتێك کە نامەکەیان بۆ (عەبدولمەلیك) خوێندەوە ووتی بەلاوەکان کەلەخزمەتیا بوون:

نامەکەم بدەنیێ، ئەوانیش دایانە خزمەتی .

ئەوجا (عەبدولمەلیك) ووتی بە (شەعبیی) :

ئایا زانیووتە چی نووسراوە لەو نامەیەدا ؟

ئەویش ووتی: نەخێر ئەی (ئەمیری بڕواداران) .

(عەبدولمەلیك) ووتی: دەی (پادشای ڕۆم) نوو سیوویەتی بۆ من دەڵێت :

سەرم سوڕماوە لە (عەرەب) کە چۆن جگە لە لاوێکی ئاوەها پیاوێکی دی دەکاتە پادشا بەسەرخۆیەوە.

ئا لەوێدا خێرا (شەعبیی) ووتی: لەڕاستیدا ئەوەی ووتووە لەبەرئەوەی کە جەنابتی نەبینیووە، خۆ ئەگەر جەنابتی ببینیایە ئەی (ئەمیری بڕواداران) ئەوەی نەدەووت:

پاشان (عەبولمەلیك) ووتی: ئایا ئەزانی بۆچی (مەلیکی ڕۆم) ئەوەی بۆ من نووسیووە ؟ ...

(شەعبیی) ووتی: نەخێر ئەی (ئەمیری بڕواداران) .

(عەبدولمەلیك) ووتی:

ئەوە بۆیە ئەوەی بۆ من نووسیووە لەبەرئەوەی حەسوودی بەمن بردووە کەکەسایەتی وەك و تۆم لەلایە، جا وویستوویەتی هانی من بدات بۆ کوشتنت و ڕزگار بوونم لێت .

جا ئەوە گەشتەوە بە (مەلیکی ڕۆم) و ووتی :

سوێند بەخوا جگە لەوە هیچ مەبەستێکی دیم نەبووە ...

* * *

وە (شەعبیی) لە زانست دا گەیشتبووە ئاستێك کە بوو بووە یەکێك لەو چوار زانایەی کەلە چاخی خۆیدا ناوبانگیان دەرکرد بوو .

جا (زوهریی) دەیفەرموو: زانایان چوارن ...

(سەعیدی کوڕی موسەییەب) لە مەدینەدا .وە (عامیری شەعبیی) لە کوفە.

وە (حەسەنی بەصری) لەبەصرە .وە (مەکحول) لە شام .

بەڵام بەڕاستی (شەعبیی) لەبەرخۆ بەکەم زانینی – شەرمی دەکرد ئەگەر یەکێك نازناوی (زانای) لیّ بنایە .... جارێك یەکێك دوواندی و ووتی: وەڵامم بدەرەوە ئەی زانای شەرع زان .

ئەویش ووتی: ئەی هاوار ئەوە چی دەڵێیت؟...

زیادە ڕەوی مەکە لە پیاهەڵدانمان دا بەشتێك کەتیاماندا نی یە ...

چونکە شەرع زانی (الفقیه) ئەوە یەکە خۆی بپارێزێت لەقەدەغەکراوەکانی خودا، وە زانا (العالم) ئەوەیە لەخوا بترسێت، جا ئێمە لە کوێین لەچاو ئەوانە؟!.

وە یەکێکی دی دەربارەی پرسێك پرسیاری لیّ کرد، جا وەڵامی دایەوە:

(عومەری کوڕی خەتتاب) ئاوای فەرمووە تیایدا .

وە (عەلی کوڕی تالب) ئاوای فەرمووە تیایدا .

پرسیارکاریش ووتی پیّ ی: ئەی تۆ چی دەفەرموویت ئەی (ئەبا عومەر) .

بەشەرمەوە زەردەخەنەیەکی کردوو گووتی:

جا چی لە ووتەی من دەکەیت پاش ئەوەی کە ووتەی (عومەرو عەلی) ت بیست .

* * *

وە (شەعبیی) ڕازاوە بوو بە پیرۆزترین سروش و (الطبائع – الشّمائل) بەرزترین سیفات ...لەوانە :

بەڕاستی ئەو بێزی لە دەمەقاڵی دەکردەوە، وە خۆی دەپاراست لەخۆ هەڵقورتاندن لەو شتانەی کە پەیوەندی بەوەوە نەبوو .

یەکێك لە هاوڕێیانی قسەی لەگەڵ دەکرد ووتی:

ئەی (ئەبا عومەر) ...

هاوڕێکەی ووتی: چی دەڵێیت لەوەدا کە خەڵکی لێی دەدوێن دەربارەی ئەو دوو پیاوە ؟

(شەعبیی) ووتی: مەبەستت کام دوو پیاوەیە ؟.

کابرا ووتی: (عوسمان و عەلی) .

ئەو جا (شەعبیی) ووتی: بێ گومان من – سوێند بەخوا – بێ بەریم لەوەی کە ڕۆژی ڕەستا خێز بێم و ببمە دژی (عوسمانی کوڕی عەففان یان عەلی کوڕی ئەبی تالب) ڕەزای خودایان لەسەر بێ.

* * *

وە (شەعبیی) دانبەخۆداگرتنی (الحلم) لەگەڵ زانستدا (العلم) کۆکردۆتەوە. گێڕاوەتەوە کە پیاوێك پیسترین جنێوی پێدراوە، وەخراپترین و قیزەوترین ووتەی داوە بەگوێی دا، لەسەرو هەموو ئەوەوە ووتی پیٚ ی :

ئەی کابرا ئەگەر تۆ ڕاستگۆ بوویت لەوەدا کە بەمنت ووتووە خودا لە من ببورێت ...خۆ ئەگەر تۆ درۆزن بوو بیت خودا لە تۆ ببورێت .

* * *

وە (شەعبیی) لەگەڵ ئەوەدا کە خاوەنی پلەی بەرزوو پایەی گەورە بوو، بەلاٚم بەلایەوە پلە نزمی نەبووە کە زانست و دانایی وەربگرێت و فێر ببێت لە بێ شانۆ شکۆترین مرۆڤ .....

(دەشتەکی یەکی عەرەب) بەردەوام بوو لەسەر ئامادە بوون لە کۆڕەکانی (شەعبیی) دا، لەگەڵ ئەوەدا هەمیشە وابەست بوو بەبێدەنگی یەوە،



(شەعبیی) پێ ی ووت: بۆچی قسە ناکەیت ؟!.

ئەویش وەلآمی دایەوەو ووتی: بێ دەنگ دەبم بێوەی دەبم، وە گوێ ڕادەگرم ئەوجا فێر دەبم ...

وە بەڕاستی بەشی (بەختی) مرۆڤ لە گوێ ی دەگەڕێتەوە سەرخۆی ....

بەلآم بەشی (بەختی) لە زمانی دەگەڕێتەوە سەر غەیری خۆی ....

جا (شەعبیی) بەردەوام ووتەی (دەشتەکی یەکەی) دەووتەوە ئەوەندەی ژیانی درێژەی کێشا .

بەڕاستی (شەعبیی) ئەوەندەی لە ڕەوانبێژی و هەڵس و کەوت جوانی لە ڕەوانبێژیدا بەدەست هێنا بوو، کەکەمێکی ناوازە نەبێت لە ڕەوانبێژان کەس بەدەستی نەهێنا بوو ...

لەنموونەی ئەوە: بەڕاستی (شەعبیی) قسەی لەگەڵ (ئەمیری دوو عیراقەکە) (بەسرە و کوفە) (عومەری کوڕی هوبەیرەی فەزازی) کرد دەربارەی کۆمەڵێك کەبەندی کردبوون جا فەرمووی: ئەی ئەمیر...

ئەگەر تۆ بەناڕەوا بەندت کردبوون، ئەوا ڕەوا (الحق) ڕزگارییان دەکات ...

خۆ ئەگەر بەڕەوا بەندت کردوون، ئەوا لێ بووردن دەیانگرێتەوە .

ئەوجا (ئەمیر) ڕاما بە ووتەکەی و، وەلەبەر خاتری ئەو بەرەلآی کردن .

* * *

وەلەگەڵ ئەوەشدا کە (شەعبیی) لەسەر تەواوترین شێوەی نەرم و نیانی و ڕاوەستاوی و پایە بەرزیدا بووە لە دین و زانستدا، کەسێکی ڕۆح سووك و شیرین سروش و گفت خۆش بووە، وەهیچ قسەیەکی خۆشی لەکیس نەداوە هەرکاتێك بۆی هاتبێ .

پیاوێك دێتە خزمەتی دەبینێت کەلەگەڵ هاوسەرەکەیدا دانیشتووە، جا دەڵێت:

کامتان (شەعبیین) ؟ (شەعبییش) لەوەلآمیدا ووتی: ئەوە، ئاماژەی کرد بۆ هاوسەرەکەی ....پاشان پرسیارێکی تری لێکرد:

هاوسەری ئیبلیس چی پێ دەوترێت ؟.

ئەویش ووتی: ئەوە بوکێك بوو نەماندیبوو .

وەباشترین شتێك کە وێنای دۆستایەتی (شەعبیی) مان بۆ بنوێنی و پیشانمان بدا ئەوەیە کە خۆی لەبارەی خۆیەوە گێڕاوییەتیەوە کە ووتی:

هەرگیز لە شوێنی خۆم بەرز نەبوومەتەوە بۆ حاشاوڵ بردن بۆ شتێك کە خەڵکی چاویان تیّ بڕیبێت ......وەهەرگیز لەبەندەو خزمەتکارێکی خۆمم نەداوە ...
وەشکم نەبردووە خزمێکم مردبیّ و قەرزی لەسەر بوو بێت و، بۆم نەبژاردبێتەوە.

وەلەدوای ئەوەی، کەتەمەنی (شەعبیی) درێژەی کێشا تا زیاتر لە هەشتا ساڵ، ئەوجا وەلاّمی بانگی پەروەردگاری خۆی دایەوەو وەفاتی فەرموو ... وە (حەسەنی بەصری) دەربارەی فەرمووی:
(خودای بالاّدەست بەزەیی پێیدا بێتەوە بەڕاستی ئەو خاوەنی زانستێکی فراوان بوو... دانبەخۆدا گرتوویەکی نموونەیی بوو... وەبەڕاستی ئەو لەئیسلامدا خاوەنی پلەو پایە بوو... وەشوێنی دیار بوو). خودایە زانست و عیلمی (شەعبیی) مان پیّ ببەخشە ، ئامین..

بۆ زیاتر شارەزا بوون لە ژیانی (شەعبیی) سەیر بکە :
١- الطبقات الكبرى لابن سعد ٦١ / ٢٤٧ .
٢- ئأريخ بغداد : ١٢ / ٢٢٧ .
٣- تهذيب التهذيب : ٥/ ٦٥ .
٤- حلية الأولياء : ٤/ ٣١٠ ؟
٥- صفة الصفوة :٣ / ٧٥ .
٦- وضيات الأعيان :٣/ ١٢ .
٧- شرح المقامات للشريشي :٢/ ٢٤٥ .
٨- المعارف لابن قتيبة : ٤٤٩ .
٩- التهذيب لابن عساكر:١٣٨/٧ .
١٠- سحط اللاكئ :٧٥١ .

# ١٣)سەلەمەی کوڕی دینار

**ناسراو بە (ئەبی حازیمی عەعرەجی)**

**(هیچ کەسێکم نەدیووە جگە لە (ئەبی حازم) کە دانایی لە لوتکەی نزیکیدا بووبێ لەسەر زاری).** **(عبدو ڕەحمانی کوڕی یەزید)**

لە ساڵی نەوەدو حەوتی (٩٧) کۆچی دابوو، کە (خەلیفەی موسڵمانان)(سولەیمانی کوڕی عەبدولمەلیك)، بڕیاری دا بە سەفەرکردن بۆ (کەعبەی پیرۆز)و، بە دەمەوە چوونی بانگەوازی باوکی پێغەمبەران (سەلامی خودایان لەسەر بێ) (ئیبراهیم) (سەلامی خودای لەسەر بێت) ......

جا حوشترەکەی ڕێگەی بەڕێ کرد بەخێرایی لە (دیمەشقەوە) پایتەختی (ئەمەوییەکان) بۆ (مەدینەی مونەوەرە) .

کە لەناخی دا ئارەزوویەکی بێ سنوور هەبوو بۆ نوێژکردن لە ڕەوزەی خاوێندا (الرَّوْضة المُطَهَّرة)......

لەگەڵ هەمان ئارەزوودا بۆ سڵاوکردن لە (موحەمەد ڕەوانە کراوی خودا)(سەلات وسەلامی خودای لەسەربێت) .

وە کاروانی (خەلیفە) پڕ و ڕازاوە بوو بە (خوێنەران)و (زانایانی فەرمودە) و (شەرع زانان) و(زانایان) و (ئەمیرەکان)و (پێشەوایان) .

جا کاتێك کە گەیشتە (مەدینەی موننەوەرە)، وە لەوێ جێ نشین بوو، پیاوماقوڵان و پایەدارانی خەڵکی هاتنە خزمەتی بۆ بەخێرهێنانی و سەلام لێ کردنی .

بەڵام (سەلەمەی کوڕی دینار) دادوەری (قازی) (مەدینە و)، زانای خاوەن بەڵگەو پێشەوای خاوەن متمانە، لە نێوان ئەوانەدا نەبوو کە سەردانی (خەلیفە) یان کرد بۆ بەخێرهێنانی وسەلام لێ کردنی .

جا کە (سولەیمانی کوڕی عەبدولمەلیك ) لێ بوویەوە لە پێشوازیکردنی ئەوانەی کە هاتبوونە خزمەتی بۆ بەخێرهێنانی، ووتی بە هەندێك لە ئەندامانی کۆڕەکەی :

بەڕاستی ناخەکان(دلەکان) ژەنگاوی دەبن هەر چۆن کانەکان ژەنگاوی دەبن، ئەگەر بەیناو بەین کەسێك نەبێت ئامۆژگاری بکات و ژەنگەکەی لێ بسڕێتەوە .

پاشان ئەوانیش ووتیان : بەڵێ ئەی (ئەمیری بڕواداران) (خەلیفە) فەرمووی: ئایا لە (مەدینە دا)

پیاوێك نی یە کە کۆمەڵێك لە هاوڕێیانی پێغەمبەری خودای (ﷺ) بینی بێت کە ئامۆژگاریمان بکات ؟

ئەوانیش وەڵامیان دایەوە و ووتیان : بەرای وەڵا ئەی (ئەمیری بڕواداران).....

ئا ئەوە لێرەدایە (حازیمی ئەعرەجی) یە .

(خەلیفە) ووتی: (ئەبو حازیمی ئەعرەجی) کێ یە ؟

ئەوانیش ووتیان: (سەلەمەی کوڕی دینارە)، زانا و پێشەوای (مەدینەیەو)، یەکێکە لەو شوێنکەوتووانەی کە ژمارەیان لە هاوڕێیانی پایە بەرزو بەڕێزی بینیوە .

جا فەرمووی: بۆم بانگ بکەن، وە لە بانگێشتنەکەیدا بە نەزاکەت بن .

ئەوجا چوونە خزمەتی و بانگهێشتیان کرد .

کەهاتە خزمەتی ..... بەگەرم بەخێری هێناو لە نزیك خۆیەوە دایناو بەگلەییەوە پێ ی ووت:

ئەو بوخزاندنە چی یە ئەی (ئەبا حازم) ؟

ئەویش ووتی : چ بوخزاندنێکت لەمن بینیوە ئەی (ئەمیری بڕواداران).

ئەوجا (ئەمیر) ووتی: پیاو ماقوڵان و بەناوبانگانی خەڵکی سەردانیان کردم بەڵام تۆ سەردانت نەکردم !!

ئەویش لە وەڵامیدا ووتی: بەڕاستی رووپیشان نەدان لەدوای ناسینە ........

وە جەنابیشت پێش ئەمڕۆ نەتاناسیووم، وە منیش جەنابتم نەدیووە، کەوابوو چ رووپیشان نەدانێك لە منەوە ڕوویداوە ؟.

ئەوجا (خەلیفە) ووتی بە ئامادەبووانی کۆڕەکەی : بەڕاستی (شێخ) لە بەهانەکەیدا پێ کای، وە (خەلیفە)ش لە گلەییەکەیدا لێ ی بەهەڵەدا چوو .

پاشان لایکردەوە بەلای (حازم)دا و ووتی:

بەڕاست لە ناخم دا کۆمەڵێك دۆز و کاروباری گرنگ هەیە، پێم خۆش بوو کە لای تۆ رایانگەیەنم ئەی (ئەبا حازم) .

ئەویش ووتی : فەرموو – ئەی (ئەمیری بڕواداڕانی) خودا پایەدارت کات .

ئەوجا (خەلیفە) ووتی: ئەی (ئەباحازم)، چی یە وا ئێمە مردنمان لاناخۆشە؟!

(ئەبا حازم)لە وەڵامیدا ووتی: بەڕاستی لەبەر ئەوەی ئێمە دونیامانمان ئاوەدان کردۆتەوەو دواڕۆژمان تێك وپێك داوەو ڕووخاندوومانە .........

لەبەر ئەوە پێمان ناخۆشە لە ئاوەدانی وە بڕۆین بۆ کاولگە .

ئەوجا (خەلیفە)ووتی: ڕاستت فەرموو...... پاشان بەردەوام بوو، ووتی :

ئەی (ئەبا حازم) خۆزگە بمزانییایە – سبەینێ لەلای خودا چیمان دەبێ ؟

ئەویش ووتی: ئەی(خەلیفە) کردانەکانت بخەڕوو لەبەردەم قورئانەکەی خودای باڵادەستدا ئەوەت دەست دەکەوێت .

(خەلیفە) ووتی: لە کوێدا دەیبینمەوە لە پەڕاوی خودای باڵادەستدا؟

ئەویش ووتی: دەیبینیتەوە لەم فەرموودەیەدا .... جا دەنگی بەرز کردەوە :

إِنَّ ٱلْأَبْرَارَ لَفِى نَعِيمٍ ﴿١٣﴾ وَإِنَّ ٱلْفُجَّارَ لَفِى جَحِيمٍ ﴿١٤﴾ (سورة الانفطار / ١٣ -١٤).

واتە: بێ گومان بڕوادارە ڕاستگۆ و چاکەکارەکان لەناو بەهرەکانی بەهەشتدا دەبێ.

جا(خەلیفە) ووتی: کەوابوو ئیتر بەزەیی خودا لە کوێ دایە؟

(ئەبوحازم)ووتی: إِنَّ رَحْمَتَ ٱللَّهِ قَرِيبٌ مِّنَ ٱلْمُحْسِنِينَ (سورة الأعراف/٥)

واتە: (بێ گومان بەزەیی خوداو لێ بوردنی نزیکە لە چاکەکارانەوە) .

جا (خەلیفە) ووتی: خۆزگە بمزانیایە، سبەینێ چۆن دەگەینەوە خزمەتی خودا؟

(ئەبو حازم) لە وەڵامدا ووتی: چاکەکار، وەك نادیارێك وایە کە دەگەڕێتەوە ناو خاوخێزان و کەس وکاری .

وە تاوانکارو بێ باوەڕ، وەك بەندەیەکی هەڵهات و پەلکێش دەکرێتەوە بۆلای خاوەنەکەی چۆن پەلکێش کردنێك .

ئەوجا (خەلیفە) دەستی کرد بە گریان، هەتا دەنگی بەرزبوویەوەو، گریانەکەی تینی سەند .

پاشان ووتی: ئەی (ئەبا حازم)، چۆن بۆمان هەیە کە چاك ببین ؟.

ئەویش ووتی: بەوەی کە لووت بەرزی خۆبەزل زانین وەلابنێن و، خۆتان بڕازێننەوە بە نەرم و نیانی و ڕاوەستاوی شیاو .

ئەوجا (خەلیفە) ووتی:- ئەی ئەو سەروەت و سامانە، بەچ ڕێگایەك لە بەکارهێنانیدا خۆمان لەخودا بپارێزین ؟.

پاشان (ئەبوو حازم) ووتی:

بەوەی کە ئەگەر بەڕێگای ڕەوا بە دەستتان خستبێ .........

وە لەبەر دەستی کەسی شیاودا داتاننابێ .........

وە وەك یەك دابەشتتان کردبێت ...........

وە دادپەروەریتان کردبێت لە نێوان ڕەعیەت دا .

دوای ئەوە (خەلیفە) ووتی: ئەی (ئەبا حازم)، پێم بڵێ کێ گەورەترین ی خەڵکە ؟

پاشان (ئەبو حازم) ووتی :

کەسانی نەرم و نیان و خاوەن هەڵوێست و ڕاوەستاوی و خۆپارێز و خوداناس .

جا (خەلیفە) ووتی: ئەی دادوەرترین (أعْدَل) ووتە چی یە ئەی (ئەبا حازیم)؟

ئەویش ووتی:ووتەیەکی ڕەوایە کە کەسێك بیڵێت لەلای کەسێك کە لێی دەترسێت، وە لەلای کەسێك کە ئومێدی پێ یەتی .

پاشان (خەلیفە) ووتی : ئەی خێراترین نزا کە خودا وەڵامی بداتەوە کامەیە ئەی (ئەبا حازم) .

ئەویش وتی : نزای چاکەکار بۆ چاکەکاران .

خەلیفە پرسیاری کردەوەو ووتی : گەورەترین بەخشینی (صَدَقَة) کامەیە ؟.

(ئەبو حازم) وەڵامی دایەوە و ووتی: کەمێکە لە پارەیان هەر پێویستی یەك کە کەسێك بیداتە دەستی هەژارێکی بێ دەرەتان بەبێ ئەوەی منەت بکات بەسەریدا و ئازاری بدات بە خۆرامان بەسەریدا .

دیسان (خەلیفە) ووتی : ژیرترین و بە سەلیقەترین خەڵك کێ یە ئەی (ئەبا حازم) .

ئەویش ووتی : پیاوێك شارەزای گویٚ ڕایەڵی خودا بووبێت ، وە بە کردار ئەو گوێڕایەڵی یەی ئەنجام دابێت، وە ڕێنمایی خەڵکی کردبێت بۆ شارەزابوونی و ئەنجام دانی .

پاشان (خەلیفە) ووتی: خراپترینی خەڵکی کیٚ یە لەبیروبۆچوون دا ؟

(ئەبو حازم) ووتی : پیاوێك لەگەڵ ئارەزووی هاوڕێکەیدا بێت، وە هاوڕێکەیشی ستەمکار بێت، جا ئەوە قیامەتی خۆی فرۆشتووە بە دونیای غەیری خۆی .

جا (خەلیفە) ووتی: ئایا لە تواناتدا هەیە و دەتەوێت کە هاوڕێیەتیمان بکەیت تا تۆ لە ئێمە سوودمەند ببیت و ئێمەش لە تۆ ؟

(ئەبا حازم) ووتی : نەخێر نەوەڵا ئەی (ئەمیری بڕواداران).

(خەلیفە) ووتی : لەبەرچی ؟!

(ئەبا حازم) ووتی: دەترسم کە کەمێك پشت بە ئێوە ببەستم، جا ئەوە وابکات کە خودای باڵادەست بەهۆی ئەوەوە تووشی لاوازی ژیان و مردنم بکات.

پاشان (خەلیفە) ووتی : دەی فەرموو ئەی (ئەبا حازم) ئاتاجی یەکت بفەرموو.

(ئەبا حازم) بێدەنگ بوو، وە وەڵامی نەدایەوە .........

دووبارە (خەلیفە) ووتەکەی ڕووبەڕووکردەوە : ئەی (ئەبا حازم) ئاتاجیت چی یە بیفەرموو: هەرچیەك بێت جیٚ بەجیٚ ی دەکەین .

جا ووتی: ئاتاجی من ئەوەیە کە ڕزگارم بکەیت لە دۆزەخ و، بم خەیتە بەهەشت.....

(خەلیفە) ووتی: ئەوە لە کارەکانی من نی یە ئەی (ئەبا حازم) .

(ئەبو حازم) ووتی: جگە لەوە هیچ ئاتاجیەکی دیم نی یە ئەی (ئەمیری بڕواداران).

ئەوجا (خەلیفە) ووتی: نزام بۆ بکە ئەی (ئەبا حازم) .

ئەویش ووتی: خودایە ئەگەر (سولەیمانی)بەندەت لە دۆستانتە، ئاسانکاری بۆ بکە بە بەدەستهێنانی چاکەی دونیاو دواڕۆژی ........

خۆ ئەگەر لە نەیارانتە، چاکی بکە و ڕێنمایی بکە بۆ ئەوەی کە خۆت پێت خۆشە و پیٚ ی رازیت .

ئا لەوکاتەدا پیاوێك لە ئامادەبووان ووتی :

لەوە خراپترت نەووتووە ئەوەتای هاتوویتە خزمەتی (ئەمیری بڕواداران).

بەڕاستی تۆ (خەلیفەی موسڵمانانت) کرد بەیەکێك لە نەیارانی خوداوە بەوە ئازارت دا.



(ئەبو حازم) ووتی : بەڵکو خراپترین ئەوە بوو کە تۆ ووتت، لەڕاستی دا خودای بالأدەست پەیمانی لە زانایان وەرگرتوە کە ووتەی ڕەوا بڵێن، ئەوەتا خودای بالأدەست فەرموویەتی :

لَتُبَيِّنُنَّهُۥ لِلنَّاسِ وَلَا تَكْتُمُونَهُۥ (سورەتی ئالی عیمران : ١٨٧).

واتە: خودای بالأدەست پەیمانی وەرگرتووە لە زانایان کە ئەوەی دەیزانن لەبارەی بڕیارەکانی خودا و ڕەواو نارەواکان بۆ خەڵکی ڕوونبکەنەوە داینەپۆشن و پشت گوێی نەخەن .

ئینجا لایکرد بەلای (خەلیفە) وەو ووتی :

ئەی (ئەمیری بڕواداران)، بەڕاستی ئەوانەی لە پێش ئێمەدا ڕێیان بەڕێ کرد لە ئوممەتە ڕابردووەکان، لە چاکەو سەلامەتی بێوەییدا بوون مادام ئەمیرەکانیان هاتوونەتە خزمەتی زانایانیان بە ئارەزووی ئەوە کە ئەوەی لایانە لا زانست و زانیاری لێیان وەربگرن ........

بەلأم کاتێك (ئەمیرەکان) بێ باك بوون و پشتیان لە زانایان کرد ........

بەهۆی ئەوەوە ڕسواو بێدەسەلأت بوون لە بەرچاوی خودای بالأدەست کەوتن.

خۆ ئەگەر زانایان بێ نیازبونایە لەوەی کە لەلای ئەمیرەکانە، ئەوە بێ گومان ئەمیرەکان ئارەزوومەند و تامەزرۆی زانستەکەیان دەبوون .....

بەلأم بە داخەوە ئەوان چاویان بڕیبووە ئەوەی لە دەستی ئەمیرەکاندا بوو......

بۆیە ئەمیرەکانی لێ یان بێ نیاز بوون و ...... سوکایەتیان پێ دەکردن ...یاخود بڵێین بە سووکی سەیریان دەکردن .

ئەوجا (خەلیفە)ووتی: ڕاستت فەرموو .......

ئامۆژگارییەکانت زێدەتر کە بۆم ئەی (ئەبا حازم)، بەڕاستی هیچ کەسێکم نەدیووە کە وەك تۆ دانایی نزیکترین شتێك بێت لە سەرزاری .

جا (ئەبوحازیم) ووتی : ئەی (ئەمیری بڕواداران) ئەگەر تۆ لەوانە بیت کە گوێبیستی ئامۆژگاری دەبن و جێ بە جێ ی دەکەن، ئەوا بەڕاستی ئەوەندەم پێ ووتوویت کە بەس بێت .........



خۆ ئەگەر لەوانەش نەبیت کە دەبیستن و جێ بە جێی ناکەن، هیچ پێویست ناکات بۆ من کە تیرێك لە کەوانێکەوە بتەقێنم کە ئامانج نەپێکن، یان بڵێین کورد واتەنی (بەردێك بهاوێژمە ناو دەریایەك).

ئەوجا (خەلیفە) ووتی : سوێندت بۆ دەخۆم و پەیمانت دەدەمێ ئەی (ئەبا حزیم) فەرموو بەردەوام بە ئامۆژگاریم بکە .

(ئەبو حازم) ووتی : بەڵێ باشە ... ئامۆژگاریت دەکەم و کورتیشی دەکەمەوە.

ئەی (ئەمیری بڕواداران) پەروەردگاری بالأدەستت بە گەورە رابگرەو، لە هەموو کەم و کوڕی و ناتەواوی و بێ دەسەلأتی یەك بە دووری بگرە کاتێك کە لە بتبینێت کە کارێك ئەنجام بدەیت کە لێی قەدەغە کردویت، وە کارێك پشت گوێ بخەیت کە فەرمانی پێکردووی بە ئەنجامدانی .

ئەوەش[1] ئەوە دەگەیەنێت کە خودای بالأدەست یەندەی خۆی زۆر لا بەڕێز و خۆشەویستە بۆیە لەکاتی ئەنجامدانی خراپەدا خێرا قەدەغەی دەکات تا تووشی سزای دین و دونیا نەبێت، وە کاتێك فەرمانی پێدەکات بۆ چاکە و عیبادەتێك، وازی لێدەهێنێت با بە ئارەزووی خۆی ئەنجامی بدات ئیتر پاش ئەوە سڵاوی کرد و لێی دا ڕۆی .

جا (خەلیفە) ووتی : خودا پاداشتی خێرت بداتەوە وەك ئەو پاداشتەی کە هینی زانایەکی ئامۆژگاریکار دەداتەوە .

* * *

لەوەدا بوو کە (ئەبو حازم) بگاتە ماڵەوەی، کە بینی وا (ئەمیری بڕواداران) کیسەیەکی بۆ ڕەوانە کردووە کە پڕە لە دینار، وە بۆی نووسیوە و دەڵێت :

ئەی (ئەبا حازم) خەرجی بکە، بەڕاستی تۆ لەوە زیاترت هەیە لەلای من .

ئەویش گەڕاندییەوە بۆی، وە نامەیەکی بۆ نووسی بوو دەڵێت :

ئەی (ئەمیری بڕواداران)، پەنا بە خودا دەگرم لەوەی کە پرسیارەکەی لە من گاڵتەجاڕی بووبێت، وە وەلأمەکەی منیش بۆ تۆ نارەوا بووبێت .

---

[1]/ روون کردنەوەیەك بوو لەلایەن وەرگێڕەوە .



جا سوێند بەخوا من بەوە ڕازینیم بۆ جەنابت ئەی (ئەمیری بڕواداران) ئیتر چۆن پێ ی ڕازیدەبم بۆ خۆم ؟!

ئەی (ئەمیری بڕواداران)، ئەگەر ئەو دینارانە بەرامبەر ئەو قسانە بێت کەمن بۆ جەنابتم کردووە، ئەوە مردارۆبوو و گۆشتی بەراز لە کاتی ناچاریدا ڕەواترە لەوە.....

خۆ ئەگەر مافی منە لە(گەنجینەی موسڵمان)دا، ئایا جەنابت یەکسانیت ئەنجامداوە لە نێوان من و هەموو خەڵکیدا لە دابەشکردنی ئەو مافەدا؟

وەماڵەکەی(سەلەمەی کوڕی دینار) سەرچاوەیەکی سازگاربوو بۆ قوتابیانی زانست و، ئارەزوومەندانی چاکە خوازی.

جیاوازی نەبوو لە وەدا لە نێوان براکانی و قوتابی یەکانیدا...

جارێکیان (عەبدو ڕەحمانی کوڕی جەریر) و کوڕەکەی چوونە خزمەتی،وەدانیشتن لە خزمەتیاو، سەلامیان لێ کردوو، نزای چاکەی دین و دونیایان بۆ کرد.

ئەویش بەباشترین لە سڵاوەکەی ئەوان وەڵامی دانەوە و، بەگەرم بە خێری هێنان، پاشان دوای ئەوە گفتۆگۆ لە نێواندا دەستی پێ کرد، (عەبدوڕەحمانی کوڕی جەریر) پێ ی ووت:

ئەی(ئەبا حازیم) چۆن بە(ئاگایی دڵمان) دەست دەکەوێت؟

ئەویش ووتی:لەکاتی ڕاستکردنەوەی ناخەکان دا (التصحيح الضمائر) گوناهە گەورەکان بەر لێ خۆش بوون دەکەون....

وەئەگەر بەندە سوربێت لەسەر وازهێنان لەسەر تاوانەکان ئەوەدڵی بەئاگادێتەوە....

وە ئەی(عەبد و ڕەحمان) لەبیرت نەچێ کە کەمێکی دوونیا سەرجەنجاڵمان دەکات لە زۆرێکی دووا ڕۆژی قیامەت.

وەهەموو بەهرەیەك ئەگەر نزیکت نەخاتەوە لە خودای باڵادەست ئەوە نەهامەتی یە.

جاکوڕەکەی (عەبدڕەحمان) پێ ی ووت: بەڕاستی شێخەکانمان(زاناکانمان) زۆر و زەبەندن، شوێن پێ ی کامیان هەڵبگرین ؟

ئەویش لە وەڵامدا ووتی: ئەی کوڕم، شوێن پێ ی یەکێك هەڵبگرە کەلە نادیاریدا لە خودا دەترسێت، وە وازدەهێنێ لە تێکەڵبوون لەگەڵ کارە گومانلێکراوەکان.

وەشوێنی ئەوکەسە بکەوە کەلە سەرەتای لاویەتیەوە چاکسازی لەناخی دا دەکاو، وەدوای ناخات بۆ کاتی پیریەتی.

وەبزانە ئەی کوڕی من هیچ ڕۆژێك نی یە کە خۆرتیایدا هەڵ بێت و ئارەزووبازی و، فێر خوازی زانست لەناخی مرۆڤدا دەست لە ملانی یەکدی نەبن و، لەدواییدا لەناودڵیدا(ناخی دا) نەکەونە زۆران بازی بۆ زاڵبوونی یەکێك لەدوو نەیارە بەسەر ئەوی کەیاندا.

جائەگەر زانستەکەی زاڵ بوو بەسەر ئارەزووەکەیدا ئەوە ئەو ڕۆژەی ڕۆژێکە کەتیایدا براوەیە...

خۆئەگەر ئارەزوو سەرکەوت بەسەر زانستەکەیدا ئەوە ئەو ڕۆژەی ڕۆژی زەرە رۆمەندییە.

ئەوجا(عەبدو ڕەحمان کوڕی جەریر) پیێ ی ووت:

ئەی (ئەبا حازیم) زۆر جار هانت داوین لەسەر سوپاسگوزاری، دەی سوپاسگوزاری ڕاستەقینە کامەیە؟

ئەویش لە وەڵامدا ووتی:هەموو ئەندامێك لە ئەندامەکانمان مافی سوپاسگوزاری هەیە بەسەرمانەوە.

ئەوجا(عەبدو ڕەحمان) ووتی: سوپاسگوزاری دووچاوەکە چی یە؟

(ئەبووحازیم) ووتی: ئەوەیە ئەگەر چاکەیەکت بینی پێیان ڕابگەیەنی،وەئەگەر خراپەیەکت پیێ بینین دایپۆشی و ئاشکرای نەکەی.

(عەبد وڕەحمان) ووتی: ئەی سوپاسگوزاری گوێکان چی یە؟

(ئەبو حازیم) ووتی: ئەوەیە ئەگەر ووتەیەکی خێرت پیێ بیست لەبەری بکەین و لیێ ی ووردبیینەوە،وە ئەگەر ووتەیەکی خراپت پیێ بیستن لە گۆڕی بنێیت و لەبیری خۆتی ببەیتەوە وەك ئەوەی کەهەرنەت بیستووە.

ئەوجا(عەبد وڕەحمان) وتی: ئەی سوپاسگوزاری دوو دەستەکە چی یە؟

ئەویش ووتی: ئەوەیە کەئەوشتانەی پیێ وەرنەگریت کە هی خۆت نی یە.......

وە هەروەها هیچ مافێك لە مافەکانی خودایان پیێ قەدەغەنەکەی.

وە ئەی(عەبدو ڕەحمان) ئەوە لەیادنەکەی کەهەرکەسێك سوپاسگوزارییەکەی تەنها لەسەر زمانی بێت،وە دڵ و هەموو ئەندامەکانی لەگەڵ زمانی دا هاوبەشی نەکا......نموونەی وەك پیاوێکە کەبەرگێکی هەبێت تەنها سوچێکی بگرێت وەلەبەرینەکات.....

جائەوە نە لەگەرما و نە لەسەرما ناپیارێزێت.

*　　　　*　　　　*

وەساڵێکیان (سەلەمەی کوڕی دینار) لەگەڵ سوپای موسڵماناندا بەرە و وولاتی (ڕۆم) بەڕێکەوت بەمەبەستی جەنگ (جیهاد) لەڕێگەی خوادا لەگەڵ کۆششکاران (المجاهدین)

جاکاتێك کە سوپا گەیشتە کۆتا قۆناغ لە قۆناغەکانی سەفەر، وایان بەباش زانی کە پشویەك بدەن و خۆیان بشۆن پێش ڕوو بەڕوو بوونەوەی دوژمن و ڕۆچوون لە جەنگەکەدا.

وەلە سوپاکەدا ئەمیرێك لە ئەمیرەکانی(بەنی ئومەیە) هەبوو.

کەسێکی (ڕوانەکرا) بۆلای(ئەبی حازیم) کە پێی ڕابگەیەنێت (ئەمیر) ناردوویەتی بەشوێنتا کە بێتە خزمەتی تا قسەی بۆ بکەیت و شارەزای بکەیت لەشەرعی خودا.

ئەویش نامەیەکی نوسی بۆ (ئەمیر) دەڵێت: ئەی (ئەمیر)، بەڕاستی من لە خزمەت زانایان دا بووم، جا ئەوان زانست نادەنە کۆڵیان داو بیبەن بۆخەڵکی لەم لاولەولای دونیادا .

وەمنیش والە جەنابت ڕانابینم‌و وات دانانێم کەبتەوێت یەکەم کەس بیت ئەوکارە بکەیت .......

جائەگەر پێوویستی یەکت هەیە پێمان فەرموو تەشریف بهێنە بۆلامان .... ئیتر سلاو لەجەنابت و لەوانەی لەخزمەتتان .

ئەوجاکە(ئەمیر)نامەکەی خوێندەوە چوو بۆخزمەتی و، سلاوی لێ کردو نزایی پایە بەرزی بۆکردو ووتی: ئەی(ئەبا حازیم)، بەڕاستی هەڵوێستەمان کرد لەسەر ئەوەی

کەبۆت نووسیبووین، جابەوهەڵوێستەت زیاتر پلەوپایەو ڕێزت لای ئێمە زیادی کرد

دەی فەرموو ئەوەی پێوویستە یادمان بخەرەوەو ئامۆژگاریمان بفەرموو، خودای بالاّ دەست پاداشت بداتەوە لەجیاتی ئێمە باشترین پاداشت .

ئەوجا(ئەبو حازم) ئامۆژگاری دەکردو شتی یادی دەخستنەوە، وە لەکۆی ئەوەی کەپیّ ی ووت:

ئەی (ئەمیر) سەرنج بدەن لەوەی کەپێت خۆشە لەڕۆژی ڕەستاخێزدا لەگەڵتابێت، ئەوجا لەدونیادا سوور بە لەسەر ئەنجامدانی ئەوە .........

وەسەرنج بدە لەوەی کەپێت ناخۆشە لەوێدا لەگەڵت بێت، لێرە لەدونیادا پشتی تیّ بکەو وازی لیّ بهێنە

وابزانە- ئەی (ئەمیر)- ئەگەر ناڕەوایەتی و گەندەڵی لای جەنابت پەرەی سەندو بەپیّ ی حەزی خەڵکی گەندەڵ و ناڕەوابوو، ئەوە دەبینیت دووڕوو گەندەڵەکان دێنە خزمەتت، لە دەوری کۆدەبنەوە ......

خۆئەگەر بەپێچەوانەوە ڕاستی و ڕەواکاری لای جەنابت بوو، وەپەرەی سەندبوو، وەهەموو لایەکی گرتبووەوە، ئەوە خەڵکی چاك و چاکە ویست لەدەورت کۆدەبنەوەو، یاریدەت دەدەن لەسەری ......جابۆ خۆت چیت پیّ خۆشە ئەوە هەڵبژێرە .

*　　　　*　　　　*

وەکاتێك کەمەرگ یەخەگیری (ئەبی مازیم ی ئەعرەجی) بوو، هاوڕێکانی پێیان ووت: چۆن خۆت دەبینی ئەی (ئەبا حازم) ؟ ئەویش ووتی: وا دەبینم کە ئەگەر ڕزگارمان بوو لە خراپەی ئەوەی کە تووشمان بووە لە دونیاو لەزەتەکانی، ئەوە زەرەرۆمەندنابێت لەوەی کەپشتی تیّ کردین و پێچرایەوە .ئینجا ئەم ئایەتەپیرۆزەی خوێندەوە :

إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّـٰلِحَـٰتِ سَيَجْعَلُ لَهُمُ ٱلرَّحْمَـٰنُ وُدًّا ﴿٩٦﴾ (سورة مريم ئاية/٩٦).

واتە: بەڕاستی ئەوانەی ڕاستگۆیانە باوەڕیان بەخوداو پێغەمبەرەکەی هێنا، وەگوێ ڕایەڵی خودایان کردو،دوریان گرت لە قەدەغەکراوەکانی، خودای بەسۆز و میهرەبان خۆشەویستیان دەکات لە دڵەکاندا و خەڵکی خۆشیان دەوێت و خوداش لێیان ڕازی دەبێت.جا بەردەوام ئەو ئایەتەی دوپات دەکردەوە هەتا گیانی سپارد.

(دەی خودایە کۆتایی تەمەنمان وەك کۆتایی تەمەنی

(حازیمەی ئەعرەجی) بێت و لەگەڵ ئەوان دا حەشربکرێین و لە خزمەتی پێغەمبەردا(ﷺ) لەبەهەشتەکەتدا جێگیر و حەواوە بین)

بۆ زیاتر لە شارەزابوون لە ژیانی (حازیم ی ئەعرەبی) بڕوانە.

١- طبقات خليفة:٦٤.

٢-تأريخ البخاري ٧٨/٢

٣-التأريخ الصغير:٤٧/٢

٤- الجرح و التعديل:١٥٩/٤

٥-حلية الأوليا ٔ :٢٢٩/٣

٦- تهذيب التهذيب:١٤٣/٤

٧- تهذيب ابن الساكر:٢٢٨/٢١٦/٦

٨- خلاصة تذهيب الكمال:١٤



# ١٤)سەعیدی كوڕی موسەیب

**(سەعیدی كوڕی موسەیب) فەتوای داوە و هاوڕێیانیش لە ژیاندا بوون.**

**﴿ مێژوو نووسان ﴾**

(ئەمیری بڕواداران عەبد ولمەلیكی كوڕی مەڕوان) بڕیاری دا و سووربوو لەسەر حەجی ماڵی خودا.....

وەسەردانی دووەم پارێزراوی پیرۆز(ثاني الحَرَمَين الشَّريفَين)

وەسڵاوكردن لە پێغەمبەری خودا دروود و سڵاوی خودای لەسەربێ.

جاكاتێك مانگی(ذیلقةعدة) هات، (خەلیفەی پایە بەرز) ووشتری سواری تایبەندمەندی خۆی ئامادەكردوو، ڕووی كردە سەر زەمینی (حیجان) وە كۆمەڵێك لەگەورە پیاوانی بەڕێز لە ئەمیرەكانی بەنی(ئومەییە) لە خزمەتیابوون.

وەهەروەها كۆمەڵێكیش لە گەورە پیاوانی دەوڵەتەكەی و ....هەندێ لە كوڕەكانی...

كاروانی(خەلیفە) ڕێ ی بەڕێكرد لە(دیمەشقەوە) بۆ شاری (مەدینەی منەووەرە) لەسەر خۆ بەبێ پەلەكردن....

جاهەركاتێك لە مەنزلێكدا لایان دەدا بۆ حەوانەوە، خێمەیان بۆ هەڵدەدرا، وەراخەریان بۆ ڕادەخرا، وە كۆڕی زانست و گفتوگۆیان بۆ دەبەسترا، تا زیاتر شارەزابن لە دیندا.

وە دڵ و ناخەكانیان وابەست بكەن بەدانانی و ئامۆژگاری چاكەوە.

* * *

جا کاتێك کە(خەلیفە) گەیشتە شاری(مەدینەی منەوەرە)،خۆی گەیاندە (پارێزراوی پیرۆزی)
(حَرَما الشریف).یانی مزگەوتی پێغەمبەران وە شکۆداربوو بە سڵاو کردن لە نیشتەجێکەی(موحەمەد)
بەهاترین سەلات و سەلامی خودای لەسەربێت، وەبەختەوەر بوو بە نوێژکردن لەرەوزەی خاوێنی دا
(الرَّوضة المطَّرة).
وەبەشێوەیەك تام و چێژی بەختەوەری و دڵنیایی و ئارامی دەرووني کرد، کە هەرگیز لەوە پێش وێنەی ئەو تام و چێژەی نەکردبوو.....
وەبڕیاری دا لەسەر درێژکردنەوەی مانەوەی لەشاری(پێغەمبەردا) سەلات و سەلامی خودای لەسەربێ، ئەوەندەی بگونجێت.

* * *

وەلە گرنگترین شتێك کەلەشاری (مەدینەدا) جێگەی گرنگی پێدانی (خەلیفە) بوو، وەزاڵبو بوو بەسەریدا و زۆر پێوەی جەنجاڵ بوو، بازنەکانی زانست بوو کە مزگەوتی پێغەمبەر(ﷺ) پیرۆزی ئاوەدان کردبووە وەتیایاندا زانایانی نمونەیی و ناوازە دەدرەوشانەوە لەگەورە شوێنکەوتووان، هەروەك چۆن ئەستێرە درەوشاوەکان دەدرەوشانەوە لە ناوجەرگەی ئاسماندا... جا ئەوە بازنەی (عوروەی کوڕی زوبەیرە) وە ئەوەیان بازنەی(سەعیدی کوڕی موسەییەبە)
وە ئەمەی تریان بازنەی(عەبدوڵای کوڕی موتبە یە)[1] ......

* * *

ڕۆژێکیان (خەلیفە) لە خەوی چێشتنگاو خەبەری بوویەوە، کە بە پێ ی نەریتی خۆی ڕۆژانی تر لەو کاتەدا بەخەبەر نەدەهات، بە هەر حاڵ جا بانگی پارێزەرەکەی (دەرگاوانەکەی) کرد ووتی : ئەی (مەیسەرە) .
ئەویش ووتی.: بەڵێ لە خزمەتدام ئەی (ئەمیری بڕواداران) .
(خەلیفە) ووتی : بڕۆ بەبێ وەستان بۆ مزگەوتی (پێغەمبەر) (ﷺ) ، وە یەکێك لە زانایانمان بۆ بانگ بکە تا بماندوێنێ واتە قسەمان بۆ بکات ..........

---

١/ یەکێکە لە گەورە شوێنکەوتووان .

(مەیسەرە) ڕۆشت بۆ مزگەوتی (پێغەمبەر)ی پیرۆز، وە چاوی گێڕا جگە لە یەك بازنە (حلقه) هیچی دی کەی نەبینی، کە زانایەك (شیخ) کە تەمەنی لەسەرو شەست ساڵی یەوە بوو، لە ناوەندی بازنەکەدا وەك زانایەکی سادە دانیشتبوو، کە لەناو چاوی ئەودا بە ها وڕێز بەدی دەکرا .......

پاشان (مەیسەرە) لەنزیك بازنەکەوە ڕاوەستا، وە بە پەنجەی ئاماژەی بۆ (زانا)کە کرد .......

بەڵام (شێخ) لاینەکردوە بەلایەوە، وە گرنگی پیٚ نەدا.

(مەیسەرە) نزیکتر بوویەوە لە (شێخ) و ووتی: ئایا نابینی کە من ئاماژە بۆ تۆ دەکەم؟!.

(شێخ) فەرمووی: بۆ من ؟!.

(مەیسەرە) ووتی: بەڵێ ...

ئەویش فەرمووی :پێویستیت چی یە؟.

(مەیسەرە) ووتی: (ئەمیری بڕواداران) لەخەوهەستاو، ووتی بەمن: بڕۆ بۆ مزگەوتی(پێغەمبەر) (ﷺ) و لەویٚ سەیر بکە بزانە کیٚ دەبینی لەو زانایانەی کە توانای قسەکردنی هەیە بۆمان، باتەشریف بهێنێت و بۆمان بدویٚ .

(شێخ) فەرمووی: من لەوانە نیم کە قسەی بۆ دەکەن .جا (مەیسەرە) پیٚ ی ووت: بەڕاستی ئەو کەسێکی دەوێت کە قسەی بۆ بکات ئەوجا (شێخ) فەرمووی: بیٚ گومان ئەو کەسەی کە شتێکی بوویٚ بەدوای دەکەوێت، ڕووتر دەچێت بەشوێنیدا ...

وە بازنەکەش لە مزگەوتدا شوێنەکەی فراوانە ئەگەر ئەو ئارەزووی ئەوەی هەیە ئامادەی بێت .وە ووتەو قسەش خەڵکی دێت بۆ بیستنی، نەك ئەو بچێت بۆ لای ئەو کەسەی کەدەیەوێت بیبیستیٚ ...

جا دەرگاوانەکەی (خەلیفە) بەشوێنی خۆیدا گەڕایەوەو ووتی بە (خەلیفە): کەسم نەدیوە لەمزگەوت دا جگە لە شێخێك (زانایەك)، کە ئاماژەم بۆ کرد بەڵام ئەو گوێی نەداو هەڵنەستا ئەوجا لێی نزیك بوومەوەو ووتم: بەڕاستی (ئەمیری بڕواداران) لەم کاتەدا لە خەوهەستاوەو بەمنی فەرموو: بڕۆ سەرنج بدە بزانە کێت بەرچاو کەوت لە ووتار بێژانی مزگەوت بۆم بانگ بکە ...

ئەوجا ئەویش زۆر بەهێمنی و لەسەرخۆیی پیٚ ی ووتم: بەڕاستی من لە ووتاربێژو قسەکارانی مزگەوت نیم ...

وە لەبازنەی مزگەوت دا شوێن بۆ ئەویش هەیە ئەگەر ئارەزووی هەیە هاوبەشی بکات لە بیستنی گفتەگۆکەدا .

جا (عەبدولمەلیکی کوڕی مەروان) هەناسەیەکی قوڵی هەڵکێشا ....

ڕاپەڕی و هەستایە سەر پێ و، ڕوویکردە ژوورەکەی خۆی و دەیووت: ئەوە (سەعیدی کوڕی موسەییەب) بووە ...

خۆزگە نەچوویتایە بۆ لای، وەقسەت لەگەڵ نەکردایە ...

جا کاتێك لە کۆڕەکە دوورکەوتەوەو چووە ژوورەوە، ئا لەو کاتەدا کوڕە هەرە بچووکەکەی (عەبدولمەلیك) لای کردەوە بەلای هەرە گەورەکەیەوەو ووتی: ئەوە کێ بووە خۆی بەسەر (ئەمیری بڕواداران)دا نواندووە، وەخۆی لەوە بەگەورەتر زانیووە کە ڕابوەستی لەنێوانی دەستەکانی داو، ئامادەی کۆڕەکەی بێت ...

لەگەڵ ئەوەدا کە دونیاو پادشای (ڕۆم) مل کەچی پایە بەرزیی ئەو بوون .

ئەوجا براگەورەکەی ووتی: ئەوە ئەو پیاوەیە کە (ئەمیری بڕواداران) داخوازی کچەکەی کردبۆ(وەلید) ی برات، بەڵام ئەو ڕازی نەبوو بیداتێ .

جابرا بچووکەکە ووتی: یانی بڕیاری دا کەکچەکەی نەدات بە (وەلیدی کوڕی عەبدولمەلیك)؟!

وەگوایە ئەو ویستوویەتی هاوسەرێکی بەڕێزترو بەشکۆتر لە جێنشینی (ئەمیری بڕواداران) بۆکچەکەی دابین بکات؟! .

کەلەدوای (ئەمیر) دەبێتە ئەمیری بڕواداران .

ئەوجا برا گەورەکەی بێ دەنگ بوو وەهیچ وەڵامێکی نەدایەوە ............

برا بچووکەکەش ووتی: لەکاتێکدا کە ئەو کچەکەی نادات بەجێنشینی (ئەمیری بڕواداران)، ئایا هاوشانێکی وەهای بۆ بەدیکردووە کەشایستەی ئەوبێت؟

یاخود لەڕاستیدا ئەویش حاڵی وەك هەندێ خەڵکی وەهایە کەنایانەوێت کچەکەنیان بە شووبدەن، بەڵکو هەردەیانەوێت کارەکەری ناوماڵ بن .

ئەوجا براگەورەکەی پێ ی ووت:

لەڕاستیدا من هیچ شتێك لەدەنگ وباسی ئەو ئافرەتە نازانم، دەنگ و باسی لەگەڵ خۆی دایە ........

جائالەو کاتەدا یەکێك لە دانیشتوان کەخەڵکی شاری (مەدینە) بوو لایکردەوە بەلایانەوەو ووتی:

ئەگەر (ئەمیر) ڕووخسەت بفەرمووێ چیرۆکی ئەو ئافرەتەی هەموو بۆ دەگێڕمەوە

لەڕاستیدا ئەو ئافرەتە شویکردووە بەلاوێك لەلاوەکانی گەڕەکەکەی ئێمە، پیێ ی دەوترێت:(ئەبو وەداعە)

دراوسێمانە، ماڵەکەیان بەتەنیشت ماڵەکەمانەوەیە ......

وە دەربارەی ئەو هاوسەرگەریەتییەی نێوانیان چیرۆکێکی سەرنج ڕاکێش و ناوازە هەیە کە (ئەبو وەداعە) خۆی بۆی گێڕاومەتەوە ......

جادوو براکە پێیان ووت: فەرموو بۆمان بگێڕەڕەوە ......

ئەوجا پیاوەکە گوتی: (ئەبو وەداعە) قسەی بۆ کردم ووتی:

ئەی برا– وەك دەزانین – من بەردەوام وابەستی مزگەوتی (پێغەمبەری خودا) بووم سەلاَت و سەلامی خودای لەسەربێ، بۆ فێربوونی زانست .

وەمن ئامادەی بازنەی زانستی (حلقە العلم) (سەعیدی کوڕی موسەیەب) دەبووم، کەخەڵکی بەشێوەیەك قەرەباڵغیان دەکرد شانیان لەسەر شانی یەکتربوو.

جامن چەند ڕۆژێك نادیاربووم لە باونەکەیدا، بەڕێزی بەدوومدا گەڕابوو، وە پرسیاری دەربارەم کردبوو، چونکە ئەو وای گومان بردبوو کەناساغی یەکەم هەیە، یاخوود تووشی چەرمەسەری و دۆزێك بووم .جاپرسیاری دەربارەم کردبوو، دەنگوباسی منی لای هیچ کەسێك بەدەست نەکەو تبوو جاکاتێك دوای چەند ڕۆژێك گەڕامەوە خزمەتی، سلاَوی لێکردم و بەخێری هێنام و ووتی:

ئەی (ئەبا وەداعە) تۆلە کوێ بوویت؟ .

ئەوجا منیش عەرزم کرد: هاوسەرەکەم وەفاتی کرد، جامنیش سەرجەنجاڵ بووم بەکاروباری ئەوەوە ..

ئەوجا(شێخ) فەرمووی: ئەی بۆچی ئاگادارت نەکردووین ئەی (ئەبا وەداعە)، تایاریدەت بدەین،

وەلەگەڵتا ئامادەی بەخاك سپاردنی بووینایە، وەیارمەتیمان بدایتایە لەوسەرجەنجاڵی یەتدا .

ئەوجا منیش ووتم: خودا پاداشتی خێرت بداتەوە ....... ئیتر وویستم کە هەڵبستم

جاهێشتمی یەوە هەتا هەموو ئەوانەی کە ئامادەی کۆڕەکە بوون، کۆڕەکەیان بەجێهێشت، ئینجاپێ ی ووتم :

ئەی (ئەبا وەداعە) ئایا بیرت نەکردۆتەوە لە هاوسەرگەرییەتی یەکی تازە؟

منیش ووتم: بەرسۆزو میهرەبانی خودا بکەویت .

کێ کچی خۆی دەدات بەمن، لەکاتێکدا کەمن بەبێ باوکی گەشەم کردووە، وەبە هەژاری ژیاوم .......

بەڕاست من جگە لە دوو درهەم یان سێ درهەم زیاترم نی یە .

ئەویش ووتی: من کچەکەی خۆمت لێ مارەدەکەم .

جابەڕاست من زمانم بەسراو ووتم: ئایا تۆ؟! ....

ئایاتۆ کچەکەتم دەدەیتێ لەگەڵ ئەوەدا کەتۆشارەزای منی ئەوەندەی کەتۆ شارەزابوویت ؟!

ئەویش فەرمووی: بەڵێ ..........

ئێمە ئەگەر کەسێك هاتە لامان و کچی لێ خواستین، وەئێمەش لەدین و ڕەوشتی ڕازی بووین، ئەوا دەیدەینێ، وەتۆش لای ئێمە دین و ڕەوشتت جێگەی ڕەزامەندی یە

ئینجا لایکردەوە بەلای ئەوانەوە کەلێمانەوە نزیك بوون، وەبانگی کردن ........ ئەوجا کەهاتن بەدەنگی یەوەو، چوونە خزمەتی، سوپاسی خودای باڵادەستی کردو، وەسەڵاواتی لەسەرپێغەمبەردا سەڵات وسەلامی خودای لەسەربێ .

وەئینجا کچەکەی لەمن مارەکرد ......وەمارەیەکەی دوو درهەمی دانا .......

ئەوجا من هەستام وەنەم دەزانی لەخۆشی و سەرسوڕمان چی بڵێم .........

پاشان ڕووم لەماڵەکەم کرد، وە ئەو ڕۆژە بەڕۆژوو بووم، وەڕۆژووەکەم لەبیرچوو وەهەردەم ووت:

ئەی هاوار، چیت کرد بەخۆت ئەی (ئەبا وەداعە) ؟! .......

لە کێ قەرز دەکەیت ؟! ..........

وەلەکێ داوای پارە دەکەیت ؟! ..........

وە بەو شێوەیە لەسەر ئەو حاڵەی خۆم مامەوە هەتا بانگی ئێوارەی فەرموو.......

ئەوجا نوێژی ئێوارەم (مَغرب) بەجێ هێناو، دانیشتم بۆ ڕۆژوو شکاندنەکەم و نان خواردن، کە خواردنەکەم زەیت و نان بوو ........

هەر ئەوەندە بوو کە پارووێەك یان دووپارووم لە خواردنەکە خواردبوو، گوێبیستی لێدانی دەرگاکە بووم.

جا ووتم: کێ یە لە دەرگا دەدات ؟

لێدەری دەرگا فەرمووی: (سەعید) م .........

جا سوێند بەخوا هەرچی مرۆڤێك کەناسیبێتم و ناوی (سەعید) بووبێ بەبیرو هۆشمدا هاتووە جگە لە (سەعیدی کوڕی موسەیەب) ........لەبەر ئەوە لەڕاستیدا ئەو لەماوەی چل ساڵ دا نەبینراوە مەگەر لەنێوان ماڵەکەی و مزگەوت دا ، دەرگاکەم کردەوە، خۆم لەبەردەمی (سەعیدی کوڕی موسەیەب) دا بینییەوە...وە لەوکاتەدا واگومانم برد کە گوایە گۆڕانکاریەك لەبڕیارکەی دا بووە دەربارەی هاوسەرگەرییەتی کچەکەی لەگەڵ مندا .وەپێم ووت:

ئەی (ئەبا موحەممەد)؟! ..... بت ناردایەوە بە دوامدا دەهاتمە خزمەتت .........

جائەویش فەرمووی: بەڵکو ئەمڕۆ تۆ ڕەواتری کەمن بێم بۆلات .

جاعەرزم کرد: فەرموو تەشریفت ببەرە میوانم ...........

ئەوجا ئەو فەرمووی: نەخێر، بەڵکو بۆکارێك هاتووم بۆلات .

منیش ووتم: فەرموو کارەکەت چی یە خوای باڵادەست بەزەیی پێدابێتەوە ؟

ئەوجا فەرمووی: لەڕاستیدا ئەی (ئەبا وەداعە) کچەکەم بەپێ ی شەرعی خودا لە چێشتەنگاوەوە بووەتە هاوسەری تۆ، وەمنیش دەزانم کەتۆ کەست لەگەڵدا نی یە دڵنەوایت بداتەوەو لەتاکەکەسی ڕزگارت بکات، جابەلامەوە ناخۆش بووکەتۆ لەشوێنێك شەوبەسەربەیت و هاوسەرکەشت لە شوێنێکی دی، جا ئەوە هاوسەرەکەتم بۆهێناوی .

ئەوجامنیش ووتم: ئەی هاوارهەی ......... جەنابت بۆت هێناوم ؟!

ئەویش فەرمووی: بەڵێ .........

جاسەیرم کرد، هاوسەرکەمە بەباڵای بەرزی یەوە ڕاوەستاوە .

ئینجا باوکی لای کرد بەلایەوەو ووتی: ئەی کچی من دەبە ناوی خوداوە بچۆرە ماڵی هاوسەرەکەت، خودا بەرەکەتی خۆی بەسەرتانا بڕێژێت .........

جاکاتێك کەویستی هەنگاوبنێ بە چارشێوەکەی لەشەرما ڕووی خۆی داپۆشیبوو، بۆیە خەریك بوو بکەوێت بەئەرزدا .

وەمنیش بەسەر سوڕمانێکی بێ سنورەوە لەبەردەمیا ڕاوەستا بووم ...
نەم دەزانی چی دەڵێم ...
ئینجا پێشی کەوتم بۆ سەر ئەو سفرەیەی کە زەیت و نانەکەی لەسەربوو،وە لەڕووناکی چراکە لامدا تانەیبینێ.
ئینجا سەرکەوتمە سەربان و دراوسێکانم بانگ کرد، ئەوانیش بەدەم دەنگمەوە هاتن و ووتیان :چ خێرتە؟
منیش ووتم: بەڕاستی ئەمڕۆ کە (سەعیدی کوڕی موسەیب) کچەکەی لە مزگەوت دا لێ مارەکردم...وەوا ئێستا خۆی بۆی هێناوم بەبێ ئەوەی ئاگاداربم....جا فەرموون بێن دڵنەوایی بکەن هەتا دایکم بانگ دەکەم، چونکە ئەو ماڵەکەی دوورە.
ئەوجا پیرە ژنێك لەو دراوسێیانە ووتی: ئەی هاوار ئەزانیت چی دەڵێیت؟!
ئایا(سەعیدی کوڕی موسەیب) کچەکەی لێ مارەکردی .... وە خۆی بۆی هێنایت بۆ ماڵەوە؟!.
ئەوە ئەو کەسە بوو کە ڕازی نەبوو ئەو کچەی بداتە(ولیدی کوڕی عەبدولمەلیك)!!
منیش ووتم: بەڵێ..
وەئا ئەوە ئەو کچەیە کەلای منە و لەماڵەکەمدایە،فەرموون بۆلای و، بیبینن.
ئەوجا دراوسێکان ڕوویانکردە ماڵەکەی، وە ئەوان لەوەدا بوون کە بڕوای پێ نەکەن، جا بەخێریان هێنا و دڵنەواییان کرد و لەو نامۆییە ڕزگاریان کرد...

* * *

وە زۆری پێ نەچوو هەتا دایکم هات، جا کاتێك کە بینی لای کردبەلامەوە و ووتی:
ڕووم لە ڕووت قەدەغەیە، واتە نەیاریت دەکەم و سەیرت ناکەم ئەگەر بەجێ ی نەهێڵی بۆ من تاوەك و پێویست بیڕازێنمەوە و- ئەوجا هەروەك ئافرەتە پایە بەرز و بەرێزەکان چۆن ڕێکدەخرێن و دەڕازێنرێنەوە بۆ شەوی هاوسەرگیریەتی ، پێشکەشتی بکەم بۆ ژووری زاوایەتی.
جا ووتم: لەخزمەتتام دایە گیان تۆ چۆنت دەوێت...
ئەوجا سێ ڕۆژگرتی یە لای خۆی، دوای ئەوە بە بووکی بۆی هێنام.
کە بینیم لە جوانترین و بە بەهاترینی ئافرەتانی(مەدینە) بوو....
وەلە هەموو خەڵکی زیاتر قورئانی پیرۆزی بەجوانی لەبەر بوو.

وەهەروەها لە زۆربەیان زیاتر گێڕەرەوەی فەرموودەکانی پێغەمبەر(ﷺ) بوو..

لەسەروو هەموو ئەوانەوە شارەزاترینی ئافرەتان بوو لە مافەکانی هاوسەرگەریەتیدا.وەبەتایبەتی تر ماف هاوسەر بەسەر هاوسەرەکەیەوە.

چەند ڕۆژێك لەگەڵیدا مامەوە و بەجێم نەهێشت، وەلەو ڕۆژانەدا نەباوکی و نەهیچ کەس لە خانەوادەکە سەردانیان نەکردم.

پاش ئەوە چوومە بازنەی(شێخ) لە مزگەوت و ئامادە بووم لەخزمەتیا، وەسڵاوم لێکرد، ئەویش وەڵامی سەلامەکەی دامەوە، بەڵام قسەی لەگەڵ نەکردم.

جاکاتێك ئامادەبووانی کۆڕەکەبڵاوەیان کردوو کۆڕەکەیان بەجێ هێشت و جگە لە من کەسی دی نەمایەوە(شێخ) فەرمووی:

ئەی(ئەبا وەداعە) حاڵی هاوسەرەکەت چۆنە؟

منیش ووتم: ئەو بەو شێوەیە کە دۆست پێ ی دڵشادە و نەیارپێ ی ناخۆشە...

ئەویش فەرمووی: سوپاس بۆ خودا.

جا کاتێك گەڕامەوە بۆماڵەوە، بینیم ئەندازەیەك ی زۆر پارەی بۆ ڕەوانە کردبووین تا بۆ پێویستی یەکانی ژیانمان بەکاری بهێنین...

ئەوجا(کوڕی عەبدلمەلیك) ووتی: جێ ی سەرسوڕمانە کاری ئەو پیاوە.....

پیاوێکیش لە خەڵکی(مەدینە) پێ ی ووت: لەچ ڕوویەکەوە جێگەی ڕامان و سەر سوڕمانە ئەی (ئەمیر)؟...

لەڕاستیدا ئەو مرۆڤێکە کە دوونیای بە هەموو جوانی یەکانی یەوە کردۆتە هۆکارێك بۆ مسۆگەر کردنی قیامەتی....

وەقیامەتی بە دوونیای کڕی وە بۆ خۆی و خاوو خێزانی...

وە سوێند بە خودا ئەو ڕژدی نەکردووە(مابُخِيلَ).بەکچەکەی بەسەر کوڕی(ئەمیر برواداران دا)... وە وای نەزانیووەکە هاوشانی نی یە،بەڵکو لەوە ترساوە کەکچەکەی بەهۆی دونیاو ناز و نیعمەتەکانی دونیاوە تووشی گێچەڵ(فتنە)بێت...

وەیەکێك لە هاوڕێیانی (سەعید) پرسیاری لێکردو ووتی:داوای (ئەمیری برواداران) بۆ کچەکەت وەلا دەخەیت و نایدەیتێ، بەڵام مارەی دەکەیت لە پیاوێك لە کۆی موسڵمانان؟!.

ئەویش لە وەڵامدا ووتی: بەڕاستی کچەکەم سپاردەیە لە ئەستۆی من دا، جا بۆیە گەڕام و هەوڵم دا کەکەسێك بۆ دەسنیشان بکەم و بیدەمێ کە خێری دین و دونیای تیا بێت بۆی.جا کابرا پێ ی ووت: ئەوە چۆن؟!

(شێخ) ووتی: ئایا ئێوە گومانتان چی دەبێت پێ ی ئەگەر بگوێزرێتەوە بۆ ناو کاخەکانی بەنی(ئومەییە).....

وەئالو گوێزبکات لە نێوان جل و بەرگ ی ناوازەی و کەل و پەلی ناو ماڵی دا....

وەخزمەتکارانی و دەورو بەروو بەندەکانی لە نێوان دەستی دا بێت و بچن، وەلەلای ڕاست و چپ یەوە...

ئەوجا خۆی بینی وەك کە ئەوەی کە ئەو هاوسەری (خەلیفە)یە:

جا دینی ئەو بەرەو کوێ دەچێت لەو ڕۆژگارەدا؟

پیاوێك لەخەڵکی شام ووتی: وادەردەکەوێت کە هاوڕێکەتان لە جۆرێکی ناوازەیە لە خەڵکی...ئەوجا پیاوێکی مەدینەیی ووتی:

سوێند بە خوا هەرگیز ڕەواو ڕاستی دوورنەکەوتۆتەوە و بەسەریدا تێ نەپەڕیوە و لێ ی لانەداوە...

وە ئەو بە ڕۆژ بە ڕۆژوو بووە....

شەوی بە خودا پەرستی زیندو کردۆتەوە...

وەنزیکەی چل حەجی ئەنجام داوە .......

وەلەماوەی ئەوچل ساڵەدا لەمزگەوتی ڕەوانەکراودا (اللّهُ اکْبَر) ی یەکەمی واتە نوێژی دابەستنی لەکیس نەچووە .......

وەلێوەی نەزانراوە کەڕوانیبێتی بۆپشتەملی پیاوێك لەکاتی نوێژدا. لەماوەی ئەو (40) ساڵەدا ئەویش لەبەرئەوەی هەوڵی داوە هەمیشە لەڕیزی یەکەمدابێت...

وەئەو لەتوانایدا هەبوو کە هەرکەسی بەرچاوبکەوێت بی خوازێت لەئافرەتانی قوڕەیش، بەلأم ئەو ئەوەی هەڵبژاردوو بەلایەوە باشتربوو کەژیان لەگەڵ کچی (ئەبی هورەیرەدا) بەرێتە سەر، وەفەزڵی ئەوی دەدا بەسەرئافرەتانی دی دا........

ئەوەش لەبەر پلەوپایەی (ئەبی هورەیرە) لەلای پێغەمبەری خودا سەلأت وسەلامی خوای لەسەربێ ...

وەهەروەها لەبەر بەتوانایی لەگێڕانەوەی فەرموودەکانی داو تامەزرۆمەندییەتی زانست و فەرموودە وەرگرتن لێ ی .



وە ئەو بەڕاستی خۆی بەخشیبوو بۆفێربوونی زانست لە منداڵی یەوە. جا دەچووە خزمەتی هاوسەرەکانی(پێغەمبەری ئیسلام) سەلأت و سەلامی خودای لەسەربێ، تازانست و فەرموودەیان لێ وەربگرێت و شوێن پێ ی ئەوان هەڵبگرێت....

بەتایبەتی: فێردەبوو لەسەر دەستی (زەیدی کوڕی سابت) و(عەبدوڵلای کوڕی عەباس)و (عەبدوڵلای کوڕی عومەر) [1] ........

وەهەروەها گوێبیست بووە لە (عوسمان و عەلی و سوهەیب [2] و، کەسانی دیکەش لە هاوڕێیانی پێغەمبەر(ﷺ) .

وەوابەست بووە بەڕەوشت و سیفەتە جوانەکانی ئەوانەوەو، خۆی پێ جوان کردووە

وە ووتەیەکی هەبوو کەبەردەوام دەیووتەوە، هەتا وای لێهاتبوو کە بوو بووە دروشمێك بۆی کە ئەویش ئەم ووتەیەی بوو:

هیچ شتێك نی یە بەوێنەی گوێ ڕایەڵی خودا بەندە خۆی پێ بەرز ڕاگرێ ...
وەهیچ شتێك نی یە بەوێنەی سەرپێچی کردنی خودا بەندە خۆی پێ رسوا بکات

خودایە گیان.. ئەو دڵسۆزییەی (سەعیدمان) پێ ببەخشە و..وامان لێ بکە هەموو کارێکمان لەبەرخاتری تۆ بێ نەك بۆ دونیا .... وەلە خزمەتی ئەوانەدا حەشرمان بفەرموو ....ئامین

بۆزیاتر شارەزابوون لە ژیانی (سەعیدی کوڕی موسەییەب) بڕوانە:
١- الطبقات الكبرى لابن سعد: ١١٩/٥
٢- يأريخ البخاري .
٣- المصارف : ٤٣٧ .

---

[1] - (عەبدوڵلای کوڕی عومەری کوڕی خەتتابە) خودا لە خۆی و باوکی ڕازی ببێت .

[2] - بڕوانە پەراوی وێنەیەك لە ژیانی هاوڕێیانی هی دانەر .

٤- حُلية الأولياء : ٢/ ١٦١ .

٥- تهذيب الأسماء واللغات القسم الأول، الجزء الأول: ٢١٩ .

٦- وفيات الأعياف لابن خلكان: ٢/ ٣٧٥ .

٧- تذكرة الحفاظ: ١/ ٥١ .

٨- العبر: ٢/١١٠ .

٩- النجوم الزاهِرة: ١/ ٢٢٨ .

١٠- شذراتُ الذُهب :١٠٢/١ .

# ١٥)سەعیدی کوڕی جوبەیر

**(سەعیدی کوڕی جوبەیر)شەهیدکرا، وەلەسەر ڕووی زەمینی دا هیچ کەسێك نەبوو کە ئاتاجی زانستی ئەو نەبووبێ . (ئەحمەدی کوڕی حەنبەل)**

(سەعیدی کوڕی جوبەیر) لاوێکی بەهێزی تێ سمڕاوو بوو، کەجمووجووڵ و گورج و گۆڵی لێ هەڵدەقولاً، ولەگەڵ ئەوەشدا، خاوەنی دڵێکی زیندوو ژیرییەکی تیژوو بۆچوونێکی ناوازەبوو، وەزۆر وابەست بوو بەڕەوشتە بەرزەکانەوە، وە دوورەپەرێزبوو لە قەدەغەکراوەکان ........

وەڕەنگی ڕەشی و قژی گرژوو، بنەمایی یە حەبەش یەکەی، لەکەسایەتی یە دیارو ناوازەکەی کەمی نەکردبووەوە، لەگەڵ ئەوەشدا کەلەسەرەتای تەمەنیدابوو.

* * *

بەڕاستی لاوی ڕەگەز حەبەشیو، عەرەبی زمان و نەریت، هیچ لە گومان دانەبوو لەوەدا، کەزانست ڕاستە ڕێگایەتی بۆ ئەوەی بیگەیەنێتە ڕەزامەندی خودای بالاّ دەست،

وەخۆپارێزیو شەرم لەخودا(التُقی) لەڕاستیدا ئەو هۆکارێکە پیّ ی شاد دەبێت بەبەهەشتی خودا، جا بۆیە خۆپارێزی (التُقی) لەلای ڕاستی یەوەو .... زانستیشی لەلای چەپی یەوە دانابوو ... وەهەر دوو دەستی لیّ گیر کردبوون .

وەبەهۆی ئەوانەوە کاروانی ژیانی تێ دەپەڕاند بەبێ کۆڵدان و، کەمتەرخەمی هەر لەمنداڵی یەوە خەڵکی دەیانبینی سەری بەسەر کتێبەکانیدا داخستبوو خەریکی کۆشش و فێر بوون بوو، یان لەمیحرابەکەیدا خەریکی خودا پەرستی بوو ...

دەی فەرموون ئێوەن هەڵکەوتووەی موسڵمانان لە چاخی خۆیدا ...

* * *

(سەعیدی کوڕی جوبەیر) زانستەکەی فێربووەو وەریگرتووە لە کۆمەڵێك لەهاوڕێیانی پایەبەرز، لەنموونەی ئەوانە: (ئەبی سەعیدی خودری) وە (عەدیی کوڕی حاتەمەتائی) ... وە (ئەبی موسای ئەشعەری)، وە (ئەبی هورەیرەی دوسی) ... و (عەبدوڵڵای کوڕی عومەر) ، وە (عائیشەی دایکی بڕواداران) خودای باڵا دەست لە هەموویان خۆش بێت .

بەڵام مامۆستای گەورەو، مامۆستای بەڕێزو پایەبەرزی (عەبدوڵلا کوڕی عەبباس) بوو، زانای ئوومەتی (موحەمەد) (ﷺ) و، دەریای زانستی بێ پایانی..

(سەعیدی کوڕی جوبەیر) وابەست بووە بە (عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسەوە) وابەست بوونی سێبەر بەخاوەنەکەیەوە ... جا قورئان و لێکدانەوەی و، فەرموودە پێغەمبەر و ئامۆکانی لێ وەفێر بوو ...

وەلەسەر دەستی ئەودا بەتەواوی شارەزا بوو لەیاساکان و بڕیارەکانی ئایین دا، وەهەروەها لەوەوە فێری لێکدانەوە بوو ....

وەهەروەها لە خزمەتیا وانەکانی زمانی خوێندو، بەتەواوی شارەزایی لە ووردەکارییەکانی زمان داپەیدا کردو، بوو بەیەکێك لەبەتواناکانی لەزماندا .

هەتا وای لێهات لەسەر ڕووی زەوی دا کەسێك نەبوو لەخەڵکی ئەو ڕۆژگارەی خۆی کەئاتاجی زانستی ئەو نەبێت .

پاشان کەوتە گەڕان بە وولاتانی موسڵماننداا، گەڕان بەدوای زانستدا ئەوەندەی خودا ویستی لەسەر بوو کە بگەڕێت .

جاکاتێك ئەوەندەی کە ویستی لەزانست فێری بوو، شاری (کوفەی) کردە شوێنی جێ نشینی .

وە بوویە پێشەواو مامۆستا بۆ خەڵکەکەی .

* * *

لەڕەمەزاندا پێشنوێژی دەکرد بۆ خەڵکی، شەوێك بەشێوەی (عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود)[1] قورئانی دەخوێند، وە شەوی دووەم بەشێوەی (زەیدی کوڕی سابت)[2] دەیخوێند، وەشەوی سێ یەم بەشێوەی دی جگە لەو دووانە ... ئا بەو شێوەیە..

وەئەگەر بەتەنها نوێژی بکردایە ئەو لەیەك نوێژدا هەموو قورئانی دەخوێند، وەکاتێك کە دەگەیشتە فەرموودەی خوای بالآدەست:

فَسَوۡفَ يَعۡلَمُونَ ۝ إِذِ ٱلۡأَغۡلَٰلُ فِيٓ أَعۡنَٰقِهِمۡ وَٱلسَّلَٰسِلُ يُسۡحَبُونَ ۝ فِي ٱلۡحَمِيمِ ثُمَّ فِي ٱلنَّارِ يُسۡجَرُونَ ۝ (غافر ٧٠-٧٢)

واتە/ ئەوانەی کە قورئان و پەڕاوە ئاسمانی یەکانی دی کە بەدرۆ دەخەنەوە و بەدرۆی دەزانن سەرئەنجامی ئەو کارەیان دەبیننەوە، کاتێك زنجیر لەگەردنیان دەکرێت، و کەلەبچەی ئاسنینی بەئاگری دۆزەخ سورەوەکراو لەدەست و قاچیان دەکرێت و پێ ڕائەکێشرێن، وە ئاوی لەکوڵ دەکرێت بەسەریان دا، وە لەئاگری دۆزەخ دا دەسوتێنرێن و گڕیان تێ بەردەدرێت .

یان هاو شێوەی ئەو ئایەتە لەئایەتەکانی ترساندن و بەئاگاهێنانەوە، پێستی گرژ دەبوو ... وەدڵی دەکەوتە لێدان و ... چاوەکانی فرمێسکیان هەڵدەڕشت .

پاشان بەردەوام دووپاتی دەکردەوە تا لەوە بوو کە گیانی ببەخشێ .

* * *

وەهەموو ساڵێك دووجار سەفەری دەکرد بۆ زیارەتی(کەعبەی پیرۆز)...

جارێك لەمانگی(ڕەجەب)دا بۆ جێ بەجێ کردنی (عەمرە) و جاری دووەم لە مانگی (ذیلقەعدە)دا بۆ جێبەجێ کردنی حەج.

وەبێ گومان قوتابیان و زانست خوێنان و چاکە ویستان و گوێبیستانی ئامۆژگاری ڕوویان لە شاری(کوفە) دەکرد تا لە سەرچاوە پڕ و شەپۆل دەرە سازگارەکەی زانست هەڵبهێنجن...وەسود مەند بین لەڕێنماییە بەنرخەکانی...

ئەوە یەکێکە پرسیاری لێ دەکات دەربارەی(ترس) ووتی: ترس چی یە وەکامەیە؟

---

١- بروانە (صور في حياة الصحابة) للمؤلف .

٢- بروانە (صور في حياة الصحابة) للمؤلف .

وەڵامی دایەوە و ووتی: لەڕاستیدا(ترس) ئەوەیە کە ئەوەندە لە خودای باڵادەست بترسیت کە ئەو ترسەت لێ ی لەو ئاستەدابێت کە بکەوێتە نێوان تۆ و نێوان تاوانەکانت.

وە ئەوەیان یەکێکی تریانە پرسیاری لێ دەکات دەربارەی(ذکر) ووتی: (ذکر) چی یە و کامەیە؟

جا ئەویش لەوەڵامدا فەرمووی : (ذکر) گوێ ڕایەڵی خودای باڵادەستە....

جاهەرکەسێك ڕووی کردە خودا و گوێ ڕایەڵی کرد ئەوە بەڕاستی یادی خودای کردووە....

وەهەرکەسێك ڕووی لێ وەربگێڕێت و گوێ ڕایەڵی نەکات، ئەوە بەیادکەرەوەی خودا دانانرێت باشە و تا بەیانی هەرخەریکی یادکردنەوە و خوێندنەوەی قورئانیش بێت.

* * *

وەبێ گومان (کوفە) ئەوکاتەی کە(سەعیدی کوڕی جوبەیر) کردبوو بە شوێنی جێ نشینبوونی، لەژێر دەسەڵاتی(حەجاجی کوڕی یوسفی سەقەفی) بوو.

وە(حەجاج) لەو ڕۆژەدا کە والی بوو بەسەر(عێراق) و، ڕۆژهەڵات ، و ئەو وولاتانەی کەوتبوونە پشتی ڕووبارەوە، چوارمشقانە قاچی لێ نابووە سەر قاچ لە لوتکەی لوتبەرزی و دەسەڵاتی دابوو...

وەئەوەش پاش ئەوەبووکە (عەبدوڵلای کوڕی زوبەیر)[1] ی شەهید کرد، زاڵ بوو بەسەر جمو جوڵەکەیدا..

وە(عێراق) مل کەچی دەسەڵاتی بەنی(ئومەییە)بوو، وەهەموو ئەو شۆڕشانەی کە لەملا و لەو لاوە سەریان هەڵ دابوو(حەجاج) دایمرکاننەوە....

وەشیری لەسەر گەردنی خەڵکی دانا...

وەترس و بیمی بڵاوکردەوە لە چوارچێوەی وولاتدا....

هەتا گەیشتبوە ئەو ئاستەی کەدڵەکان پڕببون لەترس و بیم، وە لەوە دەترسان لەهەرچرکەساتێکدا بەدەستی یەوە توشی بن و بەرستەمی بکەون.

---

[1]/ (عەبدو ڵلای کوڕی زوبەیری کوڕی عەوام) کە پەیمانی پێ درابوو بۆ جێ نشینی.

پاشان خودا وویستی وابوو کە پێکدا دانێك ڕوودات لە نێوان(حەجاجی کوڕ ی یوسفی سەقەف) و(عەبدوڕەحمان ی کوڕی ئەشعەث) کە یەکێك بوو لە گەورەفەرماندەکانی.

وەئەو پێکدادانە بگۆڕێ بۆ ئاژاوەیەك کەتەڕوو ووشك هەڵبوەشێ ....

وەکۆمەڵێك برینی قوڵ لەلاشەی موسڵماناندا بەجێ بهێڵێ وە دەربارەی ئەو ئاژاوەیە ئەوە بوو، کە(حەجاج) (ئەشعەس) بەسوپایەکەوە بەڕێ کرد بۆ گرتنی(ڕەتبیل) پادشای(تورك) بەسەر ئەو ناوچانەوە کە کەوتبوونە پشتی (سیجیستانەوە)[1].

جافەرماندەی بەجەرگ و سەرکەوتوو، بەشێکی گەورەی لە ووڵاتی(ڕەتبیل) داگیرکرد لەگەڵ دەستگرتنی بەسەر کۆمەڵێك بازگەی سەربازی و قەڵای قایم دا لە ناوچەکەیدا....

وەدەستکەوتێکی زۆری بەدەست هێنا لە شار و گوندەکانی ئەو ووڵاتەدا....

پاشان چەند تەتەرێکی(ڕەوانەکراو) نارد بۆ لای(حەجاج) تا مزگێنی ئەو سەرکەوتنە گەورەیەی پێ ڕابگەیەنن، وە پێنج یەکی دەستکەوتەکانی پێیایاندا ڕەوانەکرد تابیخەنە گەنجینەی دارای موسڵمانان(بيت مال المسلمين) .

وەنوسراوێکی نووسی بۆ (حەجاج) وتیایدا داوای ڕوخسەتی کردبوو بۆ وەستانی جەنگ بۆ ماوەیەك، تالەو ماوەیەدا چۆنیەتی چوونە ناوەوەی شارەکان و دەرچوون لێیان تاقی بکەنەوەو، هەڵوێستە بکەن لەسەر سروشت و دارو باری ناوچەکە.

وە ئەوەش پێش ئەوەی بچنە قوڵایی و دۆڵ و دەشتی نێوان چیا یاخی و چۆڵەکان و... سوپای سەرکەوتوو تووشی مەترسی یەکان بکەن.

(حەجاج) لەسەر ئەو نوسراوە زۆر لێ ی شلوێ بوو.

وەنامەیەکی بۆ ڕەوانەکرد کەتیایدا بەترسنۆك و لاواز و سواو وەسفی کردبوو....

وەئاگاداری کردبووەوە بەتیاچوون ، هەڕەشەی لێ کردبوو بە لابردنی لە فەرماندەی سوپا.

کاتێك(عەبدوڕەحمان) کەئەوەی بینی، زۆربەی سەربازەکان و فەرماندەی سریەکانی کۆکردەوە...وەنامەکەی(حەجاج) بۆ خوێندنەوە و، ڕاوێژی پێ کردن دەربارەی ناوەڕۆکەکەی....

---

١/ ووڵاتێکە دەکەوێتە نێوان ئێران و ئەفغانستان.

جا ئەوانیش داوایان لێ کردکە بە گوێی نەکات، وەهەر خێرا دەست بەکاربێت بۆ لە فەرمان دەرچوونی و بێ گوێی کردنی.

ئەوجا(عەبدو ڕەحمان) پێ ی ووتن:

ئایا لەسەر ئەوە پەیمانم دەدەنێ و هاوکاریم دەکەن لەسەر ئەوەی کەلەگەڵی بجەنگێن هەتا خودای باڵادەست سەرزەوی(عێراق) لە ستەم و پیس و پۆخڵەکەی پاك دەکاتەوە؟

سەربازەکان بە کۆ پەیمانیان دایە لەسەر ئەوەی کە داوای لێ کردبوون.

* * *

(عەبد و ڕەحمان ی کوڕی ئەشعەس) ڕابەری بەو سوپایەوەی کە پڕاو پڕ بوو لە خەشم و کین و دژ بە (حەجاج).

وەجەنگ لە نێوان سوپای ئەو و سوپای (کوڕی یوسفی سەقەفی) هەڵگیرسا جەنگێکی بێ ئەمان و هاڕێنەر، کە(عەبدو ڕەحمان) تیایدا سەرکەوت سەرکەوتنێکی شکۆدار.

کەتیایدا دەستگیرا بەسەر(سیجیستان) و زۆربەی ووڵاتی(فارس).....

پاشان هات ویستی کە (کوفە) و (بەسرە) لەدەستی(حەجاج) وەدەربهێنێ.

* * *

وا گڕوو کڵپەی جەنگ بەردەوامە لە نێوان دوو تیمی نەیاردا ...

وە (ئیبن و ئە شعە ث) لەسەرکەوتنێکەوە بۆ سەرکەوتنێکی دی کەدەچێت ..

وە وەزعێکی خراپ ڕووبەڕووی (حەجاج) بووەتەوە، کە دژایەتی زیاتر بەهێز دەبێت...

ئەوەش ئەوەیە کە والی ناوچەکان نووسراوێکیان ڕەوانە کرد بۆ (حەجاج) کە تیایدا ووتوویانە .

کەبەڕاستی (ئەهلی زیممە) – (جوولەکەو گاورەکان) بەردەوام دێنە ناو ئایینی پیرۆزی ئیسلام و موسڵمان دەبێ تاڕزگاریان ببێت لە دانی باج. وەئەو گوندانەیان بەجێ هێشتووە کە کاریان تێدا کردووەو وەجێ نشین بوون لەشارەکاندا ...

وە بێ گومان بەو هۆیەوە باج نەماوە ...

وەدەستهاتەکان بەرەو نەمان چووە ...

جا (حەجاج) نامەیەکی نووسی بۆ والی یەکانی لە (بەصرە) و شوێنەکانی دی، وەفەرمانی پێدان، بەوەی کە هەموو ئەوانە کۆبکەنەوە کە کۆچیان کردووە بۆ شارەکان لە خەڵکی (زیممە) ...

وەبیانگێڕنەوە بۆ گوندەکانیان لەهەرکەیەکەوە بەجێیان هێشتووە .جاوالی یەکان فەرمانەکەیان ڕاگەیاندو جێ بەجێیان کرد، وە ژمارەیەکی زۆریان لەوانە لەماڵەکانیان ڕاپێچ کردوو ... دووریان خستنەوە لەسەرچاوەکانی بژێوی و لەدەوروبەری شارەکان دا کۆیانکردنەوە ...

وەلەگەڵیان دا ژن و منداڵانیشیان وەدەرنان ...

وەپاڵیاننا چۆن پاڵنانێك تا کۆچ بکەنەوە بۆ گوندەکان ...

پاش ئەوەی ماوەیەکی زۆر تێ پەڕی بوو بەسەر بەجێ هێشتنی گوندەکانیان دا . جا ژنان و منداڵان و بەساڵاچووان دەگریان و، هاواریان دەکردو، داوای پەنایان دەکردو، بانگیان دەکرد: ئەی ئەی موحەممەد، ...

ئەی موحوممەدا ...

وەسەریان لێ شێوابوو لەوەدا کە دەیان کرد، وە بۆ کوی دەچن ؟ .

جا زانایان ی (بەصرە) و خوێنەران ی چوون بۆ لایان تا بەهانایانەوە بچن و، تکایان بۆ بکەن ، بەڵام نەیانتوانی هیچیان بۆ بکەن چونکە (حەجاج) بەدەم دەنگیانەوە نەهات . بۆیە بەناچاری لەگەڵ گریانەکەی ئەواندا ئەمانیش بۆیان دەگریان و، وەهاواری بەهاناتنیان بۆ دەکردن بۆ ڕزگاربوونیان لەو کارەساتەی کە تووشیان بو بوو .

*　　　　*　　　　*

ئالەوێدا (عەبدوڕەحمان ی کوڕی ئە شعە ث) ئەو فرسەتەی قۆزتەوەو، داوای لەزانایان و خوێنەران کرد کە هاریکاری بکەن .

ئەوجا کۆمەڵێك لەشوێنێکەوتووانی پایەبە رزو زانایانی موسوڵمانان، وەڵامی داواکەی (عەبدو ڕەحمانیان) دایەوە، لەسەرو هەموویانەوە (سەعیدی کوڕی جوبەیر) و(عەبدوڕەحمانی کوڕی (ئەبی لەیلا)[1] و........(شەعبیی)[1] ، و(ئەبو لبەختەری)[2] و، هی تر، جگە لەوان .

---

[1] (عەبدوڕەحمانی کوڕی ئەبی لەیلا، یەکێکە لەگەورە شوێنکەوتووان .

وەجەنگ لەنێوان دوو تیمەکەدا گڕی سەند، وەلەسەرەتاوە سەرکەوتن دەستەملانی (کوڕی ئەشعەث)و ئەوانەی لەگەڵیدابوون بوو بەسەر (حەججاج) و سەربازەکانیدا .

پاشان تای ترازووکە هێدی هێدی دەستی کرد بەگەڕانەوە.........هەتا(کوڕی ئەشعەث) تێکشکا چۆن تێکشکان و بەزینێکی خراپ ........ وەخۆی ڕایکردوو خۆی ڕزگارکرد ..........

وەسوپاکەی و سەربازەکانی تەسلیمی (حەججاج) بوو.

*          *          *

(حەججاج) فەرمانی دابە بانگەوازکارەکەی کەبانگی سەربازە تێکشکاوە بەزیوەکان بکات، کەپەیمانی بۆ نوێ بکەنەوەو، واتە سەرلەنوێ پەیمانی پێ بدەنەوە و بچنەوە ژێر دەسەلاتی .

جازۆربەیان وەلامیان دایەوەو پەیمانیان بۆ نوێ کردەوە، وە هەندێکیشیان لێ ی تەرین .

(سەعیدی کوڕی جوبەیر) خودای لێ ڕازی بێت یەکێك بوو لەوانەی کەتەریبوون.

جاکە تابووری ئەوانەی کەتەسلیم بوو بوون، یەکەیەکە دەچوونە بەردەمی (حەججاج) بۆپەیمانی پێدانی، ڕوو بەڕووی شتێکی کوتووپڕ بوونەوە کەلە بیرو هۆشیاندانەبوو....... بیریان لێ نەکردبوەوە ....

ئەویش ئەوەبوو(حەججاج) بەیەکێکیانی ووت: ئایا گەواهی دەدەیت لەسەر خۆت بەوەی کەکافر بوویت بەهۆی شکاندنی پەیمانەکەتەوە کەکاتی خۆی دابووت بەوالی ئەمیری بڕواداران ؟ ........

جائەگەر بی ووتایە: بەڵێ ........ ئەوە نوێکردنەوەی پەیمانی لێ وەردەگیرا، وەڕزگاری دەبوو ......

خۆ ئەگەر بی ووتایە: نەخێر ........ ئەوە دەیکوشت .

جا هەندێکیان مل کەچی دەبوون و دانیان دەنا بەخۆیاندا کە کافربوون، بۆ ئەوەی خۆی لەکوشتن ڕزگاربکات .

---

[1]/ (شەعیبی) یەکێك بووە لەزانایان و بوێران و زیرەکە ناوازەکانی شوێنکەوتووان .

[2]/ (ئەبولبەختەری) شوێنکەوتوویەکی خواناسی دونیا نەویست بوو .

وە هەندێكی تریان ئەوەی زۆر بەقورسی دەزانی و ملی نەئەدا ........ جانرخی ئەو مل نەدانەی گەردنی بوو كە دەیبەخشی لەوڕێگەیەدا ........

وەبێ گومان دەنگۆی ئەو قەسابخانە ترسناكەی كەچەند هەزاران پیاوی تیاكوژرا بڵاو بوویەوە بەناو خەڵكی دا....... وەچەند هەزارێكی كەم لەو كارەساتە ڕزگاریان بوو ئەویش بەهۆی ئەوەوە كە دانیاننابەوە بەپەیمان شكاندنیان كافربوون ........

* * *

لەنموونەی ئەوكارەساتە .......زانایەكی بەتەمەن لەهۆزی (خەسمەم) گۆشەگیری كردبوو لەهەردووتیمەكە....... لەپشتی ڕووباری (فوڕاتەوە) جیێ نشینی بوو بوو .

ڕاپێچ كرا بۆلای (حەجاج) لەگەڵ ئەوانەدا كەڕاپێچ كرابوون بۆلای ........

جاكە گەیشتە لای پرسیاری لێ كرد دەربارەی هەڵوێست وكاروباری،

ئەویش ووتی:

لەو كاتەوە كە ئەو ئاگرە هەڵگیرساوە گۆشەگیریم هەڵبژاردووە لە پشتی ئەو ڕووبارەوە چاوەڕێ ی ئەوە بووم كە سەر ئەنجام ی جەنگ روونببێتەوە ........

جا كە ئێستا كە تۆ دەركەوتوویت و سەركەوتویت، منیش هاتومەتە خزمەت بۆ پەیمان دان .

(حەجاج) ووتی : دەك تیا بچیت ....... دانیشتویت چاوەڕێ دەكەیت ..... وە ناجەنگی لەگەڵ ئەمیرەكەتدا ؟!

پاشان زۆر شكاندی و ووتی : ئێستا گەواهی دەدەیت لەسەر خۆت كە كافریت؟.

ئەویش ووتی : خراپترین پیاوێكم ئەگەر من پاش ئەوەی هەشتا ساڵە خودام پەرستبێ و، پاشان لە پاش ئەوە گەواهی لەسەرخرم بدەم بە كوفر .

(حەجاج) پیێ ی ووت : كەوابوو دەتكوژم .

ئەویش ووتی : خۆ ئەگەر بشمكوژی ......... سوێند بەخودا بە ئەندازەی ئارام گری گوێدرێژێك لەسەر تینوییەتی لە تەمەنی من باوە .

پاشان سەر لە بەیانی تێر ئاو دەخواتەوە، وە لە ئێوارەدا كۆتایی بە تەمەنیێ دیێ.

منیش بەو شێوەیە چاوەڕێ ی مەرگم جا سەر لە بەیانی بێت یان ئێوارە، جا چیت بەلاوە باشە جێ بە جێ ی بکە .

ئەوجا (حەججاج) ووتی بە بکوژەکەی (جلاّدە) بدە لە گەردنی .....

جا بکوژەکە دای لە گەردنی، یەك كەس نەماله كۆڕەكەیدا نە لە خزم و یارویاوەران و نە لە نەیارانیش کە (زانای بە سالاّچوو) بە گەورە ڕانەگرن و شینی بۆ نەکەن و ..... بەزەییان پیایدا نەیەتەوە ......پاشان ناردی بە دوای (کە میلی کوڕی زیادی نەخەعی)[1] ئامادەی بەردەمی خۆی کردوپێ ی ووت :

ئایا گەواهی دەدەیت لەسەر خۆت بەوەی کە کوفرت کردووە و کافر بوویت ؟!.

ئەویش ووتی : سوێند بەخودا گەواهی نادەم

(حەججاج) ووتی : کەوابوو دەتکوژم

ئەویش ووتی : چی دەکەیت بی کە ...

وە من و تۆ لای خودای بالاّدەست ...... وە لەدوای کوشتن حساب هەیە .

پاشان (حەججاج) پێ ی ووت : ئەو ڕۆژەش بەڵگە لەسەر تۆ دەبێت نەك بۆ تۆ.

ئەویش ووتی پێ ی :

ئەوە دەبێت ئەگەر لەو ڕۆژەدا تۆ دادوەر بێت .

پاشان (حەججاج) ئەوەی کە لێی بیست ووتی : بیکوژن

ئەویش ئامادەکراو کوژرا ........

*                    *                    *

پاشان لە دوای ئەوە پیاوێکی دیکەیان ئامادەی بەردەمی کرد، کە زۆر رقی لێ ی بوو وە ئارەزوومەندی ئەوە بوو کە بۆی بڕەخسێ بیکوژێ، لەبەر ئەوەی بۆیان گێڕابووەوە کە گاڵتەی پێ کردووە ......جا ڕووبەڕووی بویەوەو ووتی :

بەڕاستی لەبەردەمم دا پیاوێك دەبینم کە گومان نابەم کە گەواهی لەسەر خۆی بدا بە کوفر .

---

١/ (کە میلی کوڕی زیادی نەخەعی)) شوێنکەوتووی متمانەدار – قسە ڕەوای گەلەکەی، جەنگی (سیفەین)ی دیووە لەگەڵ علی دا (ڕەزای خوای لێ بێت).

پیاوەکە ووتی: تووشی تیاچوونم مەکە، دەتەوێت هەڵم بخەڵەتێنی و فێڵم لیٚ بکەی، من لە خەڵکی سەر زەوی کافرترم، وە هەروەها لە فیرعەونیش کافرترم .

جا کە ئەوەی لیٚ بیست ڕێگەی پیٚ داو وازی لیٚ هێنا وە بۆی نەگونجا ئەگینا هەر تینو بوو بۆ کوشتن .

*   *   *

دەنگوباسی ئەو کارەسات و قەسابخانە ترسناکەی کە بە هەزارەها لە بڕوادارە جێگیر و ڕۆچووەکانی تیا کوژرا .

وە چەند هەزارەها کەسێکیش ڕزگارییان بوو لەوانەی کە ناچار کرابوون لەسەر ئەوەی کە خۆیان نیشان بدەن بە کوفر ..... واتە بە کافربوون هەموو لایەکی گرتەوە .

(سەعیدی کوڕی جوبەیر)یش دڵنیابوو لەوەی کە ئەگەر بکەوێتە بەردەستی (حەججاج)، لەم دووانە بەدەر نابێت :

جا یان دەدرێت لە گەردنی ......

وە یان ئەوەیە کە گەواهی لەسەر خۆی بدات بە کوفر ......

ئەو دوانەش شیرینیەکەشیان هەر تاڵە ....... بۆیە ئەوەی هەڵبژاردوە بەباشی زانی کە لە (عیراق) دەربچێتە دەرەوە و لەبەرچاودا نەمێنیٚ .

ئەوجا لەسەر ڕوونی زەوی فراوانی خودادا دەستی کردە خۆشاردنەوە لە (حەججاج) و سیخوڕەکانی، هەتا پەنای بردە گوندێکی بچکۆلە لەسەر زەوی یەکانی (مەککە) .

وە لەسەر ئەو حاڵە دەساڵ مایەوە، وە ئەوەی بەوە دەزانی کە بەسە بۆ ئەوەی ئەو ئاگرەی لە دڵی (حەججاج) کڵپەی سەندبوو بیکوژێنێتەوە، وە ئەو خەشم و کینەی کە لەناخی دا هەیی بوو دژی کۆتایی بێت .

*   *   *

بەڵکو ئەوەی کە ڕوویدا کەس چاوەڕێی ڕوودانی نەدەکرد......... ئەویش ئەوە بوو کە (والی) یەك لە والی یەکانی بەنی (ئومەییە) هات و بوویە والی بەسەر (مەککە) و دەوروبەریدا ..... کە (خالیدی کوڕی عەبدوڵڵای قەسری) بوو .

جا هاوڕێیانی (سەعیدی کوڕی جوبەیر) هەستیان بە ترس و بیم کرد لێی، لەبەر ئەوەی ئەوان شارەزای ڕەوشتی خراپی بوون، وە چاوەڕێی خراپەیان لیٚ دەکرد .

بۆیە هەندێکیان هاتنە خزمەتی (سەعید) و پێیان ووت :

ئەو پیاوە هاتۆتە (مەککە)، وە سوێند بەخوا ئێمە دڵنیانین لیٚ ی دەربارەی جەنابت

جا تکایە بەدەم داواکەمانەوە وەرە، وە لەم وولاتە بچۆرە دەرەوە .

ئەویش ووتی : سوێند بەخوا ئەوەندە هەڵهاتم، تا وام لێهات شەرم لە خودا دەکەم

جا بڕیارم داوەو سوورم لەسەر ئەوەی کە لەم شوێنەدا بمێنمەوە .

با خودا چی دەوێت چی با بیکات .

(خالید) ئەو گومانە خراپەی کە گومانیانیان لێی بوو بەدرۆی نەخستەوە، هەر کە زانی بە شوێنی (سەعیدی کوڕی جوبەیر)، سریەیەکی لەسەر بازەکانی ڕەوانە کرد بۆی، وە فەرمانی پێدان کە بە کەلەپچەکراوی راپێچی بکەن بۆلای (حەججاج) لەشاری (واسیت[1]).

سەربازەکان دایان بەسەر ماڵی (شێخ) دا .......

وەکەلەپچەیان کردە دەستەکانی لە پێش چاوی هەندێك لە هاوڕێکانی ....... وە داوایان لیٚ کرد کە ڕیٚ بە ڕیٚ بکات بۆلای (حەججاج) جا ڕووبەڕوویان بوویەوە بە دەروونێکی زۆر ئارام و دڵێکی پڕ لە دڵنیایی پاشان روویکرد بەلای هاوڕێکانی یەوەو ووتی :

نامبیننەوە جگە بە کوژراوی نەبێت لەسەر دەستی ئەو ستەمکارەدا .......

لە ڕاستیدا من و دوو هاوڕێم لە شەوێکی خوداپەرستیدا، هەستمان بە شیرینی نزاکرد، جا داوامان لە خودا کرد ئەوەی کە داوامان کرد، وە لێی پاڕینەوە بەوەندی کە ویستی ئەوی لەسەر بوو کە بپاڕێینەوە.

---

[1]/ (واسیط) شارێکە لە نێوان (بەسرە) و (کوفەدا) کە لەهەریەکەیانەوە پەنجا میل دوورە .وەرگێر

پاشان داوامان لە خودای بالآدەست کرد کە شەهیدی بکاتە چارەمان، جا پاش ماوەیەك خودا هەردوو هاوڕێکەمی بەو پلە بەرزە گەیاند، وە من مامەوە وا چاوەڕێ ی دەکەم ..........

پاشان لەوەدابوو کە خەریك بوو لە قسەکانی تەواو بێت، بینی کچێکی بچکۆلەی دەرکەوت و، باوکی بینی کەلەپچەکراوە و سەربازەکان ڕاپێچی دەکەن، خۆی پیا هەڵواسی، وە بۆی دەگریا و هەناسەی هەڵدەکێشا ......

جا زۆر بە نەرم و نیانی بەسۆزەوە لە خۆی دورخستەوەو پیێ ی ووت :

ئەی کچی خۆم : بڵێ بە دایکت : ویستی خودای بالآدەستی لەسەر بێ بەیەکگەشتنەوەی من و ئەو لەبەهەشتایە .........

ئینجا ڕێ ی بەڕێ کردوو ڕۆشت ...........

سەربازەکان زانای خوداناس و دونیا نەویست و خۆپارێزو خاوێن و سنوور پارێزیانی گەیاندە شاری (واسیط)، وە بردیانە بەردەم (حەججاج).

کاتێ کە لەلای ئامادەبوو، بە خەشم و کینەوە سەرنجی داو ووتی : ناوت چی یە؟

ئەویش فەرمووی : (سەعیدی کوڕی جوبەیر).

(حەججاج) ووتی : بەڵکو (شَقِيُّ بْنُ كُسَيْرٍ) واتە دڵڕەقی کوڕی تێکشکاو .

(سەعید) فەرمووی : بەڵکو دایکم لە تۆ شارەزاترە لەناوی من .

جا (حەججاج) ووتی : چی دەڵێیت لەبارەی (موحەمەدەوە) ؟.

ئەویش ووتی : مەبەستت (موحەممەدی کوڕی عبدوڵڵایە) (درودی خودای لەسەر بێت) ؟!.

ئەویش ووتی : بەڵێ .

جا (سەعید) فەرمووی : گەورەی نەوەکانی ئادەم و، پەیامبەری هەڵبژێراوی خودایە

چاکتری ئەوانەیە کە ماون لە مرۆڤ، وە چاکتری ئەوانەیە کە ڕۆشتوون (مردون).

پەیامی وەرگرت و، سپاردەی گەیاند .......

وە ئامۆژگاری کرد بۆ خواپەرستی و پەیڕەوی قورئانەکەی، وە ئامۆژگاری کۆی موسڵمانان و تایبەتمەندانیانی کرد .

ئەوجا ووتی : دەربارەی (ئەبی بەکر) چی دەڵێیت ؟

ووتی : ئەو (الصَّدِّيق)ە جێ نشینی پێغەمبەری خودایە (ﷺ)، ڕۆشت سوپاسکراو بوو ........وە ژیاو بەختەوەر بوو ........لەسەر بەرنامەی پێغەمبەر(ﷺ) ڕێی بە ڕێ کرد، لێ ی نەگۆڕی و، لێشی ئاڵوگۆڕ نەکرد .

دیسان ووتی : دەربارەی (عومەر) چی دەڵێیت ؟!.

ئەویش فەرمووی : ئەو جیاکەرەوەیە بوو کە خودای باڵادەست جیایی پێ خستە نێوان ڕەواو ناڕەوا ....وە ئەو هەڵبژێردراوی خوداو پێەمبەرەکەی بوو، و لەسەر هەمان ڕێچکەو ڕێبازی هاوڕێکەی (پێغەمبەر(ﷺ) ) ئەبوبەکر (ڕەزای خودای لەسەر بێت) ڕێ بە ڕێ کردو ڕۆشت .......جا ژیا و سوپاسکراو، وە بەشەهیدی دونیای بەجێهێشت .

ئەوجا ووتی : دەربارەی (عوسمان) چی دەڵێت ؟

ئەویش فەرمووی : ئەو دابینکەری پێویستی یەکانی سوپای جەنگی تبوك بوو کە ناودەبرێت بە (سوپای تەنگەژە) .....

وە کریاری (ڕوومە) و بەخشێنەری بوو لەڕێی خودادا بە موسڵمانان لە مەدینە...

وە کڕیاری ماڵێك بوو بۆخۆی لە بەهەشتا .زاوای (پێغەمبەر) بوو (ﷺ)، هاوسەری دوو کچی بوو ..وە ئەوکەسە بوو کە پێغەمبەر(ﷺ) بە فەرمانی ئاسمانی کچی خۆی داوەتێ، وە ئەو ئەوکەسە بوو کە بەناڕەوا کوژرا ...

ئەوجا ووتی : دەربارەی (عەلی) چی دەڵێیت ؟!

ئەویش فەرمووی : ئەو ئامۆزای (پێغەمبەری خودا) بوو درووودی خودای لەسەربێ، وە یەکەم کەس بوو کە لە توێژی لاوان دا موسڵمان بوو ........

وە ئەو هاوسەری (فاتیمە) ی بێ گەرد و داوێن پاك بوو ....

وە باوکی (حەسەن) و (حوسەین) بوو کە گەورەی لاوانی بەهەشتن .

ئەوجا ووتی : کام لە جێ نشینەکانی بەنی (ئومەیە) جێی رامانتە ؟

ئەویش فەرمووی : ئەوانەیان کە جێگەی ڕەزامەندی پەروەردگاریان بن .

(حەجاج) ووتی : جا کامەیان زیاتر جێگەی ڕەزامەندی پەروەردگارە ؟

ئەویش فەرمووی : زانینی ئەوە لەلای ئەو کەسەیەکە نهێنی و ئاشکراکانیان دەزانێ

ئەوجا ووتی : دەربارەی من چی دەڵێیت ؟

فەرمووی : خۆت زاناترین بەخۆت، واتە خۆت باشتر خۆت دەناسی .

ئەویش ووتی : بەڵکو من شارەزایی تۆم دەوێت .

ئەویش فەرمووی : ئەوەی من دەیزانم دڵتەنگت دەکات، دڵخۆشت ناکات .

ئەوجا ووتی : هەر ئەبێت لێت بیستم .

ئەویش فەرمووی : ئەوەی من دەیزانم تۆ پێچەوانەی قورئانەکەی خودای باڵادەستی بەکاروبارێك هەڵدەستێت کە مەبەستت پێی خۆسەپاندن و خۆنواندنە، ئەوەش بەرەو تیاچوونت دەبات..وە پاڵت دەنێت بەرەو دۆزەخ چۆن پاڵنانێك .

(حەجاج) ووتی: کەوابوو سوێندبەخوا دەتکوژم .

ئەویش فەرمووی : کەوابوو، تۆ دونیا لەمن تێك دەدەیت، وە منیش قیامەت لەتۆ تێك دەدەم .

ئەوجا ووتی: چ جۆرە کوشتنێکت دەوێت هەڵیبژێرە بۆ خۆت .

ئەویش فەرمووی : خۆت هەڵیبژێرە ئەی (حەجاج) ........

سوێند بەخودای باڵادەست بەهەر شێوەیەك من بکوژیت، بەهەمان شێوە خودای باڵادەست تۆ دەکوژێتەوە لە ڕۆژی دواییدا .

ئەوجا ووتی : ئایا دەتەوێت کە لێت خۆشببم ؟

ئەویش فەرمووی : ئەگەر لێ خۆشبوونێك لەلایەن خودای باڵادەستەوە بێت.....

بەڵام تۆ، نە لێ بووردن لەلایەن تۆوەیە و، نە عوزریش لەلایەن منەوە .

جا کە (حەجاج) گوێبیستی ئەوە بوو زۆر توڕەبوو و ئارامی لێبڕاو ووتی :

شیر و ڕاخەر ئەی (غولام)

جا ئا لەو کاتەدا (سەعید) زەردەخەنەیەکی کرد و(حەججاج) گوتی :

ئەو زەردەخەنەیەت چی یە ؟

ئەویش فەرمووی: سەرم سوڕما لە بەخۆدا ڕابینینی تۆدا بەسەر فەرمانی خودادا و دان بەخۆداگرتنی خودا بەرامبەر بە تۆ، واتە : خودایەك بەو هەموو دەسەلآتەی خۆیەوە کوشتنی نارەوای قەدەغەکردووە، تۆش بەو سانایی یە ئەنجامی دەدەیت .

جا (حەججاج) ووتی : ئەی (بەندە) بی کوژە

ئەویش ڕووی بەرەو ڕووگە (قیبلە) وەرگێڕاو ووتی :

إِنِّي وَجَّهْتُ وَجْهِيَ لِلَّذِي فَطَرَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ حَنِيفًا ۖ وَمَا أَنَا مِنَ الْمُشْرِكِينَ ﴿٧٩﴾ (سورة الأنعام : ٧٩)

واتە:ڕووم و بوونم و خواپەرستیم و دڵم و ژیریم هەموو ئاڕاستەو ڕووبەڕووی ئەو خودایە کردەوە کە ئاسمانەکان و زەوی بەدیهێناوە، وەمن لەسەر ڕاستە ڕێ ی ئایینی خودام، وەمن لەوانەنیم کەهاوبەش پەیداکارن .

ئەوجا(حەججاج) ووتی بەجەندرمەکانی: ڕووی لەڕووگە لابدەن .

ئەویش فەرمووی: فَأَيْنَمَا تُوَلُّوا فَثَمَّ وَجْهُ اللَّهِ ۚ (البقرة : ١١٥)

واتە: بەرەوکوێوە ڕووبکەن ئەوە ڕووگەی خودایە و پێ ی ڕازی یە .

جاووتی: بەسەر زەوی دابیخەن .

ئەویش فەرمووی: مِنْهَا خَلَقْنَاكُمْ وَفِيهَا نُعِيدُكُمْ وَمِنْهَا نُخْرِجُكُمْ تَارَةً أُخْرَىٰ ﴿٥٥﴾ (سورة طه :٥٥) .

واتە: لەو زەوی یە دروستمان کردوون، وەبۆ ئەوێتان دەگێڕینەوە، وەبۆجارێکی دی لەوێ دەرتان دەهێنینەوە (زیندوتان دەکەینەوە) .



ئەوجا(حەججاج) ووتی: سەرێبڕن دوژمنی خودا، هیچ پیاوێکم نەدیوە ئاوا بەتوانابێت لەخێرا هێنانەوەی ئایەتەکاندا بەپێ ی پێویست .

جا(سەعید) هەردوو لەپی دەستی بڵند کردوو فەرمووی:

خوایە: لەدوای من (حەججاج) بەسەر هیچ کەسێکی دیدا زاڵ مەکە .

*　　　*　　　*

زیاتر لەپانزە ڕۆژ تێ پەڕی بەسەر شەهیدکردنی (سەعیدی کوڕی جوبەیر) دا کە(حەججاج) تووشی گرانەتابوو، وەنەخۆشی یەکە تینی لێ سەندو زۆری بۆهێنا ........بەیناو بەین لەهۆش خۆی دەچوو، وەهاتەوە هۆش خۆی ........

جا ئەگەر تۆزێك ڕابکشایە و خەوی لێبکەوتایە، بەترس و لەرزەوە بەخەبەر دەهاتەوەو، هاواری دەکرد:

ئەوە (سەعیدی کوڕی جوبەیرە) دەسی ناوەتە گەردنم ...

ئەوە (سەعیدی کوڕی جوبەیرە) دەڵێت: لەسەر چی بۆچی کوشتمت ؟! .

پاشان دەگریاو دەیووت :

ئەی هاوار بەدەست (سەعیدی کوڕی جوبەیرەوە) من چیم هەیە لەگەڵیا ؟!!

(سەعیدی کوڕی جوبەیرم) لێ لادەن ...

جاکاتێك مردوو لەگۆڕ نرا، هەندێکیان لەخەودا بینی بوویان، جا پێ یان ووتبوو :

خودای خاوەن دەسەڵات دەربارەی ئەوانەی کە کوشتنتن چی لەگەڵ کردووی .

ئەویش ووتی: بەرامبەر هەریەکێکیان خودا یەکجار کوشتمی یەوە ...

وەلەبەرامبەر (سەعیدی کوڕی جوبەیر) دا حەفتا جار کوشتمی یەوە ...

*　　　*　　　*

خودایە لەگەڵ (سەعیدی کوڕی جوبەیر) دا حەشرمان بکە لە ڕۆژی ڕەستا خێزداوە لە دونیاش دا هەمان هەڵوێستی ئەو زاتە مان پێ ببەخشە . (وەرگێڕ)



بۆ زیاتر شارەزا بوون لە ژیاننامەی (سەعیدی کوڕی جوبەیر) سەیری ئەم سەرچاوانە بکە :

١- الطبقات الكبرى :٦/٢٥٦ .

٢- الزهد الأمام احمد بن خيل :٣٧٠ .

٣- طبقات العثاء للشرازى :٨٢ .

٤- البداية والنهاية : ٩/ ٩٦- ٩٨ .

٥- تأريخ البخارى : ٣/ ٤٦١ .

٦- وفيات الأعيان : ٢/ ٣٧١ .

٧- تأريخ الأسلام : ٢/٤ .

٨- تذاكرة الحفاظ : ٧١/١ .

٩- الصبر : ١/ ١١٢ .

١٠- أخبار القضاة :٢/ ٤١١ .

١١- العقد الثمين: ٤/ ٥٤٩/٤ .

١٢- النجوم الزاهرة : ٢٢٨/١ .

١٣- طبقات المفسرين : ١/ ١٨١ .

١٤- شذرات الذهب : ١٠٨

# ١٦ )موحەممەدی کوڕی واسیعی ئەزدیی

(شێخی دونیا نەویستان لە چاخی خۆیدا)

(بۆ ئەمیرەکان خۆشخوانان هەیە، هەروەها دەوڵەمەندانیش خۆشخوانانیان هەیە، وە (موحەممەدی کوڕی واسیعی ئەزدی لە خۆشخوانانی خودای میهرەبانە)

(مالیکی کوڕی دینار)

## بەشی یەکەم

ئێمە ئێستا لە کاتی جێ نشینی ئەمیری بڕواداران (سولەیمانی کوڕی عەبدولمەلیک) داین ....

وەئەوەش (یەزیدی کوڕی موهەللەبی کوڕی صوفرەیە)، یەکێکە لە شیرە بڕەرەکانی ئیسلام ... وەوالی بەهێزی (خوراسان) ئامادەیە ...

ئامادەباش و لەسەر پێ یە بەسوپاکەیەوە کە نزیکەی سەد هەزار سەربازە، جگە لە خۆبەخشان لە داواخوازانی شەهید بوون و، تامەزرۆیانی پاداشت ....

وەبڕیاری دابوو لەسەر گرتنی (فَتح) (جورجان) و (تەبەریستان) ....وەلەپێشەنگی خۆبەخشاندا كەلەگەڵی بوو شوێنكەوتووی پایەبەرز (موحەممەدی كوڕی واسیعی ئەزدیی بەصریی) یە ...

كە ناونرابوو بە (جوانی زانایان) یان (ڕازێنەرەوەی زانایان)

وەناسراو بە خوداپەرستی (بەصرە)

وەقوتابی هاوڕێی پایەبەرز (ئەنەسی كوڕی مالیكی ئەنصاری) خزمەتكاری (پێغەمبەر) (ﷺ) بوو.

*　　　　*　　　　*

(یەزیدی كوڕی موهەللەب) بەخۆی و سوپاكەیەوە گەیشتنە سەرزەمینی (دیهستان) ۆ كردیانە سەربازگە، وە ئەو ناوچەیە دانیشتوانی لە (تورك) بوون، كە زۆر جەنگاوەر بوون ...

دەستكردنەوەو هێزیان زۆر بەهێز بوو ...

شوێن و پارێزگاكانیان زۆر قایم بوو ...

هەموو ڕۆژێك ئامادەی كوشتارو جەنگی موسڵمانان دەبوون ....

جاكاتێك كەشەكەت ببونایە زۆریان بۆ بهاتایە، پەنایان دەبردە بەر چیا بەرزو بڵندەكانیان و، لەناو دۆڵو دڕەكانیدا خۆیان پەنا دەدا ....

وەدەستیان دەگەیاندە لوتكە بەرزەكان و خۆیان حەشار دەدا لە حەشارگە قایمەكانیدا ....

*　　　　*　　　　*

وە (موحەممەدی كوڕی والسیعی ئەزدیی) لەو جەنگەدا پلەو پایەو دەورێكی گەورەی هەبوو لەگەڵ لاوازی لەش و بەسالاچوونیدا ...

بەڕاستی جەنگاوەرو سەربازەكان دڵخۆش دەبوون بەو ڕووناكی یە ئیمانی یەی كە دەردەكەوت لە ڕووی كراوەو دەم بەزەردەخەنەی دا ...

وە گورج و گۆڵی ڕووی تێدەكردن بەهۆی ئەو یادكردنانەوەی (الذّكر) كە لەسەر زووبانە پاراوو سازگارەكەی بلاودەبوونەوەو تیشكیان دەبەخشی ...

وە دڵنیایی ڕووی تێدەکردن کە گوێ بیستی نزا پەسەندکراوەکانی دەبوون لەچرکە ساتەکانی ناڕەحەتی و تەنگەژەدا ....

وە ڕەچەو ڕێباز و پیلانی وابوو کاتێك فەرماندەی سوپا بڕیاری جەنگی بدایە، ئەو بانگی دەدا و هاواری دەکرد: ئەی سوارچاکەکانی خودا سەر زینی وولاّخەکانتان کەون و ئامادەی گۆڕەپانی جەنگ بن بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی نەیاران. دەی فەرموون خێراکەن .

هەر ئەوەندە کە سەربازو جەنگاوەری موسڵمانان گوێ بیستی ئەو بانگەوازە دەبوون؛ دەبینران ڕادەپەڕین بۆ کوشتار کردنی دوژمنانیان، وەك ڕاپەڕینی شێری ڕاپەڕی و ....

وە ڕوویان دەکردە گۆڕەپانی جەنگ، وەك ڕاپەڕین و هانا بردنی تینویەك بۆ سەر ئاوێکی ساردی سازگار لە ڕۆژێکی زۆر گەرم دا ...

وەلەیەکێك لەو جەنگە خوێناوی و بێ ئامانانەدا، لە ڕیزەکانی دوژمندا سوارێك دەرکەوت، کە چاوی لەوە تێ سمڕا وو قەبەتری نەبینی بوو ...

هەروەها بەهێزی و، چاو نەترس و، عەزم و بڕیاردانددا ....

وە لەنێوان ڕیزبەندەکاندا دەهات و دەچوو، هەتا بەشێوەیەك کە موسڵمانان خۆیان لەشوێنەکانیان لادەدا لەترسدا ...

وەترس و بیمی خستبووە دڵیانەوە ....

پاشان بانگی دەکردن تا بێنە بەرامبەری و بەلوتبەرزی یەوە ڕووبەڕوویان وەستا بوو .... وەسوور بوو لەسەر بانگهێشتەکەی .

کەس نەبوو جگە لە (موحەممەدی کوڕی واسیع) کە ویستی و بڕیاری دا کە بۆی بچێتە گۆڕەپان .

ئالەو کاتەدا ڕازی نەبوون سەری هەڵدا لەناخی سەربازەکان و سوارچاکەکانی موسڵمانان دا ...

وەیەکێکیان لە (شێخ) چووە پێشەوەو، شوێنی دا کە ئەو کارە نەکات، وەداوای لێ کرد کە ئەو کارە واز لێ بهێنێت بۆ ئەو ....

ئەوجا (شێخ) بەناچاری سوێندانەکەی جێ بەجێ کرد، وەنزای سەرکەوتن و یارمەتی خودای بالاَدەستی بۆ کرد ....

* * *

هەریەکە لەدوو سوارەکە کەڕووبەڕووی نەیارەکەی دەبوویەوە، ڕوو بەڕوو بوونەوەی جەنگ ... هێرشیان دەبردو پەلاماری یەکتریان دەدا وەك پەلاماری دوو شێری بەهێز ..... سەربازەکان چاویان تێ بریبوون، دڵیان وابەست بوو پێیانەوە لەهەموو شوێن و لایەکەوە ....

وەبەردەوام بوون یەك کاتژمێر دەهاتن و دەچوون و پەلاماریان دەدا، هەتا شەکەتی بەتەواوی دایگرتن .

پاشان لەیەك چرکە سات دا بەجیا لەیەکتر شێریان ئاڕاستەی سەری یەکتر کرد.

جا شیری(سواری تورکی) جێ گیربوو لە خودەئاسنینەکەی سوارە موسڵمانەکەدا ..... وەشیری موسڵمانەکە کێشای بەناوچاوانی سواری (تورکی) دا، وە کەللەسەری کرد بەدوو بەشەوەو......... تەوێڵی کردە دوو پارچە .... ئەوجا سوار چاکی سەرکەوت و گەڕایەوە بۆڕیزی موسڵمانان، بەشێوەو

نواندنێك کەهەرگیز چاوێنەی ئەوەی نەدیبوو .

شیرێك لە دەستی دایە کە خوێنی لێ دەتکێ .......وە شیرێکی دیشی کە جێگیرە لە خودەکەیدا و دەدرەوشێتەوە لە ژێر تیشکی خۆردا .......ئەوجا موسڵمانان پێشوازیان لێ کرد بە (لا إله إلا اللهُ) و (اللهُ اکبر) و (الحمدُ لله) .

وە (یەزیدی کوڕی موهەللەب) سەرنجی دەدا و دەیڕوانی بۆ درەوشانەوەی دوو شیرەکە و، خودەکە و، چەکەکەی لەسەری پیاوەکەی دابوو ........ جا فەرمووی:

تەنها لەلایەن خوداوەیە کە ئەو سوارە موسڵمانە ئەو سوارە (تورکەی) پێکاوە واتە (ئەو لەگەڵ ئەودا بەرامبەر نی یە) !! ......

ئەوجا بەرامانەوە ووتی : ئەوە چ پیاوێکە ؟!

جا پێیان ووت : ئەوە پیاوێکە کە خودا پیرۆزی پێ بەخشی بە هۆی نزاکانی (موحەممەدی کوڕی واسیعی ئەزدی یەوە) .



تای تەرازووی هێز لە دوای کوشتنی سوارە (تورکی یەکە) وەگەڕایەوە ....

جا ترس و بیم ناخی هاوبەشی پەیداکارانی داگرت، هەروەك چۆن ئاگر بەردەبێتە پووشی ووشك .......

وە متمانە بەخۆ و عیززەت لە دڵ و دەروونی موسڵمانان دا کڵپەی سەند

جا رووبەڕووی دوژمنانی خودا بوونەوە و هێرشیان کردە سەریان، وەك هاتنی لافاو ......وە دەوریان گرتن هەروەك زنجیرەکە لە گەردن بکرێت ......... وە ئاوو خۆراکیان لێ برین .جا پاشاکەیان هیچی بۆ نەمایەوە جگە لە ئاشتەوایی ........

بۆیە ناردی بۆ لای (یەزید) داوای ئاشتەوایی لێ کرد، وە ئامادەیی خۆی راگەیاند بۆ ئەوەی کە لەژێردەستیدایە لە شارو شارۆچکەو گوندەکان، بە هەموو ئەوەی کە تێیدایەو، ئەوانەی کەئەوان تیایدایە، بیدات بە دەستەوە، بەمەرجێك دڵنیایی ببەخشێتە خۆی و، ماڵ و سامانی و، خاو خێزان وکەس وکاری.

(یەزیدیش)ئەو ئاشتەوای یەی پەسەندکردو، مەرجی بۆ دانا کە حەوت سەد هەزار (درهەم) بەشێوەی بەشە مانگانە (أقساط شهرية) بۆ ماوەیەکی دیاریکراو بێت .......

وە دەبێت چوارسەد هەزاری نەخت بدرێت ........

وە هەروەها چوارسەد وولاخی بارکراو بە (زەعفەران)[1] ........

لەگەڵ ڕەوانەکردنی چوارسەد پیاوەکە هەریەکەیان کاسێ:ی زیوی بەدەستەوە بێت و پارچە بەرگێکی بەمێزەرەوە بەسەرەوە بێت کە لە (حەریر) بێت ...

و لەگەڵ ئەو پارچە بەرگەدا جووبەیەکی لە (مەخحەڵ) دروستکراو و، بەرگێکە ئافرەتان لە (حریر) دروست کراو بۆ هاوسەری سەربازەکان ........

جا کاتێك کە جەنگ کپ بوویەوە، (یەزیدی کوڕی موهەللەب) ووتی بە (گەنجینەدار)، دەی دەستکەوتەکانمان بۆ ژمارە بکە تا هەرکەسە بە پێ ی مافی خۆی ، مافەکەی بدەینە دەست .......

---

١/ (زەعفەران) ڕووەکێکە بەکاردەهێنرێت بۆ بۆنخۆش کردنی و ڕەنگ جوان کردنی خواردن .

ئەوجا (گەنجینەدار) و هاوکارەکانی هەوڵیان دا کە ژمارەی بکەن، بەڵام لەبەر زۆر و زەبەندەیی نەیانتوانی .......بۆ دەستکەوتەکان بە دەستکراوەی بەسەر سەربازەکان دا دابەش کرا .........

وە موسڵمانەکان لەناو ئەو دەستکەوتانەدا (تاجێکیان) دی یەوە کە لە (ئاڵتون)ی پوختە دروست کرابوو، وە رووکەش کرابوو بە (دوڕو) و (جەوهەر) و ....... ڕازابووەوە بە جوانترین و وێنە و هەڵکەنراو لیّ ی ........ لە هەموو لایەکەوە ملی بۆ درێژکرابوو، سەیریان دەکرد، وە چاوەکان بەردەوام بوون لەسەر سەیرکردنی درەوشانەوەکەی .

(یەزید) گرتی بە دەستیەوە، وە بەرزی کردەوە، ئەوەندەی کە ئەو سەربازانەی کە نەیانتوانی بوو بیبینن .ئینجا ووتی :

ئایا کەسێك دەبینن کە بیّ باك بێت لەم (تاجە) و نەیەوێت ؟

ئەوانیش ووتیان : ئەی خودا چاکت بۆ بکات جەنابی (ئەمیر) .

کیّ هەیە لەوە بیّ باك بێت و نەیەوێت ؟!

ئەویش ووتی :

دەبینن کە بەردەوام تا ئێستا لەناو (ئومەتی موحەممەددا) (ﷺ)، کەسانێك ی دونیا نەویست هەیە کە لەو تاجەو پڕ بەزەوی لەوێنەی ئەوە، بیّ باکە و نایەوێت و خۆی لیّ دووردەگرێت و وازی لیّ دەهێنیّ

ئینجا لای کرد بەلای دەرگاوانەکەیەوە و ووتی :

بگەڕیّ بە شوێن (موحەممەدی کوڕی واسیعی ئەزدیی) دا بۆمان .

جا دەرگاوان بە پەلەپرۆشت بۆ گەڕان بە دوایدا لە هەموو لایەکدا .....

بینیانەوە کە گۆشەگیری کردبوو لە خەڵکی لە شوێنێکی دووردا، وە خەریکی نوێژی سوونەت بوو، وە نزای دەکردو، دەپاڕایەوە و داوای لێخۆشبوونی لەخودا دەکرد .....

جا دەرگاوان چووە خزمەتی و ووتی :

لە ڕاستیدا (ئەمیر) داوای کردوویت کە بەخزمەتی بگەیت، وە داوات لیّ دەکات هەر ئێستا بچینە خزمەتی .......

جا لەگەڵ دەرگاوانەکە ڕێ بەڕێ کرد، تا گەشتە خزمەتی (ئەمیر) سلاوی کرد و لە نزیکی یەوە دانیشت، ئەمیریش بەباشتر سڵاوەکەی سەندەوە ......

ئینجا (تاجەکەی) گرت بە دەستی یەوە و بەرزی کردەوەو ووتی :

ئەی (ئەبا عەبدوڵڵا) بێ گومان سەربازانی موسڵمانان لە جەنگ دا ئەو (تاجە) بە نرخەیان بە دەستهێنا ..... وە منیش وای بەباش دەزانم کە بە بەخشینی ئەوە جەنابت ڕێزت لێ بگرم ، وە ببێتە دەستە بەشی تۆ، دڵی سەربازەکان بەوە زۆر شاد دەبێت ........

ئەویش ووتی: ئەی (ئەمیر) ئەیکەیتە دەستە بەشی من ؟!.

ئەمیریش فەرموی : بەڵێ لە دەستەبەشی تۆیە .

ئەویش ووتی : ئەی (ئەمیر) من پێویستیم پێ ی نی یە .

وە خودا لە جیاتی من پاداشتی جەنابت وە سەربازەکانیش بداتەوە .

ئەمیر ووتی : سوێندت دەدەم بە خودا بە وەرگرتنی .

ئەوجا کە سوێند درا لەلایەن (ئەمیر)ەوە، (موحەممەدی کوڕی واسیع).

(تاجە)کەی وەرگرت، ئینجا رووخسەتی ئەمیری وەرگرت و ڕۆشت جا هەندێك لەوانەی کە (شێخیان) نەدەناسی ووتی :

ئا ئەوە تایبەتمەند بوو بە (تاجەکە) و، وەریگرت و، لێ ی دا ڕۆشت :

جا (ئەمیر) فەرمانی دا بە یەکێك لەبەندەکانی، کە بە نهێنی شوێنی بکەوێ .

وە سەرنجی بدات چی دەکات بە (تاجەکە) .

وە سەرئەنجامەکەیم بۆ وەرگێڕێ ....

بەندەکەش شوێنی کەوت، وە ئەویش ئاگای لێ ی نەبوو .

(موحەممەدی کوڕی واسیع) ڕێی بە ڕێ کرد، وە تاجەکە لەدەستی دابوو ...

پیاوێکی قژ هەڵچووی دەم و چاو تۆزاوی ، سەرو شکڵ شێواوی لێ پەیدا بوو، داوای لێ کرد کە لەو ماڵ و سامانەی خودا پێ ی بەخشیووە بەشی بدات..

جا (شێخ) سەرنجی لای ڕاست و، چەپ و، دواوەی کرد ......

کاتێك دڵنیابوو کە کەس چاوی لێی نی یە، تاجەککەی دا بە سواڵکەرەکە ....

ئینجا بە دڵخۆشی یەوە بەپەلە بۆی دەرچوو .......

وەك ئەوەی کۆڵە پشتێکی لە کۆڵ بووبێتەوە کە خەریك بوو پشتی دەشکاند ..

ئەوجا بەندەکە دەستی سواڵکەرەکەی گرت و، هێنای بۆلای (ئەمیر)و ڕووداوەکەی بۆ گێڕایەوە .....

جا (ئەمیر) تاجەکەی لە سواڵکەرەکە وەرگرت، وە بە پارەیەکی زۆر قەرەبووی بۆ کردەوە ئەوەندەی کە پێ ی ڕازی بوو .

پاشان لای کردەوە بەلای سەربازەکان دا ووتی :

پێم نەووتن : تا ئێستا لەم (ئوممەتەی) (موحەممەد) دەدا (ﷺ) کە لەو (تاجە) و نموونە و نموونەی ئەو تاجە بێ باکەو نایەوێت ....

* * *

(موحەممەدی کوڕی واسیع ئەزدی) مایەوە جیهادی هاوبەش پەیداکارانی دەکرد لە ژێر سایەی ئاڵای (یەزیدی کوڕی موهەللەب) هەتا کاتی (حەج) نزیکبوویەوە .

جا کاتێك جگە لە کاتێکی کەم، کات نەما لەبەردەمیا، چووە لای (یەزید) وە ڕووخسەتی لێ وەرگرت، بۆ ڕۆشتن بۆ مەککە بۆ حەجی سووننەت .

جا (یەزید) پێ ی ووت :

ئەی (ئەبا عەبدوڵلا) ڕووخسەتت بەدەستی خۆتە، کەی ویستت بڕۆ ......

وە وا فەرمانم داوە بەوەی ئەندازەیەك پارەت بدرێتی کە هاریکارت بکات لەسەر جێ بە جێ کردنی حەججەکەت .

جا ووتی بە (ئەمیر) :

ئایا فەرمانت داوە بەوەی کە ئەو ئەندازە بۆ منت بڕیارداوە، بدرێ بەهەر یەکە لە سەربازەکانت ؟!

ئەویش فەرمووی : نەخێر ......

ئەوجا (موحەممەد) ووتی : من پێویستم بەشتێك نی یە کە تایبەتمەندبێت بە منەوە، جگە لە سەربازەکانی موسڵمانان .

ئینجا خوا حافیزی لێ کر و ڕۆشت .

* * *

سەفەری (موحەممەدی کوڕی واسیعی ئەزدی) قورس کەوت لەسەر دڵی (یەزیدی کوڕی موهەللەب)، هەروەك قورس کەوت لەسەر دڵی سەربازەکان کە بەختەوەر سوودمەند بوون بە هاوڕێیەتی ئەو .

وە دڵمەند بوو بە لێ بێ بەشبوونی سوپا سەرکەوتووەکەیان لە خێرو بەرەکەتەکانی، وە ئاواتە خوازبوون کە خێر بگەڕێتەوە بۆلایان پاش جێ بە جێ کردنی خوداپەرستی یەکەی .

ئەوەی کە جێی تێڕامان نی یە ئەوەیە کە فەرماندەکانی موسڵمانان، کە بڵاوەیان کردبوو بە هەمولایەکی ئاوەدانیدا، سووربوون لەسەر ئەوەی کە خوداپەرستی (بەصرە) (موحەممەدی کوڕی واسیعی ئەزدی) لەناو سوپاکەیدا بێت ...

وە دڵخۆش بوون بە بوونی لەگەڵیاندا و، بوونیشی مژدە بەخشی خێرو بەرەکەتێکی زۆر بوو ........

وە تکایان لە خودای باڵا دەست ئەوەبوو کە بەهۆی نزاچاکەکانی ئەوەوە سەرکەوتنی لەبەرچاویان پێ ببەخشێ .....

*                    *                    *

وە لەدواییدا، جا سەیرکە ئەو زاتانەی کە لەبەرچاوی خۆیاندا بچووکن، چەند بەڕێزو گەورەن لەلای خوداو خەڵکی ........

وە ئەو مێژووە چەند بە بەهایە کە پیاوانی وەها بێ وێنەی لە خۆی گرتووە .

ئیتر تا بە یەکگەیشتنەوەیەکی دی لە بەشی دووەمدا لەگەڵ خوداپەرستی (بەصرە) (موحەممەدی کوڕی واسیعی ئەزدی) بەخوداتان دەسپێرم.

# موحەممەدی کوڕی واسیعی ئەزدی

## بەشی دووەم

**خودا پەرستی (بەصرە) بەڕاستی پەنجەی(موحەممەدی کوڕی واسیعی ئەزدی) لەلام خۆشەویسترە لەهەزار شیری بڕەر کەبەدەستی هەزار لاوی پێگەیشتوە وەبێت .**
**(قوتەیبەی کوڕی موسلم)**

ئێمە ئێستا واین لەساڵی هەشتاو حەوتی کۆچیدا ...

وەئەوەش فەرماندەی بەتواناو سەرکەوتوو (قوتەیبەی کوڕی موسلیمی باهیلی یە) کە جێگە شانازی موسڵمانانە، ڕێ بەڕێ دەکات بە سوپا شێر ئاساکەیەوە لەشاری (مەروە)[1] وە بەرەو ناوچەی (بوخارا)[2]

وەبڕیاری دابوو لەسەر ئەوەی کە ئەو شارو ناوچانە دەستبەسەرا بگرێت کە دەکەونە پشت ڕووباری (جەیحون) لەخوراسان ...

وەهەروەها دەستبگرێت بەسەر دەورو بەری (سین) دا ...

وە باج دابنێ لەسەر (زمی یەکان) (یەهودو گاورەکان) .

بەڵام (قوتەیبەی کوڕی موسلیم) کاتێ کە لەوە بوو خەریك بوو لەڕووباری (سەیمون)[3] بپەڕێتەوە، خەڵکی (بوخارا) پێیان زانی و خۆیان ئامادەکردوو، تەپڵی جەنگیان لە هەموو شوێنێك لێدا ...

---

١- (مَرْوَ) یەکێکە لەشارەکانی (فارس) ، (موهەلەبی کوڕی ئەبی سوفرە) لەوێ کۆچی دوایی کرد .

٢- (بخاری) شارێکەلە (ئۆزبکستان) لەسەر چوارێ ی (فارس و هیند و سین) .

٣- (سَیحُون) ڕووبارێکی بەناوبانگ و گەورە بوو کەدەکەوتە پشت (سەمەرقەند) .



وەدەستیان کرد بە هاوار بۆ بەهانا هاتنی ئەو نەتەوانەی کە لەدەورو بەریاندا بوون، بەتایبەتی ئەوانەی کەلەژێر دەسەڵاتی (فارس) دا بوو لە (سوغەدەکان)[1] ... وە (تورکەکان) و ... (سین) وەهی ترو ... هی تر ... جگە لەوانە .

جاکاتێك زانرا کۆمەڵێکی زۆر لەجەنگاوەران لە هەموو ڕەنگ و ڕەگەزو زمان و ئاینەکان ... ڕژانە سەریان کە ژمارەیان چەندان ئەوەندەی سوپای موسڵمانان بوون لە ڕووی ژمارەو کەرەستەی جەنگەوە .

پاشان دەستیان دایە ڕووبەڕوو بوونەوەو دەرگای هەموو ڕێگاکانیان بە ڕووی موسڵمانان دا داخست ...

وەهەموو دۆڵ و دەرەی چیاکانیان لێ گرتن ....

هەتا وای لێ هات کە (قوتەیبەی کوڕی موسلیم) نەیتوانی کە سریەیەکی بچوکیش ڕەوانە بکاتە ناویان تا سەرنجی کاروباریان بدەن و، دەنگوباسیان بگەیەننەوە بە (قوتەیبە) ...

هەروەك یەك کەس لە سیخوڕەکانی نەیتوانی دزە بکاتە ناویان و دەنگوباسیان بگەیەنەتە فەرماندەی موسڵمانان .

*　　　　*　　　　*

(قوتبەی کوڕی موسلیم) بەخۆی و سوپاکەیەوە لەسەربازگەیەکدا جێگیر بوون و هەڵیان دا لەنزیك شاری (بیکەند)[2] ، وە بەبێ ئەوە نەبۆ پێشەوە نەبۆ دواوە جووڵە بکات ....

جا دووژمنیشَ هەموو ڕۆژێك لەگەڵ هاتنی بەرەبەیاندا دەهاتنە سەریان و بەدرێژایی ڕۆژ، ڕۆژیان لێ دەکردنە شەوە زەنگ لەژێر تەپوتۆزدا ...ئەوساکە شەودا دەهات دەگەڕانەوە بۆ پێگە دامەزراوو قایمەکانیان. بەو شێوەیە کار بەردەوام بوو بۆ ماوەی دوو مانگ بەبێ دابڕان .

---

٤- کۆمەڵە خەڵکانێ بوون کەلەژێر پارێزگاری فارس دا بوون .

١- (بیکَند) یەکێك بوو لەشارەکانی پشت ڕووباری (جەیحون) لەخۆراسان .

وە (قوتەیبەش) کەوتبووە ڕامان و دڵە ڕاوکێوە دەربارەی وەزعەکەی .نەی دەزانی چی بکات، ئایا پەشیمان بێتەوە لەو بڕیارەی داویەتی و دوای بخات بۆ کاتێکی دی و بگەڕێتەوە، یاخود بەرەو پێش بچێت ؟.

پاشان زۆری نەخایاند موسڵمانان لە هەموو شوێنێکەوە گوێبیستی دەنگوباسی (قوتەیبە) و سوپاکەی بوون ... جا خەڵکی زۆر شلویْ و بوون و داچڵەکین و غەم دایگرتن بۆ ئەو سوپا گەورەی کە هەرگیز تێکنەشکاوە ...

وەبۆ ئەو فەرماندە پایە بەرزەی کە هەرگیز نەبەزیووە .

بۆیە داواکرا لە هەموو والی یەکان لەناوچەکاندا کە ڕابگەیەنن بە مسوڵمانان کە نزابکەن و لەدوای هەموو نوێژێك بپاڕێنەوە بۆ ئەو سوپایەی کەلە وولآتانی پشتی ڕووباری (جەیحونەوەن) .

ئیتر ئەوە بوو دەنگی نزاو پاڕانەوە لە مزگەوتەکانەوە بەرز بوویەوە و سەرزەوی پڕ کرد .

وە لە دەنگۆکانەوە (مآذِن) خەڵکی بەدەنگی بڵند و چاو پڕ لە گریان و کەساسی یەوە دەپاڕانەوە .

وە پێشەوایانی مزگەوت لە کۆتایی هەموو نوێژێك دا دوعای قونتیان دەخوێند.

لەگەڵ ئەو دوعا و پاڕانەوەدا خەڵکێکی زۆر ڕاپەڕین بۆ هاریکاری سوپاکە .

وەلە پێشەوەیاندا شوێنکەو تووی پایەبەرز (موحەممەدی کوڕی واسیعی ئەزدی) بوو .

* * *

(قوتبەی کوڕی موسلیمی باهیلی) سیخوڕێکی هەبوو کە عەرەب نەبوو، گەواهی بۆ درابوو بەوەی کە کەسێکی زۆر وریاو زیرەك و کار بەجیْ بوو لەکاری سیخوڕیدا، پیْ ی دەوترا (تەیزەر) ...

جا دووژمنان ڕایانکێشا بوو بەلای خۆیان، بەپیْ بەخشینی پارەو سامانێکی زۆر

وە داوایان لیْ کردبوو کەبەهۆی فێڵ و زیرەکی خۆیەوە کاربکات بۆ لاواز کردنی هێزی موسڵمانان و نەهێشتنی وورەیان و ناچارکردنیان بەبەجیْ هێشتنی ناوچەکە بەبیْ جەنگ ....

(تەیزەر) چووە خزمەتی (قوتبەی کوڕی موسلیمی باهیلی) کەلەوکاتەدا کۆڕەکەی زۆرێك لەفەرماندەو کاربەدەستانی سەربازی لیٚ بوو، جا (تەیزەر) چووە تەنیشتی (قوتەیبەوەو) دانیشت و لایکرد بەلایەوەو چرپاندی بەگویٚ ی داو ووتی:

ئەی (ئەمیر) ئەگەر دەتەوێت شتێکت عەرز بکەم کۆڕەکەت چۆڵ بکە .

ئەوجا (قوتەیبە) ئاماژەی کرد بۆ ئەوانەی کە لە کۆڕەکەیدا بوون بە چۆڵکردن، جا هەموو دانیشتوان هەستان و ڕۆشتن جگە لە (زیراری کوڕی حوسەین) نەبێت کە (قوتەیبە) هیٚ شتی یەوە .

ئا لەو کاتەدا (تەیزەر) لایکرد بەلای (قوتەیبەوەو) ووتی :

ئەی جەنابی (ئەمیر) دەنگوباسی تایبەتم لایە ......

(قوتەیبە) بە ڕامانەوە – ووتی : دەی بیڵیٚ .

ئەویش ووتی: لە ڕاستیدا (ئەمیری بڕواداران)) – لە (دیمەشق)– (حەجاجی کوڕی یوسفی سەقەفی) – لەسەر کار لابردووە ....

وە هەروەها ئەو فەرماندانەی سوپاکە شوێنی ئەو کەوتوون، و تۆش یەکێکی لەوانە

وە فەرماندەی تازەی داناوە بۆ سەرپەرشتی سوپا، وە ڕێنمایی کردوون بۆ دەستبەکاربوونیان ........

وە بیٚ گومان جیٚ نشینەکەت لە نێوان ئێوارە وە بەیانی دا ئامادە دەبێت .

جا ڕای من ئەوەیە کە جەنابت سوپاکەت لەم ناوچانە بکشێنیتەوە ......

وە بگەڕێیتەوە بۆ (مەروە) بۆ چارەسەرکردنی کاروبارەکەت دوور لە گۆڕەپانەکانی جەنگ ...

لەوە دابوو کە (تەیزەر) لە قسەکەی تەواو بێت (قوتەبیەی کوڕی موسلیم) بەندەکەی (سیاهی) بانگ کرد، کە ئامادەبوو لە خزمەتیا پیٚ ی ووت :

ئەی (سیاه) بدە لە گەردنی ئەم ناپاکە ........

جا (سیاه)دای بە گەردنی داو، گەڕایەوە بۆ ئەو شوێنەی لێوە هاتبوو .......

ئا لەوێدا (قوتەیبە) لایکرد بەلای (زیرای کوڕی حوسەینەوەو) ووتی :–

لەسەر ڕووی ئەم زەوی یە هیچ کەسێك ئەو دەنگوباسەی نەبیستووە جگە لە من و تۆ: جا دڵنیابە من سوێند دەخۆم بە خودای باڵادەست، ئەو دەنگوباسە لای

هەرکەسێك ئاشکرابێت پێش تەواو بوونی ئەم جەنگەمان ئەتنێرم بۆلای ئەو ناپاکە

جا ئەگەر شتێك لەناختا هەیە، دان بەخۆتا بگرە و زمانت بگرەولای کەس مەیلێ، چونکە باش بزانە بڵاوبوونەوەی ئەو دەنگوباسە وورەی سەربازەکان دەڕوخێنێت

وە تێکشکاندنێکی ناخۆش و نەویستمان تووش دەکات .

پاشان بانگهێشتی خەڵکی کردوو هاتنە خزمەتی .

جا کاتێك (تەیزەریان) بینی کوژراوەو لەسەر زەوی کەوتووە، لەناو خوێنی خۆیدا خنکاوە .......

راوەستان بە ڕامان و بێ دەنگی و ترسەوە ...........

(قوتەیبە) پێی ووتن : وای لێ کردوون کە بێ تاقەت بن لە کوشتنی پیاوێکی ناپاك دا ؟

ئەوانیش ووتیان : بەڕاستی ئێمە وا گومانمان پێ یەتی کە ئامۆژگاریکاری موسڵمانان بووە .

جا (قوتەیبە) ووتی : بەڵکو ئەو ناپاك بوو بەرامبەریان، وا خودا گیرۆدەی تاوانی خۆی کرد .

ئینجا دەنگی بڵند کردو ووتی :

فەرموون ئێستا بڕۆن بۆ جەنگی دووژمنەکەتان .......... وە دڵانێك ڕووبەڕوی بینەوە جیا لەو دڵەی کە ئێوە پێ ی ڕووبەڕوو دەبوونەوە لەگەڵیدا لەمەو پێش...

سەربازەکان ڕێیان بەڕێ کردو، وابەست بوون بە جێ بە جێکردنی فەرمانی فەرماندەکەیان (قوتەیبەی کوڕی موسلیم)، وە سنووری نێوان خۆیان دوژمنیان تێ پەڕاند، بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی دوژمن ........

وە کاتێك هەردوو سوپاکە بە دوو ڕیز بەرامبەر یەك ڕیزبوون، موسڵمانەکان کە ژمارەی زۆر و زەوەندی دوژمن و، چەك وجبەخانەیانیان بینی، ترسێکی زۆریان لێ نیشت ...... وە بیم دایگرتن ........



وە (قوتەیبەی کوڕی موسلیم) هەستی کرد بەوەی کەچ دڵەتەپێیەك دڵ و دەروونی سەربازەکانی داگرتووە، جا بۆیە هەر دەهات و دەچوو لەنێوان سریەکان داتا وورەیان بەرز بکاتەوەو، راوەستاوی بکات بە بەریاندا ......

پاشان بەلای ئەوانەوە کە لە دەوروبەریدا بوون و ووتی :

(موحەممەدی کوڕی واسیعی ئەزدی) لە کوێ یە ؟!

ئەوانیش ووتیان : ئەوەتا ئالەوێدا لەلای ڕاستەوە ئەی جەنابی (ئەمیر) ئەوجا ووتی: چی دەکات ؟

ووتیان : خۆی داوە بەسەر رمحەکەیداو، چاوی بڕیوەتە ئاسمان و، پەنجەکانی بەرەو ئاسمان دەجووڵێنێت ...ئایا بۆت بانگ کەین ئەی جەنابی (ئەمیر)؟

جا فەرمووی : نەخێر وازی لێبهێنن .......

ئینجا بەردەوام دەیووت : سوێند بەخودا ئەو پەنجانە لای من خۆشەویستترن لە هەزار شیری بڕەر، کە بەدەستی هەزار لاوی پێگەیشتوەوە بێت ..........

وازی لێبهێنن با دوعای خۆی بکات ......

وە ئەوەی کە ئێمە لیّ ی شارەزابووین ئەوەبوو کە نزاکانی هەمیشە لەلای خودا گیرابوو .

*　　　　*　　　　*

سوپای موسڵمانان و دوژمنەکانیان هێرشیان هێنا بۆ سەر یەکتر، هەروەك شێر گەلێکی ڕاپەڕی و ......

ئەوجا هەردوو کۆمەڵە تێکڕژان، هەروەك شەپۆلەکانی دەریا لە ڕۆژێکی گژە بادا (یوم عاصیف) .

وە خودای باڵادەست لەو تێکڕژانەدا دامەزراوی دابەزاندە سەر دڵ و دەروونی موسڵمانان ....... وە لەلای خۆیەوە گیانی بەرگری و ڕووبەڕووبوونەوەی دوژمنی پیّ بەخشین ..... وە بەردەوام بە درێژایی ئەو ڕۆژەیان شیرەکانیان لە لێدانی دوژمنان بەردەوام بوو، تا شەو داهات و خودای باڵادەست هاوبەش پەیداکارانی تووشی قاچە لەرزەکرد و، ترس و بیمی خستە دڵیانەوە ........

بۆیە ڕوویان لە موسڵمانان وەرگێڕاو هەڵهاتن ........

جا موجاهیدەکان سوار سەریان بوون، بە کوشتن و، بەندکردن و ئەفکەندەکردن (پەرش و بڵاو کردن) دوژمنان تا لەو کاتەدا داوایان لە (قوتەیبە) کرد بۆ سوڵح و خۆکڕینەوە ......

ئەویش .........سوڵحی لەگەڵ کردن .

*    *    *

لەناو بەندەکانی دوژمن دا، پیاوێکی دەروون پیسی، زۆر شەڕەنگیزی تیا بوو، کە زۆر کاریگەری هەبوو لەناو گەلەکەیدا بۆ هاندانیان دژی موسڵمانان ... جا ئەوە ووتی بە (قوتەیبەی کوڕی موسلیم) : من ئامادەم خۆم بکڕمەوە ئەی ئەمیر...

ئەویش پیێ ی ووت : چەند دەبەخشیت ؟!

کابرا ووتی : پێنج سەد هەزار (حەریرە) (سینییە) کە نرخەکەی هەزار هەزار بوو جا (قوتەیبە) لایکردەوە بەلای لێپرسراوە سەربازیەکانەوە و، ووتی:

ئێوە چی دەڵێن ؟ یاخود چۆن دەبینن ؟

ئەوانیش ووتیان : ئێمە وای دەبینین کە ئەو پارەیە لە دەستهاتی موسڵمانان زیاد دەکات .........

پاش ئەوە بەڕاست ئێمەش پاش ئەو سەرکەوتنەی کە بەدەستمان هێناوە، جارێکی دی لەتۆڵەسەندنەوەی ئەو پیاوەو نموونەی ئەو ناترسین .........

ئەوجا (قوتەیبە لایکرد بەلای (موحەممەدی کوڕی واسیعی ئەزدییەوە) و ووتی:

تۆ چی دەڵێیت ئەی (ئەبا عەبدوڵلا) .

ئەویش ووتی : ئەی جەنابی (ئەمیر) لە ڕاستیدا موسڵمانان لە ماڵی خۆیان و نیشتمانی خۆیان دەرنەچوونەتە دەرەوە بۆ کۆکردنەوەی دەستهات و، کەڵەکەکردنی پارەو سامان، بەڵکو لە ماڵ و دەرچوون لەبەر ڕەزامەندی خودا و مسۆگەرکردنی پاداشت و بڵاوکردنەوەو ڕاگەیاندنی دینەکەی لەسەر زەوی دا....

تێکشکاندنی دوژمنانی خودا و دینەکەی .

ئەوجا (قوتەیبە) فەرمووی : خودا پاداشتی بەخێرت بداتەوە ......

سوێند بەخوا وازی لێناهێنم لەدوای ئەم چرکەساتە ئافرەتێکی موسڵمان بترسێنێت، ئەگەر هەموو سامانی دونیای داوە بۆ کڕینەوەی خۆی .......

ئینجا فەرمانی دا بە کوشتنی ..

وە پەیوەندی (موحەممەدی کوڕی واسیعی ئەزدی) بە ئەمیرەکانی بەنی (ئومەیە) وە وانەبووبێ تەنها لەگەڵ (یەزیدی کوڕی موهەللەب) و (قوتەیبەی کوڕی موسلیم ی باهیلی) بووبێ ...

بەڵکو ئەو پەیوەندییەی جگە لەو دوانە کەسانی کەشی گرتبووەوە لە والی یەکان و ئەمیرەکان .

لە دەرکەوتووترینی ئەوانەی کە (موحەممەد) پەیوەندی لەگەڵی دا هەبوو والی (بەصرە) (بیلالی کوڕی ئەبی بوردە) بوو .

وە لەگەڵ ئەو والی یەدا کۆمەڵێك هەڵوێستی بەناوبانگی هەبووە کە لەسەر زمانی خەڵکی دەماو دەم کراوە و گێڕراوەتەوە، ئەمە جگە لە کۆمەڵێك دەنگوباس گێڕدراوەو دەماو دەم کەوتووی نێوان خەڵکی ......

لەوانە (بیلال) ڕۆژێك دەچێت بۆلای (موحەممەد) دەبینێت (جبەیەکی) دڕاوی زبری لە خوری لەبەردایە، پێ ی ووت :

چی وای لێ کردووی ئەو بەرگە زبرەت لەبەرکردووە ئەی (ئەبا عەبدوڵڵا) ؟!

(شێخ) خۆی خەریك کردوو ، وەڵامی نەدایەوە ........

(بیلال) سەرنجی داو ووتی : بۆچی وەڵامم نادەیتەوە ئەی (ئەبا عەبدوڵڵا)؟!

ئەویش لە وەڵامدا ووتی :

پێم ناخۆشە کە بڵێم دونیا نەویستنە، گوایە بەوە شان و شکۆی خۆم بەرز ڕابگرم ....

گوایە دونیا نەویستم وە هەروەها پێم ناخۆشە کە بڵێم ئەوە هەژارییە، وە بەوەش سکاڵای لای پەروەردگارم بکەم ....

من نەئەوەو نەئەوەی تریشم دەوێت، واتە مەبەستم هیچ کامیان نی یە .

ئەوجا(بیلال) پێ ی ووت:ئەی ئایا پێویستی یەکت هەیە بۆت جێ بەجێ بکەین ئەی (ئەبا عەبدوڵڵا) ؟

ئەویش ووتی: من هیچ پێویستی یەکم نی یە کەلەهیچ کەسێکی داوابکەم ..... بەڵکو هاتووم بۆخزمەتت بۆ پێویستی برایەکی موسڵمان ....

ئەگەر خودا بڕیاری دابێ بەجێ بەجێ کردنی، ئەوا جەنابت جێ بەجێ ی دەکەی بۆی و جەنابت جێگەی سوپاس و ستایش دەبیت ........

خۆ ئەگەر خودا بڕیاری نەدابێ ئەوا جەنابت جێ بەجێ ی ناکەیت، وەتۆش بەبەهانە دەبیت لە جێ بەجێ کردنی .

ئەوجا (بیلال) فەرمووی: بە ئیزنی خودا جێ بەجێ ی دەکەین .

پاشان (والی) لایکرد بەلایەوەو ووتی:

چی دەفەرموویت دەربارەی (قەزاو قەدەرەوە) ئەی (ئەبا عەبدوڵلا) ؟ .

ئەویش فەرمووی: ئەی ئەمیر ...........

لەڕاستیدا خودای بالأدەست لەڕۆژی ڕستاخێزدا پرسیار لەبەندەکانی ناکات دەربارەی (قەزاوقەدەر)...

بەڵکو پرسیاریان لێ دەکات دەربارەی ئەو کردارانەی ئەنجامیان داوە .

کە (والی) گوێبیستی ئەوە بوو شەرم دایگرت و پەنای بەبێ دەنگی برد .

ئەو هەردانیشتبوو لە خزمەت (والی) دا کەکاتی نان خواردنی نیوەڕۆ هات، جا خواردن ئامادەبوو، ئەوسا(والی) فەرمووی کرد بۆنان خواردن ....... ئەویش ڕووی پیشان نەدا....... بۆیە (والی) زۆری بۆهێنا، ئەویش بەزۆرشت بیانووی بۆ دەهێنایەوە

(والی) ش تووڕەبوو ووتی:

وا دەبینم بەلاتەوە ناخۆشە شتێك لە خواردنمان بخۆیت ئەی (ئەبا عەبدوڵلا)!!

ئەویش ووتی: شتی وەها مە فەرموو ئەی جەنابی (ئەمیر) ،

سوێند بەخودا لاکەوتووەکانیشتان ئەی کۆمەڵی ئەمیران، خۆشەویسترن لەلامان لە جگەرگۆشە وخزمەنزیکەکانمان .

وە(موحەممەدی کوڕی واسیعی ئەزدی) زیاتر لەجارێك داوای لێکراوە بۆسەرپەرشتی دادوەری (القضاء)، بەڵکو ئەو ئەوەی پەسەند نەکردووەو بەڵکو زۆر بەتوندیش ڕەفزی کردووە .........

وەبەهۆی ئەو نكۆڵی لێكردنەوە خۆی تووشی ئازاردان كردووە ........

لە نموونەی ئەوە (موحەممەدی كوڕی مونزیر) بەڕێوەبەری پۆلیسی (بەصرە) بانگهێشتی (موحەممەدی كوڕی واسیعی) كرد و پیّ ی ووت:

بەڕاستی ئەمیر(عیراق) داوای لەمن كردووە كە داوا لەتۆبكەم بۆسەرپەرشتی دادوەری (القضاء)، ئەویش ووتی:

لەوبارەوە لێم ببورن خودا لێتان ببوریّ .

ئەوان داواكەیان دووبارەو سیّ بارەكردەوە لیّ ی، ئەویش هەرسوور بوو لەسەر نەكردنی .

پاشان ئەویش پیّ ی ووت: سوێند بە خودا یان سەرپەرشتی دادوەری دەكەین، وەیاخود سیّ جەڵدت لیّ دەدەم و سوكایەتیت پیّ دەكەم ئەویش پیّ ی ووت: ئەگەر تۆ ئەوە بكەیت ئەوە تۆ دەستكراوەو خاوەن دەسەڵاتی ....

وەبیّ گومان سزادراوی دونیاش باشترە لەسزادراوی دواڕۆژ ....

ئەوجا كە (موحەممەدی كوڕی مونزین) ئەوەی لیّ بیست، شەرمەندە بوو وە بەشێوەیەكی باش وازی لێهێنا .

وە كۆڕی (موحەممەدی كوڕی واسیع) لە مزگەوتی (بەصرە) پەناگا بوو بۆ خوێندكاران و قوتابیانی زانست ... وەسەرچاوەیەك بوو بۆ ئارەزوو مەندانی دانایی و ئامۆژگاری و پەند وەرگران .

وەپەڕاوەكانی مێژوو و ژیاننامە (كُتَب التأريخ و السِّيرة) ڕازاوەن بە دەنگوباسی ئەو كۆڕانە .

لە نموونەی ئەوە یەكێك لە ئامادەبووانی كۆڕەكەی پیّ ی ووت:

ئەی (ئەبا عەبدوڵلاّ) ئامۆژگاریم بكە .

ئەویش فەرمووی: ئامۆژگاریت دەكەم كە پادشای دونیا و دواڕۆژ بیت .

پرسیار كەر ڕاماو ووتی:

جا چۆن ئەوەم بۆ دەبێت ئەی (ئەبا عەبدوڵلاّ)؟!.

ئەویش فەرمووی: بێ باك بە لەوەی کەلە دونیادا هەیەو مایەی مانەوە نی یە و کۆتایی دێت، وەدەستبەردار بوون و نەویستنی ئەوەی کەلە دەستی خەڵکی دایە دەبێتە پادشای دونیا ....

و دەبێتە پادشای ئەولاش بەبەدەست هێنانی ئەوەی کە لەلای خودایە لەپاداشتی چاك بەخۆپارێزی خوداپەرستی ...

یەکێکی دی پێ ی ووت:

بەڕاستی من لەبەرخاتری خودا خۆشم دەوێت ئەی (ئەبا عەبدوڵلاّ) ...

ئەویش فەرمووی: ئەو خودایەی کەلەبەرخاتری ئەو منت خۆش دەوێ خۆشی بوێیت ....

پاشان لێیداو ڕۆی و لەبەرخۆیەوە دەیفەرموو:

خوایە پەنادەگرم بەتۆ کەلەبەرخاتری تۆ خۆش بوێم و، تۆش لێم بەقین بی. وەهەرکاتێك گوێبیستی ستایش و پیا هەڵدانی خەڵکی بوایە بەسەریاو وەسف کردنی لەبەرخۆپارێزی خودا پەرستی، پێ ی دەفەرموون :

خۆئەگەر گوناهەکان بۆگەنیان بلاٌوبکردایەتەوە، هیچ کەسێکتان نەی دەتوانی نزیکی من بکەوێ لەبەرئازاری ئەو بۆگەنەی من کە تووشی دەبوون .

* * *

وە (موحەممەدی کوڕی واسیع) کەمتەرخەمی نەدەکرد لەهاندانی قوتابیەکانیدا لەسەر وابەست بوون بەپەڕاوەکەی (قورئان) خودای بالاّ دەستەوەو ژیان لە ژێر سایە و سێبەریدا دەیفەرموو:

(قورئان) باخی بڕوادارە ... جا لەهەرکوێ یەکیدا بی یەوێ، ئەوە لە باخچەیەکدایە لەباخچەکانی دا...

هەروەها ئامۆژگاری دەکردن بەکەم خواردن و دەیفەرموو:

هەرکە خواردنی کەم بێت تێ گەیشتوەو، تێگەیشتوتر دەبێت ...ناخ بێ گەردوو نەرم و نیان دەبیت ...وەبەپێچەوانەوە زۆری خۆراك بەرگری لەپیاو دەکات لەجێ بەجێ کردنی زۆربەی ئەوەی کەدەیەوێت، واتە لەش قورس دەبێت و خەو دایدەگرێت و بێ تاقەت دەبێت .

وە (موحەممەدی کوڕی واسیع) لە خوداپەرستی وخۆپارێزی دا گەشتبوە ئاستێکی بڵند ....... لەوبارەوە زۆر لێدەگێڕنەوە ...........

لەوانە: ئەو لەبازاڕدا بینرا، کە گوێدرێژێکی هەبوو دەیفرۆشت، پیاوێك پرسیاری لێکرد:ئەی (شێخ) ئایا بۆمن بەباشی دەزانی؟

ئەویش فەرمووی: ئەگەر بۆخۆم بەباشم بزانیایە نەم دەفرۆشت.

وە (موحەممەدی کوڕی واسیع) لەهەموو ژیانیدا واژیاوە کە لەترس و دڵەڕاوکێدابووە لەبەرگوناهەکانی و ......... کاتێك بخرێتە بەرچاوی پەروەردگاری

جائەگەر پیّ ی بووترایە: ئەی (ئەباعەبدوڵلاّ) چۆنت ڕۆژکردۆتەوە ؟.

وەلاّمی دەدایەوەو دەیووت:

ڕۆژم کردۆتەوە نزیك لەسەرگەدە ....دوور لەئاواتەکانم .....بەخراپی کردارم .......

وە ئەگەر شتێکی بەدیبکردایە لەڕامان لەسەر ڕووی پرسیارەکانی دەیفەرموو: گومانتان بەرامبەر بەپیاوێك چی یە کەهەموو ڕۆژێك قۆناغێك دەبڕی بەرەو دوا ڕۆژ (قیامەت) ؟! .

* * *

وەکاتێك کە(موحەممەدی کوڕی واسیع ی ئەزدی) نەخۆش کەوت نەخۆشی مەرگ، خەڵکێکی زۆر چوونە سەردانی، تاوای لێهاتماڵەکەی جمەی دەهات بەوانەی دەچوونە ژوورەوەو دەهاتنە دەرەوەو بەپێوە وەستاوان و دانیشتوانانەوە ..........

ئالەوکاتەدا ڕووی وەرگێڕا بەلای یەکێك لە هاوڕیّ تایبەتی یەکانیداو ووتی:

پێم بڵیّ ئەوانە کاتیّ کە لەسەر ڕوو قاچەکانمان ڕاپێچ کراین چیمان بۆ دەکەن، یاخودبڵێین چیمان لەکۆڵ دەکەنەوە ؟!

وە ئەگەر فڕێدراینە ئاگرەوە چ سوودێکمان پیّ دەگەیەنن ؟!

پاشان ڕووی بەرەو پەروەردگاری وەرگێڕاو دەیووت:

خوایە داوای لێخۆشبوونت لیّ دەکەم لەهەموو هەڵوێستەیەکی خراپ کە هەڵوێستەم تێدا کردووە ...

وەلە هەموو دانیشتنێکی خراپ کەتێیدا دانیشتووم .....

وەلە هەموو چوونە ژوورەوەیەکی خراپ کەلێوەی چوومەتە ژوورەوە .....



وەلە هەموو چوونە دەرەوەیەکی خراپ کە لێ ی چوومەتە دەرەوە .....
وەلە هەموو کارێکی خراپ کە ئەنجامم داوە .....
وەلە هەموو وتەیەکی خراپ کە ووتوومە .....
خودایە داوای لێخۆشبوونت لێ دەکەم لە هەموو ئەوانە، دەخودایە لێم خۆشببە لێیان .....خودایە پەشیمانم لێیان و دەگەڕێمەوە بۆلای جەنابت... گەڕانەوەو پەشیمانیم لێ وەربگرە .....
بۆئەوەی بەسەلامەتی بەخزمەتی جەنابت بگەم، پێش ئەوەی لەسەری موحاسەبە بکرێم و سزاکەی بدەم بە کۆڵما .....
پاشان ڕۆحی بەخشی .....

خودایە هەمان خۆپارێزی و خوداپەرستی و ڕاوەستاوی (موحەممەدی کوڕی واسیعی ئەزدی) مان پێ ببەخشەو لە خزمەتیان دا لەبەهەشتا کۆمان بکەوە .
﴿وەرگێڕ﴾

بۆ زیاتر شارەزابوون لە ژیاننامەی (موحەممەدی کوڕی واسیعی ئەزدی) بڕوانە:
١
- تأريخ البخاري: ١/ ٢٥٥ .
٢- التأريخ الصغير: ١/ ٣١٨-٣١٩ .
٣- الجرح والتعديل: ٨/ ١١٣ .
٤- حلية الأولياء: ٢/ ٣٤٥- ٣٥٧ .
٥- الوافي بالوفيات: ٥/ ٢٧٢ .
٦- تهذيب التهذيب: ٩/ ٤٩٩- ٥٠٠ .
٧- شذرات الذهب: ١/ ١٦١ .
٨- طبقات الخليفة: ٢١٥ .
٩- تهذيب الكمال: ١٢٨٣ .
١٠- صفة الصفوة: ٣/ ٢٦٦ .
١١- تأريخ الأسلام للذهبي:٥/ ١٩٥ .
١٢- وفيات الأعيان: ٦/ ٣٠٨ .

# ١٧) عومەری کوڕی عەبدولعەزیز

(عومەری کوڕی عەبدولعەزیز لەلای زانایان دەژمێررێت بەیەکێك لەزانایانی بەکردارو خەلیفەکانی ڕاشیدین) (زەهەبیی)

## بەشی یەکەم

قسەکردن لەبارەی جێ نشینی (خەلیفە) خوداپەرستی دونیانەویست پێنجەمین جێ نشینی ڕاشیدین، گفتوگۆیەکە بۆنخۆشترە لەبۆنی میسك، وەجوانترە لەپارچە باخچە ڕازاوەکان ........

وەژیاننامەی ناوازی ڕازاوەی بەهەموو کردارێکی جوان، باخچەیەکی بەپیتی بۆنبەخشە، لەهەرشوێنێکدا هەڵوێستە بکەی دەستلەملانی ڕووەکێکی بەردارو، بەرهەمێکی تەڕو تازەو ...... گوڵێکی جوان و گەشاوە دەبێت ........

جائەگەر لەتوانامانا نەبێت کەئێستا هەموو ئەو ژیاننامەیەی لوتکەی مێژووی پێ ڕازاوەتەوە باسی بکەین و بیخەینە ڕوو بەردەستی خوێنەر، بەڕاستی ئەوە ڕێی ئەوەمان لێ ناگرێت کەچەند گوڵێك بچێنین لەباخچەی ڕازاوە و پڕ لەگوڵی ...... یاخود تیشکێك لەڕووناکی یەکەی ...... وەربگرین .ئەوەش ئەوەیە کە ووتراوە:

ئەوەی کەهەمووی نەزانرێت، هەندێکی وازی لێ ناهێنرێت .

جافەرموو چەند وێنەو نموونەیەك لەژیانی (عومەری کوڕی عەبدولعەزیز)، کەئەگەر خودا ڕووخسەت بدات و کارئاسان بکات، وێنەو نموونەی دیکەش لەپەڕاوی داهاتومان دا بەدوایاندا دێت .

جایەکەم وێنەو نموونەی ئەو وێنەو نموونانە، (سەلەمەی کوڕی دینار) زاناو دادوەرو شەیخی شاری (مەدینە) بۆمان دەگێڕێتەوەو فەرمووی:

هاتمە خزمەتی جێنشینی موسڵمانان(عومەری کوڕی عەبدولعەزیز) کەلە (بوخناسیرە) بوو کەلەناوچەکانی سەربە (حەلەب) بوو. وەئەو کاتە من بەساڵداچوو بووم و، وەماوەیەکی دوورو درێژیش بوو کەیەکترمان نەدیبوو، بینیم لە هەیوانی ماڵەکەیدابوو .........

بەڵام من لەوە بوو کە نەیناسمەوە لەبەر ئەو گۆڕانەی کەبەسەریدا هاتبوو لەچاو ئەوکاتەی کە والی بوو لەشاری (مەدینە).

زۆر بەگەرم بەخێری هێنام و فەرمووی:

لێم نزیك بەوە ئەی (ئەبا حازم) .

کاتێك لێی نزیك بوومەوە ووتم: ئایا تۆ ئەمیری بڕواداران (عومەری کوڕی عەبدولعەزیز) نیت؟ .

ئەویش فەرمووی: بەڵێ ........

ئەوسا منیش ووتم: چی یە وات لێ هاتووە؟!! ....... ئایا ڕوو ڕواڵە تێکی گەش و جوانت نەبوو...... وەپێستێکی نەرم و نیان و ...... ژیانێکی پڕ لە ڕەفاهی یەت و بوونت نەبوو .......

ئەویش فەرمووی: بەڵێ .

منیش ووتم: دەی قوربان ئەوەی کە ئەو ڕوو ئەو گۆڕانەی تیابەدیهێناوی چی یە، لەگەڵ ئەوەدا تۆ ئێستا خاوەنی زێڕو زیوی و، بوویتە ئەمیری بڕواداران ؟

ئەویش فەرمووی: ئەو گۆڕانکاری یە چیە تیام دا بەدی دەکەیت ئەی (ئەبا حازم) ؟!

منیش عەرزم کرد: ئەوە لەش و لارتە لاوازبووە ........

وەپێستی نەرم و نیانت چرچ بووە .......

وەڕوو ڕواڵەتەت زەرد هەڵگەڕاوە .........

وەچاوەکانت کزبوون و درەوشانەوەیان نەماوە ........

ئەوجاکە جەنابی گوێبیستی من بوو گریاو فەرمووی:
جا ئەبێت چۆن بێت ئەگەر بم بینیت لە گۆڕەکەم دا لەبینینی سێ یەم دا؟!
ئەوکاتەی چاوەکانم بەسەر کوڵمەکانمدا شۆڕبووەتەوە ..........
وەسکم ڕزیوەو پارچە پارچە بووە .......
وەکرمەکان هاتوچۆ دەکەن و دەخۆنەوە لەولاشە ڕزیوو بێ نازەم. بەڕاستی ئەگەر ئائەوکاتە بمبینی .... ئەی (ئەبا حازم) ئەوتا زیاتر لێم ڕادەمێنی و نام ناسیتەوە

پاشان سەری هەڵبڕی و ووتی:
ئەی (ئەباحازم) ئایا دێتەوە یادت کەلە (مەدینە) فەرموودەیەکت بۆگێڕامەوەو، بەدرێژی هەڵوێستەت لەسەر کردوو بۆت ڕوونکردمەوە ..........
منیش ووتم: ئەی (ئەمیری بڕواداران) من فەرموودەی زۆرم بۆجەنابت باس کردووە ..... جامەبەستت کامیانە ؟.
ئەویش فەرمووی: فەرموودەیەك بوو کە فەرمووت:(ئەبو هورەیرە) گێڕاوی یەتەوە .
منیش ووتم: بەڵێ ..... باش دێتەوە یادم ئەی (ئەمیری بڕواداران)
ئەوجا فەرمووی: دەی بۆم دووبارە بکەرەوە، بەڕاستی من دەمەوێت کەلە خۆتەوە گوێ بیستی ئەو فەرموودەیە ببمەوە .
ووتم: بیستم (ئەبا هورەیرە) دەیفەرموو: بیستم پێغەمبەری خودا(ﷺ) دەیفەرموو:
بەڕاستی لەبەر دەمتانایە کۆسپێکی زۆر نارەحەت و پشت شکێنی، کەجگە لە هەموو ئەوانەی کەخوداپەرستی و کۆششی لاوازی کردون کەسی دی ناتوانێ لەو کۆسپە تێپەڕێ،
ئەوجا(عومەر) گریا، گریانێکی ئەوندە بەتین کەمن ترسام لەوەی لەگەڵ ئەو گریانەدا زراوی بتۆقێ و بمرێ .
پاشان جا لەدوای جار فرمێسکەکەکانی دەسڕی، ئەو جا لایکرد بەلامەوەو ووتی:
ئایا ئەی (ئەبا حازم) ئیتر لۆمەم دەکەیت لەسەر ئەوەی کەمن خۆم لاوازکردوە بۆ ئەوەی ئەو کۆسپە تێ پەڕێنم، تکام وایە کە ڕزگارم ببێت لێ ی ........ بەلاَم من گومانم لە وەدانی یە کە ڕزگاربم ..........

*　　　　*　　　　*

وێنەو نموونەی دووەم لەوێنەو نموونەکانی ژیانی (عومەر)،(تەبەریی) لە (توفەیلی کوڕی میرداسەوە) بۆمان دەگێڕێتەوەو، دەڵێت:

(ئەمیری بڕواداران) کاتێك جێنشینی (خلافه) گرتە دەست نامەیەکی دڵنیاکەری نووسی بۆ (سولەیمانی کوڕی ئەبی سەڕیر) کە والی بوو بەسەر ناوچەکانی (سوغدەوە) (الصُغد) کە لە ناوەڕاستی ئاسیادا بوو تیایدا فەرمووبووی :

لەو شاروشارۆچکانەی کە لە ژێر دەستەلاتدایە میوانخانە بکەرەوە بۆ میوانداریيەتی موسڵمانان، جا کاتێك کە یەکێك لە موسڵمانان بەلای ئەو میوانخانەیەدا تێ پەڕی، میوانداری بکەن بۆ ماوەی شەووڕۆژێك ........

وە کاروباری بۆ ڕابپەڕێنن، خۆ ئەگەر سکالای شەکەتی زۆر دەکرد، ئەو دووشەوو دوو ڕۆژ میوانداری بکەن و دڵنەوایی بکەن .

وە ئەگەر قۆشەی لێ بڕابوو، وە وولاخێکی نەبوو کە ڕێ ی پێ ڕێ بکات، ئەوا ئەوەندەی تۆشە بۆ ڕێکبخەن و بیدەنێ کە پێویستی یەکەی جێ بە جێ بکات، وە بیگەیەننەوە وولاتەکەی خۆی .

ئەوجا (والی) فەرمانی (ئەمیری بڕواداران)ی ڕاگەیاندو، دەستی کرد بە جێ بە جێ کردنی، وە ئەو میوانخانانەی کە فەرمانی پێ دابوو کە ئامادەیان بکات، دایمەزراندن .

وە کە دەنگوباسی لە هەموو لایەك بلاوبوويەوە، وە خەڵکی لە ڕۆژهەلات و ڕۆژئاوای وولاتی ئیسلامی یەوە دەربارەی دە دووان و، نرخداریان دەکرد لە دادپەروەری جێ نشین و (خەلیفە) خوداپەرستی و خۆپارێزی و (تقواه) دەستخۆشیان لێ دەکرد

کۆمەڵێك لە پیاوماقوڵانی خەڵکی (سەمەرقەند)[1] چوونە خزمەتی والی (سەمەرقەند) (سولەیمانی کوڕی ئەبی سەڕیی) وە عەرزیان کرد :

بەڕاستی ئەو والی یەی پێش جەنابت (قوتەیبەی کوڕی موسلیمی باهیلی) هێرشیان هێنایە سەر وولاتەکەمان و داگیری کرد بەبێ هیچ ئاگادارکردنێکی پێشینە، وە لە جەنگی دا لەگەڵمان ئەو ڕچەو ڕێبازەی نەگرتبوە بەر کە ئێوە دەیگرنە بەر، ئەی جەماوەری موسڵمانان ........

---

١/ (سَمَرقَند) ئەمڕۆکە یەکێکە لە شارەکانی کۆماری سۆڤییەتی پاش ئەوەی کە ڕووسیا دەستی بەسەریدا گرت .

وە ئێمە ئاگاداری ئەوەین کە ئێوە بانگهێشتی دوژمنانتان دەکەن بۆ موسڵمان بوون و هاتنە ناو ئایینی ئیسلامەوە ......

جا ئەگەر ڕوویان پیشان نەدا و نکوڵیان لێ کرد، ئەوە بانگی بانگهێشتیان دەکردن بۆ دانی باج ......

خۆ ئەگەر لەوەش هەر نکوڵیان بکردایە، ئەوسا بڕیاری جەنگتان دەدا لە گەڵیان..

وە وا ئێمە بەڕاستی دادپەروەری و خوداپەرستی لە خوداترسانمان لە (جێنشینەکەتاندا) بەدی کردووە، وە ئەوە هانی داین و وای لێکردین کە سکالاّ لەسەر سوپاکەتان بەرز بکەینەوە بۆ خزمەتتان ..... وە داوای یارمەتیتان لێ بکەین لەسەر ئەوەی کە توشمان بووە لەسەر دەستی فەرماندەیەك لە فەرماندەکانتان .........

جا ئەی (ئەمیر) لوتف بفەرموو ڕوخسەت بدە بە وەفدێکمان کە بچێتە خزمەتی (جێ نشینەکەتان) و، ئەو ستەمەی لێمان کراوە بەرزی بکەینەوە بۆ خزمەتی .

ئەوسا ئەگەر مافی ئێمە بوو وە لێمان زەوت کرابوو ئەو بۆمان بگێڕێتەوە، وە ئەگەر وا نەبوو، ئەوا دەگەڕێینەوە بۆ ئەو شوێنەی لێوەی هاتووین .

(سولەیمان) ڕوخسەتی دا بە وەفدێکیان بە چوونە خزمەتی (خەلیفە) لە (دیمەشق)، جا کاتێك چوونە ماڵی (خەلیفە) و داواو مەبەستەکەیان بەرزکردەوە بۆ خزمەتی (خەلیفەی موسڵمانان) (عومەری کوڕی عەبدولعەزیز).

(خەلیفە) نامەیەکی نووسی بۆ والی یەکەی (سولەیمانی کوڕی ئەبی سەرِیی) فەرمووبووی تیایدا:

لەپاش پێشەکی .... کاتێك کە ئەو نامەیەم گەیشتە دەستت، دادوەرێك دابنێ لەگەڵ وەفدی خەڵکی (سەمەرقەند) دا تالە سکالاّکەیان بڕوانێت ..........

جا ئەگەر بڕیاری دا بۆیان، ئەوە فەرمان بدە بە سوپای موسڵمانان کە شارەکەیان بۆ بەجێ بهێڵێت ......

وە داوا لەو موسڵمانانە بکە کە لە نێوانیان دا لە شارەکەیاندا جێگیر بوون، شارەکەیان بۆ بەجێ بهێڵن و.......... بگەڕێنەوە بۆ ئەو شوێنەی کە ئێوە و ئەوانی لێ بووە، پێش ئەوەی کە (قوتەیبەی کوڕی موسلیمی باهیلی) چووبێتە ئەوێ .

کاتێك کە وەفدەکە گەیشتنە خزمەتی(سولەیمانی کوڕی ئەبی سەرِیی)، وە نامەکەی (ئەمیری بڕواداران) دایە خزمەتی ...... ئەویش خێرا دەست و بردی کردووە، سەرۆکی دادوەرانی (قاضي القُضاة) (جومەیعی کوڕی حازیری ناجیی) دەستنیشان کرد، ئەوجا ئەویش سەیری سکالاَکەی کردن و، بە ووردی لیّ کۆڵینەوەی کرد لە دۆزەکەیان و لەو ستەمەی لێیان کرابوو .....

وە گوێبیستی گەواهی (شاهیدی) کۆمەڵێك لەسەربازی موسڵمانان و فەرماندەکانیان بوو لەوبارەیەوە..........وە درووستی داواکەیانی بۆ ڕوونبوویەوە .............پاشان بڕیاری بۆ دان .......... کە مافەکانیان بۆ بگەڕێتەوە .........

ئیتر هەر لەگەڵ دەرچوونی بڕیارەکەدا (وای) فەرمانی دا بە سەربازی موسڵمانان کە ماڵ و شوێنەکانیان بۆ چۆڵ بکەنەوە، وە بگەڕێنەوە بۆ سەربازگەکانیان، وە جارێکی دی ئەگەر پێویستی کرد لەگەڵیان بجەنگێن .....

جائەو جایان سوڵح و ئاشتەوای دەچنە ووڵاتەکەیان ،وەیاخود لە ڕێی سەرکەوتنەوە لە جەنگ دا دەچنە ئەویّ ........

وە یان سەرکەوتن لە بەختیان نابێت و .....ئە ووڵاتەیان بۆ فەتح ناکرێت ....

جا کاتێك پیاو ماقوڵانی گەلەکە بڕیاری سەرۆکی دادوەرانی موسڵمانانیان بیست کە مافەکانی بۆ گێڕابوونەوە، هەندێکیان بە هەندێکیانیان ووت :

ئەی هاوار بۆتان چی لەوە زیاتر جیّ ی رامانە بۆتان ........... ئەوە تێکەلاَوی ئەو گەلەکەتان کرد، وە لەگەڵیان دانیشتن، وە بەچاوی خۆتان هەڵس و کەوتی جوان و دادپەروەریان و ڕاستگۆییانتان بینی ....

بەڕاستی وا باشە بیانهێڵنەوە لەگەڵ خۆتان .........

وە بە تێکەڵی و دۆستایەتیان پشووبدەن و، هەناسەیەکی خۆش ئامێز بدەن لەگەڵیان ،وە بە هاوڕیّ یەتیان دڵنیاو بەختەوەر بن ..... ئەوجا ئەو بڕیارەیان دا ....

*                    *                    *

وە وێنەو نموونەی سیٚ یەم لەوێنە و نموونەکانی ژیانی (عومەر) (خودای لیٚ ڕازی بێت)، (کوڕی عەبدولحەکەم) لە (پەڕاوە ناوازەکەیدا) کە پێی دەوترێ (ژیاننامەی عومەری کوڕی عەبدولعەزین) بۆمان دەگێڕێتەوە و دەفەرموێت :

کاتێك کە (عومەر) (ڕەزای خودای لەسەربێت) کەوتە سەرە مەرگ، (مەسلەمەی کوڕی عەبدولمەلیك) چووە خزمەتی و ووتی :

بەڕاستی جەنابت ئەی (ئەمیری بڕواداران) تۆ ڕێگات نەدا بە کوڕەکانت لەوەی کە ئەم فرسەتە بقۆزنەوەو، هەندێك سەروەت و سامان بەدەست بخەن.

خۆزگە ئەوانت ڕووبەڕووی من یان هەرکەسێك لەئەندامانی خانەوادەکە جەنابت بەباشی دەزانی بکردنایەتەوە لەو ڕووەوە سەرپەرشتیمان بکردنایە ...

کاتێك کەلە قسەکانی تەواو بوو، (عومەر) ووتی: فەرموو لەلام دانیشە ....

کەلەخزمەتیا دانیشت ئەویش فەرمووی: بیٚ گومان گوێبیستی گفتوگۆکەت بووم ئەی (مەسلەمە)، جا دەربارەی فەرمووتە: کە گوایە من دەمی کوڕەکانم داخستووە لەو پارەو سامانەی کەلە بەردەستمایە بەهۆی جیٚ نشینی یەوە ... وە دەستیانم لیٚ قەدەغە کردوە. بیٚ گومان بە سوێند بەخوا ئەوەی کە مافی خۆیانە لێم قەدەغە نەکردوون، وەمن لەوانە نیم کە شتێکیان بەدەمیٚ کە هی ئەوان نی یە ...

وەدەربارەی فەرمووتە: خۆزگە ڕووبەڕووی من یان هەرکەس کە خۆت لەئەندامانی خانەوادە بەباشی دەزانی بکردنایەتەوە تا لەو بارەیەوە سەرپەرشتیمان بکردنایە ...

من بەڕاستی پێت دەڵێم، سەرپەرشتیارو خەم خۆری من بۆ ئەوان تەنها ئەو کەسەیە کە قورئانی بەڕەوا (حق) ڕەوانەکردووە، وەهەر ئەوە کە پیاوچاکان دەپارێزێت و سەرپەرشتیان دەکات و هاریکاریان دەکات .

وە باش بزانە ئەی (مەسلەمە) بیٚ گومان کوڕەکانی من یەکێکن لەم دوو جۆرە پیاوانە:

یان پیاوێکی چاکی خودا پەرستی خۆپارێزن، بیٚ گومان ئەو خودا بەلوتفی خۆیٚ لەبەخشندەیی خۆی دەوڵەمەندیان دەکات و لەخەڵك بیٚ باکیان دەکات و، کاریان بۆ ئاسان دەکات ....

وەیاخود پیاوێکی خراپ و دور لەخودان و ڕوو لەیاخی بوون و تاوانن، جا ئەوسا من نابمە یەکەم کەس کە هاریکاریان بم بەماڵ و سامان لەسەر یاخی بوونی لەفەرمانی خودای بالاَ دەست:

پاشان فەرمووی: کوڕەکانم بۆ بانگ بکە ....

ئەویش بانگی کردن، کەنزیکەی نۆزدە کوڕ بوون.

کاتێك کە بینی چاوەکانی فرمێسکیان هەڵڕشت و ووتی: بەخۆمم ووت کۆمەڵە لاوێکن پشتگوێی خستوون، هیچ شتێکیان نی یە ....

ئەوجا (عومەر) گریا گریانێکی بێ دەنگ ... پاشان لایکرد بەلایانەوەو ووتی: ئەی کوڕەکانم ... بەڕاستی من خێرو بێرێکی زۆرم بۆ بەجێ هێشتوون و پشت گوێم نەخستوون ....

ئەوجا فەرمووی ئێوە دڵنیا بن بەلای هیچ کەسێکدا تێ ناپەڕن لە موسڵمانان یان ئەهلی (زیممە) (یەهودی و گاور) دا مافی ئێوەیان بەسەرەوە نەبێت

ئەی کوڕەکانم، بەڕاستی ئێوە لەبەردەم دوو هەڵبژاردەدان:

یەکەمیان ئەوەیە کە خۆتان دەوڵەمەند بکەن و، باوکتان بچێتە ناو دۆزەخەوە....

وەدووەمیان ئەوەیە کەبەهەژاری و بێ نەوایی بمێننەوەو باوکتان بچێتە بەهەشتەوە...

وە من بێ گومان وای بۆ دەچم کە ئێوە ڕزگار بوونی باوکتان لە دۆزەخ فەزڵ دەدەن بەسەر دەوڵەمەندی خۆتاندا .

پاشان بەسۆزو میهرەبانی یەوە سەیرکردن و فەرمووی :

هەستن خودا بتانپارێزێت و ئاگای لێتان بێت ....هەستن خودا ڕۆزیتان بدات ...

ئالەو کاتەدا (مەسلەمە) لایکرد بەلایەوەو ووتی:

من لەوە باشترم لایە ئەی (ئەمیری بڕواداران) .

ئەویش فەرمووی: ئەوە چی یە ؟؟.

(مەسلەمە) ووتی: من سێ سەد هەزار دینارم لەدەستدایە ...

وەمن ئەیبەخشم بەجەنابت، جا جەنابیشت بەش بکە لەنێوانیان دا ...

یاخود ئەگەر دەتەوێت بیکە بەخێر ....

(عومەر) پێ ی ووت: ئایا لەوە باشترو خێرتر نی یە بیکەیت ئەی (مەسلەمە)؟..

ئەویش ووتی: لەوە باشتر چی یە ئەی (ئەمیری بڕواداران) ؟.

(عومەر) فەرمووی: ئەو پارەیە بگێڕەرەوە بۆ ئەو کەسەی لێت وەرگرتووە، بەڕاستی ئەوە بەتۆ ڕەوا نی یە ...

جا چاوەکانی (مەسلەمە) دەستیان کردە فرمێسك هەڵڕشتن و ووتی: بەر بەزەیی خودا بکەویت ... ئەی (ئەمیری بڕواداران) بەزیندوویی و بەمردوویی .

بەڕاستی دڵە ڕەقەکانمانت نەرم و نیان کردەوە ...

ئەوەی لەیادتان کردبوو بیرت خستنەوە ...

وەیادکردنەوەمانت لە نێوان پیاوچاکاندا بۆ بەجێهێشتین ...

*		*		*

پاشان خەڵکی شوێن دەنگوباسی کوڕەکانی (عومەر) کەوتن لە دوای خۆی تا بزانن چیان بەسەردێت....

بینیانن کە هیچ کامێکیان نەئاتاج بوون و نەهەژار ...

خودای باڵادەست ڕاستی فەرموو کاتێك کە دەفەرمووێت :

وَلْيَخْشَ ٱلَّذِينَ لَوْ تَرَكُوا۟ مِنْ خَلْفِهِمْ ذُرِّيَّةً ضِعَٰفًا خَافُوا۟ عَلَيْهِمْ فَلْيَتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَلْيَقُولُوا۟ قَوْلًا سَدِيدًا ﴿٩﴾ (النساء آية:٩)

واتە/ باسەرپەرشكارانی بێ باوكان لەستەم لێكردنیان بترسن، هەروەك چۆن دەترسن لەستەم كردن لە منداڵە ساواكانیان لەپاش مردنی خۆیان، وەیا بەبەزەی و سۆزێك و نەرم و نیانی یەك هەڵس و كەوتیان لەگەڵ بكەن، كە پێیان خۆشە بۆ جگەر گۆشەكانی خۆیان، با لەخودا بترسن لەپارێزگاری ماڵ و سامانیان و گەشەپێدانی، وە ووتەیەكیان پێ بڵێن كە گونجاو بێت لەگەڵ ڕاستی و دادوەریدا لەگەڵیان، وەبە

ووشەی جوان و نەرم و نیان دڵنەواییان بكەن، وەك بانگكردنیان بە: ئەی كوڕی خۆم، ئەی جگەر گۆشە شیرینەكەم .... هتد .

دەی خودایە دادوەری و خۆپارێزی (عومەر) مان پێ ببەخشەو لەگەڵ ئەو وێنەی ئەودا حەشرمان بفەرموو .

﴿ وەرگێڕ﴾

بۆ زیاتر شارەزا بوون لەژیاننامەی (عومەر) بڕوانە:

١- سيرة عمر بن عبدالعزيز لابن عبدالحكم .
٢-سيرة عمر بن عبدالعزيز لابن الجوزي .
٣-سيرة عمر بن عبدالعزيز للآجري .
٤- الطبقات الكبرى لابن سعد :٥/ ٣٣٠ .
٥-تأريخ الخليفة:٣٢١- ٣٢٢ .
٦-التأريخ الكبير:١٧٤/٦ .
٧-تأريخ الفسوي : ١/ ٥٦٨- ٦٢٠ .
٨-الطبري: ٥٦٥/٦- ٥٧٣ .
٩-الجرح و التعديل:١٢٢/٦ .
١٠-الطبقات للشيرازي: ٦٤ .

# عومەری کوڕی عەبدولعەزیز

## بەشی دووەم

### سێ هەڵوێست لەخزمەتیا

**(عومەری کوڕی عەبدولعەزیز هەندام جوان و ڕەووشت جوان و بەرز و، زێدە زانست زان و، پەیڕەو شەرع و خودا دۆست و تەوبەکار بوو) (الذَّهَبيُّ)**

**گفتوگۆکردن دە ربارە ی (خە لیفە ی شوێنکەوتوو) (عومەری کوڕی عەبدو لعەزیز ) گفتو گۆیەکی هەمەچەشنە وهونەر ئامێزە، تۆهێشتا تینویەتیت نەشکاوە لەوێنەونمونەیەك لەوێنە ونمونەکانی ژیانی تایبەتیت دەستت دەگرێت ودەتبات بۆلای نموونەیەکی دی کەبە هادارترو..دەوڵەمەند ترو.. کاریگەرترە.**

**ئەوەبوو ئێمە لە نووسینی یەکەم دا سێ وێنە و نموونەمان لەو وێنەو نموونەکانی ژیانی پێنجەم خەلیفە راشیدینمان بینی... دەیفەرموو بائێستاش بەهرەمەند ببین بەسێ نموونەی دیکەی کەلەپێشووەکانی کەمتر نین لە درەوشاوەی و رووناکی بەخشیندا:**

**باوێنەی یەکەم لەوهەڵوێستانەی (عومەر)، (دوکەینی کوڕی سەعیدی درامی) بۆ مان دەگێڕێتەوە کە بوێژێکی دەشتەکی (رجَّازٌ بدويٌّ) بەناو بانگە، دەڵێت: ڕۆژگارێك کە (عومەری کوڕی عەبدولعەزین) والی شاری (مەدینە) و دەوروبەری بوو، چوومە خزمەتی و مەدحم کرد، ئەویش فەرمانی دا پانزە حوشتریان دامی لەچاکترین جۆری حوشتر جا کاتێك گەشتنە دەستم، بەووردی سەرنجم دان، کە زۆر پێیان رامام، وەپێم**

ناخۆش بووە بەتەنها بیانخەمە ڕێگەو لەوەش بترسم یەکێك دەستدرێژی بکاتە سەریان، وە پێشم خۆش نەبوو کە بیانفرۆشم. کاتێك ئالەو دڵەڕاوکی یەدا بووم، کە کۆمەڵێك هاتن دەیانویست سەفەربکەن بەرەو ناوچەکانی ئێمە لە (نەجد). جاداوام لێکردن کە هاوڕێیەتیان بکەم، ئەوانیش ووتیان:

بەخێر هاتی،ئێمە ئەمشەو دەردەچین، تۆش خۆت ئامادە بکە لەگەڵمان. منیش کە گوێبیستی ئەوە بووم چووم بۆ خزمەتی (عومەری کوڕی عەبدولعەزیز) بۆ خواحافیزی، لەکۆڕەکەیدا دوو پیاو ماقووڵم بینی کەنەم ئەناسی... جاکاتێك کە ویستم بەجێیان بهێڵم، (عومەر) لایکردەوە بەلامەوە و ووتی:

ئەی (دوکەین) بەڕاستی من ناخێکی ئارەزوومەندی زۆر تەماکارم هەیە... جا ئەگەر زانیت من گەشتمە پایەو دەسەلاتێکی زیاتر لەوەی کەئێستا هەمە، وەرە بۆلام، ئەوە بێ گومان بە چاکەو بەخشیت باشترین لەگەڵ ئەنجام دەدەم. منیش ووتم: لەسەر ئەو ووتەیەت گەواهیم بۆبدە ئەی (ئەمیر) ئەویش فەرمووی:

خودا دەکەم بەشاهید لەسەر ئەوە. منیش ووتم: لەبەندەکانی خوداش. ئەویش فەرمووی: ئەو دووپیاو ماقوڵ و زانایە. منیش رووم کردە یەکێکیان و ووتم:

باوك و دایکم بەقوربانت بێ، ناوتم پێ بڵێ تا بتناسم. ئەویش ووتی: (سالمی کوڕی عەبدوڵلای کوڕی عومەری کوڕی خەتتابم) ئەوجا منیش لامکردەوە بەلای (ئەمیر)دا ووتم: بەڕاستی ڕێم لەگەواهیدەرێکی قسە رەواکەوت.

پاشان رووانیم بۆ پیاو ماقووڵەکەی دی و، ووتم: ئەی تۆ کێیت بەقوربانت بم.

ئەویش ووتی: (ئەبو یەحیا) راوێژکاری ئەمیرم. منیش ووتم: بەخ ئەوەگەواهیدەرێکی لەخودی خانەوادەی ئەمیر.

پاشان سلاوم کرد بەخۆم و وشترەکانمەوە لێمدا ڕۆشتمەوە بۆ وولاتی گەل و هۆزەکەم لە (نەجد). خوداش پیت و بەرەکەتی تێ خستن هەتا لەبەرووبووکەیان گەلێك ووشتر و بەندەم کڕی.

پاشان رۆژگار هات و رۆژگار رۆشت... منیش لەبیابانی (فەلەج) بووم لەسەر زەمینی (یەمامە) لە (نەجد) ڕێم لە کەسێك کەوت، پێی ڕاگەیاندم کە (ئەمیری

بڕواداران) (سولەیمانی کوڕی عەبدولمەلیك) وەفاتی کردووە، منیش ووتم بەراگەیەنەرەکە: کێ لەجێگەی ئەو بووەتە خەلیفە؟.

ئەویش ووتی: عومەری کوڕی عەبدلعەزیز.ئەوجا منیش هەر بەبیستنی دەنگوباسە کە سەفەرم ڕێکخست بەرەو وولآتی شام و ڕۆشتم. کاتێك کە گەشتمەوە (دیمەشق) تووشی (جەریر)[1] بووم لەلای (خەلیفە)وە دەگەڕایەوە...

هالە کوێوە ئەی (ئەبا حەزرە)؟ ئەویش ووتی: لەلای (خەلیفە) بووم کەبە هەژاران دەبەخشێت و بوێژان (الشعراء) بێ بەش دەکات.جاتۆش لەکوێوە هاتویت بگەڕێرەوە بۆئەوێ، ئەوەت باشترە. منیش ووتم:: من پلەو پایەیەکم هەیە جیاوازە لەهی ئێوە. ئەویش ووتی: فەرموو تۆو ویستی خۆت.

منیش ڕۆیشتم هەتا گەشتی ماڵی (خەلیفە)... بینیم لەحەوشەی ماڵەکەدا بوو، وەبێ باوکان و بێوە ژنان و ستەم لێکراووان دەورەیان دابوو... منیش ڕێگەیەکم نەبینی یەوە کە بچمە خزمەتی لەبەر قەرەباڵغی. ناچار دەنگم بەرزکردەوە ووتم: یا

عُمَرَ الخيراتِ والمكارمِ وعُمَرَ الدَّ سائع العظائمِ

إنِّي امْرَءٌ مِن قَطَنَ مِنْ دارِمِ طَلَبتُ دَيْني مِن أرضي المَكارِمِ

واتە: ئەی (عومەر)ی چاکەو بەخشندەکان، وە عومەری کیسەی پڕ من مرۆڤێکم لە شاری (قەتەن) لەهۆزی (بەنی دارم) لە عەرەبی حیجاز، داواکاری قەرزەکەم دەکەم لەبرای بەخشندەم.

(یەحیا)ی راوێژکاری سەرنجێکی دوورو درێژی دام، پاشان لای کردەوە بەلای (خەلیفە)وە و ووتی: ئەی (ئەمیری بڕواداران)، بەڕاستی من گەواهییەکم هەیە بۆ ئەو پیاوە دەشتەکییە لەلای جەنابت. (عومەر) فەرموو: ئەیناسم... پاشان (خەلیفە) لای کرد بەلای منەوە و ووتی:

ئەی (دوکەین) لێم نزیك بەرەوە کاتێك چوومە خزمەتی رووی تێکردم و ووتی: ئەی (دوکەین) لەبیرتە ئەوەی لەشاری (مەدینە) پێم وتی، کەناخی من کاتێك شتێکی

---

[1] (خریر) یەکێك بوو لەسێ بوێژەکەی (شاعر) چاخی ئەمەوی کە ئەمانەبوون: ا-جریر ب-الفرزدق ج-الاخطل.

وەدەست دەکەوێت، ئارەزوومەندی شتێکی ترە کەلەو بەهادارتربێت. منیش ووتم: بەڵێ ئەی (ئەمیری بڕواداران).

ئەویش فەرمووی: ئەوە ئێستا من مەبەستێکم لە دونیادا بەدەست کەوتووە... ئەویش دەسەڵاتە. بەڵام ئاخم ئارەزوومەندو تامەزرۆی ویستێکە لەدوارۆژدا (القیامە)... ئەویش بەهەشتە... وە هەوڵ دەدات بۆ بەدەست هێنانی خوای باڵا دەست جا لەکاتێك دا کە پادشایان دەسەڵات دەکەنە رێگا بۆ گەیشتن بە پلەو پایەی دونیایی... من دەیکەمە رێگایەك بۆ گەیشتن بە پلەو پایەیی دوا رۆژ...

پاشان فەرمووی: ئەی (دوکەین) سوێند بەخوا من ئەوەتای کاروباری موسڵمانانم گرتوەتە دەست نە درهەمێك و نە دینارێکم لەماڵ و سامانیان وەرنەگرتووە... وە دڵنیا بە کە من جگە لە (هەزار درهەم) هیچی ترم نی یە، جا تۆ نیوەی بەرەو، نیوەکەی تریشی بەجێ بهێلە بۆ من... منیش ئەو پارەیەی کە پێ ی بەخشیم وەرم گرت. وە سوێند بەخوا لەوە بەبەرەکەت ترم نەبینی.

*			*			*

وە وێنەو نموونەی دووەم، دادوەری (قاضی) موسڵ (یەحیای کوڕی یەحیای غەسانی) دەگێڕێتەوەو دەڵێت: (عومەری کوڕی عەبدولعەزیز) رۆژێکیان بەبازارەکانی شاری (حمص)[1]دا دەگەڕا، بۆ ئەوەی فرۆشیارەکان بەسەر بکاتەوەو ئاگاداری نرخەکان بێت، ئالەو کاتەدا پیاوێك هاتە پێشێ کە (بوردەیەکی) سووری قەتەری لەبەردا بوو، پێ ی ووت:

ئەی (ئەمیری بڕواداراَن)... بیستوومە کە جەنابت فەرمانت فەرمووە کە هەرکەس ستەمی لێکراوە بابێتە لام. ئەویش فەرمووی: بەڵێ... کابرا ووتی: دەی ئەوە پیاوێکی ستەم لێکراوە هاتووەتە خزمەتت کە ماڵی لێرەوە دوورە. (عومەر)فەرمووی: خانەوادەو کەس و کارت لەکوێیە؟ پیاوەکەش ووتی: لە (عەدن)ە ...(عومەر) فەرمووی سوێند بەخوا لە ڕاستی دا شوێنی تۆ لە شوێنی (عومەر)ەوە دوورە.

---

[1] (حمص) شارێکە لەگەورە شارەکانی (سوریا)و دەکەوێتە ناوەندی وولاتەکەو گۆڕی (خالیدی کوڕی وەلیدی) تێدایە رەزاو رەحمەتی خودای لەسەر بێ.

پاشان (عومەر) لەولاخەکەی دابەزی و، لەبەردەمی دا ڕاوەستاو ووتی: ئەو ستەمە چی یە لێت کراوە؟ پیاوەش ووتی: پارچە زەوییەك هی منە، پیاوێك لەپیاوەکانی جەنابتان دەستی بەسەردا گرتووە و لیٚ ی داگیر کردووم. (عومەر) نامەیەکی نووسی بۆ (عوروەی کوڕی موحەمەد) کە والی (عەدەن)بوو تیایدا فەرمووبووی:

لە پاش پێشەکی... کاتێك ئەو نامەیەم گەیشتە دەستت، گویٚ لەبەڵگەی هەڵگری نامەکە بگرە، جا ئەگەر مافەکەی سەلماند، مافەکەی بۆ بگێڕەرەوە، پاشان نامەکەی مۆر کردو دای بە پیاوەکە. کاتێك پیاوەکە ویستی بڕوات (عومەر) پیٚ ی فەرموو:

پەلە مەکە لەسەرخۆ بە... لەڕاستی دا تۆ لەووڵاتێکی دوورەوە هاتوویت بۆلای ئێمە... لەوەدەچێت ولاخەکەشت لەدەست دابێت. ئەوەش هەمووی حساب بکە، هەمووی گەیشتە پانزە دینار، ئەوجا هەمووی دایەوەو ووتی: ئەوە لەناو خەڵکیدا بلاو بکەرەوە، تا خەڵکی ستەم لێکراو بەهۆی نەبونییەوە کەم تەرخەم نەبن لەبەرز کردنەوەی ئەو ستەمەی لێیان کراوە بۆلای خەلیفە لەمڕۆ بەدواوە ، هەرچەند ڕێگاکەش دوور بێت، قەرەبووی خەرجی یەکەی بۆ دەکەینەوە.

*		*		*

وە وێنەی نموونەی سیٚ یەم، خودا پەرستی دونیا نەویست (زیادی کوڕی مەیسەرەی مەخزومی) بۆمان دەگێڕێتەوە کەئەو کاتە بەندەی عەبدوڵا بووە دەڵێت:

گەورەم (عەبدوڵای کوڕی عەبباس) ڕەوانەی کردم لەشاری (مەدینەوە) بۆ شاری (دیمەشق)، بۆ خزمەتی ئەمیر ی بڕواداران (عومەری کوڕی عەبدولعەزیز) بۆ هەندیٚ پێویستی خۆی. وە لەنێوان من و (عومەر)دا پەیوەندییەکی دێرین هەبوو کە دەگەڕایەوە بۆ ڕۆژگاری والی یەتی ئەو لە (مەدینە)، جاکە چوومە ژوورەوە بۆ خزمەتی، بینیم نووسەرێکی لابوو، نامەی بۆ دەنووسی...

جا کە گەیشتمە سەرەتایی ژوورەکەی ووتم: (السلام علیکم)، ئەویش ووتی: (وَعَلَيْكمَ السلامُ ورحمةُ اللهِ وَبَرَكاتُهُ) ئەی (زیاد).

پاشان بە خەجاڵەتی یەوە بەرەو ڕووی چووم، چونکە سڵاوم لیٚ نەکردبوو بەناوی (ئەمیری بڕوادارانەوە). کە گەیشتمە نزیکی ووتم: (السَّلامُ عليْكَ) ئەی (ئەمیری بڕواداران) وە (رحمةُ اللهِ وبَرَكاتهُ) ئەویش فەرمووی: ئەی (زیاد) خۆ ئێمە ڕەخنەمان لەتۆ نەگرت لەسەر سڵاوی یەکەمت، ئیتر چی پێویست بوو بۆ سڵاوی دووەمت؟. جا ئا لەو کاتەدا (نووسەر)ەکەی ئەو نامانەی دەخوێندەوە کەبە بەرید دا لە (بەسرە) هاتبوو دەربارەی ئەو ستەمانەی لەخەڵکی کرابوو. فەرمووی پێم: دانیشە ئەی (زیاد) تا دەستمان بەتاڵ دەبێت بۆ گفتوگۆ لەگەڵ تۆ.

منیش لەسەر کۆتەرە دارێك لای دەرگاکە دانیشتم، و نووسەرەکەش نامەکانی دەخوێندەوە بۆی، (عومەر)یش کە گوێبیستی نامەکان دەبوو هەناسەی قوڵی پڕ لە ئێش و ئازار هەڵدەکێشا.

جا کاتێك نووسەرەکە لە خوێندنەوەی ئەو نامانە بوویەوە کە لەلای بوو، وەچوو بەلای کاروباری خۆیەوە، ئەوجا (عومەر) لەشوێنەکەی هەستا، وە هات بۆلای من، وەلەلای دەرگاکەوە لەلام دانیشت، وە هەردوو دەستی خستە سەر ئەژنۆکانم و پاشان ووتی:

پیرۆزت بیٚ ئەی (زیاد) جبە نەرم ونیان و کراوەکەت، لەوەی کەلەبەر ئێمەدایە باشتر و چاکتر و فێنکترە. ئەوەتا من جبەیەکی خوریم لەبەردایە. پاشان دەستی کرد بەپرسیار کردن لێم دەربارەی پیاو چاکانی شاری (مەدینە) و، ئافرەتە چاك و بەناوبانگەکانی... یەك بە یەك... هیچ کەسیانی لەیاد نەکردبوو، دەربارەی هەر هەموویان هەواڵ پرسی لەمن کرد...

لەدوای ئەوە پرسیاری لیٚ کردم دەربارەی ئەو شتانەی کە فەرمانی دابوو بەکردنیان لەشاری (مەدینە) لەو کاتەدا کە والی ئەویٚ بوو. منیش دەربارەی هەموو ئەو کەسایەتی و کاروبارانەی کە هەواڵپرسی کردبوو ئاگادارم کرد. پاشان بەدوای ئەوا هەناسەیەکی قوڵی پڕ لەهەم و غەمی هەڵکێشا و ووتی: ئەی (زیاد)، ئایا نابینی ئەوەی کە (عومەر) تیٚ ی کەوتووە؟

منیش ووتم: من تکام ئەوەیە کەتۆ لەوەدا دەستلەملانی چاکەو پاداشت بیت.
ئەویش فەرمووی: ئەوە دوورە... پاشان گریا هەتا بەزەییم پێیدا هاتەوەو ووتم:
ئەی (ئەمیری بڕواداران) بەزەییت بەخۆت دا بێتەوە، من تکام وایە لەوەدا خێرت دەستگیر ببێت. ئەویش فەرمووی: ئەی زیاد ئەوەی تۆ ئومێدت پیێ یەتی زۆر دوورە... چونکە من ئەمڕۆکە وام لێهاتووە کە دەتوانم قسە بەخەڵك بڵێم و قسەی پیێ نەوترێت... وە لەخەڵك بدەم و لێم نەدرێت... وە خەڵکی ئازار بدەم و کەس ئازاری من نەدات.

پاشان جارێکی تر دەستی بەگریان کردەوە هەتا زۆر بۆی غەمبار بووم. لەخزمەتیا (سیێ رۆژ) مامەوە تا ئەوەی کە گەورەم ڕەوانەیکرد بووم بۆی جیێ بەجیێ بوو.
جاکاتێك ویستم بگەڕێمەوە، نامەیەکی پیێ دام بۆ گەورەکەم کە تیایدا داوای لیێ کردبوو کە منی پیێ بفرۆشیێ... پاشان لەژێر ڕاخەرەکەیدا (بیست دینار)ی دەرهێنا و ووتی: ئەو پارەیە بۆ کاروباری دونیات خەرج بکە... خۆ ئەگەر لەدارای دەوڵەتدا مافت هەبووایە، مافەکەی خۆتم دەدایتیێ.
منیش نکۆڵیم کرد لەوەی کەپارەکەی لێوەرگرم. ئەویش فەرمووی:
وەری بگرە، ئەوە لەدارایی موسڵمانان نی یە، بەڵکو لەخەجی تایبەتی خۆمە... جا من هەر سوور بووم لەسەر وەرنەگرتنی... بەڵام ئەو هەر پیێ ی داگرت لەسەر ئەوەی کە لیێ ی وەربگرم، ئیتر ناچار پارەکەم لیێ وەرگرت و، ڕۆشتم.
کاتێك گەشتمەوە شاری (مەدینە) نووسراوەکەم دایە دەستی گەورەم (ئەمیری بڕواداران)، کە کردییەوە، ووتی: لەڕاستیدا داوای لێکردووم کەتۆ بفرۆشم تا سەربەستت بکات... جا بۆ من خۆم ئەو کەسە نەبم کەتۆ سەربەست و رزگار بکەم؟ پاشان ئەو خۆی سەربەست و رزگاری کردم لەکۆیلایەتی...

خودایە سۆز و بەزەیی و دادپەروەری (عومەری کوڕی عەبدولعەزیز)مان پیێ ڕەوا ببینەوە لەگەڵ ئەوزاتانەدا لەخزمەتی (پێغەمبەر) (ﷺ)حەشرمان بکەو بە بەهەشتمان بسپێرە. ﴿وەرگێڕ﴾



بۆ زیاتر ئاگادار بوون لەدەنگ و باسی (عومەری کوڕی عەبدلعەزیز) بڕوانە:

١- سيرة عمر بنُ عبد العزيز لأبن عبد الحكيم.
٢- سيرة عمر بنُ عبد العزيز لأبن الجوزي.
٣- سيرة عمر بنُ عبد العزيز للآجري.
٤- الطبقات الكُبْرى لأبن سعد: ٥/٣٣٠
٥- صفة الصفوة لأبن الجوزي: ٢/١١٣_١٢٦
٦- وفياتت الأعيان لأبن خلكان: المجلدات ٢،٣،٤،٥
٧- العقد الفريد لأبن عبد ربه: الأجزاء ١،٢،٣،٤،٥،٦،٧،٨
٨- البيان والتبين للجاحظ: أُنْظر فهارس الأجزاء: ١،٢،٣،٤
٩- تأريخ مدينة (دمشق) لأبن عساكر: ٢/١١٥_١٢٧

# ١٨) موحەمەدی کوڕی حەنەفییە

﴿موحەمەدی کوڕی عەلی کوڕی ئەبی تالب﴾

**(هیچ کەسێك ناناسم لە (محەمەدی کوڕی حەنەفییە) زیاتر زانستی و زانیاری لە (عەلی کوڕی ئەبی تالبە)وە فێربوبێت و لیٚ ی سوودمەند بوبیٚ)**

**(کوڕی جونەید) (إبن الجُنَیْد)**

لەنێوان (موحەمەدی کوڕی حەنەفییەو) براکەیدا (حەسەنی کوڕی عەلی) ناکۆکی و پشت لەیەك هەڵکردنێك روویدا، جا (موحەمەد) نامەیەکی نارد بۆ (حەسەن) و فەرمووی تیایدا:

ئەی برا خودای گەورە ڕێزی تۆی داوە بەسەر من دا ... ئەویش ئەوەیە کە دایکی جەنابت (فاتیمەی کچی موحەمەدی کوڕی عەبدولاّیە (ﷺ) وە دایکی منیش ئافرەتێکە لەهۆزی (بەنی حەنەفییە).

وە بابە گەورەی جەنابت لەدایکتەوە (ڕەسولولاّیە (ﷺ)، کە هەڵبژاردەی نێوی هەموو دروستکراوەکانێتی...

وە بابە گەورەی من لەدایکمەوە (جەعفەری کوڕی قەیسە).

جا کاتێك ئەم نامەیەم گەشتە خزمەتت، تەشریف بهێنە بۆلای من و ئاشتەوایم لەگەڵ بکە، تا گەورەی و پایە بەرزی هەر شایستەی جەنابت بیٚ لەهەموو شتێك دا.

کاتێك نامەکەی گەشتە خزمەتی (حەسەن)... خێرا دەست و برد تەشریفی برد بۆ ماڵی ئەوو ئاشتەوایی لەگەڵ کرد و، ئاشت بوونەوە... جاکێ یە ئەو ڕۆشنبیرە ڕەوانبێژە زیرەك و کارامەو ڕەوشت دامەزراوە (موحەمەدی کوڕی حەنەفییە)؟.. دەی فەرموو با چیرۆکی ژیاننامەی لەسەرەتاوە بخەینە ڕوو و باسی بکەین.

ئەو چیرۆکە لە کۆتایی ژیانی (پیغەمبەردا) دروودی خوای لەسەر بێت دەست پێ دەکات.

ڕۆژێکیان (عەلی کوڕی ئەبی تالیب) لەدانیشتنێکدا لەخزمەت پەیامبەری دا دروودی خوای لەسەر بێ فەرمووی: ئەی پەیامبەری خودا (ﷺ) ئایا بەباشی دەزانیت، یان بڵێین بەڕەوای دەبینیت ئەگەر لەدوای جەنابت خودا کوڕێکی پێ بەخشیم بەناوی جەنابتەوە ناوی بنێم... وە هەمان نازناوی جەنابتی لێ بنێم.؟.

ئەویش فەرمووی: بەڵێ.

ئینجا ڕۆژگار هات و تێپەڕی و ... دەورو خولی خۆی دا...

پێغەمبەری خودا (دروودی خودای لەسەر بێ)، وەفاتی فەرموو، وەگەڕایەوە بۆ لای پەروەردگاری... وە بەدوای ئەودا (ﷺ) بەچەند مانگێك کچەکەی (فاتیمەی) خودا پەرست و خاوێن و (ڕێحانەی) ئەو خانەوادە پیرۆزەو، دایکی حەسەن و حسەین وەفاتی کرد.

لەدوای ئەو ڕووداوە (عەلی) خودای لێ ڕازی بێت نزیك بوویەوە لە (بەنی حەنەفییە). وە (خەولەی کچی جەعفەری کوڕی قەیسی حەنەفییە) ی لێ خواستن، وە لەو ئافرەتە خودای باڵا دەست کوڕێکی پێ بەخشی کە ناوی نا (موحەمەد) وە نازناوی لێنا ئەبی (قاسم) بەڕووخسەت وەرگرتن لە پەیامبەری خودا (دروودی خوای لەسەر بێ).

بەڵام خەڵکی بانگیان دەکرد بە (موحەمەدی کوڕی حەنەفییە)، بۆ ئەوەی جیاییبکەنەوە لە دوو براکەی (حەسەن) و (حوسەین)، دوو کوڕەکەی (فاتیمەی زەهرا) پاشان ئیتر لە (مێژوودا) بەوە ناسرا.

* * *

(موحەمەدی کوڕی حەنەفییە) لەدایك بووە لە کۆتایی جێ نشینی یەتی (ئەبو بەکری صدیق)دا خوای لێ رازی بێ. گەشەی کردو پەروەردە دەبوو لەژێر چاودێری باوکیدا (عەلی کوڕی ئەبی تالب)دا وە لەسەر دەستی ئەودا پێ ی نایە هەڵس و کەوتی ژیانەوە.

جا لەجەنابی ئەوەوە خودا ویستی و دونیا نەویستی فێر بوو...

وەلەوەوە بوویە میراتگری هێزو ئازایەتی... وە رەوانبێژی و ووتەپاراوی لەوەوە فێر بوو... هەروەك بوویە پاڵەوان و کلّپەدارکردنی جەنگ لە گۆڕەپانەکانی جەنگدا... وەهەروەها بووە یەکێك لەزیندوو کەرەوانەی شەو کاتێك کە بەتاریکی یەکەی بوونەوەری تاریك دەکرد و، چاوەکانی دەچوونە خەو...

*          *          *

وە جەنابی (باوکی) خوای لێ رازی بێت دەیکێشایە نێو ئەو جەنگانەی کە ئەنجامی دەداو ئامادەییان دەبوو. وەئەوەندەی کەلە تەنگەژەو ناڕەحەتی یەکانی ئەو جەنگانەی دەخستە ئەستۆی ئەو، ئەوەندەی نەدەخستە ئەستۆی براکانی (حەسەن) و (حوسەین). ئەویش هەرگیز نە دەبەزی و، هەستی بەلاوازی نەدەکردوو، خاوەن هەڵوێست بوو. وە ئەمە وایکرد جارێکیان پێ ی ووترا:

چی یە وا لە جەنابی باوکت دەکات کە دەتهاوێژێتە نێوو ئەو تەنگەژانەوەو، هەندێك لە کاروباری ئەستەم دەخاتە ئەستۆت کە زۆر جار لە تواناتدا نی یە، بەبێ ئەوەی ئەوە لەگەڵ براکانت (حەسەن) و (حوسەین) ئەنجام بدات؟.

ئەویش لە وەڵامدا فەرمووی: ئەوە لەبەر ئەوەی جەنابی باوکم دوو براکەم ی لەئاستی پلەو پایەی چاوەکانی دا داناون... وە منیش لەئاستی پلەوپایەی دەستەکانی دا داناوە...

دەی ئیتر ئەوە یەکە بەدەستەکانی چاوەکانی دەپارێزێ... منیش لە خزمەتیام.

*          *          *

ولەجەنگی (سیفڤین)دا کە کڵپەی سەند بوو لەنێوان (عەلی کوڕی ئەبی تالب) و (موعاویەی کوڕی ئەبی سوفیان)دا خودا لەهەردووکیان رازی بێت، (موحەمەدی کوڕی حەنەفییە) ئالآکەی باوکی هەڵگرتبوو.

جاکاتێك کە بازنەی جەنگ چڕ بوویەوە و گڕی سەند بەشێوەیەك خەڵکی دەهاڕی لەهەردوو تیمەکەهاڕینێك کەپێچەوانەی هەموو بیرکردنەوەیەك بوو، بۆیە لای (موحەمەد) ئەو ڕووداوە چیرۆکێکی سەرنج راکێش بوو، کە خۆی گێڕاویەوەو فەرمووی:

خۆمانم بینی لە (سیفڤین)دا، کە بەیەك گەیشتین لەگەڵ هاوڕێیانی (موعاویە)دا، کێشامان بەیەکداو، کوشتاری یەکترمان کرد، تا گومانم وابرد کەیەك کەس لە ئێمەو ئەوان نەماوە، کارەکەم زۆر لا ناشیرین بوو، وە بەهەند وەرگرت. پاشان ئەوەندەی پێ نەچوو کە گوێبیستی کەسێك بووم کە لەپشتمەوە هاواری دەکرد: ئەی کۆمەڵی موسڵمانان، ئەڵلآ، ئەڵلآ، ئەی کۆمەڵی موسڵمانان کێ بۆ ئافرەتان و منداڵآن جیهاد دەکات؟. کێ بۆ پارێزگاری لە دین و ناموس جیهاد دەکات؟. کێ بۆ موسڵمان بوونی(ڕۆم) و (دەیلەم)[1] جیهاد دەکات؟.

ئەی کۆمەڵی موسڵمانان ئەڵلآ، ئەڵلآ، دەی لەخودا بترسن، ئەی کۆمەڵی موسڵمانان.

کە گوێبیستی ئەوە بووم پەیمانم دا بەخۆم کەلەدوای ئەو ڕۆژەوە ئیتر شیر بەرزز نەکەمەوە بەرەو ڕووی هیچ موسڵمانێك.

*　　　*　　　*

پاشان (عەلی) رەزای خوای لەسەر بێت بەدەستی چەپەلی تاوانبار (عەبدو ڕەحمان کوڕی مەلجەم) شەهید کرا...

وە کاروبار کەوتە دەستی (مەعاوییەی کوڕی ئەبی سوفیان)، ئەوەبوو (موحەمەدی کوڕی حەنەفییە) پەیمانی دایە لەسەر گوێبیستی و گوێڕایەڵی لەسەر هەموو ئەوەی کە لەناخەوە پێ ی خۆشە، یان پێ ی ناخۆشە، ئەوەش بەینی خۆی و خودا تەنها

---

[1] (الدَّیْلَم)گەلێکی گەورە بوون لەباکوری قەزوین کە جەنگی موسڵمانانیان کرد بەڵآم دوایی موسڵمان بوون.

لەبەر ئەوەی ناکۆکی نەکەوێتە نێوان موسڵمانانەوە... کۆی برایەتی موسڵمانان پارێزراوبێت... وە شان و شکۆی ئیسلام و موسڵمانان پایەدار بێت...

کە (مەعاویە) خوای لێ رازی بێت هەستی کرد بەڕاستی ئەوپەیمان پێدانە بێ غەل و غەشەو، وە بەتەواوی دڵنیابوو لە پەیماندەرەکە، ئەوە وایلێکرد کە سەردانی (موحەمەدی کوڕی ئەبی حەنەفییە) بکات، ئەوەبوو بەهۆی جیاجیا زیاتر لەجارێك لە (دیمەشق) سەردانی کرد... وە بەهۆکاری جیاجیا...

*　　　　*　　　　*

لەنموونەی ئەو پەیوەندیانەی کە هەبوو لەنێوان (موعاویە) و (موحەمەدی کوڕی حەنەفیە)دا.

جارێکیان پادشای (ڕۆم) نامەیەك دەنووسێت بۆ (موعاویە) تیایدا دەڵێت: بەڕاستی پادشایان لەلای ئێمە، نامە گۆڕین دەکەن لە نێوان یەکترداو، هەندێکیان دڵخۆش دەکەن بەو شتەنایاب و سەرسوڕهێنەرانەی کەلەلایانە...

وە هەندێکیان مشت و مڕ دەکەن لەگەڵ هەندێکیان دا دەربارەی ئەو شتەناوازەو سەرسوڕهێنەرانەی کە لە وولاّتەکانیان دا هەیە.

جا ئایا جەنابت روخسەت دەدەی بەمن بەوەی کە لەنێوان ئەواندا هەیە لەنێوان من و جەنابیشتا هەبێت؟.

(موعاویە)ش وەلاّمی دایەوە بەرازی بوون و، ڕووخسەتی دا.

جا پادشای (ڕۆم) دوو پیاوی لەپیاوە سەرسوڕهێنەرەکانی بۆ ڕەوانەکرد: یەکێکیان بالاّ بەرز بوو زۆر زیاد لەبالاّ بەرزیدا، وە لەش و لارێکی بەرزو بڵند و تێ سمڕاوی هەبوو، دەتووت درەختێکی بەرز و بڵندە، یان هەمارتەیەکی بڵندی ڕوو لە کەشکەشانە.

وە دووەمیانیش، پیاوێکی بەهێز بوو، بەهێزێکی سنوور شکێن، لەشێکی قەوی و قۆڵ دەتووت دووڕەندەیەکی هێرش بەری تێکشکێنەرە... وە لەگەڵیان نامەیەکی ڕەوانەکردبوو کە ووتبوی:

ئایا ئەی جەنابی (مەعاویە) لە وولاتەکەتدا هەیە هاوشێوەی ئەو دوو پیاوە لە درێژی و بەهێزی دا؟.

(موعاویە) ووتی بە (عەمری کوڕی عاص):

وەك بالا بەرزەکە کەیەکێکم بەدی کردووە کە هاوشێوەیەتی و لەویش بالابەرزترە... ئەویش (قەیسی کوڕی سەعدی عەبادەیە). بەلام دەربارەی بەهێزەکە چاوەڕێ ی ڕای تۆ دەکەم بۆ دەستنیشان کردن.

(عەمر) ووتی: دووپیاو هەن بۆ ئەو مەبەستە، بەلام ئەوەندە هەیە کە هەردووکیان لەجەنابتەوە دوورن...

کە ئەوانیش : (موحەمەدی کوڕی حەنەفییە) و (عەبدوڵلای کوڕی زوبێر)ن. ئەوجا (موعاویە) ووتی: بەڕاستی (موحەمەدی کوڕی حەنەفییە) لێمانەوە دوور نی یە.

(عەمر) ووتی: بەلام ئایا جەنابت گومان دەبەیت ، کە ئەو لەگەڵ ئەو ڕێزو پایەبەرزی شانو شکۆیەی دا بچێتە مەیدانی پیاوێکی (ڕۆمی) لەبەرچاوی خەڵکیدا؟.

(موعاویە) لەوەلامی دا ووتی: لەڕاستی دا ئەو ئەوە دەکات و لەوەش زیاتر، ئەگەر شکۆمەندی ئیسلامی تیا بەدی بکات.

*　　　*　　　*

ئینجا (موعاویە) هەریەکە لە (قەیسی کوڕی سەعد) و (موحەمەدی کوڕی حەنەفییە)ی بانگهێشت کرد. جا کاتێك کۆڕەکە بەسترا (قەیسی کوڕی سەعد) هەستایە سەر پێ و شەڕواڵەکەی داکەناو فڕێی دا بۆ پیاوە بالابەرزە تێ سمڕاوە ڕۆمیەکە، وە فەرمانی پێدا کە لەبەری بکات، ئەویش لەبەری کرد... جا کەلەبەری کرد تا سەر مەمکەکانی داپۆشی. بۆیە خەڵکەکە بینیان دەستیان کردە پێکەنین پێ ی.

ئەوجا (موحەمەدی کوڕی حەنەفییە)یش ووتی بە وەرگێڕەکە: بڵێ بەو (ڕۆمی یە)... ئەگەر دەیەوێت کە ئەو دانیشێت، بادانیشێت و من بە ڕاوەستاو دەبم ئینجا دەستی بداتە دەستم.

جا ئەوکات یان من ئەو هەڵدەسێنمە سەر پێ، یان ئەو من دادەنیشێنێ... وەیان ئەگەر دەیەوێت ئەو ڕاوەستاوبێت، فەرموو با ئەو ڕاوەستاو بێت و، منیش

دانیشتودەبم... (ڕۆمی یەکە) دانیشتنی هەڵبژارد. ئەوجا (موحەمەدی کوڕی حەنەفییە) دەستی گرت و، هەڵی ساندە سەر پێ... وە (ڕۆمی یەکە) نەیتوانی ئەو دابنیشێنێ...

ئەوجا لووت بەرزی دای لەدڵی کابرای (ڕۆمی)و، داوای کرد کە ئەو ڕاوەستاوبێت و (موحەمەد)دانیشتووبێت، (موحەمەد) داواکەی پەسەند کرد، ئەوجا (ڕۆمی) ڕاوەستاو، (موحەمەدیش) دانیشت، جاکە دەستی دایە دەستی ڕاکێشانێك (موحەمەد) دەستی (ڕۆمی) ڕاکێشا لەوەبوو قۆڵی لەشانی ببێتەوە، ئەوجا زۆر بەئاسانی داینیشاندە سەرزەوی. ئەوجا هەردوو درێژ و زەبەلاحەکەی ڕۆمی بەسەرشۆری و دۆڕاوی گەڕانەوە بۆلای پادشاکەیان.

پاشان ڕۆژان جارێکی دی هاتووچوو وە (موعاویە)و(یەزید)ی کوڕی و (مەڕوانی کوڕی حەکەم) گەڕانەوە بۆلای پەروەردگاریان و وەفاتیان کرد... وە دەسەلأت لە بەنی (ئومەیە)دا کەوتە دەستی (عەبدولمەلیکی کوڕی مەروان)، وە خۆی ڕاگەیاند بە (جێ نشینی موسڵمانان) (خليفة المسلمين)، وە خەڵکی (شام) پەیمانیان دایە...

لەو لاشەوە خەڵکی (حیجاز) و (عێراق) پەیمانیان دا بە (عەبدوڵلأی کوڕی زوبەیر)[1] جا هەریەکێ لەو دووانە بانگهێشتی ئەو کەسەی دەکرد کە پەیمانی پێ نەدابوو بۆ ئەوەی پەیمانی پێ بدات...

وە خەڵکیش لەو سەردەمە دا وای بۆ دەچوون کە (عەبدوڵلأی کوڕی زوبەیر) ڕەواترە بۆ (جێ نشینی لە موعاویە)... جا وابۆ جارێکی دی ریزبەندی موسڵمانان درزی تێ بوو، وە ناکۆکی کەوتە نێو موسڵمانان...

ئا لەوێدا (عەبدوڵلأی کوڕی زوبەیر) داوایکرد (محەمەدی کوڕی حەنەفییە) کە پەیمانی پێ بدات هەروەك خەڵکی (حیجاز) پەیمانیان پێ داوە.

بەلأم (موحەمەدی کوڕی حەنەفییە) لەوە دڵنیابوو کە پەیمان دان کۆمەڵێك مافی ئەو کەسەی کە ئەم پەیمانی پێداوە، دەخاتە ئەستۆی... لەوانە وەستاندنی شیر بۆ

[1] (عەبدوڵلأی کوڕی زوبەیر) کوڕی (ئەسمای کچی ئەبوبەکری صدیق) بوو کە (ئەفریقا) لەسەر دەستی دا (فەتح) کرا.

پارێزگاری لیٚ ی، وەکو کوشتارکردنی نەیارەکانی... وە نەیارەکانی جگە لە موسڵمانانی جیهاد کار، کە پەیمانیان داوە بەنەیارەکەی ئەو، کەسێکی دی نین...

وە پیاوی ژیر هەرگیز ڕۆژی (سیفیین) لەبیر ناکات. وە ئەو چەند ساڵە دوور و درێژانە ئەو دڵتەزێنە غەمناکەی لە گوێیەکانی دا نەسڕیبوەوە کەلەو ڕۆژەدا لەپشتییەوە بانگکەرێك بانگی دەکرد:

ئەی کۆمەڵی موسڵمانان... ئەڵلاٰ... ئەڵلاٰ... لەخوا بترسن ئەی کۆمەڵی موسڵمانان. کیٚ لەبەر ئافرەتان و منداڵان جیهاد دەکات؟ کیٚ لەبەر دین و پارێزگاری لە ناموس جیهاد دەکات؟ کیٚ لەبەر ئەوە جیهاد دەکات کە (ڕۆم) و (دەیلەم) موسڵمان ببن. بەڵیٚ (موحەمەد) هیچ لەوانەی لەبیر نەچووە.

جا فەرمووی بە (عەبدوڵلاٰی کوڕی زوبەیر): بەڕاستی جەنابت بیٚ گومان باش دەزانیت کە لەو کارو بارەدا من هیچ ویست و مەبەست و داوایەکم نی یە...

بەڵکو من تەنها پیاوێکم لە موسڵمانان. جا ئەگەر ووتەی ئەو خەڵکە یەکلایی بووە لەسەر پەیمان دان بە جەنابت یان (عەبدولمەلیك)، ئەوە من پەیمان دەرم بەو کەسەی کە خەڵکەکە هەموویان یەکلابوونەتەوەو بەکۆ پەیمانیان پیٚ داوە... بەلاٰم ئێستا نەپەیمان بەجەنابت دەدەم و نەبە (موعاویەش).

(عەبدوڵلاٰی کوڕی زوبەیر) ئەو هەڵوێستە وای لێکرد کە جارێك تێکەڵی بکات و بە چاکی هەڵسوکەوتی لەگەڵ بکات و، جارێکی دی بەپێچەوانەوە لەگەڵی هەڵسوکەوت بکات.

* * *

هەر ئەو هەڵوێستەی (موحەمەدی کوڕی حەنەفییە) وایکرد کە زۆری پیٚ نەچوو کۆمەڵێکی زۆر لە پیاوان پاڵیان دا پیٚ یەوەو، رای ئەویان بەلاوە پەسەند بوو، وە خۆیان سپاردە ژێر فەرماندەیی ئەوەوە... هەتا ژمارەیان گەیشتە حەفتا هەزار پیاو کە هەموویان گۆشەگیریان لەو ئاژاوەیە بەلاوە باشتر بوو...

وە ملیان نەدا کە خۆیان بکەنە سووتەمەنی ئەو ئاگرە هەڵگیرساوەکڵپەدارە. جا هەر ژمارە شوێنکەوتووانی (موحەمەدی کوڕی حەنەفییە) زیادی کرد، خەشمەو کینی (کوڕی زوبەیر) زیاتر دەبوو لیّ ی، وە داوای لیّ چڕدەکردەوە بۆ پەیمان دان.

کاتێك کە (کوڕی زوبەیر) دەستەوسان مایەوە و بیّ ئومێد بوو لە (موحەمەد) و ئەوانەی کە لەگەڵیدا بوون لە (بەنی هاشم)و خەڵکانی تریش، ناچاریکردن لە دۆڵێکدا لەدۆڵەکانی (مەککە)دا بمێننەوە، چاودێری بەسەرەوە دانان. پاشان پیّ ی ووتن:

سوێند بەخوا یان پەیمان دەدەن یان بەئاگر دەتان سووتێنم... ئەوجا لەماڵەکانیان دا بەندیان کردن، وەداروچیلکەی کۆکردەوە و بەدەوری ماڵەکانیان دا بە بەرزییەکی وەها کە لەئاستی گوێسەبانی دا بوو... تا ئەگەر یەك چڵەداریان ئاگری بگرتایە هەموویانی دەسوتاند. ئالەو کاتەدا کۆمەڵێك لەشوێنکەوتووانی (موحەمەدی کوڕی حەنەفییە) هەستانە سەر پیّ و ووتیان:

وازمان لیّ بهێنە (کوڕی زوبەیر) دەتکوژین و خەڵکی لەدەستت رزگار دەکەین. (موحەمەدیش) فەرمووی: ئایا بەدەستی خۆمان ئەو ئاگری ئاژاوەیەی کەلەبەر ئەوە ئێمە خۆمان گۆشەگیر کردووە هەڵیبگیرسێنین و کڵپەداری بکەین... وە پیاوێك بکوژین لە هاوڕێیانی (پێغەمبەری خودا) بێت دروودی خوای لەسەر بیّ، وەیان لە کوڕانی هاوڕێیانی بێت؟!...

نەخێر، سوێند بەخوا شتێك ئەنجام نادەین کە خواو پێغەمبەر زویر و خەشمگیر بکات.

* * *

کاتێك ئەو توندو تیژییەی کە (موحەمەدی کوڕی حەنەفییە)و ئەوەی لەگەڵیدا بوو، دەیانچەشت لەلایەن (عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیر)ەوە (عەبدولمەلیکی کوڕی مەڕوان) بیستی یەوە، ئەوەی بەفرسەتێکی گونجاو زانی کە دڵیان بداتەوە بەلای خۆیدا...

بۆیە نامەیەکی بۆ نووسی و بەتەتەرێکدا بۆی ڕەوانەکرد، چۆن نامەیەك، ئەگەر بۆ یەکێك بۆ کوڕەکانیشی بنووسیایە، ئەوەندە نەرم و نیان و خۆش گوفت نەدەبوو. وە لەوەی لەو نامەیەدا هاتبوو:

ئەی (موحەمەد)ی بەڕێز دەنگوباسی ئەوەم پێگەیشتووە کە (کوڕی زوبەیر) تەنگی بەجەنابتان و ئەوەی لەگەڵتایە هەڵچنیوەو دەیەوێ بتان خنکێنێ... وە دەرگای سیلەو ڕەحمی لێ داخستویت و خزمانی لێکردویت... وە سوکایەتی پێ کردووین و ماف لێ زەوت کردووین...

جا ئەوە وولاتی (شامە) بەڕووتاندا کراوەتەوە و، پێشوازی لەجەنابت و ئەوەی لەخزمەتتایە دەکات بە سنگێکی فراوانەوە... جا لەهەر شوێنێکی دابەزێنن و جێگیرببیت کەخۆت حەزت لێ یەتی، خەڵکەکەی بەخۆشی یەوە لەخزمەتتانایە و، بەدراوسێ یەتیتان دڵخۆش دەبێ. وە ئێمەیش دەبینن چۆن مافەکانتان لەبەر چاو دەگرین... وە گەورەییتان دەنرخێنین... خزمایەتی و سیلەی ڕەحمتان دەگەیەنین بەویستی خودا...

(موحەمەدی کوڕی حەنەفییە)و ئەوانەی لەگەڵیدا بوون، ڕۆشتن و ڕوویانکردە وولاتی (شام)... جا کاتێك گەیشتنە (ئوبلە)[1]، تێیدا جێگیر بوون. خەڵکەکەی باشترین میوانداریان کردن، وە دراوسێ یەتیان کردن باشترین دراوسێ یەتی. و (موحەمەدی کوڕی حەنەفییە)یان زۆر خۆشی دەویست و، بەگەورە ڕایان دەگرت، لەبەر ئەو خودا پەرستی یە چڕوپڕو، دونیا نەویستی یەی.

ئەویش فەرمانی پێ دەکردن بەچاکە، هانی دەدان بۆ وازهێنان لەخراپە. وە درووشمە ئایینی یەکانی تیایاندا جێ بەجێ دەکرد و، ئاشتەوایی دەخستە نێوانیان، کاتێك کێشەو ناکۆکی یەك ڕوویبدایە لەنێوانیان دا. وەڕێگەی بەهیچ کەسێك نەدەدا کەستەم لە یەکێکی دی بکەن.

جا کاتێك ئەو دەنگوباسە گەیشتە (عەبدولمەلیکی کوڕی مەڕوان) زۆر لەسەری قورس کەوتوو، بەهەند وەریگرت، وە ڕاوێژی بەتایبەتمەندانی خۆی کرد، ئەوانیش پێیان ووت:

بەڕاستی ئێمە بەڕەوای نازانین کە جەنابت ڕێگەی پێ بدەیت لە وولاتەکەدا جێ نشین بێت و، ئەوەش هەڵسوکەوتی بێت کە دەزانیت... جا ئێمە ڕامان وایە: کە یان پەیمان بدات بەجەنابت... وەیان بگەڕێتەوە بۆ ئەو شوێنەی کە لێوەی هاتووە.

---

[1] (أبلە) شارێکە لەباکوری (عەقەبە)دا، ئەو ناوی ڕۆمەتی. ئێستا پێ دەوترێت (ئیلات).

ئەوجا (عبدولمەلیك مەڕوان) نامەیەکی بۆ نووسی و تیایدا ووتبووی پێ ی: بێ گومان تۆ هاتوویتە ووڵاتەکەم، و لە سوچێکی دا جێ نشین بوویت، وە ئەو جەنگەش هەیە لەنێوان من و (عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیر)دا ... وەتۆش پیاوێکی لە نێو موسڵماناندا ناوو پلەو پایەت هەیە، جا وای بەباش دەزانم ئەگەر پەیمانم پێ نەدەیت لەسەر زەمینی ژێردەسەلاتی مندا نابێت جێ نشین بیت...

جا ئەگەر پەیمانم پێ بدەیت، ئەوە دوێنێ سەد کەشتیم بۆ هاتووە لە میناى (قەلزەم)ە، ئەوەلای منەوە پێشکەشە بەتۆ، وەریبگرە بەهەموو ئەو شتانەی کەتیایدایە وە ئەوانەی کەتیایدان...

وە زیاد لەوەش هەزار درهەم و ئەوەش کەتۆ داوای دەکەیت بۆ خۆت و کوڕەکانت و خزمەکانت و خزمەتکارەکانت و ئەوانەی لەگەڵتان... ئیتر نکوڵی لەوە دەکەیت، ئەوە بگوێزەرەوە بۆ شوێنێك کەلە ژێر دەسەلاتی مندا نەبێت.

(موحەمەدی کوڕی حەنەفییە) نامەیەکی لە وەڵام دا بۆ نووسیبوەو تیایدا فەرمووی: لە (موحەمەدی کوڕی عەلی)یەوە بۆ (عەبدولمەلیکی کوڕی مەڕوان)، سڵاوی خوات لەسەر بێ. بێ گومان من سوپاس و ستایشی زاتی ئەڵلاَ دەکەم کە جگە لەو هیچ خودایەکی دی نی یە بۆتۆ، لەپاشدا...

جەنابت لەمن دەترسیت و بیمت لەمن هەیە، وەمنیش وای دادەنێم کەبەڕاستی تۆ شارەزاترین کەسێکی بەڕاستەقینەیی هەڵوێستی من لەو بارەوە. جا سوێند بەخوا ئەگەر هەموو ئەو (ئوممەتە) بێنە سەرم لەسەر ئەو کارە، جگە لە خەڵکی یەك گوند نەبێت، ئەو کارە پەسەند ناکەم، وەکوشتاری ئەو خەڵکەش ناکەم کە دێنە سەرم لەسەر ئەو کارە. وەمن جێ نشین بووم لە (مەککە)داو، (عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیر) ویستی کە پەیمانی بدەمێ، بەلاَم کاتێك نکوڵیم لێکرد، دراوسێ یەتی تێکدا لەگەڵما و خراپ بوو.

پاشان جەنابت نامەت بۆ ناردوم و بانگهێشتت کردم بۆ جێ نشین بوون لەووڵاتی (شام)دا، منیش جێ نشین بووم لەسوچێکی سەرزەوییەکەتدا لەبەر هەرزانی نرخ و مادەیی ژیان تیایدا و دووری لەمەڵبەندی دەسەلاتی جەنابتەوە. جا نامەت بۆ نووسیوم بەوەی کە نوسیووتە مەبەستتە... وە ئێمەیش بەویستی خودا بەجێتان دەهێڵین.

(موحەمەدی کوڕی حەنەفییە) و پیاوەکانی و خاوخێزان و کەسوکاری لە وولاّتی شام دەرچوون، وەهەرکە لە شوێنێکدا هەڵیان دەداو دەیانوویست جیّ نشین بن، زۆریان بۆ دەهێنران و داوایان لیّ دەکرا کەلەویّ کۆچ بکەن...

وەك بڵیّ ی ئەو هەموو غەم و پەژارەی بەس نەبوو بۆ تاقیکردنەوە، بۆیە خودای بالاّ دەست ویستی کە تاقیبکاتەوە بەغەم و پەژارەیەك کەزۆر بەتین و چڕو پڕو قورس بێت لەسەری... ئەویش ئەوەبوو کە کۆمەڵێك لەشوێنکەوتوانی کەلە دڵەکانیاندا ناساغی هەبوو، واتە لاوازی ناتەواوی لە دینیاندا هەبوو، وە کۆمەڵێکی دی لەوانەی کەبیّ ئاگایی هۆش دا یگرتبوون دەیانووت:

بەڕاستی (پێغەمبەری خوا) دروودی خوای لەسەر بیّ زۆریك لەنهێنیەکانی زانست و، بنەماکانی ئایین و، گەنجینەکانی (کنوز) شەریعەتی سپاردۆتە دڵی (عەلی) و ئەندامانی خانەوادەی.

وەبیّ گومان ئەندامانی خانەوادەی ئەو کە خانەوادەی پەیامبەر(ﷺ)تایبەتمەند کردووە بەو شتانەی کەجگە لەوان کەسی دیکە ئاگادارنین بەسەریدا... پیاوی زانای خودا ناسی ژیر و دانا هەستی کرد بەوەی کەئەو ووتەیە چی لە خۆی گرتووە لەلادان، وە ئەوەی کە دەیهێنێت بەسەر ئیسلام و موسڵماناندا لەزیان و مەترسیەکان.

جا خەڵکی کۆکردەوە و لەناوەندیاندا راوەستاو ووتارێکی بۆدان... سوپاس و ستایشی خودای بالاّ دەستی کرد و دروودی خودای نارد بۆ گیانی پاکی پەیامبەرەکەی و... ئینجا فەرمووی:

هەندێك لەخەڵکی وای دەردەبڕن و دەڵێن کە ئێمە ئەی کۆمەڵی خانەوادە، گوایە زانست و زانیاریەکمان لایە کە (پێغەمبەر) (ﷺ) تایبەتمەندی کردووە بە ئێمەوە، وەجگە لەئێمە کەسێکی دیکەی لیّ ئاگادارنەکردووە.

وە ئێمەیش بیّ گومان بن سوێند بەخودا هیچ میراتێکمان لە (پێغەمبەری خودا) دروودی خوای لەسەر بیّ، بۆ بەجیّ نەماوە جگە لەوەی کەلەنێوان ئەو دوو لەوحەدایە، وە ئاماژەی کرد بۆ قورئانی پیرۆز.

جا دڵنیابن هەر کەس وادەربیڕێت و بڵیّ کە ئێمە شتێکمان لایە جگە لە پەڕاوی خودا (قورئان) وە دەیخوێنینەوە، ئەوە درۆی کردووە.

جا هەندێك لە شوێنکەوتووانی سڵاویان لێ دەکردو دەیانووت: سڵاوت لەسەربێ ئەی (ڕێنومایییکار). جا ئەویش دەیفەرموو: بەڵێ من ڕێنومایییکارم بۆ کاری چاکە... وە ئێوەیش بەویستی خودا ڕێنومایی کراون بۆ ئەنجامدانی چاکە... بەڵام ئەگەر سڵاوتان لەمن کرد، بانگم بکەن بەناوی خۆمەوە، ئەوە سڵاوم لێ دەکات بابڵێ: سڵاوت لەسەر بێ ئەی (موحەمەد).

* * *

ئەو دوودڵییەی (موحەمەدی کوڕی حەنەفییە) زۆری نەخایاند لەو شوێنەدا کەخۆی و ئەوانەی لەگەڵیدا بوون تیایدا جێگیربوو بوون. چونکە ویستی خودا وابوو کە (حەجاجی کوڕی یوسفی سەقەفی) زاڵ بوو بەسەر (عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیر)دا. وە خەڵکی هەموو پەیمانیاندا بە (عەبدولمەلیکی کوڕی مەڕوان) ئەوجا ئەویش وەك کۆی ئەو خەڵکە نامەیەکی نووسی بۆ (عەبدولمەلیك) و تیایدا فەرمووی:

(بۆ بەندەی خودا (عەبدولمەلیکی کوڕی مەڕوان ئەمیری بڕواداران). لە (موحەمەدی کوڕی عەلی)یەوە... بەڕاستی من کە بینیم کارەکە بۆ جەنابت یەکلایی بوویەوە، وە خەڵك پەیمانیان پێ دایت، وامنیش وەك پیاوێك بەوان، پەیمانم دا بە (والی یەکەت) لە (حیجاز) وە پەیمانەکەیشم بەنووسراوی بۆ ڕەوانەکردی.

ئیتر سڵاوت لەسەر بێت.

جا کاتێك کە (عەبدولمەلیك) نامەکەی خوێندەوە بۆ هاوڕێکانی فەرمووی: ئەگەر (موحەمەد) بیویستایە لەگوێڕایەڵیمان دەرچێت، وەڕیز بەندی نێوان موسڵمانان تێك بدات، دەیتوانی ئەوە ئەنجام بدات و ئێمەیش نەماندەتوانی ڕێگەی لێ بگرین.

ئەوجا نامەیەکی بۆ نووسی و پەیمانی دایە بەدڵنیایی و سەلامەتی و پارێزراوی لە زیمەتی خوداو پەیامبەرەکەیدا، وە بەوەی کە دڵشکێن نەکرێت وە ژیانی خۆی و ئەوەی کە لەگەڵیدایە بەتاڵ نەکرێت.

جا کە ئەوەی بۆ نووسی، نامەیەکشی نووسی بۆ (حەججاج) و فەرمانی پێدابوو کەبەگەورە رایبگرێ، وەچاودێری ڕێزی بکات و، زۆر زۆر زیادەڕۆی بکات لەبەبەها گرتنیدا، بەڵام ئەوەبوو کە (موحەمەدی کوڕی حەنەفییە) لەدوای ئەوە زۆر نەژیا...

زۆری پێ نەچوو خودای بالادەست گێڕایەوە بۆ خزمەتی خۆی. ئەو رازی بە بەرنامەی خودا و پەیڕەوی کار لەژیانداو خودایش لەو رازی.

*          *          *

خودا گۆڕەکە بۆ (موحەمەدی کوڕی حەنەفییە) رووناك بکاتەوە، وە گیانی لەبەهەشتدا شاد بکات... بەڕاستی ئەو لەوانەبوو کەلەسەر زەویدا خراپەکاری و خۆبەزلزانین و لوت بەرزی نەدەویست لەنێوان خەڵکدا .

بۆ زیاتر شارەزابوون لەژیاننامەی (موحەمەدی کوڕی حەنەفییە) بڕوانە:

١- خليفة الأولياء لأبن القيم (٣٤/٣)
٢- تهذيب التهذيب: ٣٥٤/٩
٣- صفة الأخوة لأبن الجوزي: (ثبع الحلب): ٧٧/٢-٧٩
٤- الطبقات الكبرى لأبن سعد:٩١/٥
٥- الوافي بالوفيات:١٥٨٣
٦- وفيات الأعيان لأبن خلكان:١٦٩/٤
٧- الكامل: ٣٩١،٤/٣/٢٥٠
٨- شذرات الذهب:٨٩/١
٩- تهذيب الأسماء واللغات:٨٨/١-٨٩
١٠-البدء والتاريخ:٧٥/٥-٧٦
١١- المعارف لأبن قتيبة:١٢٣

# ١٩) تاوسی کوڕی کەیسان

**(چیرۆکی ژیانی لەگەڵ والیدا (موحەمەدی کوڕی یوسفی سەقەفی)**
**(هەرگیز کەسێکم نەدیووە وێنەو نموونەی تاووسی کوڕی کەیسان)**
**(عەمروی کوڕی دینار)**

## بەشی یەکەم

بە پەنجا ئەستێرە لەئەستێرەکانی رێنمایی و رووناکی بەخشین رووناکی تاووسی داپۆشی و رژا بەسەریدا...

هەر رووناکی یە لەدڵی دا...

وە رووناکی یە لە زمانی دا...

وە رووناکی یە لەنێوان دەستەکانی دا...

*　　　*　　　*

وە لەیسەر دەستی پەنجا زانا لەزاناکانی قوتابخانەی (موحەمەدیدا) پێ گەیی و دەرچوو، وە ئەو لەدامەزراوی ئیماندا وێنەیەك بوو لەهاوڕێیانی (پەیامبەری خودا) درودی خوای لەسەر بێ... وە هەروەها لەڕاستگۆیی و ... پشت هەڵکردن دا لە دونیا ویستە دونیاییەکانداو... لەخۆشەویستی دا لەبەر دەستهێنانی رەزامەندی خودا و راگەیاندنی ووتەی (حەق)دا، هەرچەند نرخی ئەو راگەیاندنە، گرانبەهاش بووبێت. وە قوتابخانەی (موحەمەدی) فێری کردبوو کە دین ئامۆژگارییە... ئامۆژگارییە بۆ پەیڕەوی لەفەرمانەکانی خوداو، پەیڕەوی لە قورئانەکەی و، شوێن پێ

هەڵگرتنی پێغەمبەرەکەی و، بەگوێ ڕایەڵی زانایانی موسڵمانان و، ئامۆژگاری کۆی گشتی موسڵمانان.

وە تاقیکارەکانی ژیانی ڕێنماییان کردبوو بۆئەو ڕاستی یەی کە چاکەو چاکەسازی هەمووی لە فەرمانڕەوای موسڵمانانەوە دەسپێدەکات... وە هەر لەلای ئەویشەوە کۆتایی دێت... جائەگەر فەرمانڕەوایان چاك بوون ئەوا خەڵکیش چاك دەبن. خۆ ئەگەر فەرمانڕەوا خراپ بوو ئەوا خەڵکیش سەر بەخراپە دەکێشن.

دەی فەرموون ئێوەو (زەکوانی کوڕی کەیسان) کە نازناوەکەی (تاووسە)[1]. وەئەو نازناوە بۆیە کراوە بەبەریدا چونکە تاووسی زانایانە... وە پێشەنگی هەموویان بووە لەچاخی خۆی دا.

*　　　　*　　　　*

(تاووسی کوڕی کەیسان) لە دانیشتوانی (یەمەن) بوو... وە سەرپەرشتیاریەتی (الولایە) (یەمەن) لەو ڕۆژگارەدا بەدەست (موحەمەدی کوڕی یوسفی سەقەفی) برای (حەججاجی کوڕی یوسف)ەوە بوو.

جا (حەججاج) ئەو برایەی ڕەوانەکرد و کردی بەسەرپەشتیار (والی) بەسەر (یەمەن)ەوە، پاش ئەوەی فەرمانڕەوایەتی فراوان بوو، وەشان و شکۆی بەهێز بوو، وە دەسەڵاتی تینی سەند، لەگەڵ زاڵبوونیدا بەسەر جموجۆڵەکەی (عەبوڵڵای کوڕی زوبەیر)دا.

وە (موحەمەدی کوڕی یوسف)یش لەناخیدا زۆرێك لەخراپەکانی (حەججاجی) برای تێدا کۆبوو بوەوە، بەڵام شتێك لەچاکەکانی پێوە دیار بوو.

*　　　　*　　　　*

[1] (الطاووس)باڵندەیەکی شێوە جوانی مل درێژی سیما ڕەنگینە، زۆرێك لە زانایان و پیاو چاکان بەناوییەوە ناو نراون.

لەسەرەتای ڕۆژێکی سارد دا لەڕۆژەکانی وەرزی (زستان) (تاووسی کوڕی کەیسان) و (وەهبی کوڕی مونەببیە)[1] چوونە سەردانی.

کاتێك لەخزمەتیا دانیشتن، (تاووس) دەستی کرد بەئامۆژگاری کردنی و هانی دەدا بۆ چاکەو، دەیترسان و ئاگاداری دەکردەوە لەسەر ئەنجامی کارەکانی، خەڵکیش لەخزمەتیا دانیشتبوون... جا (والی) بەیەکێك لەپارێزگارەکانی (حُجابە) ووت:

کوڕم (جووبەیەکی) سەوزی شایستە ئامادە بکە، وەبیدە بەسەر شانی (ئەبی عەبدوڕەحمان)دا. کابرای پارێزگار خێرا (جوبەیەکی) گران بەهای ئامادەکردو، دای بەسەر شانی (تاووس)دا. (تاووس) بەردەوام ئامۆژگاریەکانی دەدا بەگوێیدا و، لەسەرخۆ شانی دەجوولآن هەتا (جووبەکە) لەشانی کەوتە خوارەوە، جا ڕاپەری و هەستایە سەر پێ و لێیدا ڕۆشت...

(موحەمەدی کوڕی یوسف) کە ئەوەی بینی تووڕە بوونێك تووڕە بوو کە چاوەکانی سوور هەڵگەڕا و دەم و چاویشی سوور داگیرسا... بەڵام هیچی نەووت... جا کاتێك کە (تاووس) و هاوڕێکەی چوونە دەرەوەی کۆڕەکە، (وەهەب) ووتی بە (تاووس):

سوێندم بەخوا ئێمە بێ باك بووین لەتوڕە بوونەکەی، وە بەخەیاڵماندا نەدەهات... ئەگەر تووشی بەڵایەکیش ببووینایە... بەڵام تۆ چ زەرەرێکت دەکرد، ئەگەر ئەو (جوبەیەت) لێ وەربگرتایەو، پاشان بتفرۆشتایە و، بەهاکەیت (نرخەکەی) بکردایەتە خێرو دابەشت بکردایە بەسەر هەژاران و بێ دەرامەتەکاندا؟!.

(تاووس) ووتی: ئەوە وایە کەتۆ دەڵێیت ، بەڵام بەڕاست من لەوە دەترسم کەزانایان بڵێن شت لە والیەکان وەردەگرین هەروەك تاووس ، بەڵام ئیتر ئەگەر ئەوان وەریشی بگرن ناتوانن ئەوە بڵێن کە تۆ دەیڵێت .

---

[1](وهب بُنُ مُنَبِّه) شوێنکەوتوویەکی (یەمەنی) کەبەرەچەڵەك فارس بوو، شارەزای سەرگوزشتەی ئەهلی کتاب، بوو واتە ،گاور و جولەکە).



جا وەك بڵێ ی (موحەمەدی کوڕی یوسف) ویستی کە بەردەکە بهاوێژێتەوە بە ناوچاوی (تاووس)دا، واتە ڕوو بەڕووی ببێتەوە بەوشێوەی کە ئەو ڕوو بە ڕووی بوو بوەوە، هات تەڵەیەك لەتەڵەکانی بۆ نایەوە... وە پیاوێکی زیرەك و ووریاو فێڵبازی لە پیاوانی خۆی دەستنیشان کرد و پێ ی ووت:

بڕۆ ئەو (کیسەیە) بەرە بۆ (تاووسی کوڕی کەیسان)، بەهەر فرِوفێڵێك بووە کاربکەرە سەری تاوەریبگرێت... جا ئەگەر وەریگرت ئەوە پاداشتێکی زۆر باشت دەدەمەوە... وە بەرگێکی جوان و نایابت بۆ دەکەم، دەتکەمە نزیکانی خۆم...ئەوجا پیاوەکە بەخۆی و کیسەکەوە دەرچووە دەرەوە و ڕۆیشت، تا گەیشتە خزمەتی (تاووس) لەگوندێکدا کەتیایدا جێ نشین بوو، لەنزیك شاری (سەنعائدا) کە پێ ی دەوترا (ئەلجەنەد).

کاتێك ئامادەی خزمەتی بوو، سەلاوی لێکرد، وە زۆر دڵی دایەوە و نەزاکەتی نواندلە خزمەتیاو پێ ی ووت: ئەی (ئەبای عەبدوڕەحمان)، ئەوە خەرجییەکە جەنابی (ئەمیر)ناردویەتی یەتە خزمەتت. ئەویش ووتی: هیچ پێویستی یەکم پێ ی نی یە.

کابرا بەهەموو ڕێگایەك هەوڵی لەگەڵدا کە وەریبگرێت، بەلاْم ئەو هەر نکوڵی لێ کرد لەوەرگرتنی. کابرا هیچی بۆ نەمایەوە جگە لەوەی بێ ئاگایی یەکی (تاووسی) قۆستەوە... کیسەکەی هاویشتە پەنجەرەیەکی بچکۆلە کەبەتەنیشتی دیوارەکەوە بوو، ئەوجا گەڕایەوە بۆلای (ئەمیر) و ووتی:

ئەی جەنابی (ئەمیر) (تاووس) کیسەکەی وەرگرت. ئەوجا (موحەمەدی کوڕی یوسف) کە ئەوەی لێ بیست بەوە زۆر دڵخۆش بوو... وەلێ ی بێ دەنگ بوو.

ئەوجا چەند ڕۆژێك بەسەر ئەوەدا تێ پەری، دووکەسی لەپیاوەکانی ڕەوانەکرد بۆلای (تاووس) وە ئەو پیاوەیان لەگەڵدا بوو کە (کیسەکەی)بۆ برد بوو، وە فەرمانی پێ دان کە پێ ی بڵێن: بەڕاستی ئەو ڕەوانەکراوی (ئەمیر)ە بە هەڵە ئەو پارەی دابووە جەنابت ئەی (تاووس)، بەڵکو ئەوەی ڕەوانە کردبوو بۆ کەسێکی دی جگە لەتۆ... جاوا ئێمە هاتووین کەلێت وەربگرینەوە، بیبەین بۆ ئەو کەسەی کە بۆی ڕەوانەکراوە.

(تاووس) ووتی: من هیچ پارەیەکم لەسامانی (ئەمیر) وەرنەگرتووە تابۆی بگێڕمەوە. ئەوجا ئەوانیش ووتیان : بەڵێ وەرت گرتووە. (تاووس) لای کرد بەلای ئەو پیاوەوە کە (کیسەکەی) بۆ هێنابوو، وە پیێ ی ووت:

ئایا من هیچ شتێکم لەتۆ وەرگرتووە؟!.

کابرا کە ئەوەی بیست تووشی ترس و دڵەڕاوکێ بوو، وە ووتی: نەخێر ... بەڵکو پارەکەم لەپەنجەرە بچوکەکە داناوە لەکاتێکدا کەتۆ ئاگات لیێ ی نەبوو.

(تاووس) فەرمووی: دەی ئەوە ئێوەو پەنجەرەکە سەیری بکەن. ئەوانیش سەیری ناو پەنجەرەکەیان کرد، کیسە پارەکەیان وەکو خۆی بینی یەوە کە جاڵجاڵۆکە دەوریان تەنیبوو... ئەوجا پارەکەیان هەڵگرتەوە و گێڕایانەوە بۆ (ئەمیر).

*          *          *

جا وەك ئەوەی خوای باڵا ویستبێتی کە سزای (موحەمەدی کوڕی یوسف) بدات لەسەر ئەوکردارەی کە ئەنجامی دا بەرامبەر بە (تاووس)، و ئەو سزادانەش لەبەر چاوی خەڵکی دابێت. بفەرموون ئەم ڕووداوە... جا چۆن ئەوە ڕوویدا؟!.

(تاووسی کوڕی کەیسان) گێڕایەوەو ووتی:

من لە (مەککە)دا بووم بۆ جیێ بەجیێ کردنی (حەج)، (حەججاجی کوڕی یوسفی سەقەفی) ناردی بەشوێنما، کاتێك چوومە خزمەتی بەگەرمی بەخێر هاتنی کردم... وەلای خۆیەوە دایناەم... وە سەرینێکی بۆ دانام و، بانگهێشتی کردم تا لەسەری شان دا بدەم... پاشان دەستی کرد بەپرسیارکردن لێم دەربارەی خوداپەرستی (حەج) و پایەکانی و، شتی دیکە کەلیێ ی بوو بووە کێشە.

کاتێك ئێمە بەوەوە خەریك بووین. (حەججاج) گوێبیستی نزاکارێك بوو کەبەدەوری (کەعبە)دا دەگەڕا، وە دەنگی لەنزاکەیدا بەرز کردبوەوە، وە دەنگ و نزاکەی بەشێوەیەك بوو کە، دڵەکانی ڕادەچڵەکاند چۆن ڕاچڵەکاندنێك... جا (حەججاج) ووتی: دەبێت ئەو نزاکارەم بۆ ئامادەبکەن.

جا چوون هێنایانە خزمەتی، ئەویش پیێ ی ووت: ئەی پیاو لەچی هۆزێکی؟ خەڵکی کوێی؟! پیاوەکەیش ووتی: پیاوێکم لە موسڵمانان.

(حەججاج) ووتی: لەوە پرسیارت لیٚ ناکەم، بەڵکو پرسیاری ئەوەت لیٚ دەکەم خەڵکی چ وولاٚتێکی؟. ئەویش ووتی: لە خەڵکی (یەمەن)م.

(حەججاج) ووتی: کاتیٚ کە هاتی (ئەمیر)ت چۆن بەجیٚ هێشت. ئەویش ووتی: کەمن بەجێم هێشت زل و زەبەلاح و لەشێکی تێسمڕاوی هەبوو... بەرگی جوانی لەبەردا بوو... وولاٚخی سوار چاکی هەبوو... دەسەلاٚتی زۆر و خەرجی زۆری هەبوو...

(حەججاج) ووتی: لەو بارانەوە پرسیارم لیٚ نەکردی...

ئەویش ووتی: دەی کەوابوو دەربارەی چی پرسیارم لیٚ دەکەی؟.

(حەججاج) ووتی: پرسیاری هەڵسو کەوتی دەکەم لەناوتانا.

ئەویش ووتی: کە بەجێم هێشت دڵڕەق و زۆر ستەمکار بوو... گوێڕایەڵی بەدی هێنراو بوو، یاخی بوو لەبەدیهێنەر. جا لەشەرمەزاریدا لەبەرچاوی دانیشتواندا دەم و چاوی (حەججاج) سور هەڵگەڕاو، ووتی بەپیاوەکە:

چی وای لیٚ کردی کەئەوە بڵێیت دەربارەی (ئەمیر)ەکەت لەکاتێکدا تۆ دەزانی ئەو برای منە؟!. جا ئەویش ووتی: تۆ وای دەبینی کەپلەوپایەی ئەو لەلای تۆ بەرێزتر و بە بەهاترە لەپلەوپایەی من لەلای خودای بالاٚ دەست؟!. ئەو من هاتوومەتە خزمەتی ماڵەکەی میوانی ئەوم... وە پێغەمبەرەکەیم بەڕاست زانیوە... وە قەرزەکەیم داوەتەوە... جا (حەججاج) بێدەنگ بوو، وە وەلاٚمی پیٚ نەبوو.

ئەوجا (تاووس) ووتی: پاشان زۆری پیٚ نەچوو کە پیاوەکە هەستایە سەرپیٚ و، لێیدا و ڕۆیشت بەبیٚ ئەوەی کە رووخسەت بخوازیٚ، یان رووخسەت بدریٚ. منیش هەستام بەدوایدا، وە لەدڵی خۆم دا ووتم: بەڕاستی ئەو پیاوە، پیاو چاکە، جا ئەگەر بکەویت و، بی بینیتەوە و دەستت لیٚ ی گیر بێت پێش ئەوەی کە قەرەباڵغی خەڵك لە چاوەکانتی گوم بکات کارێکی باشە...

ئەوجا شوێنی کەوتم، بینیم خۆی گەیاندە (کەعبە)و خۆی هەڵواسی بەپەردەکەیدا، وە ڕوومەتی خستە سەر دیوارەکەی دەی فەرموو: خودایە پەنا بەتۆ دەگرم... وەهانا بۆ جەنابت دەهێنم ولای جەنابت خۆم حەشار دەدەم.

خودایە دڵنیایی و متمانەم بگێڕەرەوە بۆ بەخشندەییت، وە رازیبوونم بەچاودێری سەرپەرشتی خۆت. کە رزگاربوونم بیّ لە دەستی بەخیلەو رژ دەکان، وەبیّ باکیم لەوەی کەلەدەستی خۆپەرستاندایە. خودایە من داوای رزکاربوونی خێزانت لیّ دەکەم لەغەم و خەفەت... هەروەها داوای بەخشندەیی دێرینت و... نەریتە چاکەکانت ئەی ئەی پەروەردگاری جیهان.

ئینجا شەپۆلێکی خەڵکی هات و لە چاوەکانم شاردیانەوە، جا وام گومان برد کە ئیتر رێگای نی یە بۆ بینینەوەی جارێکی دی لەدوای ئەوە... کاتێك ئێوارە دەرچوون بوو لە (عەرەفە)، بینیم لەگەڵ خەڵکێدا خەریکی دەرچوون بوون بەرەو (موزدەلیفە) جا لیّ ی نزیك بوومەوە گوێبیستی بووم دەیووت:خودایە ئەگەر تۆ حەجەکەو هیلاکی و شەونخونیت لیّ وەرنەگرتووم... بیّ بەشم مەکە لەپاداشت و لەسەر موسیبەتەکەم، بەوەی کەلێت پەسەند نەکردووم.

ئینجا لەدوای ئەوە لەگەڵ خەڵکەکەدا رۆشت، وە تاریکی شەو لیّ ی شاردمەوە... جا کاتێك دڵنیابووم لە بەخزمەت نەگەیشتنەوەی ووتم: خودا نزای من و ئەویش پەسەند بکە... وەتکای منیش و ئەویش وەلاّم بدەوە و قبولّی بفەرموو... وزەی پیّ یەکانی منیش و ئەویش جێگیر بکە ئەو رۆژەی کەپیّ یەکان هەڵدەخلیسکێن و خاوەنەکانیان دەکەون بەزەوی دا... وەکۆمبکەوە لەگەڵیدا لەسەر حەوزی (کەوسەر) ئەی بەخشندەترین بەخشندەکان.

ئیتر بەیەکگەیشتنەوەیەکی دیدا لەگەڵ شوێنکەوتووی پایەبەرزدا (زەکوانی کوڕی کەیسان) کە بەناوبانگە بە (تاووسە) خودای لیّ رازی بێت... وەبەهەشت بکاتە پایەگا و جیّ نشینی

*		*		*

خودایە لەگەڵ (تاووس)دا حەشرمان بکەو لەخزمەتیا لەبەهەشتەکەتدا کۆمان بکەوە.

﴿ وەرگێڕ﴾

# تـاووسی کوڕی کەیسـان
## بەشی دووەم

**(ئامۆژگاریکار و ڕێ پیشاندەر)**

**(تۆم بینی لەخەودا ئەی (ئەبا عەبدوڕەحمان) نوێژت دەکرد لە (کەعبە)دا، وە (پەیامبەر) (ﷺ) لەسەر دەرگاکەی بوو، پێی دەفەرموویت: ڕووپۆشەکەت لابە، وە قورئان خوێنەکەت ئاشکرا بکە ئەی (تاووس).**

**(موجاهید)**

خەلیفەی موسڵمانان (سولەیمانی کوڕی عەبدولمەلیك) لەوەدا بوو کە بگاتە دەوروبەری (کەعبە) و لەوێدا جێگیرببێت... وە هەموو ئارەزوومەندییەکەوە (کەعبە)ی پایەبەرز لەباوەش بگرێت، کە لایکردەوە بەلای دەرگاوانەکەیدا و فەرمووی:

بگەڕێ بەدوای زانایەکدا و بۆمان بانگ بکە تاشارەزامان بکات لەدین، وە لەم ڕۆژە پیرۆزەدا لەڕۆژەکانی خودای بالادەستدا ئامۆژگاریمان بکات. دەرگاوان ڕۆیشت بۆ ناو موسڵمانان کەلەوێدا کۆبوبوونەوە بەمەبەستی جێ بەجێ کردنی (حەج)و کڕین و فرۆشتن، وە پرسیاری لێکردن دەربارەی داواکەی (ئەمیری بڕواداران)... ئەوانیش پێیان ووت:

ئەوە (تاوسی کوڕی کەیسان) گەورەی زانایانی چاخی خۆی... وە ڕاستگۆترینیان لەبانگەوازیدا بۆ خودا پەرستی و پەیڕەوی کردن لەئایینی خودا... فەرموو ئەوە تۆو جەنابی. دەرگاوان چووە خزمەتی (تاووس)و ووتی: ئەی جەنابی (شێخ) داوای (ئەمیری بڕواداران) ئەنجام بدە.

(تاووس)یش بەبێ هیچ کەمتەرخەمییەك دەستوبرد رووی پیشان دا. ئەوەش ئەوەبوو کەئەو باوەڕی وابوو کەپێویستە لەسەر بانگەوازکاران بۆ لای ئاینی خودای بالأدەست هەرکاتێك فرسەتێك کەوتە بەردەستیان بی قۆزنەوە... وەهەر فرسەتێکیان بۆ رێکەوت پەلەبکەن بۆ سوود لێ وەرگرتنی... وە ئەو دڵنیا بوو کە گەورەترین ووشە، ووشەیەکی حەققە، کەمەبەست پێ ی گێڕانەوەی خاوەن دەسەلأتتان بێت لەچەوتی و ناڕەواییەك... وە دوورخستنەوەیان بێت لەستەم و زۆرداری .... وە نزیکخستنەوەیان بێت لەخودای بالأدەست...

ئیتر (تاووس) دەستوبرد رێی بەڕێکرد لەگەڵ دەرگاوان دا... جا کاتێك چووە خزمەتی (ئەمیری بڕواداران) سلأوی لێکرد، (خەلیفە)ش بە جوانتر سلأوەکەی وەلأمی دایەوە... وە پێشوازییەکی گەرم و گوڕی لێکردو، لەنزیك خۆیەوە داینا.

پاشان دەستی کرد بەپرسیار لێکردنی دەربارەی ئەو شتانەی کە کێشەی هەبوو لەسەری لە بارەی خوداپەرستی یەکان و ئادابەکانی حەج، وە زۆر بەئەدەبەوە گوێی بۆ ڕاگرت.

(تاووس) ووتی:

کاتێك هەستم کرد کە (ئەمیری بڕواداران)، مەبەست و ویستەکانی بەئەنجام گەیشت و، شتێکی نەما کەلەبارەیەوە پرسیار بکات، لەدڵی خۆمدا ووتم:

بەڕاستی ئەی (تاووس)ئەم دانیشتنە، دانیشتنێکە کە خودا لەبارەیە و پرسیارت لێدەکات... پاشان رووم تێکرد و ووتم: ئەی (ئەمیری بڕواداران)، بەڕاستی (بەردێك) لەسەر دەمی بیرێکدایە لەقوولأیی دۆزەخ دایەو، دەکەوێتە ناو ئەو بیرەو حەفتا پایز (ساڵ) بەردەوام دەڕواتە خوارەوە تا دەگاتە بنی...

ئایا دەزانی خودای بالأ دەست ئەو بیرەی لە بیرەکانی دۆزەخ،بۆ کێ ئامادەکردووە ئەی جەنابی (ئەمیری بڕواداران)؟. ئەویش بەبێ هیچ بیرکردنەوەیك ووتی: نەخێر... ئینجا بەخۆی دا چووەو ووتی:

ئەی هاوار، بۆ کێی ئامادەکردووە؟!. منیش ووتم: خودای بالاّ دەست ئامادەی کردووە بۆ ئەو کەسەی کە کاروباری موسلّمانان دەگرێتە دەست و، ستەم دەکات... (سولەیمان) یەك دا چلّەکان دا چلّەکی، من وا گومانم برد کەلەگەلّی دا رۆحی دەرچێت... وە ئەوە وای لێکرد کە بگری، وە بەدەم گریانەیەکەیەوە هەنسکی هەلّدەکێشا لەوەبوو بەنی بچرێنێ... ئیتر وازم لێهێناو بەجێم هێشت و ڕۆشتم... وە ئەویش هەر داوای پاداشتی خێری بۆ دەکردم.

* * *

وە کاتێکیش کە (عومەری کوڕی عەبدولعەزیز) (جێ نشینی) گرتە دەست، ناردنی بەدوای (تاووسی کوڕی کەیسان)داو پێ ی دەووت: ئامۆژگاریم بکە ئەی (ئەبا عەبدوڕەحمان). ئەویش لەجیاتی هاتن بۆلای (ئەمیر) نامەیەکی بۆ نووسی، لەیەك دێڕدا فەرمووی:

ئەی جەنابی (ئەمیر): (ئەگەر دەتەوێت هەموو کردارت خێرو چاك بێت، خەلّکی چاك و بێ دەغەلّ بەکاربهێنە بۆ ڕاپەڕاندنی کارەکان ، ئیتر سلاّوی خودات لەسەربێ).

کاتێك (عومەر)نامەکەی خوێندەوە ووتی:

بەوە ئامۆژگاری بەسە...

بەوە ئامۆژگاری بەسە...

* * *

وە کاتێك کە (جێ نشینی) کەوتە دەستی (هیشامی کوڕی عەبدولمەلیك)، (تاووسی کوڕی کەیسان) کۆمەلّێك هەلّویستی بەناوبانگ و کاریگەری هەبوو لەگەلّی دا.

لەوانە: (هیشام) هات بۆ (کەعبە) بۆ جێ بەجێ کردنی (حەج)... جا کاتێك کەیشتە (حەرەمی کەعبە)، فەرمووی بەپیاوە تایبەتمەندەکانی لەخەلّکی (مەککە): بگەڕێن پیاوێکم لە هاوڕێیانی (پەیامبەرم) (ﷺ) بۆ بدۆزنەوەو بۆم بانگ بکەن.

ئەوانیش پێیان ووت: ئەی (ئەمیری بڕواداران) بەڕاستی هاوڕێیان یەك لەدوای یەك گەڕاونەتەوە بۆ خزمەتی پەروەردگاریان، ئێمە بزانین یەك کەسیان لەژیاندا نەماوە.

ئەوجا (ئەمیر) فەرمووی: دەی یەکێك لەشوێنکەوتووان... جا (تاووس کوڕی کەیسان)یان بانگ کردە خزمەتی. کاتێك (تاووس) چووەخزمەتی، نەعلەکانی لەتەنیشتی فەرشەکەیدا داکەند...

وەسلاوی لێکرد بەبێ ئەوەی کە بەووشەی (ئەمیری بڕواداران) بانگ بکات... وە دواندەی قسەی لەگەڵ کرد بەناوی خۆیەوە نەك بەنازناوەکەیەوە... وەدانیشت پێش ئەوەی روخسەت بدرێت بەدانیشتن... ئەو هەڵس و کەوتانە ئاگری تووڕەبوونی هەڵگیرساند لەلای (هیشام)، هەتا هەڵچوون و تووڕە بوونە کە لەچاوەکانیدا بە دەرکەوت. ئەوەش بەوەی کە ئەو بەو هەڵس و کەوتانەی خۆنواندنی بوو بەسەریدا، وە هێنانەخوارەوە بوو لەشان و شکۆی لەبەردەم ئامادەبووانی کۆڕەکەیداو دارودەستەکانیدا...

بەڵام زۆری نەخایاند کە ئەوەی بیرکەوتەوە کە ئەو لەماڵی خودای باڵادەستدایە... بۆیە بەخۆیدا چوویەوە ووتی: بە (تاووس): چی وای لێکردی ئەی (تاووس) کە ئەو هەڵس و کەوتانە ئەنجام بدەیت؟!. ئەویش فەرمووی: ئەوانە چی یە کە کردوومن؟!.

(خەلیفە) تووڕەبوون و هەڵچونەکەی خواردەوە، ووتی:

نەعلەکانت لەسەر سوچی فەرشەکەم داکەند...

وە سلاوت لیّ نەکردم بەناوی (ئەمیری بڕواداران)...

وە بەناوی خۆمەوە ناوت بردم، وە بە نازناوەکەمەوە ناوت نەبردم...

پاشان دانیشتیت بەبێ ئەوەی رووخسەت بدرێیت لەلایەن منەوە... ئەوجا (تاووس) بەهێمنی وەلامی دایەوە ووتی:

دەربارەی داکەندنی نەعلەکەم لەسەر سوچی فەرشەکەت، من رۆژی پێنج جار لەنێوان دەستەکانی پەروەردگاری باڵادەست دا دایان دەکەنم.. کەچی ئەو لۆمەم ناکات و، لێشم شلویّ نابێ... کەچی تۆ لێم شلویّ دەبیت...

وە دەربارەی ئەو ووتەیەت گوایە بەناوی (ئەمیری بڕواداران)ەوە سڵاوم لێ نەکردووی... چوونکە هەموو بڕواداران رازینین بە فەرمانڕەوایی جەنابت... جا ترسام لەوەی کە درۆزن بم لەوەدا ئەگەر بانگم بکردیتایە بە (ئەمیری بڕواداران).

وە دەربارەی ئەوەی کە بەناوی خۆتەوە بانگم کردویت، وە نازناوەکەتم بە کارنەهێناوە... لەڕاستی دا ئەوەیە خودای باڵادەست پەیامبەرانی بەناوی خۆیانەوە بانگ کردووە و، فەرموویەتی:

ئەی (داوود)... ئەی (یەحیا)... ئەی (عیسا)... وە نەیارەکانی بەنازناو ناوهێناوە و، فەرموویەتی، تَبَّتۡ يَدَآ أَبِي لَهَبٖ وَتَبَّ ۝ (المسد ايه (١) .

واتە: لەناو چوو هەردوو دەستی (ئەبی لەهەب) وە دیسان تیاچوو... وە دەربارەی ئەو ووتەیەت کە گوایە من دانیشتووم پێش ئەوەی تۆ رووخسەتم بدەیت... بەڕاستی من لە (ئەمیری بڕواداران) (عەلی کوڕی ئەبی تالب)م بیستووە فەرموویەتی:

(ئەگەر دەتەوێت کە بڕوانیت بۆ پیاوێك لەخەڵکی دۆزەخ، بڕوانە بۆ پیاوێك خۆی دانیشتووە، وە بەدەوریدا و لە نێوان دوو دەستیدا کۆمەڵێك دەستەونەزەر بەپێوە وەستاون).

جا منیش پێم ناخۆش بوو تۆ ئەو پیاوە بیت کەلە ئەهلی دۆزەخ... کە (هیشام) گوێبیستی ئەوە بوو، لە شەرمەزاریدا رووی لەزەوی کردو .... دوایی سەری بەرزکردەوە و ووتی: ئامۆژگاریم بکە ئەی (ئەبا عەبدوڕەحمان).

ئەویش فەرمووی: گوێ رابگرە ئەی جەنابی (ئەمیر): بەڕاستی من بیستوومە لە (عەلی کوڕی ئەبی تالب) کە دەیفەرموو: (بەڕاستی لەدۆزەخ دا ماری تێدایە لەئەستوری تێ سمڕاویدا وەك کۆڵەکەیەکی (عمود) زەبەلاح... وە دووپشکی وەك ئێمستر... ئەو فەرمانڕەوایە دەگەزن کەدادوەر نی یە لەگەڵ ژێر دەستەکانیدا. واتە لەگەڵ خەڵکەکەیدا.

پاشان هەستاو لێ ی دا ڕۆیشت.

*			*			*

وە (تاووس) هەروەك سەردان و هاتوچۆی هەندێ لەخاوەن دەستەڵاتانی کردووە بەمەبەستی بەئاگا هێنانەوە و رێنمایی کردنیان... دووریش کەوتەوە و پشتی لەهەندێکی دیکەیانی کردووە بەمەبەستی تەمێ کردنیان و سوکایەتی پێ کردنیان...

کوڕەکەی گێڕایەوە ووتی:

ساڵێکیان لەگەڵ باوکم دا چووین بۆ جێ بەجێ کردنی (حەج) لە (یەمەن)ەوە، جا لەهەندێ شاردا لاماندا کە لەژێر دەستی فەرمانبەرێکدا بوو پێ ی دەوترا (کوڕی نەجیح)... کەلە خراپترین فەرمانبەرەکان بوو، وە لەزۆربەیان زیاتر لەدەربوو لەڕاستی و ڕەواکاری و، ڕۆچوو بوو لەناڕەواییدا...

ئێمەش چووینە مزگەوتی شارەکە بەمەبەستمان جێ بەجێ کردنی نوێژی فەرز بوو، ئالەو کاتەدا (کوڕی نەجیح)زانیبووی بەهاتنی باوکم، کاتێکم زانی هات بۆ مزگەوتەکەو، سڵاوی لەباوکم کرد و لەبەر دەستی دانیشت... بەڵام باوکم هیچ گوێی پێ نەدا و، وەڵامی سڵاوەکەی نەدایەوە و، پشتی تێکرد... ئەو جا لەلای ڕاستەوە ڕوویکردە باوکم و دوواندی، بەڵام ئەو دیسان ڕووی لێ وەرگێڕا... ئەوجا لای کرد بەلای چەپی باوکمەوە و دیسان دوواندی، بەڵام ئەو هەر ڕووی تێ نەکرد و... دیسان ڕووی لێ وەرگێڕا...

کاتێك کە ئەوم بینی، هەستام و چوومە خزمەتی، وە دەستم بۆ درێژکردوو، سڵاوم لێ کردوو، ووتم پێ ی: ئەی جەناب دڵنیابە باوکم نەیناسیویت... ئەویش ووتی: بەڵێ بێ گومان بە باوکت دەمناسێ... وە دڵنیابە ئەوەی کردی لەگەڵما ئەوە ئەوە ئەنجامی ناسینمە... پاشان بێ دەنگ بوو لێ ی دا ڕۆشت و هیچ شتێکی نەوت.

کاتێك گەشتینەماڵەوە باوکم لایکرد بەلامەوە و ووتی: ئەی نەفام... لە پاش ملە بە زمانە درێژەکەت ئەوانە زەم دەکەیت و بەخراپە باسیان دەکەیت و، کاتێکیش ئامادەبوون و لەگەڵیانبوویت بەو پەڕی ملکەچی و ریسوایی یەوە لەگەڵیان دەدوێیت!!.. ئایا دوو لاووی جگە لەوە زیاتر هەیە؟!.



وه (تاووسی کوڕی کەیسان) سروشتی وابوو، ئامۆژگاریەکانی تایبەتی نەدەکرد بە (جیّ نشینەکان) و (فەرمانبەران) وه، بەڵکو ئامۆژگاری هەموو ئەوانەی دەکرد کە پێویستیان بە ئامۆژگاری ئەو ببوایە وه، ئارەزوومەندی گوێبیستنی بوون... ئیتر هەر کەس بووناية و لەهەرچین و توێژێك بوونایە.

لەنموونەی ئەوەی، (عەتاری کوڕی ئەبی ڕەبباح) گێڕاویەوه ووتی: (تاووس) لە هەڵوێستێکدا منی بینی پیّ ی خۆش نەبوو، فەرمووی: ئەی (عەتا)، دەستم بەدامانت نەکەی پێویستی یەکانت بەرزبکەیتەوه بۆلای کەسێك کە دەرگای بەرووتا دادەخات... وه دەرگاوانەکانی لەبەر دەرگا دەوەستێت تاتۆ نەبینێت... بەڵکو هەمیشە داواکانت روو بەرووی کەسێك بکەوه... کە دەست و برد دەرگات لیّ دەکاتەوه... وه خۆی داوات لیّ دەکات بەوەی کە پێویستی یەکانی لیّ داوابکەی... وه پەیمانت دەداتیّ بەوەلاّم دانەوەو بەدەمەوه هاتنت...

* * *

وه ئەوەتە دەڵێت بە کوڕەکەی:

ئەی کوڕم خۆم، هاوڕێیەتی هۆشمەندان بکە دەدرێیتە پالّ ئەوان، ئەگەر یەکێك لەوانیش نەبی... وه دەستم بەدامانت هاوڕێیەتی نەفامان مەکە، چونکە دڵنیابە ئەگەر هاوڕێیەتیان بکەیت دەدرێیتە پالّ ئەوان، خۆ ئەگەر لەوانیش نەبی...

وه مەبەستیش لەمرۆڤ تەواوی دینەکەی و، بیّ کەم و کوڕی رەوشتی یەتی. جا (عەبدوڵلاّ کوڕی) گەشەو نەشونمای کرد لەسەر ئەو شێوەو شێوازەی کەباوکی پەروەردەی کرد، وه هەمان رەوشتی ئەوی پەیڕەو کرد، وەلەسەر رچەو رێبازەکەی ئەو رێی بەرێکرد لەژیانیدا...

لەنموونەی ئەوه، خەلیفەی عەبباسی (ئەبا جەعفەری مەنسوور) جارێکیان (عەبدوڵلاّی کوڕی تاووس) و (مالیکی کوڕی ئەنەس)[1] بانگهێشت دەکات بۆ سەردانی، جا کاتێك چوونە خزمەتی، وه لەکۆڕەکەیدا دانیشتن، (خەلیفە) لایکرد بەلای (عەبدوڵلاّی کوڕی تاووس)ەوه ووتی:

---

[1] (مالیك) یەکێك بوو لە شوێنکەوتووان وه زانایەك بووه لەزاناکانی و خاوەنی رچەی مەلیك بووه.

شتێکم لەوە بۆ بگێڕەوە کە لە باوکت گوێبیستی بووی، ئەویش ووتی: (باوکم قسەی بۆ کردم فەرمووی: سزادارترین کەس لەخەڵکی لەڕۆژی ڕەستاخێزدا پیاوێکە کە خودای باڵادەست بۆی برەخسێنێ ببێتە فەرمانڕەوای موسڵمانان، جا لە فەرمانڕەواییەکەیدا ستەم ئەنجام بدات).

(مالیکی کوڕی ئەنەس) فەرمووی: کاتێك کە ئەو ووتەیەم لێ بیست، بەرگەکانی بەرم کۆکردەوە لەترسی ئەوەی نەوەك هەندێ لەخوێنەکەیم بەربکەوێ... چونکە ووتم هەر ئیستا دەیکوژێت... بەڵام (ئەبا جەعفەر) کاتژمێرێك هەڵوێستەی کردوو، هیچ قسەی نەکرد. پاشان ئێمەیش بەسەلامەتی لێمان دا ڕۆشتین.

* * *

تەمەنی (تاووسی کوڕی کەیسان) درێژەی کێشا تاگەیشتە سەد ساڵ، بەڵکو لەوەش تێ پەڕی... بەڵام لەگەڵ ئەو بەتەمەنی و پیریەتیەیدا لە ڕووناکی بیر و هۆشی دا وەڵامدانەوەی هیچ کەمی نەکردبوو.

(عەبدوڵڵای شامی) ووتی:

چوومە خزمەتی (تاووس) لەماڵەکەی خۆیدا، تا زانست و زانیاری لێ وەربگرم، واتە لێوەی فێر ببم، وە من پێش ئەوە نەمدەناسی... کاتێك دام لەدەرگاکە، پیاوێکی زانای بەتەمەن هات دەرگاکەی لێکردمەوە، منیش سڵاوم لێ کردو ووتم: ئایا جەنابتی تاووسی کوڕی کەیسان؟.

ئەویش فەرمووی: نەخێر من کوڕی ئەوم... ئەوجا منیش ووتم: جا ئەگەر جەنابت کوڕی ئەوبی، بێگومان ئێستا ئەو زانایەکی بەساڵا چووەو، پیر بووە، بیر و هۆشی لەئەنجامی پیریەتی تێك چووە، وە بەڕاستی منیش لەشوێنی دوورەوە هاتووم بەمەبەستی ئەوەی لە زانست و زانیارییەکانی سوودمەند ببم... بەڵام دیارە مەبەستەکەم نەهاتە جێ...

کوڕەکەش فەرمووی: ئەی هاوار بۆ تۆ... ئەوە چی دەڵێیت؟. دڵنیابە لەبەر بووان و شارەزایانی قورئان هەرگیز هۆش و بیریان تێك ناچێ... فەرمووی بچۆرە خزمەتی... منیش چوومە خزمەتی و سڵاوم لێکردوو ووتم:

لە ڕاستیدا من هاتوومەتە خزمەتت بەمەبەستی فێربوون و سوودمەندبوون لەزانست و ئامۆژگاریەکانت. ئەویش فەرمووی: پرسیار بکە و داواکانت بەکورتی..

منیش عەرزم کرد: ئەوەندەی ویستی خودای لەسەر بێ کورتی دەکەمەو... جا فەرمووی: دەتەوێت پوختەی ئەوەی کە هەیە لە (تەورات)و (زەبور)و ئینجیل)و (قورئان)دا بۆت کۆبکەمەوە؟.

منیش عەرزم کرد: بەڵێ...

ئەویش فەرمووی: لەخودای بالاّ دەست بترسە، ترسێك وابێت لە هیچ شوێنێك و کاتێك دا شتێکی دیکە نەبێ جگە لەوەی کە تۆ لێ ی بترسی. وەهیوا و ئومێدت پێ ی هەبێت زیاتر لەترست لێ ی... وەئەوەی کەپێت خۆشە بۆ خۆت بۆ خەڵکیش پێت خۆش بێت...

لە شەوی دەیەمی (زیلحیجە)دا ساڵی سەدو شەشی کۆچی، زانای خودا ناس (تاووسی کوڕی کەیسان) لەگەڵ حاجیاندا (عەرەفات)وە بەرەو (موزدەلیفە)بەرێکەوتن لە چل هەمین جاریدا. جا کاتێك لەسەر زەوی پیرۆزی (موزدەلیفە)دا. لایان داو کاروانیان خست، نوێژی ئێوارەی لەگەڵ نوێژی خەوتندا بەکۆکراوەیی ئەنجامدا... وە لەسەر زەوی پاڵکەوت، بەمەبەستی ئەوەی شتێك بحەوێتەوە و شەکەتی دەرچێت... ئالەوکاتەدا فریشتەی گیانکێشان بەرەو بارەگای پەروەردگاری بەرێ کرد...

وەدەستەملانی کاروانی مەرگ بوو دوور لەخاوو خێزان و کەس و کارو نیشتمان ، بەلاّم نزیك لەخودای بالاّدەستەوە... بە ئیحرامەوە ولەکاتی وەلاّمدانەوەی پەروەردگاری دا (لَبيْكَ اللّهمَّ لَبيْيك) بەئومێد و هیوای پاداشت... وە بە بەویست و بەخشندەیی خودا لەگوناهە کانی پاکبوەتەوە، وەك ئەو ڕۆژەی لەدایك بووە... کاتێك بەرەبەیان هەڵهات و دونیا ڕووناکبویەوە، وە ویستیان بینێژن. نەیتوانی تەرمەکەی لەنێو قەرەباڵغی و کۆبونەوەی خەڵکی لەسەری دەرکەن.

جا بۆیە (ئەمیری مەککە) پاسەوانانی ڕەوانەکرد تا خەڵکەکە لەتەرمەکەی دوور بخەنەوە تا بتوانرێ بنێژرێ... خەڵکێکی زۆر کەتەنها مەگەر خودا ژمارەیانی زانیبێت

نوێژیان لەسەر کرد... وە لەوانەی کە لەناو نوێژکەران دا بوو خەلیفەی موسڵمانان... (هیشامی کوڕی عەبدولمەلیك) بوو.

خوایە گیان وەك (تاووسی کوڕی کەیسان) بمانکا بەئەندامی خێر لەکۆمەڵگادا وە هەمان هەڵوێستی ئەو زاتەمان پێ ڕەوابببینە.

﴿ وەرگێڕ﴾

بۆ زیاتر شارەزابوون لەژیانی (تاووسی کوڕی کەیسان) بڕوانە:


١- الطبقات الكبرى لأبن سعد: ٥/٥٣٧
٢- طبقات خليفة بن خياط: ٢٨٣
٣- تأريخ خليفة بن خياط: ٢٣٦
٤- التأريخ الكبير: ٤/٣٦٥
٥- تأريخ الفسوي: ١/٧٠٥
٦- الجرح والتعديل: ٤/٥٠٠
٧- حلية الأولياء: ٤/٣،٢٣٠
٨- طبقات الفقهاء للشيرازي: ٧٣

# ٢٠ )قاسمی کوڕی موحەمەدی کوڕی ئەبی بەکر

**(ئەگەر شتێك لەدەسەلاتم هەبووایە کاروبارم بەدەست بوایە (قاسمی کوڕی موحەمەدم) دەکردە (جێ نشین) (خلیفە)**

**(عومەری کوڕی عەبدولعەزیز)**

ئایا دەنگوباس و هەواڵی شوێنکەوتووی پایەبەرزی پێ گەیشتووە؟. بەڕاستی ئەو لاوێکە پایەبەرزی و ڕێزی لەهەموو لایەکەوە کۆ کردۆتەوە، تا دەتوانین بڵێین لەپایەبەرزی و ڕێز هیچی لەکیس نەچووە...

ئەوەتە باوکی (موحەمەدی کوڕی ئەبی بەکری سیددیقە)... وە دایکی کچی کیسرا (یەزدەجوردە) کۆتا پادشای (قودس)... وە پوری لەباوکی یەوە (عائیشەی دایکی بڕوادارانە)... ئەو لەسەر و هەموو ئەوانەوە سەری تاج گوزاری کردووە بەتاجی خۆپارێزی و خودا پەرستی و زانست.

ئایا بەبیرتا دێت لەسەرو ئەو پایەبەرزی و ڕێزەوە، پایەبەرزی و ڕێزێکی دی هەبێت کەکێ بەرکێکەران کێ بەرکێی لەسەر بکەن؟. دەی فەرموون ئەوە ئێوەو (قاسمی کوڕی موحەمەدی کوڕی ئەبی بەکری سیددیق).

یەکێك لە حەوت[1] زاناکان وشەرع زانایانی شاری (مەدینە)و... وە پایەدارترین و گەورەترینی خەڵکی ڕۆژگاری خۆی لەزانستدا... وە بیرتیژترینیان و... وەلە هەموویان خۆپارێزتر و خودا ناستر... جا فەرموون دەستبکەین بە چیرۆکی ژیاننامەی لەسەرەتایەوە...

(قاسمی کوڕی موحەمەد) لەدایك بوو لەکۆتایی جێ نشینی (عوسمانی کوڕی عەففان) خودای بالاّ دەست لیّ ی رازی بێت... بەلاّم ئەو کوڕپەلە بچکۆلەیە هێشتا لە هێلانەکەیدا نەجوولاّبوو، کە بارەشێکی کاولکاری گێژاوەهێنەر هەڵیکردە سەر وولاّتی موسڵمانان...

وەجیّ نشینی خوداپەرستی دونیانەویست (عوسمانی کوڕی عەففان) کە پشتی نەویکردبوو بەسەر قورئان دا، دەیخوێندەوە شەهید کرا. وە ئاکۆکیەکی گەورە بەرپا بوو لەنێوان ئەمیری بڕواداران دا (عەلی کوڕی ئەبی تالب) و (موعاوییەی کوڕی ئەبی سوفیان)دا لە وولاّتی (شام)... وەلە زنجیرەیەکی دڵتەزێنی ترسناك دا لەرووداوی یەك لەدوای یەك دا... کۆرپەبچکۆلەکە خۆی بینیەوە لەگەڵ خوشکەکەیدا گوێزرایەوە لەشاری (مەدینە) وە بۆ (میسر)... چونکە وای پێویست دەکردلەسەریان کە بگەنەوە خزمەتی باوکیان، پاش ئەوەی باوکیان کرایە والی (میسر) لەلایەن ئەمیری بڕوادارانەوە (عەلی کوڕی ئەبی تالب)ەوە. پاشان بینی نینۆکی ئاژاوە گێڕانی سوور بەخوێن، گەیشتە باوکی و، کوشتیان بەناشیرینترین شێوەی کوشتنی.

لەدوای ئەوە کۆرپەکە، جارێکی تر خۆی بینیەوە گوێزرایەوە لە (میسر)ەوە بۆ شاری (مەدینە)، پاش ئەوەی کە هاوکارانی (موعاویە) دەستیانگرت بەسەریدا... وە ئەویش بوویە ئەو منداڵەی کە نەدایك و نەباوکی هەبوو...

* * *

(قاسم) خۆی ئەو کاروانی پڕ لەئێش و ئازارە دەگێڕێتەوە، لەگەڵ ئەوەی کە بەدوای ئەوەدا دێت و، ووتی: کاتێك باوکم لە (میسر) کوژرا، مامم (عەبدو رەحمانی کوڕی ئەبی بەکر)، هات بۆ ئەویّ، وەمن خوشکە بچکۆلەکەمی هەڵگرت و... هێناینیەوە بۆ

---

[1] فقهاء السبعة: (سەعیدی کوڕی موسەییب)، (عومەری کوڕی زوبەیر)، (ئەبوبەکری کوڕی عەبدورەحمانی مەخزومی)، (خاریجەی کوڕی زەید)، (سولەیمانی کوڕی یەسار)، (عوبەیدوڵڵای کوڕی عوبەیدوڵڵای کوڕی عوقبە)، (قاسمی کوڕی موحەمەدی کوڕی ئەبی بەکر).

(مەدینە). جا هەر ئەوەندەی کە گەیشتینەوە (مەدینە)، (عائیشە)ی پورمان ڕەزاو ڕەحمەتی خوای لەسەر بیّ ناردی بەشوێنمان دا، جا ئەو کەسەی ئەو نارد بووی هەڵیگرتین و گواستینی یەوە لەماڵی مامانەوە بۆ ماڵی پورم... وە ئیتر پورم لەباوەشی خۆیدا پەروەردەی کردین. هەرگیزباوك و دایکێکم نەدیبوو کەلەو زیاتر چاکترو دڵسۆزتر بووبێتن... وەنە لەو زیاتر خاوەن سۆز و میهرەبانی بووبێتن... بەدەستە پیرۆزەکانی خۆی خواردنی دەرخواردمان دەدان وە لەگەڵمان خواردنی ئەوە دەخوارد... جا ئەگەر شتێك لەخۆراکەکەی ئێمە بمایەتەوە دەیخوارد. وەسۆز وبەزەیی و میهربانی خۆی ئاوێزانی ئێمە دەکرد، هەروەك سۆزو میهرەبانی دایکێکی شیردەر لەکاتی شیرپێدانی منداڵە شیرەخۆرەکەیدا... لەش و لارو جل وبەرگی بۆ دەشۆردین... قژی بۆ شانە دەکردین... وە بەرگی سپی جوانی لەبەردەکردین. وەهەمیشە هانی دەداین لەسەرچاکەکردن و، ڕایدەهێناین لەسەر ئەنجامدانی... وەبەرگری لیّ دەکردین لەخراپە و، هەوڵی دەدا لەگەڵمان کەلیّ ی دووربکەینەوە ونزیکی نەکەوین. وەسوور بوو لەسەر ئەوەی ئەوەندەی کەلەتوانامان دا بێت لەقورئانی پیرۆزمان پیّ بڵێت...

وەئەوەی کەلە ئاستی ژیری و تێگەیشتنی ئێمە دا بوو لەفەرموودەکانی (پێغەمبەر)ی خودا (ﷺ)بۆ دەگێڕاینەوە و فێری دەکردین. وە زیاتر و زیاتر پورمان لەدوو چەژنەکەدا (ڕەمەزان وقوربان) چاکتر بوو لەگەڵمان و دیاری بۆ ئامادە دەکردین وبەرگی جوان و ڕازاوەی لەبەر دەکردین. جا کە ئێوارەی (عەرەفە)دا دەهات قژی بۆمن دەتاشی، وە من و خوشکمی جوان دەشۆرد...

جا کە ڕۆژ دەبووەوە جلی جوان و تازەی لەبەر دەکردین و... ئەوجا ڕەوانەی دەکردین بۆ مزگەوت بۆ ئەنجامدانی نوێژی جەژن جا کاتێك دەگەڕاینەوە من خوشکەکەمی لەباوەشی دەناو لەبەردەمماندا قوربانی بۆ دەکردین.

* * *

وە ڕۆژێك جلی سپی جوان لەبەرکردین و، پاشان من لەسەر ڕانێکی داناو... خوشکەکەشمی لەسەر ڕانەکەی تری. ئەوجا (عەبدوڕەحمان)ی مامی بانگ کرد... کاتێك مامم هاتە خزمەتی سلاوی لێکرد، ئەویش بەخێری هێناو، پاشان دەستی بەقسەکرد: سوپاس و ستایشی خودای بالاّ دەستی کرد بەوەی کە شایانی شان و شکۆی ئەوبێت جا من هەرگیز بگۆیەکم (ووتاربێژێکم) نەدیبوو نەلە پیاو

ونەلەئافرەت، نەلە پێش ئەودا نە لەدوای ئەوەوە، کەلەو ڕەوانبێژتر بووبێت... وەنەلەو گوفتار شیرینتر بووبێت...

پاشان ووتی: ئەی برام...

من بێگومان تا ئێستا دەتبینم لەمن دوورە پەرێزیت و لێم شلوێیت لەوکاتەوە کە ئەو دوو منداڵەم لێ وەرگتوویت و گرتوومنەتە لای خۆم... سوێند بەخوا ئەوەم بۆ ئەوە نەکردوە کەخۆم بەسەرتا بنوێنم... یان گومانی خراپم پێت هەبێ... یان تۆمەتبارت بکەم بەوەی کە کەمتەرخەمیان بەرامبەر دەکەیت... بەڵام ئەوەندەبووە تۆ پیاوێکی فرەژن بوویت. وە ئەوانیش دوو منداڵی ساوابوون کەخۆیان نەیاندەتوانی خزمەتی خۆیان بکەن. جا لەوە ترسام کە خێزانەکانت پیس و چەپەڵیان پێوە ببینن و بەلایانەوە خۆش نەبێت و نەتوانن خزمەتیان بکەن. جا منیش وەك پوریان خۆم بەڕەواتر زانی کەلەو حاڵەتەدا بەخەمیان بکەم. وە سوپاس بۆ خودا وائێستا گەورە بوون، وە وایان لێهاتووە کە خۆیان بەخەم بکەن و بەکاروباری خۆیاندا بگەن... دەی فەرموو وەریانگرەوە و، بیانبەرەوە بۆلای خۆت. ئیتر مامم (عەبدو ڕەحمان)، بردینیەوە بۆماڵی خۆی.

* * *

بەڵام لەراستیدا (نەوەی بەکری) بەردەوام دڵی وابەستە بوو بەماڵی پوریەوە (دایکی بڕواداران) خوا لێ ی رازی بێت... چونکە لەسەر خاکی بۆنداری ماڵەکەی ئەو کە بۆنخۆش بوو بەبۆنی خۆشی پێغەمبەرایەتی گەشەی کرد بوو... وەلە باوەشی خاوەنی ئەو خانووە دا پەروەردە و نەشونمای کردبوو... وە لە سۆزی هەڵقوڵاوی ئەو تێر ئاو بووبوو. جابۆیە ساتەوەختەکانی خۆی دا بەشدەکرد لەنێوان ماڵی پورو مامی دا.

وە بەردەوام یادەوەریەکانی ماڵە بۆنخۆشە درەوشاوەکەی پووری لەبیر و هۆش و ناخی دا دەبووژایەوە و دەهاتنەوە یادی تاکۆتایی ژیانی... جا فەرموو گوێڕاگرە بۆ هەندێ لەگفتوگۆکانی دەربارەی ئەو یادەوەریانەی کە دەفەرمووێت:

ڕۆژێکیان ووتم بەپوورم (عائیشە) خودا لێ ی رازی بێت: دایە گیان، گۆڕی پێغەمبەرم سەلات و سەلامی خوای لەسەر بێ پیشان بدە لەگەڵ گۆڕی دوو هاوڕێکەیدا... بەڕاستی زۆر حەز دەکەم بیانبینم. وە ئەو کاتە هەرسێ گۆڕەکە هەر

لەناو ناو ماڵەکەی عائیشە دا بوون، وە داپۆشیبوون بەشتێك کەلە بەر چاو نەبن... جا پوورم دڵی نەشکاندم... پەردەی لەسەر هەرسێ گۆڕەکە لادا بۆم کەبینیمن، سەیرم کرد نەزۆر بەرز بوون و نەنزم بوون.. وە بە ووردە چەوەی سووربا‌و کە لەدەوروبەری مزگەوتەکەدا هەبوو سەرگۆڕەکان داپۆشرابوو.

منیش ووتم: لەکوێدایە گۆڕی پێغەمبەری خودا دروودی خوای لەسەر بێ؟. ئەویش بەدەستی ئاماژەی کردوو فەرمووی: ئەوەتا ئینجا بینیم دوو دڵۆپ فرمێسکی گەورە بەسەر ڕوومەتەکانیدا ڕژان... ئەویش دەستو برد سڕینی هەتا من نەیانبینم نەبایە دڵتەنگ ببم. وە گۆڕی (پێغەمبەر) دروودی خوای لەسەر بێ لەپێش گۆڕی هەردوو هاوڕێکەیەوە بوو. جا ووتم: ئەی گۆڕی بابە گەورەم (ئەبو بەکر) لەکوێ دایە؟.

ئەویش ووتی: ئا ئەوەیە، بینیم نێژرابوو لەلای سەری پێغەمبەرەوە دروودی خوای لەسەر بێ. ئەوجا ووتم: ئەوە گۆڕی (عومەرە)؟.

ئەویش ووتی: بەڵێ. جا بینیم سەری (عومەر) ڕەزای خوای لەسەر بێ لەلای ناوقەدی بابەگەورەمەوە بوو، نزیك لەقاچی (پێغەمبەر)ەوە دروودی خوای لەسەر بێ.

* * *

وە کاتێك کە نەوەی (بەکر)ی گەیشتە قۆناغی لاوییەتی، قورئانی پیرۆزی لەبەر کرد... وە لەپووریەوە (عائیشە) ئەوەی ویستی خودای لەسەر بوو لە فەرموودەی پیرۆزی (پێغەمبەری خودا) دروودی خوای لەسەر بێ فێر بوو. پاشان ڕوویکردە مزگەوتی پیرۆزی (پێغەمبەر) درووودی خوای لەسەر بێ، وەخۆی یەکلاکردەوە بۆ ئامادەبوونی ئەو بازنە زانستیانەی کەبڵاوبوونەوە لە هەموو سوچێکدا لەسوچەکانیدا، وەك بڵاوبوونەوەی ئەستێرە درەوشاوەکان لەسەر ڕووی ئاسمان... فەرموودەی گێڕاوەتەوە لە (ئەبی هورەیرەوە) و (عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە) و (عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس) و (عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیرەوە)... (عەبدوڵڵای کوڕی جەعفەر) و، (عەبدوڵڵای کوڕی خەبباب) و، (ڕافیعی کوڕی خەدیج) و، (ئەسلەمە مەولای کوڕی خەتاب) و، گەلێکی دی لەهاوڕێیانی پایەبەرز... هەتا بوویە پێشەوایەکی بڕیاردەر (إماماً مُجْتَهِداً).

وە بوویە یەکێك لەشارەزاترینی زانایانی ساتەکانی خۆی لەزانستی (سوننەتدا)، واتە دیاریکردنی ئەوەی کە دروستە لەفەرموودەکانی (پێغەمبەر)ی خودا دروودی خوای لەسەر بێ. وەلەلای ئەوان پیاوی زانا بەزانا نەدەژمێررا هەتا بەتەواوی و پوختەیی لە (سوننەت)دا شارەزا نەبووایە...

کاتێك (لاوی بەکری) پێویستیەکانی زانست و زانیاری تەواوکرد، خەڵکی روویان تێکرد، کەلەخزمەتیا بە ئارەزوومەندییەوە زانست فێر بن... وە ئەویش بە ئارەزوومەنییەوە رووی لەوان دەکرد، بەوپەڕی دەستکراوەیی و رووی گەشەوە فێری زانست و زانیاری دەکردن...وە هەموو ڕۆژێك سەر لەبەیانی لە کاتێکی دیاریکراودا کەلێ ی لانەدەدا، ئامادەی مزگەوتی (پێغەمبەر)ی خودا دەبوو (ﷺ)... جا دووركاتی نوێژی سلاوی مزگەوتی دەکرد... ئەوجا دادەنیشت لەشوێنێکدا لەبەردەم (خەوخەی[1] عومەر)دا لەرەوزەی پیرۆزدا لەنێوان گۆڕی (پێغەمبەر) دروودی خودای لەسەر بێ و (مینبەرەکەیدا)[2]... ئەوجا فێرخوازانی زانست لەخزمەتیا کۆدەبوونەوە لەهەموو شوێنێکەوە... وەلە سەرچاوە سازگارو بێ گەردەکانی ناخە تینووەکانیان تێر ئاودەکرد، واتە ئەوی ئارەزوویان لێ ی هەبووایە لە زانست و زانیاری وپێ دڵ ئارام ببونایە لێیان وەردەگرت.

وە زۆری نەخایەند کە (قاسمی کوڕی موحەممەد) و پورزاکەی (سالمی کوڕی عەبدوڵلای کوڕی عومەر) بوونە دوو پێشەوای (إمامی) شاری (مەدینە) و باوەڕپێکراو جێ ی متمانەی خەڵکی...

وە دوو گەورەی گوێ لێگیراو، دوو پیاوی فەرمانڕەوای ئەوشارە... لەگەڵ ئەوشدا کە ئەم دوو پیاوە فەرمانڕەوایی و دەسەڵاتی یاساییان لەدەستدا نەبوو... کەچی

---

[1] الخَوْخَة: پەنجەرەیەکی بچووکە لەماڵدا کەرووناکی لێوە دێتە ژوورەوە، یاخود دەلاقەیەکە لەدەرگای گەورەدا.

[2] بَیْنَ قبر النبيَّ ومِنْبره: شوێنێکی پیرۆزە (پیغەمبەر) (ﷺ) دەفەرمووێت: (نێوان ماڵەکەم و مینبەرەکەم باخێکە لەباخەکانی بەهەشت) لەئەنجام دا ماڵەکەی بوویە گۆڕەکەی.

خەڵکی لەبەر خۆپاریزی و (التُّقی) خوداپەرەستی و... زانست و شارەزاییان لە بڕیارە شەرعی یەکاندا کردبوونیانە فەرمانڕەوا بەسەر خۆیانەوە... وەئەگەر زیاتر لەلای خەڵکی خۆشەویستی کردبوون و جوانی پێ بەخشیبوون ئەوە بوو کە چاویان لەوە نەبوو کە لەدەستی خەڵکی دا بوو، بەڵکو تەنها بە تەنها ئارەزوومەندی ئەوەبوون کەلەلای خودای بالاّ دەست بوو...

* * *

وە ئەوەی زیاتر پلەو پایەی ئەو دووانەی لەناخی خەڵکی دا جێگیر کردبوو، ئەوە بوو کە خەلیفە و والی یەکانی بەنی (ئومەیە) هیچ کارێکیان لەکاروباری شاری (مەدینە) بڕیار نەدەدا و ئەنجامیان نەدەدا بە رای ئەوان نەبووایە. نموونەی ئەوە، ئەوەبوو، کە (وەلیدی کوڕی عەبدولمەلیك) بڕیاری کۆتایی دا لەسەر فراوانکردنی (مزگەوتی پیرۆزی پێغەمبەر) (ﷺ) وە ئەوەش لەتوانایدا نەبوو کە ئەو ئاواتە بەرزو بڵندە بەئەنجام بگەیەنێت جگە بەرووخاندنی مزگەوتە کۆنەکە لەهەرچوار لایەوە... وە لابردنی ماڵی خێزانەکانی (پێغەمبەر) (ﷺ)و، خستنە سەر زەمینی مزگەوتەکە. کە ئەوەش لەلای خەڵکی کاروبارێکی زۆر گران بوو... وە پێ ی دڵخۆش نەبوون... (خەلیفە) نامەیەکی نووسی بۆ (عومەری کوڕی عەبدولعەزیز) کە والی شاری (مەدینە) بوو کە تیایدا دەفەرمووێت:

وای دەبینم، وە وای بەباش دەزانم کە (مزگەوتی پێغەمبەری خودا) دروودی خوای لەسەر بێ فراوان بکەم تا ببێتە دووسەد باڵ بە دووسەد باڵ. هەرچوار دیوارەکەی بڕوخێنە، وە ژووری خێزانەکانی (پێغەمبەر) دروودی خوای لەسەر بێ بخەرەسەر مزگەوتەکە... وە هەرچی خانوویەك لەچوار دەوریدا هەیە بیکڕە... وە ئەوەندەی لەتوانادا هەیە رووگە (قیبلە) پێش بخە. وە من دڵنیام کە تۆ دەتوانیت ئەوە بەئەنجام بگەیەنیت لەبەر پلەو پایەی خاڵەکانت کە لە خانەوادەی خەتابن لەدڵی خەڵکی دا.

جا ئەگەر خەڵکی (مەدینە) لەوە هاتنە سەرت، پەنابەرە بە (قاسمی کوڕی موحەمەد و سالمی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی عومەر)، وە لە ئەنجامدانی کارەکەدا بیانکە هاوبەشی خۆت... وە بەدەستکراوەیی نرخی ماڵەکانیان بدە... وەبێ گومان تۆ لەوەدا

شوێنکەوتەی دوو پێشەوایی راستگۆی... کە (عومەری کوڕی خەتتاب و عوسمانی کوڕی عەففانن).

ئەوجا (عومەری کوڕی عەبدولعەزیز) (قاسمی کوڕی موحەمەد و سالمی کوڕی عەبدوڵڵا) و کۆمەڵێکی دیکەی گەورە پیاوانی شاری (مەدینە) بانگهێشت کرد، وەنامەکەی (ئەمیری بڕواداران)ی بۆ خوێندنەوە... ئەوانیش دڵخۆش بوون بەبڕیارەکەی (خەلیفە)، وە ڕاپەڕین بۆ جێ بەجێ کردنی.

جا کاتێك کە خەڵکی دوو پێشەواو زانای شاری (مەدینە)یان بینی، بەدەستی خۆیان دەستیانکرد بەرووخاندنی مزگەوتەکە، لەگەڵیان دا وەك ڕاپەڕینی و هەڵوێستی وەك یەك پیاو دەستیان دایە کارەکە... وە ئەوەی کە لە نامەکەی (ئەمیری بڕواداران)دا هاتبوو جێ بەجێیان کرد... وە سوپاکانی موسڵمانان لەو ساتەوەختەدا بەسەرکەوتوویی دەیدا لەیەك بەیەکی دەرگا قایمکراوەکان بۆ گەیشتن بەشاری (قوستەنتینی یە) وە دەستیان گرت بەسەریاندا یەك لەدوای یەك بەفەرماندەیی (ئەمیر) بەجەرگ و سەرکەوتوو (مەسلەمەی کوڕی عەبدولمەلیکی کوڕی مەروان)... ئەوەش وەك پێشەکی یەك بۆ فەتح کردنی خودی شاری (قوستەنتینی یە) (قُسطَنْطينية).

جا کاتێك پاشای (ڕۆم) ئاگادار بوو لە بڕیاری (ئەمیری بڕواداران) لەسەر فراوانکردنی مزگەوتی (پێغەمبەر) (ﷺ)، پێ ی خۆش بوو کە دڵی (ئەمیری بڕواداران) بداتەوەو، بەشێوەیەك لێ ی نزیك ببێتەو کەپێ ی خۆش بێت... هێنای (سەد هەزار) میسقاڵی ئاڵتونی بۆ ڕەوانەکرد، لەگەڵ (سەد) کاریگەر لە نایابترین و دەستە ڕەنگترین بەناکانی وولاتی (ڕۆم)... وە هەر لەگەڵ ئەواندا (چل) بار (فوسەیفەسائی)[1] بۆ ڕەوانەکرد...

[1](الفسَيفَساء) پارچەی بچووکەی کاشی ڕەنگاو ڕەنگ، دەدرێتە پاڵ یەك بۆ جوانکردن و ڕازاندنەوەی دیواری کاخەکان (قەسرەکان).

جا (وەلید)یش هەموو ئەوانەی ڕەوانەکرد بۆ (عومەری کوڕی عەبدولعەزیز)، تا سوودیان لێ وەربگرێت بۆ نوێکردنەوە و فراوانکردنی مزگەوتەکە... (عومەر)یش خودای لێ رازی بێت زێرەکەی خەرج دەکرد بە ڕاوێژکردنی (قاسمی کوڕی موحەمەد) و هاوڕێکەی.

وە (قاسمی کوڕی موحەمەد) زۆر لە بابەگەورەی (صدیق) دەچوو لە سیماو ڕەویەیدا، هەتا خەڵکی ووتوویانە:(ئەبو بەکر) ڕەزای خوای لەسەر بێ هیچ کوڕێکی نەبوو کە وەك ئەولاوە لەخۆی چووبێت. زیاتر و زیاتر لەو چووە لەرەوشت بەرزی و سیفەتە بەرزەکانیدا و... لەدامەزراوی بڕواو، زۆر خۆپارێزییداو... دڵگۆشادی و دەستکراوەییدا... وەزۆرێك لە ووتەو کردارەکانی کەلێوەی گێڕدراوەتەوە گەواهی دەدەن لەسەر ئەوە. لەوانە دەشتەکییەك (أعرابياً) هاتە خزمەتی لە مزگەوت و پێ ی ووت:

کامتان زاناترن تۆ یا (سالمی کوڕی عەبدوڵلا)؟ جا ئەویش خۆی لەوەلامەکە بێ ئاگا کرد... کابرا دیسان پرسیارەکەی دووبارە کردەوە... جا (قاسم) فەرمووی: (سبحان الله) ئەوجا کابرا سێ بارەی کردەوە، جا پێ ی فەرموو: ئەوە (سالمە) ئەی برازام لەوێدا دانیشتووە.

جا یەکێك لە کۆڕەکەدا ووتی: بۆ خاتری خودا ئەمە چۆن پیاوێکە... پێ ی ناخۆشە بڵێت: من لەو زاناترم، واتە خۆی مەدح بکات... وەبەلایشیەوە ناخۆش بوو کە بڵێت... ئەو لەمن زاناترەو، ئەوجا درۆ بکات... واتە لەوەدا درۆ بکات. وە بێ گومان ئەو لە سالم زاناتر بوو.

وە جارێك لە (مینا)، وە خەڵکی وولاّتان لە حاجیەکانی ماڵی خودا لەهەموو لایەوەکەو لە دەوری کۆبوبونەوە، وە پرسیاریان لێ دەکرد ئەویش بەوەی کە دەیزانی وەلاّمی دەدانەوە، وە لەوەدا کەنەیدەزانی دەیفەرموو: ئاگام لێ ی نی یە ... نازانم... ئاگام لێ ی نی یە... جاوای لێکردبوون کە سەریان لێ سووڕبمێنێ... جا ئەویش پێ ی فەرموون: هەموو ئەوەی کەئێوە پرسیاری لەبارەوە دەکەن نایزانین...

خۆئەگەر بمانزانیایە نەماندەشاردەوە... چونکە ڕەوا نی یە ئێمە بیشارینەوە... جا پیاو بژی بەوەی کە نەزانە پاش ئەوەی کە شارەزایی ماف خودا بوو بەسەرییەوە چاکترە بۆی کە شتێك بڵێت کە نەیزانێ.

*                *                *

وە جارێکیان دابەشکردنی زەکات بەسەر شایستەکاندا خرایە ئەستۆی جا (قاسم)یش ئەوەندەی لەتوانایدا بوو خۆی شەکەت کردو، هەوڵی زۆری دا ئاکارەکە بەباشی بە ئەنجام بگەیەنێت... جا هەر خاوەن مافێك ماف خۆی لەلایەن ئەوەوە پێدرا... بەڵام یەکێکیان رازی نەبوو بەوبەشەی کە پێ ی درابوو.

هات بۆلای و ، (قاسم)یش ڕاوەستابوو نوێژی دەکرد، ئەویش دەربارەی زەکاتەوە دەدوا... جا کوڕەکەی (قاسم) پێ ی ووت:

سوێند بەخوا تۆ دەربارەی پیاوێك دەدوێیت کەلە زەکاتەکەتان دەستگیری یەك درهەم و دانقێك[1] نەبووە... وە هەتا دەنکە خورمایەکیش لێ ی دەستکەوت نەبووە. جا ئالەو کاتەدا (قاسم) نوێژەکەی کورت کردەوەو، لایکرد بەلای کوڕەکەیەوە و ووتی:

ئەی کوڕم، لەمڕۆ بەدواوە قسە لەشتێك مەکە نایزانی. خەڵکی ووتیان: کوڕەکەی ڕاستی گوت... بەڵام (قاسم) ویستی کە پەروەدەی بکات، کە زمانی بپارێزێت لەزیادەڕەوی لە قسەکردن دا.

وە تەمەنی (قاسمی کوڕی موحەمەد) درێژەی کێشا بۆ زیاتر لە (حەفتاو دووساڵ)... بەڵام چاوی کوێر بوو کاتێك کە پیر بوو. وە لەکۆتا ساڵی تەمەنیدا، بەمەبەستی حەج کردن رووی لە (مەککە) کرد... لەنیوەرێیدا وەفاتی کرد و گەڕایەوە بۆلای پەروەردگاری... جا کاتێك هەستی کرد بەوەفاتکردن لایکرد بەلای کوڕەکەیەوە و ووتی: ئەگەر من مردم، کفنم بکە بەو بەرگەمەوە نوێژم پێوە کردووە: کراسەکەم و... ئیزارەکەم و... ریدا ئەکەم... ئەوانە کفنی باپیرت بوون (ئەبی بەکر) خوا لێ ی رازی بێت. ئینجا لەگۆڕم بنێ و گۆڕەکەم بۆبکە بەگڵ جوان داپۆشە. ئەوجا بچۆرەوە

---

[1] دانق/ شەشیەکی درهەمێکە.

بۆناو خاوخێزان و خزمانت. وە دەستم بەدامانتان نەکەن لەسەر گۆڕەکەم ڕا بوەستن و بڵێن: وابوو... وابوو... من هیچ شتێك نەبووم

خودایە یارمەتیمان بفەرمووێت ڕەویەی (قاسم) بگرینە بەروو لەگەڵ ئەوو نموونەی ئەودا حەشرمان بفەرموو، وە لەخزمەتیا بەبەهشتمان شاد بکە. ﴿وەرگێڕ﴾

بۆ زیاتر شارەزا بوون لە ژیانی (قاسم) سەرنج بدە لە:

١- حلية الأولياء:١٨٣/٢
٢- صفة الصفوة:٨٨/٢
٣- تهذيب التهذيب:٣٣٣/٨
٤- وفيات الأعيان لأبن الخلكان:٥٩/٤
٥- الطبقات الكبرى لأبن سعد:١٨٧/٥
٦- شدرات الذهب للعماد الحنبلي:١٣٥/١
٧- نكت الهثيان للصفري:٢٣٠
٨- الكامل في التأريخ: ١١٤/٥
٩- تأريخ الطبري:٤٢٢/٣
١٠-الأغاني لأبن الفرج الأصفهاني:٢٧٩/٢٠

# ٢١) سیلەی کوڕی ئەشیەمی عەدەوی

**(سیلەی کوڕی ئەشیەم لەزۆرێك لە هاوڕێیا زانستی وەرگرت وە لە نێوانیاندا فێربوو، وە بەرچاوی روناکبوەوەو، رەوشت ئامێز بوو بە ڕەوشتی ئەوان)**
**(ئەسبەهانی)**

**(اصبهاني)**

(سیلەی کوڕی ئەشیەمی عەدەوی) خودا پەرستێك بوو لەخودا پەرستەکانی شەو... وە سوار چاکێك بوو لە سوار چاکەکانی ڕۆژ... کاتێك کە تاریکی پەردەی بەسەر بوونەوەردا کێشاو، خەڵکی چوونە قوڵایی خەوەوە... لەخەو هەڵساو دەستنوێژێکی پوختەو تەواوی دەگرتوو، پاشان دەچوویە محرابەکەی و، دەستی بەدەستنوێژ وابەست بوو لەگەڵ پەروەردگاری دا.

ڕووناکی خودایی لەناخی دا هەڵی دەکردوو، بەو ڕووناکیە کون و قوژبنی بوونەوەری دەهێنایە بەر چاووی خۆی و، نیشانە و بەڵگەکانی خودای لەبوونەوەردا دەدییەوە وە لەزیندوو کردنەوەی شەودا زۆر وابەست بوو بە (قورئان خوێندنی بەرە بەیانەوە)... جا کاتێك سێ یەکی کۆتایی شەو دادەهات، بەهەموو بیر و هۆشییەوە دەچووە خزمەتی بەشەکانی کۆتای قورئان...

وە ئایەتەکانی قورئانی بەشێوەی (ترتیل) بەدەنگێکی خۆشی دڵئامێز... زەنگێکی سەرنج ڕاکێشی دەخوێند.. کە نەك دڵێك بەڵکو هەزاران دڵ تێی ڕادەما... جا جارێك لەقورئان خوێندندا شیرینییەکی بەدی دەکرد کە هەموو دڵ و دەروون و بیر و هۆش و

ژێری دەگرتەوە لە ترسی خودا... وە جارێکی دی بەقورئان خوێند هەستی دەجولاْ بەشێوەیەك رادەچڵەکا کە خەریك بوو دڵی لەکار بکەوێ...

(سیلەی کوڕی ئەشیەم) هەرگیز لەو خودا پەرستییەی سارد نەبووەتەوە... وە جیاوازی نەبووە لەوبارەوە لە نێوان لەماڵەوە بوون و سەفەری دا، لە نێوان سەر جەنجاڵی و دەست بەتاڵی دا، (جەعفەری کوڕی زەید) گێڕایەوەوە ووتی: لەگەڵ (صیلەی کوڕی ئەشیەم)دا لەگەڵ یەکێك لە سوپاکانی موسڵماناندا ڕۆیشتن بۆ غەزا بۆ شاری (کابول)[1] بەئومێدی ئەوەی کە خودا یارمەتیمان بدات فەتحی بکەین...

کاتێك شەو تاریکی داهات... وە ئێمەش لەنیوە رێدا بووین... سەربازەکان بارگەیان خست، وە هەندێ خواردنیان خواردو، نوێژی خەوتنانیان ئەنجام داو... ئینجا هەرکەسە چووە لای بارگەو بنەی خۆی تا بحەوێتەوەو بخەوێ تا شەکەتی دەرچێت...

(صیلەی کوڕی ئەشیەم)م بینی هەروەك ئەوان چووە لای بارگەو بنەکەی و راکشا هەروەك ئەوان بۆ نوستن.

منیش لەناخی خۆمدا ووتم: لەکوێ و لەچی کاتێکدا ئەو خەڵکە بینوییانە کە ئەو پیاوە ئاوا خودا پەرستی دەکات و شەو زیندوو دەکاتەوەو بەپێ وە خەریکی نوێژە بە شێوەیەك کە قاچەکانی دەئاوسێت... ئەوە تا ئێستا وەك ئەو خەڵکە نووستووە؟! سوێند بەخودا ئەو شەوە سەیرم کرد و سەرنجم دا تا ئەوەی لێ ی دەگێڕنەوە بیبینم.

ئەوەبوو کاتێك کە سەربازەکان چوونە قولایی خەوەوە... سەیرم کرد (صیلەی کوڕی ئەشیەم) لەجێگەی خۆی هەستا پاش ئەوەی بەخەبەر هات... وەلەسەرخۆ خۆی دەدایە پاڵ تاریکی تا لەسەربازگەکە دوور کەوتەوە، وە چووە ناو دارستانێکی چڕەوە کەپڕ بوو لە دار و درەختی بەرزو گژو گیا، هەروەك ئەوەی لەدێر زەمانەوە پێ ی لێ نەکەوتبێ منیش بەنهێنی شوێنی کەوتم... کاتێك کە گەیشتە شوێنێکی پاکژی ئارام، رووگەی دیاری کرد و رووی تێکرد، وە دەستی بە نوێژ کردو تیا ڕۆچوو... منیش لەدوورەوە سەرنجم دەداو بۆم دەڕوانی ڕوو درەوشاوە... ئەندام ئارام... ناخ و دڵ بەئاگا... هەروەك لەچۆڵ و هۆڵدا هاوە دەمبینێتەوە... وە لەدووری دا هەست

[1] (کابُل) پایتەختی (ئەفغانستانە) کە دەکەوێتە سەر رووباری (کابول).

بەنزیکی بکات... وە لەتاریکی دا رووناکی بەدی بکات... ئەو ئا لەو بارودۆخەدا بوو... کەشێرێك لەلای رۆژهەڵاتی دارستانەکەوە لێمانەوە دەر کەوت، کە دڵنیابووم لیٚ ی خەریك بوو دڵم لەترسدا بووەستێت، بۆیە دەست و برد سەرکەوتمە سەر درەختێکی بەرز تا لە زیانی پارێزراوبم. ئەوەبوو بەردەوام (شێرەکە) لە (صیلەی کوڕی ئەشیەم) نزیك دەبوویەوە، ئەویش لەنوێژەکەیدا ڕۆچووبوو هەتا چەند هەنگاوێکی مابوو کە بگاتە لای... سوێند بەخوا لای نەکردەوە بەلایەوە... وە گرنگی پێنەدا... کاتێك سوجدەی برد ووتم:

ئا ئێستا پەلاماری دەداو دەیخوات. بینیم کاتێك لەسوجدەکەی هەستایەوە دانیشت، وە شێرەکە لەبەردەمیدا ڕاوەستا وەك ئەوەی سەرنجی بدات.

جا کە سلاٚوی دایەوە لەسەرخۆ ڕوانی بۆ شێرەکە...وە دوو لێوی دەجولاٚ بەووتەیەك کەنەمدەبیست... کاتێکم زانی (شێرەکە) لەسەر خۆ ڕووی لیٚ وەرگێرا، گەڕایەوە بۆ ئەو شوێنەی کە لێوەی هات.

*　　　　　*　　　　　*

وە (صیلەی کوڕی ئەشیەم) لەسەروو هەمووئەوەوە هیچ فرسەتێکی لە فرسەتەکانی ئامۆژگاری و ڕێنمایی کردن پشت گویٚ نەختستووەو کەبۆی ڕێکەوتبیٚ قۆستویەتییەوە... وە ڕچەی (اسلوبهُ) لەوەدا ئەوەبوو، کە بانگهێشتی خەڵکی کردووە بۆ پەیرەوی ڕچەو ڕێبازی پەروەردگاری بەدانایی و ئامۆژگاری جوان، کەناخە تۆراو و پەریوەکانی بەلای خۆیدا ڕاکێشاوەو... دڵە ڕەقەکانی نەرم نیان کردووە...

وە لە نموونەی ئەوە (صیلەی کوڕی ئەشیەم) دەچێتە شوێنێکی چەپ لەدەرەوەی شاری (بەصرە) بۆ گۆشەگیری و خودا پەرستی... جا کۆمەلێك لەلاوان بەلایدا تێدەپەڕن کەبیٚ سنوور دەست لە ملان و ئەنجامدەری کاری هەرزەکاری یاری دەکەن... گاڵتە و گەپ دەکەن... لاسایی خەڵك دەکەنەوەو... رادەبوێرن... ئەویش کە ئەوە دەبینێت: بەشێوەیی دۆستێکی دڵسۆز سلاٚویان لیٚ دەکات وە دەیاندوێنێت بەنەرم و نیانی و پێیان دەڵێت: چی دەڵێن دەربارەی کۆمەڵێك کە بڕیاری سەفەرێك دەدەن بۆ کارێکی گرنگ، بەلاٚم ئەوان لەڕێگادا بەرۆژدا لادەدەن بۆ یاری و گاڵتە و گەپ... وەلە شەودا دەخەون بۆ ئەوەی بحەوێنەوە... جا کەی دەیانبینن کە سەفەرەکەیان بە ئەنجام بگەیەنن... وە بگەنە ئەنجامدانی مەبەستەکەیان؟! وەبەردەوام

بوو لەسەر ئەو ووتەیەی جار لەدوای جار... پاش ماوەیەکی کەم دیسان جارێکی تر تووشیان بویەوەو، هەمان ووتەی پێ ووتنەوە... ئەوجا یەکێکیان هەستاو ڕاپەری و ووتی:

سوێند بەخوا، بەبێ هیچ گومانێك مەبەستی لەوە جگە لەئێمە کەسێکی دی نی یە، چونکە ئێمەین بەڕۆژدا گاڵتەو گەپ دەکەین بەشەو دەخەوین... پاشان لاوەکە لەهاوڕێکانی جیابویەوەو لەو ڕۆژەوە شوێن (صیلەی کوڕی ئەشیەم) کەوت... وە بەردەوام لەخزمەتیا ئەبوو هەتا وەفاتی کرد.

*	*	*

وەهەر لەنموونەی ئەوە ڕۆژێکیان (صیلەی کوڕی ئەشیەم) لەگەڵ کۆمەڵێك لەهاوڕێکانی دا دەرۆشت بۆ ئەنجام دانی کارێکیان، لاوێکی جوان بەلایاندا تێپەری... کە لە لوتکەی هەرزەکاریدا بوو. دیزداشەکەی درێژ کردبوو بەشێوەیەك کە بە لووتبەرزییەوە بەسەر زەویدا رای دەکێشا... هاوڕێکانی (صیلە) ویستیان لێ ی بچنە پێشەوەو لێ ی بپرسنەوە وەهەروەها ویستیان بەدەست و زمانیان سزای بدەن سزایەکی بەهێز. (صیلە) پێ ی ووتن: وازی لێ بهێنن بۆ من پاشان ئەو ڕووبەڕووی لاوەکە بویەوە، وەك باوکێکی بەسۆزی دڵسۆز و هاورێیەکی ڕاستگۆی گفت شیرین ووتی:

ئەی برازای خۆم، بەڕاستی من ئیشێکم پێتە. لاوەکە راوەستاو ووتی: فەرموو مامە گیان کارت چی یە بەمن؟ ئەویش ووتی: کارەکەم ئەوەیە، دیزداشەکەت بەرز بکەوە، چونکە بێگومان ئەوە خاوێنی بەرگەکەت دەپارێزێ و... وە زیاتر خۆپارێزی و... خودا پەرستی پەروەردگارتەو... زیاتر نزیك بوونەوەتە لەئاکاری پێغەمبەرەکەت لاوەکە بەخەجاڵەتییەوە ووتی: بەڵێ، بەسەرچاوو...

پاشان دەستی برد و دیزداشەکەی بەرز کردەوە. ئەوجا (صیلە) فەرمووی بە هاوڕێکانی: بێگومان ئەوە جوانتر بوو لەوەی کە ئێوە دەتانویست بیکەن... خۆ خوانە خواستە ئەگەر ئێوە لێتان بدایەو جنێوتان پێ بووتایە، بێگومان ئەویش پەلاماری ئێوەی دەداو قسەی ناشیرینی پێ دەوتن وو... دیزداشەکەیشی زیاتر لەڕقی ئێوە بەسەر زەویدا ڕادەکێشا.

*	*	*

وە جارێکیان لاوێك لەلاوەکانی شاری (بەصرە) هاتە خزمەتی و ووتی: ئەی (ئەبا صەهباء) (أبا الصَّهباء) لەوەی کە خودا فێری کردووی فێرم بکە... (صیلە) بەروویەکی گەش و زەردەخەنەوە ووتی:

بەڕاستی ئەی برازای خۆم رابووردوویەکت بیر خستمەوە کە لەبیرم ناچێت... ئەویش ئەوەبوو کە منیش ئەوکاتە وەك ئیستەی تۆ لاو بووم... چوومە خزمەتی ئەوانەی کە مابوون لە هاوڕێیانی (پێغەمبەر)ی خودا (ﷺ) و پێم ووتن: لەوەی کە خودا فێری کردوون فێرم بکەن. ئەوانیش پێیان ووتم:

قورئان بکە بە پارێزکاری ناخت و لەزەتی دڵەکەت... وە ئامۆژگاری پەسەندی لێ وەربگرە و، ئامۆژگاری موسڵمانانی پێ بکە. وە زۆر داواو نزاکانت رووبەرووی خودای بالاْ دەست بکە ئەوەندەی کە دەتوانیت. ئەوجا لاوەکە پێ ی ووت: نزام بۆ بکە، خودا پاداشتت بداتەوە.

ئەویش فەرمووی: خودای بالاْ دەست ئارەزوومەندت بکات بۆ ئەوەی کە دەمێنێتەوە (ژیانی هەمیشەیی لە قیامەتدا). وەلات دا لەوەی کەلەناو دەچێت و نامێنێتەوە (ژیان و لەزەتە دنیاییەکان). وەخودا دڵنیاییەکت پێ ببەخشێت کە ناخەکان بەهۆیەوە ئارام بگرن، وە لەپەیڕەوی دین دا پشتی پێ ببەسرێت...

* * *

وە (صیلەی کوڕی ئەشیەم) ئامۆزایەکی هەبوو کە پێ ی دەوترا (موعازەی عەدەوی) (مُعاذَةَ العَدَوِيَّةَ)... کە ئەویش هەروەك (صیلە) یەکێکی تر بوو لە شوێنکەوتووان (التابعين)... کاتی خۆی بەخزمەتی دایکی موسڵمانان (عائیشە) رەزاو رەحمەتی خودای لەسەر بێ گەیشتبوو، وە زانستی لێ وەرگرتبوو... وە (حەسەنی بەصری) بەخزمەتی (موعاذ) گەشتبوو، وە زانستی لێ وە گوێ بیست بووە. (موعاذ) خودا پەرستێکی خاوێن و... خۆپارێزێکی دونیا نەویست بوو.. وە لەنەریتەکانی (عاداتها) کاتێك کە شەو دادەهات دەیووت، لەوە دەچێت ئەمە کۆتا شەوی من بێت، جا بۆیە هەتا رۆژ دەبوویەوە نەدەنووست... وە کاتێك کە رۆژ دەهات دەیووت: لەوە دەچێت ئەمە کۆتا رۆژی من بێت، بۆیە دڵنیانەدەبوو کە پاڵبکەوێت و پشوویەك بدات تا ئێوارە دادەهات.

وەلە وەرزی (زستان)دا بەرگی تەنکی لەبەر دەکرد، بۆ ئەوەی سەرما وای لێبکات کەنەخەوێت، وە هەر بەردەوام بێت لەسەر خودا پەرستی. وە شەوی زیندوو دەکردەوە

بەنوێژ و قورئان خوێندن. جا هەر کاتێك وەنەوز زۆری بۆ بهێنایە، هەڵدەسایە سەرپێ و بەماڵەکەدا دەگەڕاو، دەیووت:

ئەی (نەفسی موعاذە) خەوێکی دوورو درێژ لەبەردەمتایە... سبەینێ ڕاکشانت درێژە دەکێشێت لەگۆڕدا... جا ئەوەش یان لەسەر ئاخ و داخ و پەشیمانی، وەیان لەسەرخۆشی و دڵخۆشی. جا کەوا بوو ئەی (موعاذە) ئەمڕۆ هەڵبژێرە بۆخوت، ئەوەی کە پێت خۆشە کەلەسەری بیت سبەینێ.

وە (صیلەی کوڕی ئەیشەم) لەگەڵ ئەو خودا پەرستی چڕوپڕەو، ئەو دونیا نەویستی یەدا، لەڕەوییەی (پێغەمبەر)ەکەی دروودی خوای لەسەر بێ لای نەداوە، ئەوەتە(موعازە)ی ئامۆزای خواستووە بۆ خۆی واتە هاوسەرگیرێتی لەگەڵدا ئەنجامدا.

کاتێك ڕۆژی گواستنەوەی هات، برازایەکی هەستا بەجێ بەجێکردنی کاروبارەکەی، (صیلە)ی برد بۆ حەمام، ئەوجا بردییە ماڵی هاوسەرگەرێتی بۆنخۆش کراو. کاتێك هەردووکیان یەککەوتن بەیەکەوە، (صیلە) هەستا دوو ڕکات نوێژی سوننەتی هاوسەرگەرێتی بکات ، جا (موعازە)ش هەمان دوو ڕکات نوێژی کرد وەك ئەو..پاشان هەردووکیان ڕۆچوون لە نوێژەکانیاندا و، بەتەواوی ئاوێزانی نوێژەکەیان بوون، بەوشێوەیە هەردووکیان بەردەوام بوون لەنوێژدا تا دونیا ڕووناکبوویەوە... کاتێك بەرەبەیان هەڵهات برازاکەی هاتە خزمەتی و ووتی:

ئەی مامی خۆشەویستم، ئامۆزاکەت بۆ گوێزایەوە و ئامادەی ژووری هاوسەرگەرێتی کرا، کەچی تۆ هەموو شەوت بەنوێژکردن ڕۆژکردەوە وازت لەو هێناوە.

ئەویش ووتی: ئەی برازای ئازیزم... تۆ ئێوارە بردمتە ماڵێك ئاگری بیرخستمەوە... پاشان لەدوای ئەوە بردمتە ماڵێکی تر بەهەشتی بیرخستمەوە... بەردەوام بیر و هۆشم لایان بوو هەتا ڕۆژم کردەوە. برازاکەی ووتی: تێم بگەیەنە ئەی مامی بەرێزم ! ئەویش ووتی: بردمتە حەمام، گەرماکەی گەرمای جەهەننەمی خستە یادم... پاشان دوای ئەوە بردمتە ماڵی زاوایەتی بۆنخۆش، بۆنی خۆش ئەوبۆنی خۆشی بەهەشتی خستە یادم...

* * *

(صیلەی کوڕی ئەشیەم) وە نەبووبێ تەنها کەسێکی تەوبەکاری ڕاستگۆ و خوداپەرەستێکی لەخودا ترس و دونیا نەویست بووبێت و بەس... بەڵکو لەگەڵ ئەوەشدا سوارچاکێکی بەهێز و دامەزراو و، پاڵەوانێکی کوشتکار بووە... کەمتر گۆڕەپانەکانی جەنگ کەسێکی تری ناسی بێت لەو ئازاتر و بەهێز تر... یان خۆگرو

راوەستاوتر و بەجەرگ... یان شمشێربڕەرتر... هەتا وابوو کە فەرماندەکانی موسڵمانان کێ بەرکێیان دەکرد لە نێوان خۆیاندا بۆ ئەوەی هەریەکەیان بەلای خۆی دا ڕایبکێشێت... هەریەکەیان دەیویست کە بەهۆی ئەوەوە سەربازەکانی سەرکەوتن بەدەست بهێنن، وە بەهۆی ئازایەتی ئەوەوە ئەو سەرکەوتنە گەورەی کە بەتەمای بوون و لەبەر چاویان گرتبوو بەدەستی بهێنێت.

(جەعفەری کوڕی زەید) گێڕایەوە ووتی:

چووین بۆ غەزایەك و (صیلەی کوڕی ئەشیەم) و (هیشام کوڕی عامر)مان لەگەڵدا بوو... جا کاتێك لەگەڵ دوژمن بەیەك گەیشتین، (صیلە) و (هاوڕێکەی) لەریزەکانی موسڵمانان دەرچوون، خۆیان گەیاندە کۆمەڵگای دوژمنان بەتیرو شمشێر دایان لێیان، هەتا کاریان کردە سەر پێشەنگی سوپاکە چۆن کارتێکردنێك، تاروماریانی کردن... هەندێك لەفەرماندەکانی دوژمن دەیان وت بەهەندێکی تریان:

تەنها دوو پیاو لەسەربازانی موسڵمانان ئەو هەموەیان پێکردین، ئەی چۆن دەبوو ئەگەر هەموویان لەگەڵمان بجەنگایەن و کوشتاریان بکردینایە؟!. دەبچنە ژێر دەسەلاتی موسڵمانان و، مل کەچیان بن بەگوێ ڕایەڵی.

* * *

وە لە ساڵی (حەفتاو دوو)ی کۆچیدا (صیلەی کوڕی ئەشیەم) چوو بۆ غەزا لەگەڵ سوپای موسڵمانان دا بەرەو (وولاتانی پشت رووبار)[1]، وە کوڕێکی خۆی لەگەڵ دا بوو...

کاتێك هەردوو بەیەك گەیشتن وە جەنگ و کوشتار تینی سەند، (صیلە) گوتی بەکوڕەکەی: ئەی کوڕی خۆم... بڕۆ بەرەو پێش و دوژمنانی خودا کوشتاربکە، هەتا لەڕێگای خودا بتکەمە قوربانی و بتسپێرم بەو کەسەی کەسپاردە لەلای ئەو لەکیس ناچێت.

جا لاوەکە بەبیستنی ووتەی باوکی دەرچوو بۆ کوشتاری دوژمن هەروەك دەرچوون تیر لەکەوان، وە بەردەوام کوشتاری دەکرد تا شەهید بوو.

جا باوکیشی لەسەر هەمان رچەی ئەو بەردەوام کوشتاری دوژمنانی خودای کرد، تا لەتەنیشتی کوڕەکەیدا شەهید بوو...

---

[1](بلاد ما وراء النّهر) : ئەو شارو شارۆچکانەیە کە ئەمڕۆ دەکەونە (تورکستان) کە رووسیا دەستی بەسەرداگرتووە و،بە بەشێك لەوولاتی گەورەی خۆی دەزانێ.

كاتێك گوزارشی شەهید بوونیان گەیشتە شاری (بەصرە) ئافرەتان روویان كردە (موعازەی عەدەوی)و چوونە خزمەتی بۆ دڵنەوایی كردنی... ئەویش پێ ی ووتی:
ئەگەر ئێوە بۆ ئەوە هاتوون پیرۆزباییم لێ بكەن، ئەوە یاخوا بەخێر بێن... خۆ ئەگەر جگە لەوە بۆ مەبەستێكی دیكە هاتوون، ئەوە بگەڕێنەوە خودا پاداشتی بەخێرتان بداتەوە...

خودا ئەو رووە پیرۆزوو رێزدارانە گەشتر و گەشتر و جوان بكات... وەپاداشتان بداتە وە بە خێر لە جیاتی ئیسلام و موسوڵمانان ... مێژووی مرۆڤایەتی لەوانە خودا پەرستر و خاوێن تر و خۆپارێزتری نەناسیوە... خودایە هەمان هەڵوێستی ئەوانەمان پێببەخشەو یارمەتیمان بدە هەمان ڕچەی ئەوان بگرینە بەرو لەگەڵ ئەواندا لەبەهەشتا كۆمان بكەرەوە.　　　﴿وەرگێڕ﴾

بۆ زیاتر شارەزابوون لە ژیاننامەو دەنگوباسی (صیلەی كوڕی ئەشیەم) بڕوانە:

١- الطبقات الكبرى لأبن سعد:٤/١٣٤
٢- التأريخ الكبير: ٤/٣٢١
٣- الكنى: ٢/١٣
٤- الجرحُ والتعديل:٤/٤٤٧
٥- حُلية الأولياء: ٢/٢٣٧
٦- اسدُ الغابة: ٤/٣٤
٧- تأريخ الأسلام: ٣/١٩
٨- البداية والنهاية: ٩/١٥
٩- الأصابة: ٢/٢٠٠

# ٢٢ )زەینولعابدین( عەلی کوڕی حوسەینی کوڕی عەلی)

(هیچ قورەیشی یەکم نەبینیوە کە گەورەتر و بەڕێزتر بووبێت لە عەلی کوڕی حوسەین)          (زوهری)

لەو ساڵە پرشنگدارەدا کۆتا لاپەڕە لەلاپەڕەکانی کیسراکان پێچرایەوە. (یەزدەجورد) کۆتا پادشای فارسەکان بەسەر شۆڕی و دەرپەڕێنراوی مرد... فەرماندەو سەرباز و پاسەوانەکانی تێك شکان و، ماڵ و منداڵی بە بەندەی کەوتنە دەستی موسڵمانان...

وەدەست کەوتی جەنگ (الغنائم) بەرەوشاری (مەدینە) بەڕێ کرا... ئافرەتان و پیاوان و لاوەکانی بە دیلگیراوی ئەو سەرکەوتنە گەورە زۆر و زەوەندە و بەنرخ بوون بە شێوەیەك، کە شاری (مەدینە) لەو ژمارە زۆر و، بەبەهاو پایە بەرزەی بەخۆیەوە نەدیبوو. وە لە نێوان بەدیلگیراوەکان دا هەرسێ کچەکەی (یەزدە جورد) هەبوون...

خەڵکی دەست و برد هاتنە سەر بەدیلگیراوەکان، وەلە چەند کاتژمێرێکی دیاریکراودا، هەموویان جگە لە سێ کچەکەی کیسرا (یەزدەجورد) فرۆشران و نرخەکانیان خرایە ماڵی دارایی موسڵمانان (بَیْت مالِ المسلمین). وە کچەکانی کیسرا لە جوانترین ئافرەتان بوون و... ڕووگەش و درەوشاوەو گەورە کچی پێکەوتوو سەرنج ڕاکێش بوون...

وە کاتێك خرانە بازارەوە بۆ فرۆشتن، لەبەر مل کەچی و سوکایەتی پێ کردن چاویان بڕیە زەوی، سەریان هەڵنەدەبڕی... وە چاوەکانیان فرمێسکی ئاخ و داخ و تێکشانیان هەڵدەڕشت...

جا (عەلی کوڕی ئەبی تالب) کە خودا ڕێزی لەڕووی گرت بەزەیی پیایاندا هاتەوەو، ئاواتی ئەوەی خواست کە کەسانێك بیانکڕن هەڵسوکەوتی جوانیان لەگەڵ بکەن. وە ئەوە جێ ی سەرسوڕمان نی یە، کە (پێغەمبەر) دروودی خوای لەسەر بێ دەفەرمووێت: (بەزەییتان بە شکۆمەندی گەلێکدا بێتەوە کە زەلیل دەبێ)...

جا (عەلی) لایکرد بەلای (عومەری کوڕی خەتتاب)ەوە ووتی: ئەی (ئەمیری بڕواداران)... بەڕاستی نابێت کچانی پادشاهان وەك کچانی خەڵکی ئاسایی هەڵس و کەوتیان لەگەڵ بکرێت.

(عومەر) ڕەزای خوای لەسەر بێ فەرمووی: ڕاستت فەرموو... بەڵام چۆن؟. (عەلی) فەرمووی: با نرخیان لەسەر دابنرێت و، نرخەکانیش بەرز بێت، پاشان سەربەستیان بدرێتێ لەهەڵبژاردنی ئەو کەسەدا کە خۆیان دەیانەوێت و نرخەکەیان دەدات.

(عومەر) ڕەزای خوای لەسەر بێت بەوە زۆر دڵشاد بوو، وە پێ ی ڕازی بوو، وە جێ بەجێ ی کرد... ئەوجا یەکێکیان (عەبدوڵلای کوڕی عومەر)ی هەڵبژارد. وە دووەمیان (موحەمەدی کوڕی ئەبی بەکری صدیق)ی هەڵبژارد. بەڵام سێ یەمیان کەپێ ی دەوترا (شاه زنان) (حوسەینی کوڕی عەلی) کچە زای (پێغەمبەر)ی دروودی خوای لەسەر بێ، هەڵبژارد...

(شاه زنان) موسڵمان بوو، موسڵمانبوونێکی جوان وچاك... ئاینی خودای ڕاست و ڕەوانی بەدەستهێنا و، لە کۆیلەتی ڕزگار بوو بوویە هاوسەر، پاش ئەوەی کە کویلە بوو، بە سەربەستی شاد بوو.

پاشان ئەوەی بەباش زانی کە هەموویان پەیوەندیەکی بەرابردوو بت پەرستی یەوە بیچڕێنێت، بۆیە وازیهێنا ناوەکەی (شاه زنان) واتە پادشای ژنان، وە ناوی خۆی نا (غەزالە)...

(غەزالە) بەختەوەر بوو بە چاکترینی هاوسەران، کەشایانی کچانی پادشاهان بێت. ئیتر هیچ لە ئاواتەکانی نەمابوو کە بێتەدی جگە لە بەهرەمەند بوونی بەنەوەیەك. خودای بالا دەست ڕێزی لێناو، کوڕێکی ڕووگەش و، دیمەن جوان و، درەوشاوەی بە (حوسەین) بەخشی، کەناوی لێنا (عەلی) بەپیرۆزی ناوی باپیریەوە (عەلی کوڕی ئەبی تالب) ڕەزای خوای لەسەر بێ.

بەڵام دڵشادی (غەزالە) بەكۆرپە چاو گەشەكەی جگە لەچەند چركە ساتێك زیاتری نەخەیاند... ئەویش لەبەر ئەوەی بەهۆی تووشبوون بەلەرزووتای دوای منداڵبوونەوە، گوێبیستی بانگی خودای پەروەردگاری بوو، وە وەفاتی كرد، ئیتر ئەوەی بۆنەمایەوە بەهرەمەند و خۆشنوود ببێت بەكۆرپەكەی.

كۆیلەیەكی (حوسەین) كە ئافرەتێكی ژیرو كارامە بوو سەرپەرشتی كۆرپە بچكۆلەكەی گرتە ئەستۆی، وە ئەوەندەی خۆش دەویست، كە زیاتر بوو لەخۆشەویستی دایك بۆ كوڕەكەی... وە بەشێوەیەك چاودێریی و سەرپەرشتی دەكرد كە زیاتر بوو لەوە كە دایكێك ئەنجامی دەدات بەرامبەر تاكە كۆرپەی... جا ئەو كۆرپەیە نەش و نمایكرد و جگە لەو كەسی دی بەدایك نەدەزانی...

* * *

(عەلی كوڕی حوسەین) ئەوەندەی نەمابوو كە بگاتە تەمەنی خوێندن، كە ڕووی كردە فێربوونی زانست بەوپەڕی ئارەزوومەندی و حەزەوە... وە قوتابخانەی یەكەمی ماڵەكەی خۆی بوو، كە پێ ی ڕێزدار بوو بوو... وە مامۆستای یەكەمی باوكی بوو (حوسەینی كوڕی عەلی)، كەبە هۆی ئەو باوكەوە گەورەیی پێ بەخشرابوو.

بەڵام قوتابخانەی دووەمی، مزگەوتی (پێغەمبەر)ی خودا بوو درو‌ودی خوای لەسەر بێ. وە مزگەوتی (پێغەمبەر) درو‌ودی خوای لەسەر بێ لەو ڕۆژگارەدا... شەپۆلی دەدا بەوانەی كەما بوونەوە لە هاوڕێیانی (پێغەمبەر)ی (ﷺ) ئازیز و چینی یەكەم لەگەورە شوێنكەوتووان. وە ئەوانە و ئەوانە، دڵەكانیان و باوەشیان كردبووە بۆ ئەو چاوە گەشاوانە لەنەوكانی هاوڕێیانی بەرێز، جا فێری خوێندنەوەی قورئانی پیرۆزیان دەكردن و... شارەزایان دەكردن بە ناوەڕۆك و ئەحكامە شەرعی یەكانی و... فەرموودەكانی (پێغەمبەر) خودایان درو‌ودی خوای لەسەر بێ بۆ دەگێڕانەوە و... مەبەست و واتاكانیان بۆ ڕوون دەكردنەوە، هەڵوێستەیان پێ دەكردن لەسەریان و... ژیاننامەی (پێغەمبەر)ی گەورەیان درو‌ودی خوای لەسەر بێ بۆ دەگێڕانەوە و باسی جەنگەكانی پێغەمبەریان بۆ دەكردن، وە ئەو پەند و ئامۆژگاریانەیان بۆ ڕوون دەكردنەوە كەلەو جەنگانە وەردەگیران.

هەروەها شیعری بوێژانی عەرەبیان بۆ دەخوێندنەوە و... جوانییەكانیان بۆ ڕوون دەكردنەوە... وە دڵە بێگەردەكانیان پڕ دەكرد لەخۆشەویستی خودای باڵا دەست و...

ترسان لەزویر بوونی... وە هەروها لە خۆپارێزی وشەرم لیٚ ی... جا ئەوەتا ئەوانەن زانایان و. ڕێنومایی کارانی راست ڕەو.

بەلاٚم (عەلی کوڕی حوسەین) ئەوەندەی کە دلٚی وابەستە بوو بە (پەڕاوکەی خودای بالاٚ دەستەوە) بە هیچی دیکەوە وابەستە نەبوو. وە سۆز و هەستەکانی ئەوەندەی دادەچلەکانی دەلەرزی لەئاستی مژدە و هەڕەشەکانی، لە ئاستی هیچ شتێکی دیکەدا نەدەچلەکاو نەدەلەرزی، کاتێك کە ئایەتێکی دەخوێندنەوە کەیادی بەهەشتی تێدابووایە، دلە ناسکەکەی کەتامەزرۆی بوو دەفڕی بۆ ئەویٚ...

وە کاتێك گوێبیستی ئایەتێك دەبوو کە یادی دۆزەخی تێدا بووایە، هەناسەیەکی دوورو درێژ و گەرم دووکەلاٚوی هەلٚدەکێشا وەك ئەوەی کە ئاگری دۆزەخ لەناخیدایە.

*　　　*　　　*

وە (عەلی کوڕی حوسەین) تەمەنی لاویی یەتی و فێربونی زانستی تەواوکرد، کە کۆمەلٚگای شارستانیەتی نموونەیی درووست بوو، بەهۆی لاوێکی پۆچوو زیاتر لەهەموو لاوەکانی نەوەی (هاشم) لەخودا پەرەستی و خۆپارێزی و... گەورەیی و ڕەووشت بەرزی و... چاکەو بەخشندەیی و... شارەزا لەزانست و زانیاریەکان دا...

لەخودا پەرستی و خۆپارێزییدا گەشتبووە ئاستێك، داچلەکانێك دایدەگرت لەنێوان دەستنوێژگرتن و نوێژەکەیدا، کە خەریك بوو هەموو ئەندامەکانی لەشی لەیەك جیا دەبوونەوە.

کاتێك لەو بارەوە دوێنراوە فەرمویەتی: ئەی هاوار بۆتان!!... وەك ئەوەی کە ئێوە نازانن من بۆلای کیٚ خۆم ئامادە دەکەم و ڕادەوستم... وە نازانن مەبەستم کیٚ یە کە لەگەلٚی بدوێم و گریٚ کوێرەی دلٚمی لابکەمەوە !.

*　　　*　　　*

وە ئەو لاوە (هاشم)ی یە لەچاکەکاری خوداپەرستیدا و پوختەیی جیٚ بەجێکردنی خودا پەرستی یەکانیدا گەشتبووە ئاستێك، کە خەلٚکی بە (زَینَ العابدین) (شۆخ و شەنگی خوداپەرستان) بانگیان دەکرد... تا وایلێهات گەلەکەی ناوەکەیان لەیادکرد و، نازناوەکەی بەتەواوی کاریگەری پەیداکرد بەسەر ناوەکەیدا... وە لە درێژەپێدانی کوڕنووشیدا و پۆچوونی تیایدا گەشتبووە ئاستێك کە خەلٚکی شاری (مەدینە) بانگیان دەکرد بە (سەججاد) واتە زۆر کوڕنووشبەر...

وە لەناخ و بێگەردی و دەروون پاکی دا گەشتبووە ئاستێك كەناویان لیّ نابوو (الزَّکي) واتە (بیّ گەرد لە گوناح)

وە (زەینو لعابدین) خودای لیّ رازی بێت دڵنیابوو لەوەی کەگیانی خوداپەرستی (نزایە)... وە ئەو نزایانەی کە زیاتر بەلایەوە خۆش بوو، وە دڵی پێیان دەکرایەوە، ئەو نزایانە بوو کەلەو کاتەدا دەیکرد کەدەستی بە پەردەی (کەعبە)وە بوو.

جا کاتێك کە خۆی دەدایە پاڵ (ماڵی دێرینی) خودای باڵادەست دەیفەرموو: پەروەردگار لە سۆز و میهرەبانیت تام و چێژت پیّ بەخشیم ئەوەندەی بە شایستەت بینی بۆم... وە بەهرەکانت ڕشت بەسەرما ئەوەندەی کە شایستەت بینی بۆم... جا وا منیش هانات بۆ دەهێنم و بەبیّ ترس... و داوای دڵنەوایت لیّ دەکەم بەبیّ بیم وترس...

پەروەردگار وا من هانام بۆلای جەنابت دەهێنم، هانای کەسێك کە هەژاری و ئاتاجی پشتی شکاندوەو زۆری بۆ هێناوە لەبەر ئەوە هانای هێناوە بۆلای سۆز و میهرەبانی جەنابت.

وە هێزی لێبڕاوە بۆجیّ بەجێکردنی مافەکانی جەنابت بەسەریەوە جا بەهانامەوە وەرە، نزای ئەو خنکاوە نادیارە پەسەند بفەرموو کە جگە لەجەنابت ئەی بەخشندەترینی بەخشندەکارانی کەسێکی دی شکانابات بۆ رزگارکردنی.

* * *

(تاووسی کوڕی کەیسان) جارێکیان (زەینولعابدین)ی بینی لەسێبەری (ماڵە دێرینەکەدا) (کەعبە) خۆی دەکێشایەوە خۆکیشانەوەی کەسێك لەکاتی گیان لەدەست داندا... وە دەگریا، گریانی کەسێکی دەردەدار... وە نزای دەکرد نزای کەسێکی ناچار.

(تاووس) ڕاوەستاوە چاوەڕێی کرد، تالە گریانەکەی لیّ بوویەوە، وە لەنزاکانی دەستی کێشایەوە، جا لیّ ی چووە پێشەوەو پیّ ی ووت:

ئەی (نەوەی[1] پێغەمبەر خودا) (ﷺ) لەسەر ئەو شێوەیە جەنابتم بینی، لەگەڵ ئەوەدا کە جەنابت سێ پایە بەرزیت هەیە کە ئومێدم وایە جەنابت بەهۆیانەو لەبیم ترس پارێزراوبیت. ئەویش فەرمووی: ئەی (تاووس) ئەوانە کامانەن؟.

تاووسیش ووتی: یەکەمیان ئەوەیە کە بێگومان جەنابت نەوەی (پێغەمبەر)ی خودای (ﷺ) دووەمیان: تکای بابە گەورەت بۆ جەنابت... سێ یەمیان: میهرەبانی زاتی (الله)...

ئەویش فەرمووی: ئەی (تاووس) بەڕاستی بەوەی کەمن یەکێکم لە نەوەکانی (پێغەمبەر)ی خودا (ﷺ) ناپارێزرێم لەترس و بیم، پاش ئەوەی کە گوێبیستی فەرموودەی خودای بالاَ دەست بووم: فَإِذَا نُفِخَ فِي ٱلصُّورِ فَلَآ أَنسَابَ بَيۡنَهُمۡ يَوۡمَئِذٖ وَلَا يَتَسَآءَلُونَ ﴿١٠١﴾ (المؤمنون _آية_١٠١).

واتە: کاتێك فوکرا بەکەڕەنادا، نەخزمایەتی لە نێوانان دەمێنێ و نەکەسیان لەکەس دەپرسێ. وە دەربارەی تکای باپیرم بۆمن، ئەوەتا خودای بالاَدەست دەفەرمووێت: وَلَا يَشۡفَعُونَ إِلَّا لِمَنِ ٱرۡتَضَىٰ (الأنبياء_٢٨)

واتە: هەرکەسێ خودا خۆی رازی نەبێ ناتوانن تکای بۆ بکەن.

وە دەربارەی سۆز و میهرەبانی خودای بالاَ دەست، ئەوەتا دەفەرمووێت: إِنَّ رَحۡمَتَ ٱللَّهِ قَرِيبٞ مِّنَ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴿٥٦﴾ (الأعراف _٥٦)

واتە: بەڕاستی سۆز و میهرەبانی خودای بالاَ دەست نزیکە لە چاکەکارانەوە، بە واتایەکی دیکە ئەو کەسانەی چاکەکارن، لەبەزەیی و میهرەبانی خودا نزیکن.

* * *

[1] (یابن رسول الله) (ئەی نەوەی پێغەمبەری خودا) (ﷺ) : واتە: کوڕی (حوسەینی کوڕی عەلی) مە (حوسەین) کوڕی (فاتیمەی کچی پێغەمبەر) (ﷺ) بوو.

خودا پەرستی و خۆپاریزی رژابووە بەسەر (زەینولعابدین)دا ئەوەندەی کەخودای بالأدەست ویستبووی کە بیرێژێت بەسەریدا، لەسیفاتی بەرز و، خانەدانی و، لەسەرخۆی و خۆگری...

تا بەشێوەیەك کە پەراوەکانی ژیاننامەرازابووەوە بەدەنگوباسە نموونەیی کانی ژیانی و لاپەرەکانی دەدرەوشایەوە بە جوانی وناوازیی هەڵوێستەکانی...

لە نموونەی ئەوانە ئەوەی کە (حەسەنی کوری حەسەن) گێرایەوەو ووتی: دژایەتی و ناکۆکیەك روویدا لە نێوان من و ئامۆزاکەم دا (زەینولعابدین) جا منیش چووم بۆلای، کە زۆر لیّ ی تووڕە بووم( ئەویش لەو کاتەدا لەگەڵ هاورێکانیدا بوو لە مزگەوت) جا هیچ شتێك نەما لەووتەی ناشیرین کە پێم ووت، بەلأم ئەو بێدەنگ بوو هیچی نەدەووت...

پاشان بەجێم هێشت... کاتێك کەشەو داهات، بینیم کەسێك هاتوەو دەدات لەدەرگا کە منیش چووم بزانم کیّ یە... کە بینیم (زەینولعابدین) بوو... ئەوەی کە هاتە خەیاڵم ئەوە بوو کە ئەو هاتووە.... ماڤ خۆی وەربگرێتەوەو ئازارم بداتەوە... بەلأم ئەو ووتی:

ئەی برای خۆم ئەگەر تۆ راستگۆ بوو بیت لەوەدا کە بەمنت ووت، ئەوە لەخودا دەخوازم لەمن خۆشبێت... خۆ ئەگەر راستت نەووتبێت، لەخودا دەخوازم لێت خۆشبێت ، پاشان سلأوی لێکردم و رۆشت... منیش بەدووی کەوتم هەتا پیّ ی گەیشتم، ئەوجا پێم ووت: سوێندت بۆ دەخۆم جارێکی دی کارێك ناکەم کەتۆ دڵمەند بکات.

ئەویش لێم جیابوویەوە و ووتی: تۆش گەردنت ئازاد بێت لەسەر ئەوەی کە پێت ووتم.

*		*		*

وە یەکێك لەنەوەکانی شاری (مەدینە) گێرایەوەو ووتی: (زەینولعابدین) لەمزگەوت دەرچووە دەرەوە، منیش شوێنی کەوتم، هەرنزیکی بوومەوە، دەستم کرد بە جنێوو قسەی ناشیرین پێی، بەبیّ هیچ هۆکارێك، جا خەڵکی کەئەو ناڕەواییەیان دی، هێرشیان کردە سەرم تا بمگرن... خۆئەگەر بیانگرتمایە بەدەستیانەوە دەرنەچووم، پشتیان دەشکاندم.

لەو کاتەدا (زینولعابدین) لایکرد بەلای خەڵکەکەوە فەرمووی:

واز لەو پیاوە بهێنن... وازی لێبهێنن بۆمن... لەسەر من هیچی لێ مەکەن... جا کەبینی من تووشی ترس و بیم بووم، بەڕوویەکی گەشەوە هات بۆلام، وە هەوڵی دا دڵنیام بکاتەوەو، ترس و بیمە کەم بڕەوێنێ، پاشان پیٚ ی ووتم:

ئەوەی پێتکرا لە جنێوو ووتەی ناشیرین پێت وتین و ئەنجامت دا، وە هیچ شتێکیش لە کاروباری ئێمە کە شایستەی ئەوە بێت لەتۆ شاراوە نەبوو.

پاشان فەرمووی پێم: ئایا پێویستی و ئاتاجی یەکت هەیە کەیارمەتیت بدەم لەسەری؟ منیش حەیام لێ کردو هیچ شتێکم نەووت... کاتێك کە ئەو شەرمەی لێ بینیم بوو ببەیەکی بەسەر شانەوە بوو، دای بەسەر شانی منداو... فەرمانی دا (هەزار) درهەمیان دامێ. ئەوجا منیش هەر کاتێك لەدوای ئەوە کە دەمبینی گەواهیم دەداو پێم دەووت بەڕاستی تۆ لەنەوەکانی (پێغەمبەر)ی خودای (ﷺ).

وە یەکێك لەبەندەکانی گێڕایەوە ووتی:

منی لاو بەندەی (عەلی کوڕی حوسەین) بووم، ڕۆژێکیان ڕەوانەی کردم بۆ ئەنجامدانی پێویستییەکی، منیش کەمتەرخەمیم ئەنجام دا لەجێ بەجێ کردنی کارەکەدا، جا کاتێك کە هاتمەوە لای، دارکاری کردم... منیش دەستم بەگریان کرد، وەزۆر لێ ی شلوێ بووم، چونکە هیچ کەس وەك من لەپێش مندا ئاوا دارکاری نەکردبووم، بۆیە پێم ووت:

لەخودا بترسە... لەخودا بترسە، ئەی (عەلی کوڕی حوسەین)... کارم پێ دەسپێرێت و، منیش بۆت ئەنجام دەدەم، کەچی لێشم دەدەیت؟!.

ئەویش کە ئەو هەڵوێستەی منی بینی دەستی بەگریان کرد و ووتی: بڕۆ بۆ مزگەوتی (پێغەمبەری) خودای (ﷺ) وەلەوێ دوو ڕکات نوێژ بکەو پاشان بڵێ:

خودایە لە (عەلی کوڕی حوسەین) ببورە... جا کە ڕۆیشتیت و ئەوەت کرد، ئەوە تۆ سەربەستی لە راهی خوادا. منیش ڕۆیشتم و دوو ڕکات نوێژم کرد و نزاکەم کرد... ئیتر دوای ئەوە جگە بەسەربەستی نەچوومە ماڵی (عەلی).

وە خودای بالاّ دەست پیت و بەرەکەتی خستبووە ماڵ و سامانی (زەینولعابدین)، وە ڕۆژی بەسەردا ڕشتبوو چۆن ڕشتێك... لە بازرگانی قازانج کەر و... کشت و کاڵی بەرهەمدا... کە بەندەکانی پیٚ ی هەڵدەسان.

جا ئەوەبوو کشت وکاڵ و بازرگانی یەکەی خێر و بێرو دارایەکەی زۆری دەست خستبوو... بەڵام (زەینولعابدین) دەوڵەمەندی تووش لووت بەرزی نەکردبوو. وەئەو بەهرەو بەرهەمانە لەخۆی بایی نەکردبوو... بەڵکو بەسەروەت و سامانی دونیای کردبووە هۆکارێك بۆ مسۆگەر کردنی ژیانی دواڕۆژ لە خزمەتی خودادا. بەڕاستی سامانی ئەو سامانی چاك بوو لەدەستی بەندەی چاك دا.

کاتێك کە تاریکی شەو دادەهات، کیسە ئاردی هەڵدەگرت و دەیدا بەسەر پشتە لاوازەکەیدا، لەو کاتەدا کە تاریکی دونیای پۆشیبوو، وە خەڵکی نوستبوو... دەستی بەگەڕان دەکرد بەکۆڵانەکان و گەڕەکەکانی شاری (مەدینە)دا، تا کۆڵەکەی بگەیەنێتە ئەوانەی کە ئاتاجیان پێ یەتی، بەتایبەتی ئەوانەی کە بەرزی ناخیان (عِزَّةُ النَّفس) نەیدەهێشت کە دەستی لە خەڵك پان کەنەوە.

جا ڕۆژێك لە خەڵکی شاری (مەدینە) دەژیان و وە خوراکیان بۆ ئەو ئەهاتەماڵەوە بەبێ ئەوەی بزانن ئەو ڕۆزیەیان لەکوێ و بۆ دێت..جا کاتێك کە (عەلی کوڕی حوسەین) وەفاتی کرد، ئەو خەڵکە ڕۆزیەکەیان لەدەست دا، جا زانیان کە سەرچاوەکەی (عەلی) بوو کە بەنهێنی خێری پێ دەکردن.

وە کاتێك (زەینولعابدین) خرایە سەر (تەتەشۆر) بۆ شۆردن، ئەوانەی کە شۆردیان سەرنجیان دا... بینیان کە ناوشانی پشتی ڕەش بووەتەوە، جا ووتیان: ئەوەچی یە؟.

پێیان ووترا: لەڕاستیدا ئەوە کاریگەری هەڵگرتنی کیسە ئاردە بۆ (صەد) ماڵ بە نهێنی لەساڵەکانی شاری (مەدینە)، کە بە وەفاتی ئەو ڕۆزیەکەیان نەما.

بەڵام دەنگوباسی (عەلی کوڕی حوسەین) لەبارەی ئازادکردنی بەندەکانەوە، کاروانچیان دەیانگەیاندە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوای ووڵات. چونکە ئەو کارەی لەسەروو هەموو بیرکردنەوەیەکی خەڵکییەوە بوو... وە سەرنجی شارەزایانی پێ پەڕاندبوو. ئەو بەندەی ئازاد دەکرد کە چاکەیەکی ئەنجام بدایە، وەك پاداشتێك لەسەر چاکەکەی...

وەبەندەی ئازاد دەکرد ئەگەر خراپەیەکی ئەنجام بدایەو دوایی پەشیمان ببوایەتەوە، لەپاداشتی پەشیمانبوونەوەکەیدا... هەتا گێڕەرەوان گێڕاویانەتەوە (هەزار) بەندەی ئازاد کردووە... وە هەرگیز هیچ کام لەبەندەکانی زیاتر لەساڵێك بەکار نەهێناوە وەزۆرترینی ئازاد کردنی بەندەکانی لەشەوی چەژنی ڕەمەزاندا ڕووی داوە...

جا لەو شەوە پیرۆزەدا ئەوەندەی کە خودا بڕیاری دابێ ئازادی دەکردن. وە داوای لێ دەکردن کە ڕوو بکەنە ڕووگە (قیبلە) بڵێن: خودایە ببورە لە (عەلی کوڕی حوسەین).

پاشان دوای ئەوە، ئەوەی پێویست بوو بۆئەوەی جەژنەکەیان و خۆشیەکەیان بۆ بکات بە دوو جەژن و دوو خۆشی، بۆی دابین دەکرد.

* * *

وە (عەلی کوڕی حوسەین) بەشێوەیەك لە دڵی خەڵکی دا جێگەی خۆی کردبووەوە کەهیچ مرۆڤێك لە چاخی خۆیدا ئەو پلەو پایەی نەبوو... بەڕاستی خەڵکی خۆشیان دەویست، بەجوانترین خۆشەویستی... وەبە گەورەیان ڕادەگرت، بەگەورەترین شێوە...

وە وابەست بوون پێیەوە، بەوپەڕی خۆشەویست و وابەستنەوە... وە ئارەزوومەند و تامەزرۆی بینینی بوون، بەوپەڕی ئارەزوومەندیەوە... ئەو خەڵکە چاودێریان دەکرد، تا بەهرەمەند بن بەبینینی کاتێك لەماڵ دەهاتە دەر، یان دەچووە ماڵەوە... یان دەچوو بۆ مزگەوت، وەیان لەمزگەوت دەگەڕایەوە.

* * *

گێڕاوەتەوە کە (هیشامی کوڕی عەبدولمەلیك) دەچێتە شاری (مەککە) بۆ حەج، وە لەو ڕۆژگارەدا جێنشینی بووە (وَليُّ العَهد) ویستویەتی سووڕی دەوری (کەعبە) بدات، وە (بەردە ڕەشەکە) ماچ بکات...

جا لەو کاتەدا ئەو سەربازانەی کەپارێزگاری بوون، خەڵکیان ئاگادار دەکردەوەو، تا ڕێگەی بۆ ئاسان و فراوان بکەن... بەڵام هیچ کام لەخەڵکی گوێیان بۆ نەگرت، وەڕێیان بۆ نەکرانەوەو دەیان ووت:

ماڵی خودایە و... خەڵکیش هەموو بەندەی ئەون... جا کە خەڵکی ئالەو حاڵەدا بوون... دەنگی (لا إله إلاّ الله) و (اللهُ أكبَر) لە دوورە وە دەهات...وە خەڵکیش گەردنیان هەڵبڕیبوو سەیریان دەکرد بەرەو ئەو دەنگە... کاتێك بینیان، پیاوێکە لەناو کۆمەڵێك خەڵکدا کەلە دەوری کۆبونەوە...

ڕووگەش و ڕوواڵەت جوان و لەش لاواز و، ڕوو درەوشاوەو دامەزراو بەڕێز.. دەڕوات بەڕێدا کراسێك و چاکەتێکی لەبەردایە... وە لەنێو چاوانیدا نیشانەی کوڕنووش بردن دەرکەوتبوو.... خەڵکی خۆیان لادەداو ڕێگەیان بۆ دەکردە و، بە ڕیز

ریز دەرۆیشتن و بەئارەزووەوە سەرنجیان دەداو، حەزیان دەکرد کە ببیبینن، تا گەیشتە (بەردە ڕەشەکە) ماچی کرد...ئا لەوێدا یەکێك لەدەست پێوەندەکانی (هیشامی کوڕی عەبدولمەلیك)دا و پیّ ی ووت:

ئا ئەوە کیّ یە خەڵکی ئەو هەموو ڕێزەی لێدەگرن و ئەوەندە بەگەورە رایدەگرن؟!.
(هیشام) ووتی: نایناسم. (فەرەزدەق)[1] لەوێدا ئامادەبوو، ووتی:
ئەگەر (هیشام) نایناسیّ من ئەیناسم... و دونیا هەمووی دەیناسیّ ئەوە (عەلی کوڕی حوسەین)ە خودا لە خۆی و باوك و باپیری رازی بێت.

ئینجا ئەم هەڵبەستەی لەوەسفیدا ووت:

هُوَ الذّي تَعْرِفُ البطحاءُ وطأَتَهُ
والبَيْتُ يَعْرِفُهُ والحِلُّ والحَرمُ

واتە: ئەوە ئەو کەسەیە دۆڵی (مەککە) دەیناسیّ و شوێن پیّ ی دیارە، هەروەها (کەعبە)و ئەوانەی لە ئیحرام دا نین و لە ئیحرام دان دەیناسن.

هذا ابنُ خَيْرِ عِبادِ اللهِ كُلِّهِمْ
هذا التَّقيُّ النَّقيُّ الطَّاهِرُ العَلَمُ

ئەو کوڕی باشترین هەموو بەندەکانی خودایە، ئەو خودا پەرەست و خاوێن و بیّ گەرد و زانایە.

هذا ابنُ فاطمةٌ إنْ كُنْتَ جاهِلَهُ
بِجَدِّهِ أنْبِياءُ اللهِ قَدْ خُتِموا

ئەو نەوەی (فاتیمە)یە ئەگەر تۆ نایناسیت، بەباپیری ئەو کۆتایی پەیامبەرانی خودا هات.

---

[1] (الفَرَزْدَق)یەکێك بووە لە شاعیرانی چینی یەکەم لەچاخی ئەمەوی دا.

فَلَيْسَ قَوْلُكَ (مَنْ هذا) بِضائِرِه
العَرَبُ تَعْرِفُ مَنْ أنْكَرْتَ والعَجَمُ

ئەو ووتەی تۆ (ئەوە كێ یە) بەكەم زانین بۆ ئەو دانانرێت، عەرەب و عەجەم دەیناسن ئەوەی كە تۆ نایناسیت.

كِلْتا يَدَيْهِ غِياثٌ عَمَّ نَفْعُها
يَسْتَوْكِفانِ، وَلا يَعْرُوهُما عَدَمُ

هەردوو دەستی پڕن لە یارمەتی كە سوود بەخشن بەوانەی كە داوای دەكەن، وە نی یە نازانن

سَهْلُ الخَلِيقَةِ، وَلا تُخْشى بَوادِرُهُ
يُزِينُهُ إثْنانِ: حُسْنُ الخُلُقِ والشِّيَمُ

سرووشی ئاسانەو، ڕووبە ڕووبونەوەی ترسێنەر نی یە، دووشت جوانیان پێ بەخشیوە: ڕەوشت بەرزی و سیفەتی جوان.

ما قالَ (لا) قَطُّ إلاّ في تَشَهُّدِه
لَوْلا التَّشَهُّدُ كانَتْ لاءَهُ نَعَمُ

هەرگیز نەیوتووە (نەخێر) مەگەر لە شایەتومانیدا، خۆ ئەگەر شایەتومان نەبوایە (نەخێرەكەی) بەڵێ دەبوو.

عَمَّ البَرِيَّةَ بِالإحْسانِ فَانْقَشَعَتْ
عَنْها الغَياهِبُ وَالإمْلاقُ وَالعَدَمُ

بەچاكەو بەخشندەیی هەموو لایەكی گرتبوەو، تاریكی یەكان و هەژاری و نەبوونی ڕەواندبووەوە.

إذا رَأَتْهُ قُرَيْشٌ قالَ قائِلُها
إلى مَكارِمِ هذا يَنْتَهي الكَرَمُ

كە هۆزی (قورەیش) بیبنی، ووتە بێژەكەی ووتی بەخشندەیی لەلای ئەو كۆتایی یە.

یُغضي حَیاءً مِنْ مَهابَتِه
فَما یُکَلَّمُ إلاَّ حینَ یَبْتَسِمُ

چاو دادەخرا لەئاستیدا وەشەرم کردن لێ ی وەهەروەها لەبەر نەفس بەرزی و گەورەیی، وە گفتوگۆی لەگڵ نەدەکرا مەگەر کاتێك زەردەخەنە بکردایە.

بِکَفِّه خَیْزُرانٌ ریحُهُ عَبِقٌ
مِنْ کَفِّ أرْوَعَ، فِي عِرْنِینِه شَمَمُ

لەبەردەستی دابوو (خەزورانێك)[1] کە بۆنەکەی پەخش دەبوویەوە، لەدەستی کەسێکی دڵ ووریای بە ئاگا، کەروویدا عیزرەت و گەورەیی دەبینرا.

مُشْتَقَّةٌ مِنْ رَسولِ اللهِ نَبْعَتُهُ
طابَتْ مَغارِسُهُ والخِیْمُ والشِّیَمُ

بنەماکەی لە پێغەمبەری خودا (ﷺ) وەرگیراوە، جا بۆیە بۆندار بۆنبەخشە لق و پۆپەکان و سروش و رەوشت و سیفەتەکانی.

خودای بالآدەست لەکچەزای پێغەمبەری خودا (ﷺ) رازی بێت... بەڕاستی وێنە و نموونەیەکی ناوازە بوو بۆ ئەو کەسەی کە لەنهێنی و ئاشکرادا لەخودا دەترسێ... وە هەمیشە ناخی خۆی دەخواردەوە لە ئازارێکی دەروونیدا بوو لەترسی سزای خوداو، بەتەمای پاداشتی لەسەر ئەو ئازارە دەروونی یە...

* * *

خودایە داواکارم لەسۆز و بەزەیی و دەست گوشادی و خوداپەرەستی و خۆپارێزیدا رێنماییمان بفەرموو تا هەمان ڕچەو ڕێبازی (عەلی کوڕی حوسەین) بگرینە بەر.

﴿وەرگێڕ﴾

[1] (خێزران) درەختێکە زۆر بۆنخۆشە، کەبۆنەکەی بڵاو دەبێتەوە، لەهندستان زۆرتر هەیە.

بۆ زیاتر شارەزابوون لە ژیاننامەی (زەینولعابدین) سەیری ئەم سەرچاوانە بکە:

١- الطبقات الكبرى لأبن سعد: ٢١١/٥
٢- تأريخ البخاري: ٢٦٦/٦
٣- الأسماء واللغات: القسم الأول من الجزء الأول: ٣٤٣
٤- الجرح والتعديل: القسم الأول من المجلد الثالث: ١٧٨
٥- المعرفة والتأريخ: ٢٦٠/١ -٥٤٤
٦- طبقات الفقهاء للشيرازي: ٦٣
٧- تأريخ ابن عساكر: ٥١٥/١٢
٨- المعارف: ٢١٤
٩- وفيات الأعيان: ٢٦٦/٣
١٠- تأريخ الإسلام: ٣٤/٤
١١-العبر: ١١١/٢
١٢-البداية والنهاية: ١٠٣/٩
١٣-النجوم الزاهرة: ٢٢٩/١

# ٢٣ )ئەبو موسلیمی خەولانی (عەبدولای کوڕی ثوب)

**(ئەبو موسلیم ئەوەندە لەخوداپەرستی دا توابووەوە و ڕۆچوو بوو کە دەیفەرموو: ئەگەر بەهەشت یان دۆزەخم بەچاوی سەر ببینیایە لەوە کە هەمەزیاترم نەدەکرد)**
**(عوسمانی کوڕی ئەبی عاتیکە)**

دەنگ و باسی لەدوورگەی عەرب دا (جزیرە العرب) بلأوەی کرد کە (پێغەمبەری) خودای دروودی خوای لەسەر بێ، نەخۆشی زۆری بۆی هێناوە پاش گەڕانەوەی لە (حەجی ماڵئاوایی).

جا شەیتان چووە بنکلێشەی (ئەسوەدەی عەنەسی) بۆ ئەوەی هەڵیبخەڵەتێنێت کە بگەڕێتەوە بۆ بێ بڕوایی پاش بڕواهێنان... وە درۆ بەدەم خودا هەڵببەستێت، جا ئەوەبوو وایدەردەبڕی بۆ گەلەکەی لە (یەمەن)دا کە گوایە ئەو پێغەمبەرێکی رەوانەکراوە لەلایەن خوداوە.

* * *

(ئەسوەدەی عەنەسی) پیاوێکی بەهێز و توانا و، تەن تیسمڕاوو، رەشتاڵەو، شەرەنگێز بوو. وەلە رۆژگاری نەفامی دا (کهانة) واتە زانینی نادیار (مَعْرِفة الغیبِ) بەباشی فێربوو بوو، وە لە فاڵگرتنەوە و هەڵخەڵەتاندنی خەڵکی دا بەتەواوی کارامە بوو...

وە لەسەرو ئەوەوە، زمان پاراو، رەوان بێژوو دڵ ووریا بوو، وە بەتوانا بوو لەسەر یاریکردن بەژیری خەڵکی بەشتی هیچ و پوچ، وە ڕاکێشانی خەڵکی بەلای خۆی دا بەهۆی دیاری و بەخشنەکانی یەوە. وەکە دەچووە ناو خەڵکی بە رووپۆشی ڕەشەوە



دەچووە ناویان، بۆ ئەوەی خۆی بەکەسێکی بەهەیبەت و زۆر جیاواز لەخەڵکی بنوێنیّ.

وە بانگەوازی (ئەسوەدەی عەنەسی) لە (یەمەن)دا بڵاو بوویەوە، وەك بەربوونی ئاگر لەپووشەڵاك، وە شوێنکەوتنی هۆزەکەی لە (بەنی مەزجج) بۆی لەوەدا زۆر هاریکار بوو. وە ئەو هۆزەش لەو رۆژگارەدا ژمارەیان زیاتر بوو لەژمارەی زۆربەی هۆزەکان، وە هەروەها لە هەموویان بەدەسەلاّتتربوون و، زۆر بەهێز بون. وە هەروەها شتێکی دیکەی کەیارمەتی دا لەسەر ئەوە، ئەوە بوو کە زۆر بەتوانا بوو لەسەر درۆ و هەڵبەستن و چەواشەکردن. وە بۆئەو درۆ هەڵبەستن و چەواشەکردنی خەڵك، زیرەك و جەربەزەکانی لە شوێنکەوتووانی بە کار دەهێنا. وای لە خەڵك گەیاندبوو کە فریشتەیەك لە ئاسمانەوە، نیگای بۆ دەهێنێتە خوارەوە، لەشتە نادیارەکان ئاگاداری دەکات. وە بڕواپێکردنی خەڵکی بەدروستی ئەوەی کە پیّ ی ڕاگەیاندوون، ڕێگای هەمە جۆری دەگرتە بەر.

وەك ئەوەی چاودێر و سیخوڕەکانی لەهەموو شوێنێك بڵاو دەکردەوە، تا چاودێری ووردی کاروباری خەڵکی و کێشە و ڕووداوەکانیان بکەن و.... نهێنی و هەواڵەکانیان بخەنە روو. وە خۆیان بگەیەننە شاراوەکانی ناخیان لە ئاوات و ئازارەکانیان.

وەلەهەمان کاتدا ئەو خەڵکانەیان هەڵدەخەڵەتان، بەوەی کە پەنا بە (ئەسوەد) ببەن و، داوای یارمەتی لیّ بکەن. جا کاتێك کە دەهاتن، ڕووبەڕووی هەر خاوەن ئاتاجی یەك دەبوویەوە بە ئاتاجی یەکەی، وە هەر کێشەدارێك بهاتایەتەلای دەستی بەباسکردنی کێشەکەی دەکرد، وای پیشان دەدان کە ئەو ئاگادارە بەسەر شاراوەو نهێنی یەکانیان دا، وە ئاگای لەوەیە کەلەناخیان دا حەشاریان داوە.

وە لەبەردەمیان دا هەندێك شتی سەرسوڕهێنەرو نامۆی ئەنجام دەدا کە دەستی بەسەر ژیریان دا دەگرت و، بیرو هۆشیانی سەرگەردان دەکرد. جا زۆری نەخایاند کەبە گەورە کار دەرکەوت...وە ناوبانگی بڵاو بویەوە و... شوێنکەوتووانی زۆر بوون....

جا بەهۆی ئەو چاودێرو سیخورە و شوێنکەوتووانەیەوە، دەستی بەسەر (سەنعاء)دا گرت و لەوێشەوە پەلی هاویشت بۆ سەر ناوچەکانی تر... هەتا هەموو ئەو ناوچانەی کە کەوتبوونە نێوان (بەحرەین) و (عەدەن) شوێنی کەوتن....

وە کاتێك کە کاروبار کەوتە دەستی (ئەسوەدی عەنەسی) و کاروباری بەتەواوی سەقامیگر بوو، وە وولآت و خەڵکی ملکەچی بوون. دەستوبرد ڕاپەڕی دژی نەیارەکانی و کەوتە شوێنپێ هەڵگرتنیان، بەتایبەتی لەوانەی کە خودای باڵا دەست باوەڕێکی تۆکمەو جێگیری پێ بەخشی بوون.

بە دینە ڕاستەکەیان و... وە باوەڕێکی دڵنیاو بێ هیچ دڵەڕاوکێ یەك بە (پێغەمبەر)ی خودا (ﷺ)... وە ملکەچی یەك تەواو گوێڕایەڵی بۆ خوداو پێغەمبەرەکەی... وە ڕاستی دەربڕین و ڕاگەیانی و، ڕوو بەڕوو بوونەوەی ناڕەوا...

جا ئەوە وای لێکردبوو کەزۆر بەتوندو تیژی، بێ بەزەییانە ڕووبەڕوویان بێتەوەو، سزاو ئازاری زۆر بەتینیان بدات. لەپێشەنگی ئەوانەدا (عەبدوڵلاّی کوڕی ثوەب) کە ناودەبرا بە (ئەبی موسلیمی خەولانی).

(ئەبو موسلیمی خەولانی) دامەزراو بوو لەسەر پەیڕەوی دینەکەی و... بەهێز بوو لەباوەڕەکەیدا... وە سوور لەسەر دەبڕینی حەق دا ... وەخۆی یەکلا کردبووە بۆ خودای و پشتی لەدونیای جوانی یەکانی کردبوو... وە وازیهێنابوو لەزریق و بریق و لەزەتەکانی دونیا... وە ژیانی تەرخان کردبوو بۆ گوێڕایەڵی خوداو، بانگهێشتنی خەڵکی بۆ گوێڕایەڵی خودا... وە ژیانی دونیای کاتی فرۆشتبوو بە ژیانی هەمیشەیی دوا ڕۆژ، فرۆشتنی ڕێپێدراو...

جا ئەوە پایەیەکی بەرزی پێبەخشی بوو لەناخی خەڵکی دا، وە وایان دەبینی کە پیاوێکی ناخ پاك و، وابەست بەخواوەو، نزا وەرگیراوە لەلایەن خوداوە.

جا بۆیە (ئەسوەدی عەنەس) ویستی کە دەستێکی لێ بوەشێنێ دەستێکی وەها بەهێز... کەترس و بیم لەناخی نەیارانی بانگەوازەکەیدا بڵاوبکاتەوە لەنهێنی و ئاشکرا دا، وەسەرکوتیان بکات سەرکوتکردنێکی تەواو.

جا فەرمانی دا بەوەی کە دارو پەردوو لە گۆڕەپانێك لە گۆڕەپانەکانی (سەنعائدا) کۆ بکرێتەوەو، ئاگری تێبەربدرێ...

وە خەڵکی بانگهێشت کرد تاچۆنیەتی بانگهێشتکردنی زانا و شەریعەت زانی (یەمەن) و خوداپەرستەکەی (ئەبی موسلیمی خەولانی) بۆ گەڕانەوەو (التَّوبە) دان پیانانی بە پێغەمبەریەتی (ئەسوەد)دا ببینن. جالە کاتی دیاریکراودا (ئەسوەدەی

عەنەس) روویکردە ئەو گۆڕەپانەی کە جمەی دەهات لە خەڵك و شەپۆلی دەدا. وە سیخوڕ دار دەستو، گەورە شوێنکەوتووانی دەوریان دابوو.

وە پاسەوان و فەرماندە سەربازیەکانی بەدەوریدا خولیان دەخوارد. ئەویش لەسەر کورسی یەکی گەورە کە بۆیان ئامادەکردبوو لەبەرامبەر ئاگرەکەوە دانیشتبوو... ئا لەو کاتەدا بەبەرچاوی خەڵکەوە (ئەبو موسلمی خەولانی)یان پەلکێش کرد بۆلای... کاتێك ئامادەی بەردەستی بوو، ئەو تاوانکارەیاخی یەی درۆزنە بەلوتبەرزیەوە بۆی ڕوانی و سەرنجی دا...

پاشان ڕوانی بۆ ئەو ئاگرەی کەلەبەر دەمی دا کڵپەی سەندبوو... وەسەرنجی دا... ئەوجا لایکرد بەلای (ئەسوەد)ەوە ووتی:

ئایا گەواهی دەدەیت کە (موحەمەد) ڕەوانەکراوی خودایە؟. ئەویش ووتی: بەڵێ گەواهی دەدەم کە ئەو بەندەو ڕەوانەکراوی خودایە... وە ئەو گەورەی هەموو ڕەوانەکراوەکانە، وەهەروەها کۆتایی پێغەمبەرانە.

جا (ئەسوەدی عەنەس) دەم و چاوی سوور داگیرسا و ناوچاوانی گرژبوو ووتی: ئایا گەواهی دەدەیت کەمن رەوانەکراوی خودام؟.

ئەویش ووتی: بێ گومان بەگوێکانم کەڕن، ئەوەی کەتۆ دەیڵێت نایبیستم... ئەویش ووتی: کەوابوو فڕێت دەدەمە ناو ئەو ئاگرە. (ئەبو مەسلیم) لەوەلأمیدا ووتی: ئەگەر تۆ ئەوە ئەنجام بدەیت من بەو ئاگرەی کە سووتەمەنیەکەی دار و پەردووە، خۆم دەپارێزم لەو ئاگرەی کە سووتەمەنیەکەی مرۆڤ و بەردە و سەرپەرشتیارەکەی کۆمەڵێك فریشتەی دڵڕەقن، کە سەرپێچی لەوە ناکەن کە خودا فەرمانیان پێ دەکات، وە ئەوەی کە فەرمانیان پێ دەکرێت ئەنجامی دەدەن.

جا (ئەسوەد) ووتی: پەلەت لێ ناکەم، وە کاتت دەدەمێ تا بەخۆتا بچیتەوە و ژیریت بەکاربهێنیت. ئینجا پرسیارەکەی لێ دووبارە کردەوە و ووتی: گەواهی دەدەیت کە (موحەمەد) ڕەوانەکراوی خودایە؟. ئەویش ووتی: بەڵێ گەواهی دەدەم کە بەبێ هیچ گومانێك ئەو بەندەو ڕەوانەکراوی خودایە، وە بەودا ئایینی ڕاست و رەوان و ڕێنماییکار رەوانەکراوە، وە بە پەیامەکەی ئەو کۆتایی بەهەموو پەیامەکان هاتووە.

جا (ئەسوەد)ە زیاتر تووڕەیی گرتی و ووتی:

گەواهی دەدەیت کە بێ گومان من ڕەوانەکراوی خودام. (ئەبو موسلیم) ووتی:

ئایا ئاگادارم نەکردی کەمن هەردوو گوێم کەڕە لەئاستی ئەو ووتەی تۆدا، وە ئەو ووتەت نابیستم؟!. (ئەسوەدەی عەنەس)ی کە ئەو وەڵامە دەم شکێنەی لە (ئەبو موسلیم) بیست توورە بوونەکەی کڵپەی سەند و، هێمنی خۆی لەدەست دا و ئەندامەکانی لەشی وەك شەق شەقە دەلەرزین... بۆیە ویستی کەفەرمان بدات بەوەی کە (ئەبو موسلیم) فرێبدرێتە ناو ئاگرەکەوە.

ئالەو کاتەدا یەکێك لە گەورە راوێژکارە گومڕاکانی چرپاندی بەگوێیەوەو ووتی:

بەراستی ئەو پیاوە وەك خۆت شارەزای لێی پیاوێکی دەروون پاکە، داواکانی لەلای خودا وەرگیراوە... وە خوداش بڕوادار پشتگوێ ناخات لەچرکە ساتەکانی تەنگانەدا و بەڵکو پشتی دەگرێت و سەریدەخات... جا ئەگەر تۆ فرێتدایە ناو ئاگرەکە و، خوداش رزگاری کرد، ئەوە بێ گومان بەهەرچی تۆ دروستت کردوەو بنیادت ناوە لە چرکەساتێك دا لەدەستی دەدەیت تێك وپێك دەچێت.

وە بەدەستی خۆت خەڵکی والێدەکەیت کە پێغەمبەریەکەت بەدرۆبخەنەوە... خۆئەگەر ئاگرەکە سوتاندی ئەوە زیاتر لەلای خەڵکی گەورە دەبیت... وە جێگەی رامانیان دەبیت... وە وەك شەهیدان بەرز رایدەگرن و بەهەمان چاو سەیری دەکەن... جا کەوابوو مەنەتباری بکە و دووری بخەرەوە لە وولآت، وەخۆتی لێ رزگار بکەو، دڵ ئارام ببە، (ئەسوەد) کە گوێبیستی راوێژکارە گومراکەی بوو، بڕیایدا بەگوێی بکات، بۆیە فەرمانی دا بە (ئەبو موسلیم) هەر لەو چرکەساتەیدا[1] وولآت بەجێ بهێڵێت.

(ئەبو موسلیمی خەولانی) روویکردە شاری (مەدینە)، وەلە ناخی خۆیدا ئاواتی ئەوەبوو کە بەخزمەتی (پێغەمبەر)ی خودا بگات، دروودی خوای لەسەر بێ.

چونکە ئەو بڕوای پێهێنابوو پێش ئەوەی چاوی روون ببێت بەبینینی، وە دڵشاد بێت بەخزمەت گەشتن و هاوڕێیەتی ئەو زاتە.

بەڵآم لەوەدا بوو کە بگاتە دەورووبەری شاری (مەدینە)ی پیرۆز رووبەری دەنگوباسی وەفاتی (پێغەمبەر)ی خودا (ﷺ) بوویەوە وە گوێبیستی ئەوەبوو کە (ئەبی بەکری صدیق) رەزای خوای لەسەر بێ بووەتە (جێ نشین) (خەلیفە) لەدوای ئەو. جا زۆر

[1] زۆربەی ئەو سەرچاوانەی لەبەر دەستماندایە ئاماژە بەوە دەکەن کە ئەو فرێدرایە ناو ئاگرەکەوە، وە ئاگرەکەش ساردو سەلامەت بوو لەسەر هەروەك لەسەر (ابراهیم) علیە السلام.

دڵتەنگ و غەمبار بوو بە بیستنی وەفاتی (پێغەمبەر) (ﷺ) دڵتەنگ بوونێك کە قوڵایی دڵی گرتبووەوە.

* * *

(ئەبو موسلیم) گەیشتە شاری (مەدینە)، وە روویکردە مزگەوتی (پێغەمبەر)ی خودا (ﷺ). جا کاتێك ئامادەی مزگەوتەکە بوو، ووشترەکەی بەستەوە لەنزیکی دەرگاکەیەوە، و چووە ناو (حەرەمی پیرۆز)ەوە، سڵاویکرد لە (پێغەمبەر)ی خودا (ﷺ). ئینجا چووە سوچێکی مزگەوتەکە و دەستی بەنوێژکردن کرد... کاتێك کەلە نوێژەکەی لیێ بوویەوە، (عومەری کوڕی خەتتاب) لێی چووە پێشەوە تا چووەبەردەمی و پێی ووت: ئەی برا لەکوێوە؟

ئەویش ووتی: لە (یەمەن)ەوە.

(عومەر) فەرمووی: خودای باڵا دەست سەرئەنجامی ئەو هاوڕێیەی ئێمەی بەکوێ گەیاند، کە دوژمنی خودا ئاگری بۆکڵپەدار کرد، ئایا خودا رزگاری کرد لێ ی؟ ئەویش ووتی: ئەو بەهرەمەند بوو لەلایەن خوداوە رزگاری بوو... جا (عومەر) فەرمووی: سوێندت دەدەم بەخودا تۆ ئەونیت؟. ئەویش ووتی: بەڵێ.

جا (عومەر) رەزای خوای لەسەر بێ نێوچاوانی ماچ کرد و ووتی: ئایا دەزانی خودا چی کرد بەدوژمنی خوداو دوژمنی تۆ؟.

ئەویش ووتی: نەخێر، چونکە لەو کاتەوە (یەمەن)م بەجێهێشتووە ئاگام لە دەنگوباسی نەماوە.

(عومەر) فەرمووی: خودای باڵادەست دایبە کوشت لەسەردەستی ئەو بڕوادارە ڕاستگۆیانەی کەمابوونەوە، وە دەوڵەتەکەشیان لە ناو برد...

وەشوێنکەوتووانیانی گێڕایەوە بۆ ئایینی خودا... ئەویش فەرمووی: سوپاس وستایشی بۆ ئەوخودایەتی کە کۆتایی بەژیانی نەهێنام هەتا چاوم روون بوویەوە بەکوژرانی ئەو و، گەڕانەوەی هەڵخڵەتینراوان لەخەڵکی (یەمەن) بۆ باوەشی ئیسلام.

(عومەر)یش پیێ فەرموو:

منیش سوپاس و ستایشی ئەو خودایە دەکەم کە لە (ئوممەتی موحەمەد)دا کەسێکی پیشان دام کە ئەوەی پێکراوە کە کراوە بە پێغەمبەر خودا (ئیبراهیمی باوکمان) سەلامی خودای لەسەربێ.

پاشان (عومەر) دەستی (ئەبو موسلیمی) گرت و، بردی بۆ خزمەتی (ئەبو بەکر)، جا کاتێك (ئەبو موسلیم) گەشتە خزمەتی (ئەبو بەکر) (خەلیفە) موسڵمانان سڵاوی لێکرد و پەیمانی دایە.

ئەوجا (ئەبو بەکر) ، (ئەبو موسلیم) لەنێوان خۆی و (عومەر)دا دانا... وە لەگەلیدا دەستیان کرد بەگێڕانەوەی ئەوەی کەڕوویدابوو لەنێوان ئەو و (ئەسوەدی عەنەسی)دا.

*　　　　*　　　　*

(ئەبو موسلیمی خەولانی) ماوەیەك لەشاری (مەدینە)دا مایەوە، وەلەو ماوەیەدا بەزۆری لە مزگەوتی (پێغەمبەر)ی خودادا درووودی خودای لەسەر بێ کاتی بەسەر دەبرد... وەئەوەندەی ویستی خودای لەسەر بوو لە (ڕەوزەی پیرۆز)دا نوێژی بکردایە نوێژی دەکرد، وە لەدوای ئەوە ئەوەندەی بۆلای دەستبدایە زانستی وەردەگرت و فێردەبوو لەگەورە هاوڕێیان، لەنموونەی ئەوانە (ئەبی عوبەیدی جەراح)، وە (ئەبی زەڕی غیفاری)، وە (عوبادی کوڕی سامیت)، وە (موعازی کوڕی جەبەل)، وە (عەوف کوڕی مالیکی ئەشجەعی). پاشان لەدوای ئەوە (ئەبو موسلیم) ئەوەی بەباش زانی کە کۆچ بکات بۆ وولاتی (شام) و بیکاتە شوێنی مانەوەو نیشتەجێبوونی.

وە لەوەدا مەبەستی ئەوەبوو کەنزیك بێت لە سنوورەکانی شامەوە لەگەڵ دوژمناندا، تا هاوبەشی بکات لەگەڵ سوپاکانی موسڵمانان دا لەغەزاکردن دا لەگەڵ (ڕۆم)دا، وەتا ببێتە خاوەنی پاداشتی پارێزگاری لە سنوورەکانی دەوڵەتی ئیسلامی لە ڕێگەی خودادا. وەکاتێك کە جێ نشینیەتی کەوتە دەستی ئەمیری بڕواداران.

(موعاوییەی کوڕی ئەبی سوفیان) خودای لێ ڕازی بێت، (ئەبو موسلیم) زیاتر و زیاتر سەردانی دەکرد و ئامادەی کۆڕەکانی دەبوو... جا لەگەلی دا کۆمەڵێك هەڵوێستی دیار و بەناوبانگی هەبوو، کە گەواهی دەدا لەسەر پایە بەرزی ئەو دوو پیاوە... وە گوزارشتی دەدا لە سیفەتە بەرزەکانیان... لەوانە:

(ئەبو موسلیم) چووە خزمەتی (موعاوییە) خودا لێ ی ڕازی بێت، بینی لەپێشەوە کۆڕێك لە کوڕە قەرەباڵغەکانیدا دانیشتووە. وە پیاوانی دەوڵەتەکەی و، فەرماندەکانی

سوپاکەوی و، پیاو ماقوڵان دەوریان داوە... وە سەرنجی دا خەڵکی زیادەرەووی دەکەن لەرێزگرتن و بەگەورە راگرتنی دا، جا لەسەر ئائەوە زۆر لێ ی ترسا کە بەهۆیەوە تووش ببێت، بۆیە دەست و برد لێ ی چووە پێشەوەو ووتی:

سلاَوت لەسەر بێ ئەی کرێ گرتەی بڕواداران جا خەڵکەکە لایانکرد بەلایەوەو ووتیان: ئەمیری بڕوادارانە... ئەی (ئەبا موسلیم)... ئەویش گوێ ی پێ نەدان ووتی:

سلاَوت لەسەر بێ ئەی کرێ گرتەی بڕواداران خەڵکەکە ووتی: ئەمیری بڕوادارانە ئەی (ئەبا موسلیم). (ئەبو موسلیم) قسەکەیانی نەبیست، وەلای نەکردەوە بەلایانەوەو ووتی:

سلاَو لەسەر تۆ بێت ئەی کرێگرتەی بڕواداران. جاکاتێك کە خەڵکەکە ویستیان بەگژیا بچنەوە (موعاوییە) لایکردەوە بەلایانەوە و ووتی: واز لە (ئەبا موسلیم) بهێنن، ئەو شارازاتر و زاناترە بەوەی کە دەیڵێت جا (ئەبو موسلیم) لایکرد بەلای (موعاوییە)وەو پێ ی ووت:

بێگومان نموونەی تۆ پاش ئەوەی کەخودا کاروباری خەڵکی خستە ئەستۆت، وەك کەسێك وایە کە کرێکارێك دەگرێت، وە بەخێوکردنی مەڕەکانی دەخاتە ئەستۆی، وە کرێ ی بۆ دیاری دەکات لەسەر ئەوەی کە باش بیانلەوەڕێنێت، وەلە فەوتان بیانپارێزێت وە بەروبومیان لە خوری و شیرەمەنیان زیاد بکات...

جا ئەگەر ئەو کەسە هەستا بەوەی کە خراوەتە ئەستۆی بەشێوەیەکی باش، تا گچکەکان گەورە بوون... وە لاوازەکانی قەڵەو بوون... وە ناساغەکان چاك بوونەوە...

بێگومان خاوەن مەڕ کرێکەی دەداتێ و، بۆشی زیاد دەکات بەلاَم ئەگەر ئەو باش نەیلەوەڕاندن، وە لاوازەکانی پشت گوێ خست تا تیاچوون، وەقەڵەوەکان لاواز بوون، بەروبوومیان لەخوری و شیرەمەنی نەماو بەتەواوی کەم بوویەوە... وە بێگومان کرێکەی ناداتێ، وەلێ ی شلوێ دەبێت و سزاکەیشی دەدات. جا ئەوەی کە چاکەو کرێکەتی تیایە بۆخۆتی هەڵبژێرە.

ئەوجا (موعاویە) کە سەری بەرەو زەوی نەوی کردبوو، سەری هەڵبڕی و ووتی:

ئەی (ئەبا موسلیم) خودا لەجیاتی ئێمەو خەڵکی پاداشتی چاکەت بداتەوە، ئەوەندەی کەشارەزات بووین و ناسیومانیت، ئامۆژگاری کاربوویت بۆ خودا و پێغەمبەرەکەی و کۆی موسڵمانان.

*　　　　*　　　　*

(ئەبو موسلیم) ئامادەی نوێژی هەینی بوو لە مزگەوتی (دیمەشق)، کە ئەمیری بڕواداران (موعاویە) ووتاری بۆ خەڵکی دەدا، وە ئەوەی بۆ باسدەکردن کە فەرمانی بەکردنی داوە، ئەویش لێدانی کەناڵێکی نوێ یە لە ڕووباری (بەرە)دا تا ئاوەکەی خاوێن بێتەوە بۆیان (ئەبو موسلیم) لە نێو خەڵکەکەدا بانگی کرد و ووتی: ئەی (موعاویە) بیر بکەرەوە بەبێ هیچ گومانێك کە تۆ دەمریت ئەمڕۆکە یان سبەینێ، وە ماڵەکەت گۆڕێکە لەگۆڕەکان... جا ئەگەر بە توێشوەوە چووینە ناوی، ئەوە لەوێدا توێشووت هەیە... خۆئەگەر بەدوو دەستی خاڵی چوویتە ناوی، ئەوە دەچێتە دەشتێکی چۆڵی کاکی بەکاکی بێ هیچ توێشوویەك. بەڕاستی ئەی (موعاویە) من پەنات پێدەگرم بەخودا کە گومان ببەیت بەوەی کە جێ نشینی هەڵکەندنی کەناڵی رووبارکان و... کۆکردنەوەی سامانەکانە...

بەڵکو جێ نشین کارکردنە بەڕەوا (الاعمال بالحقّ)... وە دواندنە بەڕاستگۆیی وبێ فرت و فێڵ... وە پەلکێشکردنی خەڵکی یە بۆ رەزامەندی خودای بالآدەست... ئەی (موعاویە) بەڕاستی ئێمە گوێنادەین بەلێڵی رووبارەکان ئەگەر سەرچاوەکەمان خاوێن بێت، وە بێ گومان تۆش سەرچاوەی ئێمەی...

جا دەستم بەدامانت تۆ و ستەم... چونکە بەبێ هیچ گومانێك ستەم تاریکی رۆژی رەستا خێزە. کاتێك (ئەبو موسلیم) لە قسەکەی تەواو بوو، (موعاویە) لە (مینبەرەکە)دا دابەزی و هاتە خوارەوە و رووی تێکرد و ووتی:

ئەی (ئەبا موسلیم) خودا بەزەیی پێتا بێتەوە لەجیاتی ئێمە بەباشترین پاداشت پاداشتت بداتەوە.

* * *

وە لەجارێکی تردا (موعاویە) چووە سەر مینبەر، دەستی کرد بە ووتارەکەی، وە لەو کاتەدا دوو مانگ بوو مووچەی خەڵکی بڕیبوو. (ئەبو موسلیم) هاواری کرد و ووتی:

ئەی (موعاویە) بەڕاستی ئەو داراییە نە دارایی تۆیەو نەهی باوکتەو نە هی دایکتە... ئیتر بەچ ماف پێدانێك بەخۆت، لەخەڵکی دەگریتەوە؟!.

ئا لەو کاتەدا تووڕەیی لەسەر رووی (موعاوی) دەرکەوت، وە خەڵکی چاوەڕێیان دەکرد، کە لەئەنجامی ئەو تووڕەییەی چی دەکات بەرامبەر (ئەبو موسلیم). بەڵام هیچ ڕووی نەدا لێوەی، جگە لەوە نەبێت کە ئاماژەی کرد بۆ خەڵکەکە لەجێگای خۆیاندا بمێنەوە و، شوێنەکانیان بەجێ نەهێڵن.

پاشان لە مینبەرەکە هاتە خوارەوەو دەستنوێژێکی گرت، وەهەندێك ئاوی کرد بەخۆیدا. ئەوجا سەرکەوتەوە بەسەر مینبەرەکە، وە سوپاس و ستایشی خودای بالأدەستی کرد بەوەی کە شایستەی بوو، وە ووتی:

بەڕاستی (ئەبا موسلیم) کە ووتی ئەو دارایی و ماڵ و سامانە نەهی منە و نەهی باوکمە و نەهی دایکمە... ڕاستی فەرموو... وەمنیش لەڕاستیدا لە (پێغەمبەر)ی خودام بیست ئەی فەرموو (تورەبوون لە شەیتانەوەیە...وە شەیتانیش لەئاگرە.... وە ئاویش ئاگر دەکوژێنێتەوە)، جا ئەگەر یەکێتان تووڕە بوو با خۆی بشوات.

ئەی خەڵکینە: سبەینێ بە ویستی خودای بالأدەست بچن بۆ وەرگرتنی مووچەکانتان.

خودا باشترین پاداشتی (ئەبو موسلیمی خەولانی) بداتەوە، کە نموونەیەکی ناوازە بوو لەدەربڕینی ووتەی ڕەوادا (كَلِمَةُ الحقّ) وە خودا لە (موعاویەی کوڕی ئەبی سوفیان) ڕازیبێت، بەباشترین ڕازیبوون، کە نموونەیەکی دیاربوو لە بیستنی ووتەی ڕەواداو پەیڕەوی کردنی، وە وازهێنان و پەشیمان بوونەوە لەکاری ناڕەواز

* * *

خودایە داوات لێدەکەین هەمان هەڵوێستی (ئەبو موسلیمی خەولانی)مان پێ ببەخشی لەدەربڕینی ووتەی ڕەوادا وەهەمان هەڵوێستی (موعاوی)مان پێ ببەخشی لەبیستنی ووتەی ڕەوادا پەیڕەوی کردن. ﴿وەرگێڕ﴾

بۆ زیاتر شارەزا بوون لە ژیاننامەی (ئەبو موسلیمی خەولانی) بڕوانە:

١- طبقات ابن سعد: ٤٤٨/٧
٢- تأريخ البخاري: ٥٨/٥
٣- المعرفة والتأريخ: ٣٠٨/٢ ، ٣٨٢
٤- الأستيعاب: ت/١٤٧٩
٥- تأريخ ابن عساكر: ١٢/٩
٦- اللباب: ٣٩٥/١
٧- تذكرة الحفاظ: ٤٩/١
٨- البداية والنهاية: ١٤٧/٨
٩- الأصحابة: ت/٦٣٠١ -شذرات الذهب: ٧٠/١




(سالیم متمانەدارو، فەرموودە زۆر بوو، پایە بڵند بوو لەناو پیاوان دا، خۆپارێز بوو)
(ئیبن و سەعد)

## بەشی یەکەم

ئەوا ئێمە واین لە سەرەتاکانی جێ نشینیەتی (خلافە) (فاروق)دا خودا لێ ی رازی بێت. وە ئەوەش (شاری پێغەمبەری خودایە) دروودی خوای لەسەر بێت، پڕبوو لەدەستکەوتەکانی جەنگ، کە موسڵمانان بەدەستیان هێناوە لە ئەنجامی سەرکەوتنیان بەسەر کۆتا کیسراکانی فارس دا، بەتایبەتی کۆتا پادشایان (یەزدەجورد)... کەلەو کەستکەوتانەدا بوو، تاجی کیسراکان کەزرە کەفت بوون بەزێر...

وە (کەمەرەو هەیاسە)[1]ی جۆر بەجۆری رازاوە بە (لۆلۆ)[2]... وە شیرەکانیان کەڕووپۆش کرابوون بە (یاقوت) و (مەرجان)[3]، کەلەوەو پێش بەچاو نەبینراو بوو...

وەلەگەڵ ئەو هەموو زێر و زیوو شمکە بەنرخانەدا، ژمارەیەکی زۆریش لەبەدیلگیراوانی فارس هەبوون... جا لە نێوان ئەو بەدیلگیراوانەدا سێ کچی (یەزدەجورد) هەبوون... کە (عەلی کوڕی ئەبی تالب) رەزای خوای لەسەر بێ بەنرخێکی زۆر کڕینی، وە بەچاوێکی پڕ لەرێزەوە سەیری دەکردن، وە کۆمەڵێك لەجوانتریی و بەرێزترینی لاوەکانی موسڵمانانی لەبەر دەمیاندا نوواند تا خۆیان

---

[1] کەمەرەو هەیاسە: کەمەر بەندە بەتتایبەتی ئافرەت لەناو قەدی دەکات...

[2] (لۆلۆ): جۆرێکە لەزێرو زیو.

[3] (یاقوت) و (مەرجان) یسان جۆرێکی سەرنج راکێشە لەزێر و زیوی سروشتی.

بەرەزامەندی خۆیان هاوسەر بۆ خۆیان هەڵبژێرن. ئەوجا یەکێکیان (حوسەینی کوڕی عەلی) کچەزای (پێغەمبەر خوا) دروودی خوای لەسەر بێ هەڵبژارد... وە لەو هاوسەرە بەرێزەی (زەینولعابدین)ی بوو...

وە دووەمیان (موحەمەدی کوڕی ئەبی بەکری صدیق)ی خودای لێ ی رازی بێت هەڵبژارد کە (قاسم)ی لێ بوو، کە یەکێك بوو لەحەوت زاناکانی شاری (مەدینە).

وە سێ یەمیان (عەبدولڵای کوڕی عومەر)ی رەزای خوای لەسەر بێ: هەڵبژارد کە (سالم)ی نەوەزادەی (فاروق) لێ ی بوو، کەلە هەموو کەسێك زیاتر لە شێوەدا چووبوەوە سەر (فاروق)... جا فەرموون با هەڵوێستە بکەین لەسەر کۆمەڵێك وێنە و نموونەی درەوشاوەو ڕووناك بەخش لەژیانی (سالمی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی عومەری کوڕی خەتتاب) خودالەخۆی و باب و باپیرانی رازی بێت.

* * *

(سالمی کوڕی عەبدڵڵا) لە باوەشی (مەدینەی پیرۆز)دا کە شوێنی نیشتەجێ و، وەفات و، خانەی کۆچ بۆ کردووی (پێغەمبەری خودا) بوو (ﷺ) لەدایك بوو.

وە لە ئاوو هەوای بۆنخۆش بەبۆنی پێغەمبەرێتی و، درەوشاوە بەڕووناکی نیگا (وحي)، نەشونمای کردوو گەورەبوو... وەلەباوەشی باوکی خودا پەرست و دونیانەویست و، زۆربەی کات بەڕۆژوو، پشت هەڵکردوو لەگوناە و، شەو زیندوو کەرەوە تا بەرەبەیاندا پەروەردەبوو...

وە رازاوەیە بەرەوشتەکانی خانەوادەی عومەرەوە... وە باوکی کۆمەڵێك شتی گرنگی تیا بەدی کردبوو لەوانە: ڕواڵەتەکانی خۆ پارێزی و نیشانەکانی ڕاست ڕەوی و دینداری...

وە لە هەڵسوکەوتی دا هەموو سیفاتە جوانەکانی ئیسلامی بەدی دەکرد، وە زیاتر لەبراکانی سەرنجی دەدا ڕەوشتی قورئان بوو...

جابۆیە خۆشی دەویست خۆشەویستیەك کەهەموو پەردەکانی ناخی گرتبوەو، تێکەڵ بە قووڵایی دڵی بوو بوو، تا گەیشتبوە ئاستێك کە رەخنەگران و لۆمەکاران لەو بارەیەوە لۆمەیان دەکرد و رەخنەیان لێ دەگرت. وە کاتێك (سلیم) دەهاتە خزمەتی باوکی ئەویش ئەوە کە لە فەرموودەی (پێغەمبەری خودا) (ﷺ) لەسنگی دابوو، واتە لەبەری بوو، بۆی هەڵدەڕشت... وە شارەزایی دەکرد لەدینی خودا... وەئەوەی



بگونجایە لە قورئان فێری دەکرد... پاشان ڕەوانەی مزگەوتی (پێغەمبەر)ی (ﷺ) کرد...

مزگەوتی (پێغەمبەر)ی خودا دروودی خوای لەسەر بێ تا ئەو کاتە ئاوادان بوو بەکۆمەڵێك لەپایە بەرزانی هاوڕێیانی (پیغەمبەر)ەوە.

جا هەر کاتێك لاوی خوداناس ڕووی لە سوچێك لە سووچەکانی مزگەوتەکە بکردایە، ڕووبەڕووبەی ئەستێرەیەکی درەوشاوە دەبوەوە، کە بەرووناکی پێغەمبەرییەتی دەدرەوشایەوە، وە بۆنخۆش دەبوو بەبۆنی خۆش پێغەمبەریەتی و پەیامە پیرۆزەکەی.

وە چاوی بۆکوێ هەڵدەخست و گوێبیستی چی دەبوو، خێروچاکەی دەبینی گوێبیستی کاری ڕەوا دەبوو. جا بەهۆی ئەوەوە، زەمینەی بۆ گونجا بوو، تالە کۆمەڵێکی پایەبەرزی هاوڕێیانە وە زانست و شەرع فێر ببێت، لەسەر هەموویانەوە (ئەبو ئەیوبی ئەنساری) ، (ئەبو هورەیرە)... (ئەبو رافیع)، (ئەبو لوبابە)، (زەیدی کوڕی خەتتاب). لەسەر ئەوانیشە وە باوکی (عەبدڵڵای کوڕی عومەر).

زۆری پێ نەچوو کەوەك زانایەك لەزانایانی موسڵمانان دەرکەوت... وە بوویە گەورەیەك لەگەورە پیاوانی شوێنکەوتووان و... یەکێك لە زانایان و شەرع زانانی شاری (مەدینە)، کە موسڵمانان بۆ چارەسەری کێشە ئایینەکانیان ڕوویان تێدەکردن و... لەوانە یاساکانی پەروەردگاریان فێردەبوون و... وە بۆ چارەسەری کێشە دینی و دونیاییەکانیان دەگەڕانەوە خزمەتیان. وە والی یەکان فەرمانیان دەدایە دادوەرەکانیان کاتێك دۆزێك دەخرێتە بەردەستیان بۆ دادوەری کردن تیایدا پەنابەرن بۆ ئەوەی تا بتوانن بڕیاری راست و ڕەوا دەربکەن لەبارەیەوە.

جا ئەگەر هەموویان هاوڕابوون لەسەر دۆزەکە و جێگەی سەرنجی هەموویان بوو، ئەوا باشە، ئەگینا دادوەرەکان بەڕای ئەوان نەبێ نابێ بڕیار بدەن.

وە بەختەوەرترین والی یەکان، خۆشەویستریان لەدڵی خەڵکی داو، متمانەپێکراو ترینیان لەلای خەلیفەکان، ئەوەیان بوو کە ڕاوێژی بە (سالمی کوڕی عەبدوڵا) دەکردو وابەست بوو بەجێ بەجێکردنی ڕێنومایەکانیەوە.

بەڵام ئەوانەیان کە نەیاری فەرمانەکانی (سالیم) بوون و پێچەوانەی ڕێنومایەکانی ئەو هەڵسوکەوتیان دەکرد، شاری (مەدینە)یان لێ تەنگەسەر بوو بوو، چونکە خەڵکەکەی گوێڕایەڵیان نەبوون، وە خۆشیان نەدەویستن و بەویلایەتیان رازی نەبوون.

لە نموونەی ئەوە (عەبدو ڕەحمانی کوڕی زوحاك) بوویە والی (مەدینە) لەسەردەمی جێنشینێتی (یەزیدی کوڕی عەبدولمەلیك)دا. وە لەو کاتەدا (فاتیمەی کچی حوسەین) خودای لێ رازی بێت و روحی شاد و گەشەدار بێ لەبەهەشتدا، بێوەژن کەوتبوو، وە بەلای منداڵەکانی یەوە دانیشتبوو، خۆی تەرخان کردبوو بۆ بەخێو کردنیان.

جا (کوڕی زوحاك) لێ ی چووە پێشەوەو داوای کرد بۆ خۆی. ئەویش ووتی:

سوێند بەخودا ویستی هاوسەرگیرێتیم نی یە، بەسەر منداڵەکانمەوە دانیشتووم، وەخۆم تەرخان کردووە بۆ چاودێری و بەخێوکردنی ئەوان.

بەڵام (کوڕی زوحاك) هەر سور بوو لەسەر داواکەی، بۆیە (فاتیمە) لەڕێگەی فێڵەوە هەندێك بڕوبیانوی بۆ هێنایەوە، بەبێ ئەوەی بەشێوەی ڕەق یان قسە پێ ووتن بەرەو ڕووی ببێتەوە تا لەخراپەی بەدوور بێت. کاتێك کە (کوڕی زوحاك) زانی هەر رازی نابێت، پێ ووت:

سوێند بەخوا ئەگەر رازی نەبیت هاوسەرگیریم لەگەڵ بکەیت، کوڕە گەورەکەت دەسگیر دەکەم، بەتۆمەتی ئارەق خواردنەوە جەڵدی لێ دەدەم. ئەویش (فاتیمە) ڕاوێژی بە (سالمی کوڕی عەبدوڵلاّ) کرد دەربارەی بارودۆخەکەی، ئەویش ئاماژەی دایە کەنامەیەك بنووسێت بۆ (خەلیفە) وە تیایدا سکالاّ بکات لەدەستی (کوڕی زوحاك)، وە باسی خزمایەتی خۆی بکات لەگەڵ (پێغەمبەر خودا) (ﷺ) وە ئاستی پەیوەندی بەخانەوادەی (پێغەمبەر)ەوە دروودی خوای لەسەر بێ.

جا (فاتیمە) نامەکەی نووسی، وەڕەوانەی کرد بەڕەوانەکراوێکیدا بۆ (دیمەشق).

لەوەدا بوو کەڕەوانەکراوەکەی (فاتیمە) بەڕێ بکەوێت بە نامەکەوە بۆ خزمەتی (خەلیفە)، کە فەرمانی (خەلیفە) هات بۆ (کوڕی هورموز) کە بەڕێوەبەری دیوانی دارایی بوو لە (مەدینە) تا بچێتە خزمەتی (خەلیفە) تا کۆی کاروباری دارایی ساڵانە لە داهات و خەرج کردن بخاتە بەدەستی. (کوڕی هورموز) کە فەرمانەکەی بەدەست گەیشت هەستا بە خواحافیزی کردن لەو کەسانەی کە مافیان بەسەریەوە هەبوو، جا

بۆ ئەو مەبەستە ڕوخسەتی خواست كە بچێتە خزمەتی (فاتیمە)، كە چووە خزمەتی خواحافیزی كردو ووتی: من دەڕۆم بۆ (دیمەشق) ئایا پێویستییەكت نی یە؟.

(فاتیمە) ووتی: بەڵێ هەمە... ئاگاداری (ئەمیری بڕواداران) بكە دەربارەی ئەوەی كە (كوڕی زوحاك) بەرامبەرم دەیكات... وە ئەو ڕێزی زانایانی (مەدینە) ڕەچاو ناكات، بەتایبەتی (سالمی كوڕی عەبدوڵا). (كوڕی هورموز) لۆمەی خۆی كرد لەسەر دیدەنیەكەی بۆلای (فاتیمە)، چونكە نەیدەویست كەسكالاكەی بەرامبەر (كوڕی زوحاك) بگەیەنێتە (خەلیفە).

(كوڕی هورموز) گەیشتە شاری (دیمەشق) لەهەمان ئەو ڕۆژەدا كە ڕەوانەكراوەكەی (فاتیمەی كچی حوسەین) گەیشتبوە ئەوێ بە نامەكەی (فاتیمە)وە كاتێك كە (كوڕی هورموز) چووە خزمەتی (خەلیفە)، (خەلیفە) پرسیاری كاروباری شاری (مەدینەی) لێ كرد، وە پرسیاری لێ كرد دەربارەی (سالمی كوڕی عەبدڵا)و هاوڕێكانی لەزانایان و، پێ ی ووت:

ئایا لەوێ كاروبارێكی خاوەن شایەن هەیە كە پێویست بێ بیزانی، یان دەنگوباسێ كە جێگەی مەترسی بێت و شایستەی ئەوە بێت كە (خەلیفە) هەڵوێست وەربگرێت دەربارەیان. وە هەوڵی چارەسەریان بدات؟ (كوڕی هورموز) هیچ شتێكی دەربارەی كێشەكەی (فاتیمەی كچی حوسەین) نەدركاند، وە ئاماژەی بەهیچ شتێك نەكرد دەربارەی هەڵوێستی (والی) لە گەڵ (سالمی كوری عەبدولا)دا ئالەو كاتەدا كە (كوڕی هورموز) لەخزمەتی (خەلیفە)دا دانیشتبوو، وە پوختەی كاروباری دارایی دەخستە بەردەستی، دەرگاوان هاتە ژوورەوەو ووتی:

خودا (ئەمیر) پایەداركات... ئەوە ڕەوانەكراوی (فاتیمەی كچی حوسەینە) لە دەرگادا. هەركە (كوڕی هورموز) ئەوەی بیست ڕەنگی گۆڕاو ووتی:

خودا (ئەمیر) پایەدار بكات، بەڕاستی (فاتیمەی كچی حوسەین) نامەیەكی بە مندا ناردۆتە خزمەتت، ئەوجا دەنگوباسەكەی بۆ گێڕایەوە... جا كە (خەلیفە) گوێبیستی ووتەكەی بوو لەسەر كورسییەكەی دابەزی و ووتی: دەك بێ دایك بیت... واتە لە دایك نەبویتایە ئەی من پرسیارم لێ نەكردی دەربارەی كاروباری شاری (مەدینە)و دەنگوباسی ئەوی؟!...

دەنگوباسی ئاوات لەلایەو كەچی لەمنی دەشاریتەوە؟!!... ئەویش بروبیانووی بۆ هێنایەوە كە گوایە لەبیری چووە.ئینجا (خەلیفە) روخسەتی دا بەرەوانەكراوەكەی

(فاتیمه) كه بێته ژوورەوه، كه كابرا هاته خزمەتی نامەكەی دایه دەستی، ئەویش نامەكەی كردەوەو، دەستی بەخوێندنەوەی كرد، لەگەڵ خوێندنەوەكەدا، چاوەكانی سورهەڵگەڕان و، ئاگر له ناو چاوانی دەباری،وه به دارحەیزەرانه كەی كه بەده ستی یەوه بوو،دەكێشا بەزەویدا ودەیووت:

(كوڕی زوحاك) وایلێهات خۆی بەسەر خانەوادەی (پێغەمبەری خوادا) (ﷺ) ڕابدات... وه گوێبیستی ئامۆژگارییەكانی (سالمی كوڕی عەبدوڵڵا) نەبێت لەو خانەوادەدا؟!!!...

ئایا پیاوێك له مەدینەدا نی یه دەنگی (كوڕی زوحاك)م بگەیەنێتێ، كاتێ كه ئەو لەشاری (مەدینه)دا سزای خەڵكی دەدات، لەگەڵ ئەوەدا من ماوم، لەسەر كورسی فەرمانڕەوایەتیم له (دیمەشق)دا؟.

پێیان ووت: بەڵێ ئەی (ئەمیری بڕواداران)... بەڕاستی بۆ والیەتی شاری (مەدینه) جگه له (عەبدولواحیدی كوڕی بیشری نەزەری) كەسێكی دی شك نابەین. بفەرموو بیكه بەوالی ئەویّ... ئەو ئێستا له (تائیف) دادەنیشێ...

ئەویش فەرمووی: بەڵێ... سوێند بخوا بەڵێ...ئەو هەر له ئێستاوه ئەو كارەی پێ سپێرراوه... پاشان داوای تیانووسی كرد و، بەدەستی خۆی نووسی:

له (ئەمیری بڕوادارانه)وه (یەزیدی كوڕی عەبدولمەلیك) بۆ (عەبدولواحیدی كوڕی بیشری نەزەری). السَّلامُ عَلَيْكَ... لەپاشدا... بێ گومان من تۆم كردوّته والی (مەدینه) جا ئەم نامەیەم گەیشته دەستت، دەست و برد دەچیت بۆ شاری (مەدینه)، وه (كوڕی زوحاك) لەوالیەتی دەخەیت و خۆت كاروبار دەگریته دەست... وه (چل هەزار دینار) غەرامەی دەكەیت و دەیخەیته دارایی موسڵمانانەوه ئەوجا سزای بده تا لەشاری (مەدینه) گوێبیستی دەنگی ببم.

پۆسته چی یەكه نامەكەی وەرگرت و، هەنگاوی هەڵگرت و ڕێی بەرێ كرد بەرەو (تائیف) له ڕێگای (مەدینەوه) جا كاتێك گەیشته (مەدینه) نەچووه لای والی یەكەی، (كوڕی زوحاك) وه سلاوی لێ نەكرد، بۆ والی له ناخی خۆی دا ترسی لێ نیشت. وه ناردی بەدوایی پۆسته چیداو بانگی كرد بۆ ماڵی خۆی، وه دەربارەی هاتنی پرسیاری لێ كرد، بەلام ئەو هیچی نەدركاند بۆی، جا (كوڕی زوحاك) سوچێكی ڕاخەرەكەی هەڵدایەوەو ووتی:

سەرنج بدە... ئەویش سەرنجی دا کیسەیەکی پڕ لە دینارە. (کوڕی زوحاك) ووتی: ئەوە هەزار دینارە... لەسەر دەستی خودادا پەیمانت دەدەمێ، ئەگەر تۆ ئاگادارم بکەی لەمەبەستی هاتنەکەت و چیت لەدەستدایە، ئەو پارەیەت دەدەمێ، وە دڵنیایشت دەکەم کە ئەوە هەرگیز ئاشکرا ناکەم...

کابرای پۆستە چیش دەربارەی هاتنەکەی و مەبەستەکەی ئاگادار بکەرەوە... ئەویش پارەکەی دایە و پیێ ی ووت: سێ شەو ڕۆژ دان بەخۆتدا بگرە، ئەوەی فەرمانت پیێ کراوە ئەنجامی مەدە تا من دەگەمە (دیمەشق) پاشان دوای ئەوە بڕۆ بۆ بەئەنجامدانی ئەوەی کە فەرمانت پیێ کراوە...

(کوڕی زوحاك) پێویستی سەفەری ڕێکخست و، دەست و برد شاری (مەدینە)ی بەجێ هێشت، وە بەپەلە بەرەو (دیمەشق) کەوتە ڕێ. جا کاتێك گەیشتە (دیمەشق) چوە خزمەتی (ئەسلەمەی کوڕی عەبدولمەلیك)ی برای (خەلیفە) کە گەورە پیاوێکی ڕەوشت بەرزی خاوەن پەنا بوو...

جا کاتێك ئامادەی خزمەتی بوو پیێ ی ووت:

ئەی (ئەمیر) بەڕاستی من خۆم داوەتە پەنای تۆ. ئەویش ووتی: خێر... بفەرموو کێشەکەت چی یە؟!. (کوڕی زوحاك) ووتی: بەڕاستی (ئەمیری بڕواداران) لێم شلوێ بووە بەهۆی ئەوەی کە هەڵەیەکم ئەنجام داوە. (مەسلەمە) چوە خزمەتی (یەزید)و ووتی:

بەڕاستی لە خزمەتی (ئەمیری بڕواداران)دا پێویستی یەکم هەیە. (یەزید)یش ووتی: هەموو پێویستی یەکی تۆ جیێ بەجیێ کراوە مادام پەیوەندی بە (کوڕی زوحاك)ەوە نەبێت.

ئەویش ووتی: سوێند بەخودا جگە لەوە بۆ هیچی تر نەهاتوومەتە خزمەتت. (خەلیفە) فەرمووی: سوێند بەخوا هەرگیز لیێ ی نابوورم...

ئەویش ووتی: تاوانەکە چی یە؟! (خەلیفە) فەرمووی: ڕوو بەڕووی (فاتیمەی کچی حوسەین) بووەتەوەو هەڕەشەی لێکردووە، ناڕەحەت و شەکەتی کردووە... وە لەو بارەوە گوێبیستی ئامۆژگاریەکانی (سالمی کوڕی عەبدوڵڵا) نەبووە، جا هەموو بوێژان و پیاو چاکان و زانایانی شاری (مەدینە) لەسەر ئەوە لۆمەی دەکەن و لیێ ی بەقینن...

ئەوجا (مەسلەمە) ووتی: دەی ئیتر جەنابت و هەڵسوکەوتت لەگەڵیدا ئەی (ئەمیری بڕواداران). (یەزید) فەرمووی: فەرمانی پیێ بکە بادەست و برد بگەڕێتەوە بۆ شاری

(مەدینە) تا والی تازە فەرمانی منی بەسەردا جێ بەجێ بکات و... بیکاتە پەند بۆ والیەکانی تر...

خەڵکی (مەدینە) زۆر دڵخۆش بوون بە والیە تازەکەیان. وە زیاتر ئەوەی دڵشادی کردن ئەوەبوو کە سوور بوو لەسەر جێ بەجێ کردنی فەرمانی (خەلیفە) لەسەر (کوڕی زوحاك) وە ئەوەی زیاتر وابەستی کردبوون پێوەی و خۆشیان دەویست ئەوە بوو کە هەمیشە ڕووی لەئەنجام دانی خێرو چاکە بوو، وە هیچ بڕیارێکی یەکلا نەدەکردەوە، تا ڕاوێژی بە (قاسمی کوڕی موحەمەدی کوڕی ئەبی بەکر)و (سالیمی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی عومەر) نەکردایە. پایە بەرزی بۆ (خەلیفەی موسڵمانان) (یەزیدی کوڕی عەبدولمەلیك)... وە شکۆداری و درەوشاوەیی بۆ ئەو ئیسلامە گەورەیەی کە ئەو نموونانەی نواندووە، ئەو پیاوانەی دابین کردووە... وە ئیتر تا بەیەکگەیشتنەوەیەکی دی لەگەڵ شوێنکەوتووی پایەبەرز (سالیمی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی عومەری کوڕی خەتتاب)دا.

*   *   *

خودایە بەهەمان ڕچەو ڕێبازی ئەوانەمان بسپێرەو لەگەڵ ئەواندا حەشرمان بکە.

﴿وەرگێڕ﴾

# سالمی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی عومەر

## بەشی دووەم

**زانای خاوەن کردار**

**(هیچ کەسێك نەبووە لە ڕۆژگاری (سالمی کوڕی عەبدوڵڵا)دا کە زیاد لەو چووبێت لەخودا ناسان و پیاو چاکانی پێش خۆی لە دونیا نەویستی و، گەورەیی و، جۆری ژیاندا) (پێشەوا مالیک)**

(ئەمیری بڕواداران) (عومەری کوڕی خەتتاب) خودای لێ ڕازی بێت کۆمەڵێك کوڕی هەبوو، بەڵام (عەبدوڵا)ی کوڕی لە هەموویان زیاتر لەو دەچوو...

وە (عەبدوڵای کوڕی عومەر) ژمارەیەکی زیاتر کوڕی هەبوو لە باوکی... وە لەناو هەموویان دا (سالم) زیاتر لەو دەچوو. جا فەرموون باپێکەوە شوێن داستانی ژیانی (سالمی کوڕی عەبدوڵا) بکەوین، کە نەوەزادەی (فروق)ە، وە لەهەموو خەڵکی زیاتر لە باوکی دەچێت لە ڕەوشت و، سیماو، دینداری، شێوەو هەڵکەوت دا.

*　　　*　　　*

(سالمی کوڕی عەبدوڵا) لە باوەشی شاری (مەدینە) ی پیرۆزدا ژیاوە... وە (مەدینەش) لەو سەردەمدا لەوپەڕی دەوڵەمەندی و بەهرەداریدا خۆی دەنواند کە لەوەو پێش نموونەی وای بەخۆیەوە نەبینبوو. دارایی و سامانێکی بێ سنوور لەهەموو لایەکەوە ڕووی تێدەکرد، وەجێ نشینەکانی (خلفاء) بەنی (ئومەییە) بەشێوەیەك هۆکارەکانی دەوڵەمەندیان بۆ ڕەخساندبوو کە بەبیرو هۆشی کەسدا نەدەهات.

بەڵام (سالمی کوڕی عەبدوڵا) باوەشی بۆ دونیا نەدەگرتەوە، هەروەك خەڵکی باوەشیان بۆ گرتبوەوە، وە پاڵی نەدەدا بەپیشاندراو جوانی و لەزەتە دونیاییەکانەوە هەروەك خەڵکانی دی کە کردبوونیانە هەمو هەست و ویستیکیان و لێیان

جیانەدەبوونەوە، وە هەرگیز چاوی لەوە نەبوو کەلەدەستی خەڵکی دابوو، بەڵکو تامەزرۆی ئەوە بوو کەلەلای خودا بوو، وە پشتی لە دونیا دەکرد تا سەرکەوتنی قیامەت بەدەست بخات. وەلەو بوارەدا (خەلیفەکانی بەنی ئومەییە) تاقیانکردەوە، بەوەی کەسامان و دارایی یەکی زۆریان بەسەردا هەڵڕشت، هەروەك بەسەر خەڵکانی تریشدا هەڵیان ڕشتبوو، بەلاّم سەرنجیان دەدا کە (سالم) بێ باکە لەوەی کەلەدەستی ئەواندایە... وە دونیاو ئەوەی لە دونیادا هەیە بەکەمی سەیردەکات و بێ بایەخ و بەهای دەزانێ....

* * *

لە ساڵێك لەساڵەکانی فەرمانڕەوایی خۆی دا، (سولەیمانی کوڕی عەبدولمەلیك) هات بۆ (مەککە) بۆ حەج... جا کاتێك کەدەستی کرد بەسووڕانەوەی هاتن (طواف القدوم)، (سالمی کوڕی عەبدوڵلاّ)ی بینی دانیشتووە بەوپەڕی ملکەچی یەوە بەرامبەر (کەعبە)...

وەزمانی دەبزوێنێ بە قورئان خوێندن، دابڕاو لەدونیاو بەوپەڕی ملکەچی یەوە... وە فرمێسکەکانی دەڕژێتە سەر هەردوو ڕوومەتی چۆن ڕژانێ، وەك ئەوە لە پشتی چاوەکانی یەوە دەریایەك لە فرمێسك هەبێت. جا کاتێك (خەلیفە) لە سووڕانەوەکەی تەواو بوو، وە دوو رکات نوێژی تەواوبوونی سووڕانەوەی ئەنجام دا، ڕووی کردە ئەو شوێنەی کە (سالمی کوڕی عەبدوڵلاّ) تێیدا دانیشتبوو.

خەڵکی ڕێگەیان بۆ (خەلیفە) کردەوە تا لەتەنیشتی یەوە جێگای خۆی کردەوە، بەشێوەیەك کە خەریك بوو ئەژنۆکانی بنێ بە ئەژنۆیەوە. بەلاّم (سالم) ئاگای لێ نەبوو، وەلاشی نەکرد بەلایەوە، چونکە ئەو لە کارەکەی خۆی بەتەواوی ڕۆچوو بوو، وەبە شێوەیەك خەریك بوو بەیادی خوداوە کەلەهەموو شتێك بێ ئاگای کردبوو...

وە (خەلیفە) بە کلەی چاوی دەستی کرد بەسەرنجدانی (سالم)... وە چاوەڕێی فرسەتێکی دەکرد کە لەقورئان خوێندن دەست هەڵبگرێت، وە واز لەگریانە بەکوڵەکەی بهێنێت تاقسەی لەگەڵ بکات. جا کاتێك ئەو فرسەتەی بۆ ڕێکەوت لایکرد بەلایەوەو، ووتی:

(السَّلامُ عَلَيْك) ئەی (ئەبا عومەر) و (رَحْمَةُ الله) ئەویش ووتی: (وَ عَلَيْكَ السَّلامُ وَرَحمةُ اللهِ تَعالى وَ بَرَكاتُهُ). ئەوجا (خەلیفە) بەدەنگێکی نزم و لەسەرخۆ ووتی:

ئەی (ئەبا عومەر) چ پێویستی یەکت هەیە پێم بڵێ تابۆت ئەنجام بدەم. (سالم) بەهیچ شتێك وەڵامی نەدایەوە.

جا (خەلیفە) گومانی وابرد کە (سالم) گوێبیستی ووتەکە نەبووە، بۆیە لە جاری پێشوو زیاتر لیٚ ی نزیك بوویەوەو ووتی: ئارەزوومەندم هەر پێویستی یەکت هەیە پێم بڵێ ی تابۆت ئەنجام بدەم. ئەوجا (سالم) ووتی: سوێند بەخوا من شەرم دەکەم لەماڵی خودای باڵادەست دابم، کەچی جگە لەو داوا لەکەسێکی دی بکەم. جا کە (خەلیفە) گوێبیستی ئەوەبوو شەرمەزاری گرتی و بێدەنگ بوو، کاتێك نوێژ تەواو بوو، (سالم) هەستاو ڕۆشت دەیویست بەکاروانەکەیدا بگات.

جا ئالەو کاتەدا کۆمەڵێك لەخەڵکی پیاگەیشتن و دەوریان دا... ئەوە یەکێك بوو پرسیاری لیٚ دەکرد دەربارەی فەرموودەیەك لە (فەرموودەکانی) پێغەمبەری خودا (ﷺ) وە ئەوە یەکێکی ترە پرسیاری کارێك لەکارە ئایینی یەکانی لێدەکات و چاوەڕێ ی بڕیاریەتی دەربارەی.

وە ئەوە سیٚ یەم کەسە داوای ئامۆژگاری لیٚ دەکات. ئەوەش چوارەمە داوای نزای خێری دەکات لیٚ ی. وەیەکێك لە نێو ئەوانەدا کە دەیانوویست بە (سالم)دا ڕابگەن، (خەلیفەی موسڵمانان) (سولەیمانی کوڕی عەبدولمەلیك) بوو، کاتێك خەڵکەکە بینیان ڕێگایان بۆ کردەوە تا شانی نا بەشانی (سالمی کوڕی عەبدوڵلا)وە

جالای کرد بەلایەوە و چرپانی بەگوێیەوە ووتی: ئەوە ئێمە واین لەدەرەوەی مزگەوت، تکات لێدەکەم چ پێویستی یەکت هەیە پێم بڵیٚ تابۆت ئەنجام بدەم ئەویش ووتی:

لە پێویستی یەکانی دونیا، یان لە پێویستی یەکانی دواڕۆژ؟ (خەلیفە) کە گوێبیستی ئەوە بوو شڵەژاو ووتی: لە پێویستی یەکانی دونیا... ئەوجا (سالم) پیٚ ی ووت:

بەڕاستی من پێویستی یە دونیاییەکانم داواکردوە لەو کەسەی خاوەنیەتی، ئەوجا چۆن لەکەسێکی داوادەکەم کە خاوەنی نی یە؟

(خەلیفە) شەرمەزاری داگرت و سڵاوی لێکرد و لیٚ ی جیابوویەوە، لەبەر خۆیەوە دەیووت: ئەی (خانەوادەی خەتتاب) بە دونیا نەویستی و خۆپارێزی عیززەت و سەربەرزیتان بۆ خۆتان مسۆگەر کرد. وە سوێند بەخودای باڵادەست لە ئێوە

دەوڵەمەندتر و بیّ باکتر نی یە... خودا بەرەکەت برِێژێ بەسەرتانە ئەی (خانەوادەی خەتتاب)

*                    *                    *

وە لەساڵی پێش ئەو ساڵەی کە (سولەیمانی کوڕی عەبدولمەلیك) حەجی تیاکرد، (وەلیدی کوڕی عەبدولمەلیك) حەجی کردبوو.

جا کاتێك خەڵکی لە (عەرەفاتە)وە رژانە خوارەوە بەرەو (موزدەلیفە)، (خەلیفە وەلید) لە (موزدەلیفە) گەیشت بە (سالمی کوڕی عەبدوڵلآ) کە لە (ئیحرام)دا بوو، سلاوی لێکرد نزای پایەبەرزی لەلای خودا بۆکرد، پاشان سەرنجی دا لە لەشی بیّ بەرگ و رووتی، بینی تەواو تێسمڕاوە، بەهێزە، هەروەك خانوویەك کەتازە بنیاد نرابێت، جا پیّ ی ووت:

بەڕاستی ئەی (ئەبا عومەر) جوانترین لەش و لارت هەیە... ئایا زۆربەی خۆراکت چی یە؟ ئەویش ووتی:

نان و زەیت....

وە ئەگەر جاروباریش گۆشتم دەستکەوێت دەیخۆم...

(خەلیفە) ووتی: نان و زەیت؟.

ئەویش ووتی: بەڵیّ.

(خەلیفە) ووتی: ئایا بەردەوام حەزی لێدەکەیت؟.

ئەویش ووتی: ئەگەر حەزم لێنەکرد، وازی لێدەهێنم هەتا برسیم دەبێت ئەوجا حەزی لێدەکەم.

جا هەروەك (سالم) زۆر لە (فاروق)ی باپیری دەچوو لە پشت کردنە دونیا و خۆلادان لە لەزەت و جوانی و هەموو شمەکە دونیایە یەکان، بەڕاستی لەدەربڕین و راگەیاندنی ووتەی حەق و راستی یەکاندا، هەرچەند زۆر لەسەری قورس بکەوتایەوە مایە ی دەردی سەری بوایە بۆی هەر لە باپیری دەچوو. لە نمونەی ئەوە، جارێکیان چووە لای (حەججاج) بۆ پێویستی یەکی موسڵمانان.

جا (حەججاج) زۆر بەخێری هێناو رێزێکی بیّ سنووری لێگرت و لەلای خۆیەوە داینا... وە ئەوان هەردووکیان بەو شێوەیە دانیشتبوون، کە (حەججاج) کۆمەڵە

پیاوێکی هێنا، قژهەڵچو، سەرچاو شلوێ وتەپوتۆزاوی، رووزەرد، کەلەپچەکراو. (حەججاج) لایکردەوە بەلای (سالمەوە)و ووتی:

ئەوانە کۆمەڵێکی یاخی و گێرەشێوێنن لەسەر رووی زەوی دا، ئەو خوێنەیان رشتووە کەخودا قەدەغەی کردووە پاشان شیرەکەی دایە دەستی و، ئاماژەی کرد بۆیەکەمیان و ووتی:

بەو دەست پێ بکەو... هەستە لەگەردنی بدە... ئەوجا (سالم) شیرەکەی لەدەست (حەججاج) وەرگرت و، بەرەو رووی پیاوەکە چوو... وە خەڵکیش چاویان تێ بریبوو، چاوەڕێ ی ئەوەیان دەکرد، تابزانن چی دەکات؟! کاتێك لەسەر سەری پیاوەکە ڕاوەستا پێ ی ووت: ئایا تۆ موسڵمانیت؟.

ئەویش ووتی: بەڵێ...

بەڵام تۆ چیتە لەو پرسیارە؟...فەرموو بۆ ئەنجام گەیاندی ئەوەی کە فەرمانت پێ کراوە. (سالم) پێ ی ووت: ئایا نوێژی بەیانیت کردووە؟

پیاوەکە ووتی: من پێم ووتیت کەمن موسڵمانم، لەدوای ئەوە تۆ هەر پرسیارم لێ دەکەیت: ئەگەر من نوێژی بەیانیم کردبێت!!... ئایا تۆ گومان دەبەیت کە یەکێك موسڵمان بێت و نوێژ نەکا؟..

دیسان (سالم)ووتی:

پرسیاری ئەوەت لێ دەکەم ئایا ئەمڕۆکە نوێژی بەیانیت ئەنجام داوە؟ پیاوەکەش ووتی: خوا ڕێنماییت بکات، پێم ووتیت بەڵێ... منیش داوات لێ دەکەم کە ئەوە ئەنجام بدەیت کە ئەو ستەمکارە فەرمانی پێداویت، ئەگینا ئەگەر ئەنجامی نەدەیت، خۆت رووبەرووی خەشم و کین و تووڕەیی ئەو دەکەیتەوە.

ئالەو کاتەدا (سالم) گەڕایەوە بۆلای (حەججاج)، شیرەکەی فڕێدایە نێوان دەستەکانیەوەو ووتی: ئەوەی راستیە ئەوەیە کە ئەو پیاوە دانی ناوە بەوەدا کە موسڵمانە، وە دەڵێت: کە ئەمڕۆکە نوێژی بەیانی ئەنجام داوە، وە منیش ئەوەم لەسەرچاوەی دروستەوە پێ گەیشتووە کە پێغەمبەری خودا درووودی خوای لەسەر بێ فەرموویەتی:

(هەرکەس نوێژی بەیانی ئەنجام دا ئەوە لە ژێر چاودێری و پارێزگاری خودادایە) وە بەڕاستی منیش کەسێك ناکوژم کە لەژێر پارێزگاری خودادا بێت.

ئەوجا (حەججاج) بەتوڕەییەوە پێ ی ووت:

ئێمە لەسەر ئەوە نایکوژین، کە یەکێکە لەو کەسانەی یارمەتی دەربوو لەکوشتنی (خەلیفە) (عوسمانی کوڕی عەففان)دا ،(سالم) پیێ ی ووت:

لە راستیدا لە نێو خەڵکی دا کەسی تر هەیە کەلە من و تۆش لە پێشترە بۆ تۆڵە سەندنەوەی (عوسمانی کوڕی عەفان) کە (حەجاج) گوێبیستی ئەوە بوو، بێدەنگ بوو، وە وەڵامی نەدایەوە.

پاشان لە دوایی ئەوە، یەکێك لەوانەی کە ئامادەی گفتوگۆکەی نێوان (حەجاج) و (سالم) بوو، هات بۆ (مەدینە)، وە (عەبدوڵڵای کوڕی عومەر)ی لەوە ئاگادار کرد کە (حەجاج) داوای کردبوو لە (سالم)ی جگەرگۆشەی (عەبدوڵڵا) چاوەڕێی نەکرد تا کابرا قسەکەی تەواو بکات... دەست و برد ڕووی تێکردو ووتی: (سالم) دەربارەی فەرمانەکەی (حەجاج) چی کرد؟

کابراش ووتی: ئاواو ئاوای کرد.(عەبدوڵڵا) بەوە زۆر دڵخۆش بوو، ووتی:

چاکی کرد، چاکی کرد...

ژیرە، ژیرە....

* * *

کاتێك کە جێنشینی (الخلافة) کەوتە ئەستۆی (عومەری کوڕی عەبدولعەزیز)، نامەیەکی نووسی بۆ (سالمی کوڕی عەبدوڵا) کە تیایدا دەڵێت:

لەدوای پێشەکی... لەراستیدا خودای بالآدەست تووشی کردووم بەسەرپەرشتی کردنی کاروباری موسڵمان، بەبێ ئەوەی کە داوام کردبێت، یان راوێژم پێکرابێت. جا داواخوازم لەو خودایەی کە توشی کردووم بەو فەرمانڕەوایەتی یە کە هاریکاریم بکات لەسەر ئەنجام دانی بەپیێ ویستی ئەو. جا داواکارم کە ئەم نامەیەم گەیشتە دەستت، نامەکان و، بڕیارە دادوەریەکان و، ژیاننامەی (عومەری کوڕی خەتتاب)م بۆ ڕەوانە بکە. چونکە من سوورم لەسەر ئەوەی کە شوێن پێی ئەو هەڵگرم و لەسەر ڕچەو رێبازی ئەو فەرمانڕەوایەتی ئەنجام بدەم... ئەگەر خودای بالآدەست لەوەدا یارمەتی دەرم بێت... (وَالسَّلام).

(سالم) لە وەڵامدا نامەیەکی بۆ نووسی و تێیدا دەڵێت:

لەپاش پێشەکی... ئەو نامەیەتم بەدەست گەیشت کە تیایدا، ئەوەت پیێ راگەیاندبووم، کەخودای بالآدەست، فەرمانڕەواییەتی موسڵمانانی خستۆتە ئەستۆت، بەبێ ئەوەی کەداوات کردبێ، یان راوێژت پیێ کرابێت... وە تۆ دەتەوێت کەلەسەر ڕچەو رێبازی (عومەر) فەرمانڕەواییەکەت ئەنجام بدەیت جا بەڕاستی ئەوەی لێرەدا

گرنگە ئەوەیە ئەبێت تۆ ئەوە لەیاد نەکەیت، کەتۆ لەساتە وەختێکدای کە جیاوازە لە ساتەوەختی (عومەر)... وەلە ناو پیاوان و فەرمانبەرانی تۆدا، کەسانێك نین کە وەك پیاوان و فەرمانبەرانی (عومەر) بن... بەلاّم تۆ ئەوە بزانە ئەگەر راستیت بوێت و بتەوێت راستی (الحق) ئەنجام بدەیت، دڵنیابە خودا بەسەر ئەنجام دانی هاریکاریت دەکا، وە کۆمەڵە فەرمانبەرێکت بۆ دەڕەخسێنێ کە هەستن بەجێ بەجێ کردنی...

وە لەلایەکەوە ئەوانەت بۆ دەست دەخات کەبە خەیاڵتا نایەت و چاوەڕێ ی ناکەیت... وەدڵنیابە هاریکاری خودای بالاّدەست بۆ بەندەی بەپێ ی ئاست و راستی نیەتەکەیەتی جا هەرکەس نیەتی تەواوی هەبێت لەئەنجامدانی کاری چاکەو خێردا، ئەوە خودا لەوەدا هاریکاری تەواوی دەکات، وەهەر کەس کەم و کوڕی لەنیەتەکەیدا هەبێت، خودا بەپێ ی ئەو کەم و کوڕی و ناتەواویەی هاریکاری دەکات...

وە ئەگەر ناخ و ئارەزووت، لایاندایت بەلای شتێکدا کە پێچەوانەی رەزامەندی خودای بالاّدەست بوو، ئەوە خاوەن دەسەلاّتانی پێش خۆت، بهێنەرەوە یادی خۆت، کەپێش تۆ چیان کردووە لەم دونیایەدا.. وە لەخۆت بپرسە کە چۆن ئەو چاوانەیان کەلەزەت و جوانی و خۆشیەکانی دونیایان پێ دەبینی، لە بینین کەوتن و پوکانەوە، وە چۆن ئەو گەدانەیان تێر نەدەبوون لەئارەزووەکان، پچڕ پچڕ بوون... وەچۆن بوونە لاکێکی بێ گیان، ئەگەر لەنزیك ماڵەکانمانەوە، فڕێبدرایانە و بەکۆمەڵە گڵێك دانەپۆشرانایە، بۆگەنەکانیان هەراسانیان دەکردین. وەبۆگەنەکانیان زیانیان پێدەگەیاندین. (والسَّلامُ عَلَيْكَ ورَحمةُ اللهِ وَبَرَكاتُهُ)

* * *

(سالمی کوڕی عەبدوڵلاّ کوڕی عومەری کوڕی خەتتاب) تەمەنێکی درێژی بەسەر برد کە پڕ بوو لەخودا پەرستی و خۆپارێزی... ئاوەدان بە ڕێنمایی... تیایدا پشتی کردە دونیاو جوانی و رازاوەکانی و... وە لەو تەمەنەیدا دەست لەملانی ئەو کارانە بوو، کە جێگەی رەزامەندی خودا بوون... وە لە خۆراکێکی دەخوارد کە زۆر سادە بوو... وە بەرگی زبری لەبەر دەکرد... وە جەنگی (ڕۆم)ی کرد وەك سەربازێك لەگەڵ سوپای موسڵمانان‌دا... وە پێویستی موسڵمانانی ئەنجام دەدا، وە وەك سۆزی دایکان، بەزەیی دەهاتەوە پیایاندا... کاتێك کە مەرگ دەستلەملانی بوو، ساڵی صەد و شەشی کۆچی، هەموو خەڵکی شاری (مەدینە) لەخەفەتیدا راچڵەکین وە مەرگی ئەو لەهەموو دڵێکدا غەمێکی بەجێ هێشت وەلە هەموو ڕوومەتێك فرمێسکێك... وە خەڵك راپەری،

هەموو خەڵکی هاوبەشیان کرد لەگەیاندنی تەرمەکەی بۆ گۆڕستان، وە هەموویان ئامادەی بەخاکسپاردنی بوون... وە (هیشامی کوڕی عەبدولمەلیك) لەو ڕۆژەدا لە شاری مەدینە بوو، وە ئەویش ئامادەی بەخاکسپاردنی بوو.

کاتێك کە قەرەباڵغی و ڕاپەرینی خەڵکی بینی، زۆری ئەو خەڵکە کاری کرد سەر دەروونی و، شتێك لەحەسوودی لە دڵیدا سەری هەڵدا، بۆیە لە ناخی خۆیدا پرسیاری ئاراستەی خۆی دەکرد و دەیووت:

ببینە ئەبێت چەندێك لەو خەڵکە دەربچنە دەرەوە، ئەگەر (خەلیفە)ی موسڵمانان لەم شارەیاندا بمرێت؟ پاشان ووتی: با (ئیبراهیمی کوڕی هیشامی مەخزومی) کە والی ئەو لە شاری مەدینە: پێویستی بکە لەسەر خەڵکی شاری مەدینە کە چوار هەزار پیاو بنێرن بۆ پاسەوانی سنوورەکان.

بۆیە ئەو ساڵەی کە (سالم) تێدا وەفاتی کرد ناو نرا بەساڵی چوار هەزار...

خودایە وەك (سالم) ڕاوەستاومان بکە لەسەر ڕاستی و گەیاندنی ڕاستی و خودا پەرستی و دونیا نەویستی. ﴿وەرگێڕ﴾

بۆ زیاتر لە شارەزابوون لە ژیاننامەی (سالمی کوڕی عەبدوڵلا) بڕوانە:

١- الطبقات الكبرى لأبن سعد: ١٩٥/٥
٢- تهذيب الأسماء واللغات، القسم الأول من الجزء الأول: ٢٠٧
٣- الجرح والتعديل، القسم الأول من المجلد الثاني: ١٨٤
٤- المعرفة والتأريخ: ٥٥٤/١
٥- حلية الأولياء: ١٩٢/٢
٦- طبقات الفصهاء للشيرازي: ٦٢
٧- تأريخ البخاري: ١١٥/٤
٨- وفيات الأعيان: ٣٤٩/٢
٩- تأريخ الإسلام: ١١٥/٤
١٠-طبقات الحفاظ للسويطي: ٣٣٠
١١-شذرات الذهب: ١٣٣/١

# ٢٥ )عەبدورەحمانی غافیقی

(ئەمیری ئەندەلوس)
(غافیقی وێنەیەکی راستەقینەی (موسای کوڕی نوسیر) و، (تاریقی کوڕی زیاد)ە ، لەبەرزێتی هیمەت و مەبەست دا) (مێژوونووسان)

## بەشی یەکەم

(ئەمیری بڕواداران) و پێنجەمین خەلیفەی ڕاشدین[1] (عومەری کوڕی عەبدولعەزیز) هێشتا تەپوتۆزی ناشتنی خەلیفەی پێش خۆی (سولەیمانی کوڕی عەبدولمەلیك) لە دەستەکانی نەبوبوەوە، کە دەستی کرد بەسەرنجدانی ئەمیری ناوچەکان و، لابردنی هەندێك و دانانی هەندێك دی.
وە لەپێشەنگی ئەوانەدا کە دانیان بە ئەمیر (سەمحی کوڕی مالیکی خەولانی). کە ویلایەتی (ئەندەلوس)و هاوسێکانی لەو شارانەی وولآتی (فەرەنسا) کە کەوتبوونە دەستی موسڵمانان، خستە ئەستۆی و کردی یە والی لەوێ.

(ئەمیری) تازە کەوتە گەڕان لە وولآتی (ئەندەلوس)، وە دەستی کرد بەگەڕان بەدوای یاریدەرانی راست و چاك، جا فەرمووی بەوانەیکە لەدەوری بوون:

---

[1] خولەفای ڕاشدین چوارن و (عومەری کوڕی عەبدولعەزیز)یان بۆ زیادکراوە.

ئایا لەم وڵاتەدا کەسێك ماوە لە شوێنکەوتووان؟. ئەوانیش ووتیان: بەڵێ ئەی جەنابی (ئەمیر). تا ئێستاش شوێنکەوتووی پایەبەرز (عەبدوڕەحمان کوڕی عەبدوڵڵای غافیقی) ماوە لەناو مانا.

پاشان کەوتنە باسی ئاستی بەرزی شارەزایی ئەو دەربارەی زانستی یە قورئانی یەکان و، تێگەیشتنی بۆ فەرموودەی پێغەمبەری خوداو (ﷺ)، شارەزایی و دانایی لە گۆڕەپانەکانی جیهاد و، ئارەزوومەندی بۆ شەهید بوون و، دونیا نەویستی و، پاڵنەدان بە شتە دونیایی یەکانەوە.

پاشان ووتیان پیێ ی:

ئەو واتە (عەبدو ڕەحمان) گەشتوە بە خزمەتی هاوڕێی پایەبەرز (عەبدوڵڵای کوڕی عومەری کوڕی خەتتاب)

خودا لە خۆی و باوکی ڕازی بێ وە ئەوەندەی ویستی خودای لەسەر بووبێ، زانست و زانیاری لێ وەرگرتووەو، بەباشی شوێنی ڕچەو ڕێبازی ئەو کەوتووە.

* * *

(سەمحی کوڕی مالیکی خەولانی) (عەبدو ڕەحمانی غافقی) بانگهێشت کرد بۆ چاوپێکەوتنی، جا کاتێك هاتە خزمەتی، زۆر ڕێزی لێگرت و، بەخێری هێنا و، لە نزیك خۆیەوە داینا، پاشان ماوەی یەك کاتژمێر دەربارەی ئەوەی کە بەبیریدا هات پرسیاری لێکرد....

وە لەزۆربەی ئەو شتانەدا کەکێشەی هەبوو تیایاندا، ڕاوێژی پێکرد... وە بۆئەوەی هەڵوێستە بکات لەسەر تواناکانی، بەووردی هەڵیدەسەنگان و مەزەنەی دەکرد...

ئەوجا بۆی دەرکەوت کە ئەو پیاوە لەسەر ئەوەشەوەیە کە بۆیان باسکردووە، بۆیە پیێ ی ڕاگەیاند، کە ئەیەوێت بیکاتە کارگێڕێك، لەگەورە کارگێڕانی لە (ئەندەلوس)دا.

ئەویش پیێ ی ووت: ئەی (ئەمیری موسڵمانان) بەر لە هەموو شتێك من پیاوێکم لەکۆی خەڵکی موسڵمانان... وە ڕەوانەکراوم بۆ ئەم ناوچانە، تاوەك سەربازێك، دەروازەیەك لەدەروازە سنوورییەکانی موسڵمانان بپارێزم لەدەستی دوژمنان... وە خۆشم یەکلاکردۆتەوە بۆ ڕەزامەندی خودای باڵادەست... وە شیرەکەم هەڵگرتوەو، گرتومە بەدەستمەوە بۆ بەرزتگرتنی ووشەی (الله).

جا بەویستی خودای باڵادەست، دەمبینی... وابەستی سێبەرەکەت دەبم، تا ئەوەندەی جەنابت وابەستی حەق و ڕاستی بیت... وە لە پەنجەکانی دەستت،

گوێڕایەڵتر دەبم بۆ جەنابت، ئەوەندەی گوێڕایەڵی خودا خودا پێغەمبەرەکەی بیت... بەبێ ئەوەی والیەتی یان ئەمیریم بوێت.

* * *

کات زۆر تێنەپەڕی کە (سەمحی کوڕی مالیکی خەولانی) بڕیاری کۆتایی داو، سوور بوو لەسەر، غەزاکردن و، دەستبەسەراگرتنی هەموو (فەرەنسا) و، دا نەپاڵی زنجیرەی دەوڵەتی ئیسلامی گەورە. وە ئەو، وولاتە فراوانە بکاتە ڕێگا بۆ غەزاکردنی دەوڵەتەکانی (بەلقان)[1] وە لە دەوڵەتەکانی (بەڵقانەوە) ڕێ بەرێ بکات بۆ فەتحی (قوستەنتینیە) بۆ بەئەنجام گەیاندنی مژدەکەی[2] پێغەمبەری خودا دروودی خوای لەسەر بێ. وە هەنگاوی یەکەم بۆ جێ بەجێ کردنی ئەو ئامانجە گەورەیە، بێ گومان ئەوەش ڕادەوەستێ لەسەر دەستبەسەراگرتنی شاری (ئەربونە)[3]ئەوەش لەبەر ئەوەیە کە (ئەربونە) لە گەورەترین شارەکانی (فەرەنسا)یە، کە هاوسای وولاتی (ئەندەلوسە).

وە موسڵمانان هەرکاتێك کەلە چیای (البِرنیة)[4]وە، بەرەو ژێر دەبوونەوە بۆئەوەی دەستیان بگاتە (أربونە) ئەو چیایەیان دەبینی وەك پاڵەوانێکی ئازای بەجەرگ، لەبەردەمیان دا ڕاوەستاوە کە تێکشکانی لێ چاوەڕێ نەدەکرا، وەلەسەر ئەوەشەوە، ئەو شارە واتە شاری (أربونە) کلیلی فەتح کردنی (فەرەنسا)ی گەورە بوو... وە هەمیشە تەماکاران چاویان تێ بڕیبوو...

(سەمحی کوڕی مالیکی خەولانی) شاری (أربونە)ی ئابڵوقە دا، ئینجا بەخەڵکەکەی ڕاگەیاند کە موسڵمان ببن، وە ئەگەر موسڵمان نابن، دەبێت سەرانە (جزیە) بدەن... ئەوانیش ئەوەیان بەلاوە سوکایەتی و سەرشۆڕی بوو، بۆیە داواکەیان پەسەند نەکرد

---

[1] (بەڵقان) نیوە دوورگەیەکە، دەکەوێتە خوارووی ڕۆژهەلاتی (ئەوروپا) ئەمڕۆ ئەمانەیە: ڕۆمانیا_ألبانیا_یوغوسلافیا_ بولغاریا –تورکیا_ یۆنان.

[2] پێغەمبەر دروودی خوای لەسەر بێ فەرمووی: بێ گومان (قوستەنتینیە) دەگرن، وە باشترین سوپا سوپای ئەوێیە، وە باشترین ئەمیر، ئەمیری ئەوێیە.

[3] (ئەربونە) شارێکە لە باشوری (فەرەنسا) دەکەوێتە ناوەندی دەشتی (لنفودوك)

[4] (البِرانیة): زنجیرە چیایەکە لەنێوان فەرەنسا و ئیسپانیادا، درێژ بوەتەوە لە دوورگەی (غاسکونیا) وە لە (ئەتڵەس) تا دوورگەی (لیون) لە (ناوەڕاست) ٤٣٠ کم ، موسڵمانان بە (برانس) ناسیویانە و، ناویان بردووە.

جا بۆیە (سەمح) هێرش لەدوای هێرش، هێرشی دەکردە سەریان و بە تۆپهاوێژ، تۆپبارانی دەکردن.

هەتا ئەو شارە دێرینە پارێزراوە، لە پاش چوار هەفتە، کۆششی پاڵەوانانەی موسڵمان و، جەنگی جوامێرانەیان لەگەڵ پارێزگاران و خەڵکی ئەو شارە، کە لە (ئەوروپا)دا، بێ وێنە بوو، کەوتە دەستی موسڵمانان.

پاشان لەدوای ئەوە (فەرماندەی بەرجەستە و سەرکەوتوو)، سوپا بەجەرگ و بەهێزەکەی، ڕەوانەکرد بۆ دەستبەسەراگرتنی ، شاری (تولُوز) کە پایتەختی (أُکتانیة) بوو.

جا لەهەموو لایەکەوە بەدواییدا تۆپ هاوێژو کەمینی دامەزراند. وە بەو (ئامێرە جەنگیانە)ی کەتا ئەو کاتە (ئەوروپا) نموونەی ئەوانەی نەدی بوو، دەستی کرد بە تۆپ بارانکردنی (شارەکە)، ئەوەندەی نەما بوو ئەو (شارە) بەهێز و پارێزراوە بکەوێتە دەستی ئەو فەرماندە بەجەرگ و ئازایە، کە بەقەدەر شتێك هاتە پێش و ڕووی دا، کارەکەی پێچەوانە کردەوەو، ئەو سەرکەوتنەی لەدەستدا و. جا لێرەدا، لێدوان دەربارەی ئەو ڕووداوە، بەجێدەهێڵین بۆ ڕۆژهەلأتناسی فەرەنسی (رینو)، تاگوزارشتی ئەو (جەنگەمان) پێ ڕابگەیەنێ. کاتێك کە سەرکەوتن لەلایەن موسڵمانەکانەوە زۆر نزیك بوو، (دوقی ئوکتانیا) ڕاپەری و هانای بۆ هەموو خەڵکی وولأت و، دۆستان برد، بۆ بەهانا چوونیەوە، لەجەنگەکەیاندا.

وە پەیامنێری ڕەوانەی سەرانسەری (ئەوروپا) کرد وە پادشا و فەرمانڕەوایانی ئاگادار کردەوەو، لەدەست بەسەراگرتنی (وولأتەکانیان)و، بەدیلگرتنی ئافرەتان و جگەر گۆشەکانیان.

جا بۆیە تاکە گەلێك نەما لە (ئەوروپا)دا، کە بەباشترین جەنگاوەرو، زۆرترین ژمارە هاوبەشی نەکا... وە زۆری و، بەرجەستەیی و، پێداگرتن و، ڕێکوپێکی جموجوڵ و هێرش بردنی، ئەو سوپایە بەجۆرێك بوو، کەلەوەو پێش بێ نموونە بوو... تا بەشێوەیەکی وەها بوو، کە تەپوتۆزی ژێر پێ ی، ئەو سوپایە، ڕووناکی خۆری لە ناوچەی (الرُن)[1] پەردەپۆشکردبوو...

---

[1] (الرُن): ڕووبارێکە لە (سویسرا) و (فەرەنسا) لە (٨١٢)کم لە زۆرترین ڕووبارەکانی (فەرەنسا)یە کە (جنیف) و (لیون) (فالنسیا) و (افینون) ئاو دەدات و، وە لە ڕۆژئاوای (مرسلیا) دەڕژێتە دەریای (ناوەڕاست).

وەکاتێك هەردوو سوپاکە، لەیەك نزیك بوونەوە، خەڵکی وا بەبیریاندا دەهات کە چیاکان رووبەرووی یەکدی بوونەتەوە، ئەوجا جەنگێکی تێکشکێنەر و یەکلا کەرەوە، لە نێوان هەردوو سوپاکە دەستی پێ کرد، کە مێژوو نموونەی ئەو جەنگەی لەوەو پێش بەخۆیەوە نەدی بوو.

وە فەرماندەی بەجەرگیش (سەمح)یان وەك ئێمە پێ ی دەڵێن (ذاما) لەبەردەم سەربازەکانیدا لە هەموو لایەکەوە، دەردەکەوت و ئامادەبوو، وە لەهەموو لایەکەوە، هەڵویستی شێرانەی دەنواند. کاتێك کە ئەو، ئا بەو شێوەیە بوو، تیرێکی دوژمن ئاوێزانی بوو، وە لە وولاخەکەی کەوتە خوارەوەو بە مردوویی کەوتە سەر زەوی. جا کاتێك، کە موسڵمانان، فەرماندەکەی خۆیان بینی، بەکوژراوی بەسەر زەوی کەوتبوو، هەڵوێستیان لەدەست داو، هەست و هێزیان لاوازبوو، وە ریزەکانیان دەستی بە لێ پچڕان کرد...

بەو شێوەیە، لە توانای سوپای بەرجەستەی ئێمەدا بوو، کە هەموویان لەناو بەرن، ئەگەر یارمەتییەکی خودایی فریایان نەکەوتایە بەهۆی فەرماندەیەکی ناوازەوە، کە (ئەورووپا) لەوەو دوا ناسی کە ئەوەش:

(عەبدو ڕەحمان غافیقی) بوو سەریان بەبەریانەوە نەدەماو کەسیان دەرنەدەچوون...

جا ئەو فەرماندە لێهاتووە زیرەکە، بەکەمترین زیان، سەرپەرەشتی کشانەوەی سوپاکەی کرد، وە گەرانییەوە بۆ (ئیسپانیا) بەڵام هەر لەو کاتەدا بریاری دا سەرلەنوێ هێرش بکاتە سەریان...

* * *

لەپاش ئەوە ئایا نەتبینیوە چۆن هەورەکان دەڕەوێنەوە، لە کاتی مانگی چواردەدا، لە تاریکە شەوێکدا، ئەوجا بەو رووناکیە، سەرلێشێوان رێ بە رێ دەکەن...

وە ئەوانەی کە پێیان لێ وون بوو، لەبەر ڕووناکیەکەیدا ڕێگا بەدی دەکەنەوە؟ ئابەو شێوەیە، جەنگی (تولوز) لەلای پاڵەوانی ئیسلامی ناوازەو دانا (عبدو ڕەحمانی کوڕی عەبدوڵا غافیقی) بەتەواوی دەرکەوت و ئاشکرا بوو... وەئایا نەتبینیوە ئەو تینووانەی کە خەریکن لە ناو جەرگەی بیاباندا دەمرن، چۆن کاتێك، ئاویان لێ دەردەکەوێت. دەستی بۆ درێژ دەکەن، تا یەك مشتی لێ بەدەست بهێنن، تابەهۆیەوە سەرلەنوێ، پێ ی ببوژێنەوە!

ئا بەو شێوەیە، سەربازە موسڵمانەکان دەستیان درێژ کرد بۆ فەرماندە گەورەکەیان و، داوای رزگارکردنیان لێ دەکرد و... پەیمانیان پێ دەدا لەسەر گوێبیستی و گوێڕایەڵی...

وەگومان لەوەدا نی یە، کە جەنگی (تولوز) یەکەم برینێکی سەخت بوو، کە تووشی لاشەی موسڵمانان بووبوو، لەو کاتەوە پێیان دابوو لەسەر زەوی (ئەوروپا).

وە (عبدو ڕەحمانی غافیقی) تیمارکاری ئەو برینە و، ئەو دەستە بەسۆزە بوو کە گرنگی پێدەداو چاودێری دەکرد تا قووڵتر نەبێتەوە، بەڵکو سارێژبێت... هەروەها ئەو دڵە گەورە بوو، کە هەمیشە سۆزی بەسەردا دەرژان...

دەنگوباسەکانی ئەو نسکۆ گەورەیەی، کە موسڵمانان تووشی بوون لە (فەرەنسا) ئازاری بەدڵ و دەروونی جێ نشینێتی گەیاند لە (دیمەشق) وە شەهید بوونی پاڵەوانی ئازا و بەجەرگ (سەمحی کوڕی مالیکی خەولانی) ئاگری تۆڵەسەندنی، لە دەروونی جێ نشینێتی دا هەڵگیرساند.

جا بۆ ئەوە فەرمانی دەرکرد، بۆ سەربازەکان تا پەیمان بدەنە (عەبدو ڕەحمانی غافیقی)وە فەرمانڕەوایەتی (ئەندەلوسی) خستە ئەستۆی، لەباشورەوە بۆ باکور، وە لە رۆژهەڵاتەوە بۆ رۆژئاوا.

وەهەروەها ئەو سەرزەوی یە (فەرەنسیانەی)، کە دەستی بەسەردا گیرابوو، وە هاوسای (ئەندەلوس) بوو، دایە پاڵی.

وە دەست واڵای کرد لەکارکردندا، هەر چۆن خۆی بیەوێت. وە گومانیش لەوەدا نەبوو، کە (غافیقی) خاوەن هەڵوێست و، بەجەرگ و، بڕیادەر و، خۆپارێز و، دەست پاك و، دانا و، پێشەنگ بوو...

(عەبدوڕەحمانی غافیقی) هەر لەو چرکە ساتەوە، کە فەرمانڕەوایەتی (ئەندەلوس) خرایە ئەستۆی، دەستیکرد بە کارکردن لەسەر گەڕانەوە باوەڕ بەخۆبوون لەلایەن سەربازەکانەوە... هەستکردن بەشان و شکۆ و، هێز و، سەرکەوتن و زاڵ بوون و، بەرەنجام گەیاندنی ئەو ئامانجە گەورەیەی، کە فەرماندەکانی موسڵمانان، ویستبوویان بە ئەنجامی بگەیەنن لە (ئەندەلوس)دا ، جا لە (موسای کوڕی نەسیرەوە)[1]... تا کۆتایی (سەمحی کوڕی مالیکی خەولانی).

---

[1](موسى بن نصير): فەرماندەی گرتنی (مغرب الأقصى والأندلس).

جا بۆیە ویستی نەپساوی ئەو پاڵەوانانە، پێداگربوو لەسەر ڕاپەڕین و، ڕێ بە ڕێکردن لە (فەرەنسا)وە ، بۆ (ئیتالیا) و (ئەڵمانیا) وە لەوێیشەوە بۆ (قوستەنتینییە). وە گۆڕینی (دەریای سپی ناوەڕاست) بە (دەریاچەیەکی ئیسلامی)، وە ناوبردنی بە دەریای (شام) لە جیاتی دەریای (ڕۆم)...

بەڵام (عەبدو ڕەحمانی غافیقی) بڕوای وابوو، بەوەی کە ئامادەبوون بۆ ئەو جەنگە گەورانە، پێویستی بە چارەسەرکردنی دەروونەکان و، خاوێنکردنەوەیانە...

وەبڕوای وابوو، هیچ گەلێك نی یە کە ئامانجەکانی لەسەرکەوتندا جیّ بەجیّ بکات، ئەگەر پریزەرانی لەناخەوە پچڕ پچڕبن و، هەر لەناو خۆشیەوە، هەڕەشە لێکراو بێت... لەبەر ئەوە ڕاپەڕی و دەستی کرد بە سەردانی، شارەکان و ناوچەکانی (ئەندەلوس) یەك بەیەك، وە فەرمانی دەدا بە بانگەوازکاران کەلەناو خەڵکیدا رابگەیەنن بڵێت: کێ ستەمێکی لێکراوە، لەلایەن والی یەکەوە لە والیەکان، داداوەرێك لە دادوەرەکان، یان هەرکەسێك لە خەڵکی با بەرزی بکاتەوە بۆلای (ئەمیر) وەلەوەدا هیچ جیاوازییەك نەبوو، لە نێوان موسڵمانان و هی کەدا جگە لە موسڵمانان، یان ئەوانەی پەیمان هەبوو لەنێوانی ئەوان و موسڵماناندا....

پاشان دەستی کرد بە سەرنجدانی ستەمەکان، ستەم لەدوای ستەم. جا مافی لاوازی لە بەهێز و خاوەن دەسەڵات وەردەگرتەوە، وە مافی ستەم لێکراوی، لە ستەمکار وەردەگرتەوە.

پاشان هات دەستی کرد بەلێکۆڵینەوە، دەربارەی (کەنیسە داگیرکراو و، داهێنراوەکان). جا ئەو (کەنیسانەی) کە لەدێر زەمانەوە دروستکراون، گێڕانییەوە بۆ خاوەنەکانیان، وە ئەوانەش کە بەبەرتیل و فڕو فێڵ دروستکرابوون رووخاندنی...

پاشان کەوتە سەرنجدانی کاروباری کارگێڕان یەك بەیەك... ئەوەی کە ناپاکی و لادانی لە ڕێگەی ڕاست سەلما، لایبردو لەکاری خست. وە لەجێگەی ئەوا کەسێکی دادەنا، کە متمانەی بەدانایی و بەرجەستەیی و درووستی و دەست پاکی هەبوو.

وە هەر کاتێك سەردانی شارێك لەشارەکانی، یان ناوچەیەك لە ناوچەکانی دەکرد، خەڵکی بانگهێشت دەکرد، بۆ نوێژی کۆ، ئەوجا ووتاری بۆ دەدان و، هانی دەدان لەسەر جیهاد کردن... وە تامەزرۆی شەهید بوونی دەکردن... وە هانی دەدان بۆ دەستهێنانی ڕەزامەندی خوداو مسۆگەر کردنی پاداشتەکەی.

* * *

وە (عەبدو ڕەحمان) ووتەو كرداری پێكەوە گرێدابوو، بە كردارەكان ئاواتەكانی پشت قایم كردبوو. وەهەر لە ساتە وەختی یەكەمی فەرمانڕەوایەتیا، دەستی كرد بە، دابین كردنی پێویستی یەكانی جەنگ و، ئامادەكردنی چەكی تەواو، وە دامەزراندنی پایەگا سەربازیەكان، لەسەر لوتكەی ئەو چیایانەی كە دەیانڕوانی بەسەر دوژمنداو، دروستكردنی پەڕیگەكان (القناطر)...

وە لە هەموویان تۆكمە ترو گەورەتر، پەرینگەی (قورتوبە) پایتەختی (ئەندەلوس) بوو، كەلەسەر ڕووباری (قورتوبەی) گەورە، دروستی كرد، تا سەربازەكان و خەڵكی لەسەری بپەڕنەوە... وە وولأت و خەڵكی لە نەهامەتی لافاو بپارێزێت.

وە ئەو پەڕینگە یە دادەنرێت بە یە كێك لەسەرسوڕهێنەرە كانی جیهان .كە درێژییەكەی گەشتۆتە هەشتا باڵ و... بەرزییەكەی (شەست)باڵ و... پانی یەكەی (بیست) باڵ... وە كەوانەكانی (اقواسها)، هەژدە كەوان و،... ژمارەی پارێزگەكانی (أبراجها) (نۆزدە) پارێزگە...

كە تا ئەم ساتەوەختەش ماوە و، (ئیسپانیا) تا ئەم ئەمڕۆی ئێمەش پیٚ ی بەهرەمەندە.

*　　　*　　　*

وە (عەبدو ڕەحمانی غافیقی)، دەستبەكار بوو لەسەر كۆبوونەوە لەگەڵ فەرمانداارانی سەربازی و، پیاو ماقوڵان، لەهەموو ئەو شار و ناوچانەی كە سەردانی دەكردن.

وە بەهەموو ئەندامەكانی لەشی یەوە، گوێبیستی ئەوە دەبوو كە دەیانگووت... وە هەموو ئەو شتانەی ئەوان پێشنیاریان دەكرد، تۆماری دەكرد... وە سوودی وەردەگرت لە ئامۆژگاریەكانیان. وە لەو كۆڕانەدا خۆی والێكرد بوو، كە زۆر ببیستیٚ، وە كەم قسەبكات.

وە هەروەها (غافیقی) خۆی دەگەیاند بە دەم راستانی موسڵمانان... هەروەك لەگەڵ گەورە پیاوانی (ئەهلی زیمە) (گاور و جو) لە پەیماندەران كۆدەبوویەوە. وە زۆر جار پرسیاری ئەوەی لێدەكردن، كە لەلای نادیار بوو، لە كاروباری وولأتیان و، ئەوەی كە بیرو هۆشی پێوەی خەریك بوو لە حاڵ و ئەحواڵی، پادشاو فەرماندەكانیان.

جارێکیان (غافیقی) یەکێك لە گەورە پەیماندەرانی لە (فەرەنسی)یەکان بانگهێشت کرد، وە گفتوگۆیەکی هەمەجۆرە و هەمەلایەنە، لە نێوانیان دا ئەنجام دراو، پیَ ی ووت:

خەیاڵ و مەبەستی پادشای هەرەگەورەتان چی یە، کەلەم جەنگەدا رووبەروومان نابێتەوە، هاریکاری پادشایانی دیکەی ناوچەکان ناکات دژی ئێمە؟!

ئەویش ووتی: ئەی (ئەمیر) بەڕاستی ئێوە، ئەوەی کە پەیمانتان پیَ دابووین، بە ئەنجامتان گەیاند جا بۆیە مافی خۆتانە، کە بەڕاستگۆیی وەلأمی پرسیارەکانت بدەینەوە... بیَ گومان، ئەوەبوو کە گەورە فەرماندەتان (موسای کوڕی نەصیر) دەستی بەسەر هەموو (ئیسپانیا)دا گرت، ئینجا لە دوای ئەوەدا، دەسەلأتی ئەو درێژ بوویەوە، تاچیای (البرنیە)ی تێپەڕاند کە دەکەوێتە نێوان وولأتی (ئەندەلوس)و وولأتی جوان و قەشەنگی ئێمە.

ئەوجا پادشایانی ناوچەکان و، زانایانی ئایینی روویان کردە پاشای گەورەمان و، پێیان ووت: ئەی پادشای وەختمان ئەم ملکەچی و ریسوای یە چی یە کە، ئاوێزانمان بووە، وەبە درێژایی رۆژگار و تا کۆتایی دونیاش، ئەوەو ئەوەزادەکانیشمانی پێوە گیرۆدەن...

وەلە سەر زمانی موسڵمانان بەردەوام گوێبیستی دەبین... وە ئێمە لەلای رۆژهەلأتەوە لە دەسەلأت و دەستبەسەراگرتنیان دەترسین، کەچی ئەوان وا لەلای رۆژئاوای وولأتەوە، بۆمان هاتن. وە دەستیان بەسەر هەمو (ئیسپانیا)دا گرت و، هەرچی تیا بوو لە پێویستی جەنگ و چەك داگیریان کرد، وە لوتکە و بەرزایی ئەو چیایانەی کە لە نێوانماندا بوون کۆنترۆڵیان کرد، لەگەڵ ئەوەدا، کە ژمارەی ئەوان کەم بوو... وە چەکەکانیان بیَ کەڵك و کەم بوو... وە زۆربەیان خاوەنی قەڵغانێك نەبوون کە لەکاتی رووبەروو بونەوەدا لەشیربازی بیانپارێزێت، یان خاوەن ئەسپێك نەبوون، کە بەسواری پیَ ی بچنە گۆرەپانەکانی جەنگ.

پادشاکە گوێبیستی ئەو ووتانە بوو پێی ووتین: منیش بیَ گومان زۆربەباشی بیرم لەوە کردوٚتەوە، کە زۆرجاربە خە یاڵی ئێوەدا هاتوە...وەبە ووردی سەرنجم داوە ولێی

کۆلێومەتەوە . جا ئەوەم بەدیکردووە، کەوا باشە، ڕووبەڕووی ئەو قەومە نەبینەوە لەم هەلوێستەی ئیستایاندا، چونکە بەڕاستی ئەوان لەم کاتەدا، وەك لافاوی بیٚ ئەمانی بەهار وان، کە هەرچی بکەوێتە بەری، لەبنی دەهێنیٚ و، لەگەڵ خۆی دەیبات و، لەهەرکوێیەك ویستی فڕێی دەدات.

وە هەروەها وایدەبینم و بۆچوونم وایە، کە ئەو قەومە، بیرو باوەڕو نیەتێکیان هەیە، کە بیٚ باکی کردوون لەژمارە زۆری جەنگەوەرانی بەرامبەریان و، بیٚ شومارەیی و چاکی چەکەکانیان... وە باوەڕ و، ڕاستی یەکیان هەیە، کە جێگەی قەڵغان و وولاٚخ سواری بۆ گرتوونەتەوە...

بەلاٚم بەرای من پشتگۆییان بخەن تا دەستەکانیان پڕ دەبێت لە دەستکەوتی جەنگ (غنائم الحرب)... وە خانووبەرە و کاخی جوان جوان و قەشەنگ بۆخۆیان دروست دەکەن، و بەدەستی دەهێنن... وە خزمەتکار و بەندەی زۆر لەخۆیان کۆ دەکەنەوەو... لەنێوان خۆیاندا دەکەونە ڕکابەرایەتی یەکتر لەسەر سەرکردایەتی و پلەو پایە...

جا ئالەو کاتەدا دەتوانن بەئاسانترین ڕێگاکان و، کەمترین هەوڵ کۆشش بەسەریاندا زاڵبن و، تێکوپێکیان بشکێنن و، مافی خۆتانیان لیٚ وەربگرنەوە.

جا (عەبدو ڕەحمانی غافیقی) کە گوێبیستی ئەوەبوو، بەغەمباریەوە سەردادەخست، چۆن سەر داخستنێك!، وە هەناسەیەکی پڕ لە ئاخی دوور و درێژی هەڵکێشا و، کوڕەکەی بەجیٚ هێشت ووتی:

(حيَّ على الصَّلاة)، بەڕاستی نوێژێك بوویەوە واتە کاتی نوێژە.

* * *

(عەبدو ڕەحمانی غافیقی)، دوو ساڵی تەواو مایەوە لەسەر ئامادەکاری چەك و پێویستی یەکانی جەنگ، بۆ ئەو جەنگە گەورەیەی کە لەبەر چاوی گرتبوو...

ئەوجا سوپای ئامادەکرد و، سەربازەکانی پڕ چەك کرد و... دڵەکانی ئاوەدان کردەوە... هیمەت و تواناکانی بەشێوەیەك ئاڕاستەکرد، وەك چەقۆی بڕندە، ئامادەی بڕین بوون، وە پەنای برد بە (ئەمیری ئیفریقیە)و داوای هاریکاری لێکرد، ئەویش بە کۆمەڵێك لە نموونەی سەربازی جەربەزە هاریکاری کرد، کە زۆر تامەزرۆی جیهاد بوون و... کڵپەیان لیٚ بەرز دەبوویەوە بۆ شەهید بوون...

پاشان (عوسمانی کوڕی ئەبی نوسعە)ی ئەمیری سنوورەکانی ئاگادارکرد، کە بەتەقەلێکردن و هێرش بردنە سەر دوژمن جەنجاڵ بکات تا خۆی دەگاتە لای، بەهێزی سوپاکەیەوە.

بەڵام ئەو (عوسمانە) دڵی پڕ بوو لە کینە بەرامبەر، هەموو ئەمیرێکی بەتواناو تەماکارێکی پایەبەرز، کە هەستێت بە ئەنجامدانی کارێکی گەورە کە ناوو شۆرەتی ئەو بڵند بکات لەناو خەڵکیدا و، لە نرخ و بەهای ئەمیر و کارگێڕانی دیکە داببەزێنێت.

زیاد لەوەش، ئەو لە یەکێك لە هێرشە پێشووەکاندا بۆسەر (فەرەنسا) بەخت ئامێز بوو بە کچێکی (دُوق اُکتانیە)، کە ناوی (مینین) بوو. وە (مینین) گەورە کچێك بوو، لەسەرەتای گەورە کچیدا، لە لوتکەی جوانیدا بوو. لەگەڵ جوانیەکەیدا خاوەنی شکۆمەندی پاشایی بوو...

وە جوانی و قەشەنگی گەورە کچی یەتیەکەی، دەستەملان بوو لەگەڵ لارو لەنجە و نازی کچانی کاخی پاشایەتیدا. جا خۆشەویستی (مینین)، هەموو کەنارەکان و ناخی دڵی (عوسمانی) گرتبوەوەو، هەمیشە ئارەزووی بینینی بوو، وە بوویە خاوەنی پلەو پایەیەکی زۆر ڕێزدار لەلای، بەشێوەیەك کە هیچ هاوسەرێك ئەو پلەو پایەی نەبوو.

جا ئەوە وای کرد لە (عوسمانی کوڕی ئەبی نوسمە) کە نەرمی لەگەڵ باوکی (منین)دا بنوێنێ، وە پەیمانی لەگەڵ بەست کە ناوچەکەی ئەو کە هاوسێ ی سنوورەکانی (ئەندەلوس)ە، لەو هێرشانە بپارێزێت کە موسڵمانان ئەنجامی دەدەن.

جا کاتێك کە فەرمانی (عەبدو ڕەحمانی غافیقی) هات، بۆ ئەوەی کە (عوسمانی کوڕی ئەبی نوسعە)، هێرش بکاتە سەر وولاتی خەزووری (دُوق اُکتانیە)، داری لەدەست داکەوتوو، نەیدەزانی چی بکات... وە بەسەرگەردانی شەوی بەسەر برد نەیدەزانی چی بکات؟.

بەڵام زۆری پێ نەچوو، کەنامەیەکی نووسی بۆ ئەمیر (عەبدو ڕەحمان غافیقی) تا چاو بگێڕێتەوە بەو فەرمانەدا، کە فەرمانی پێ کردووە، چونکە ئەو ناتوانێت ئەو پەیمانەی کە داویەتی بە (دُوف اُکتانیە) بشکێنێت پێش ئەوەی ماوەکەی تەواو ببێت... ئا ئەوە تووڕەیی (عەبدو ڕەحمانی غافیقی) هەژاندو ئاگری تێ بەردا... وە فەرمانێکی دیکەی بۆ ڕەوانەکرد کە تیایدا ووتبووی:

ئەی (عوسمان) ئەو پەیمانەی کە بەبێ ئاگاداری (ئەمیرەکەت)، داوتە بە (فەرنجەکان) بەتاڵە، وە سوپای موسڵمانان بەهیچ شێوەیەك وە بە هیچ بەندێکی یەوە وابەست نین.

جابۆیە لەسەرت پێویستە کە زوو بەزوو بەبێ هیچ دودڵی و ڕاوەستانێك، دەسبەکار بێت بۆجێ بەجێ کردنی ئەوەی کە فەرمانت پێ دراوە...

کاتێك کە (کوڕی ئەبی نوسعە)بێئومێد بوو لەوەی کە (ئەمیر) دەست هەڵگیری فەرمانەکەی ببێت، ناچار کەسێکی متمانەپێکراوی ڕەوانەکرد بۆلای خەزووری تالەوەی ڕوویداوە ئاگاداری بکات. وە داوای لێکرد بوو کە، کە ئامادەی کاری بکات و ئاگای لەخۆی بێت...

بەڵام چاوەکانی (عەبدو ڕەحمانی غافیقی) بەووردی چاودێری و جموجوڵ و، هەڵوێستەکانی (کوڕی ئەبو نوسعە) لەگەڵ دوژمندا گەیشتە (ئەمیر). دەست وبرد (غافیقی) فەوجێکی لە پیاوانی بەجەرگ و بەتوانا ئامادەکرد و، فەرماندەیی ئەو فەوجەی دایە دەست یەکێك لە فەرماندە بەتواناو بە ئەزموونەکان.

وە فەرمانی پێکرد کە (عوسمانی کوڕی ئەبی نوسعە)ی بۆ بهێنێ جا یان بەزیندووی یان بە مردوویی.

ئەو فەرماندەیە لەناکاو هەڵیکوتایە سەر پایەگای سەربازی (کوڕی ئەبی نوسعە)، لەوەدا بوو کە دەست بەسەریدا بگرێت بەڵام لە چرکەساتی کۆتاییدا، بەخۆی زانی... جا لەگەڵ کۆمەڵێك لەسەربازە تایبەتەکانی هەڵهات بۆ چیا، بەهاوڕێیەتی هاوسەرە جوانەکەی (منین)، کە هەرگیز لێ ی جیا نەدەبوویەوە،

وە بەبێ ئەو دونیای نەدەبینی. ئەو فەرماندەیە بە فەوجە سەربازەکەیەوە شوێن پێ ی تا دەوری خۆی و سەربازەکانیان دا...

ئەویش پارێزگاری لەخۆی و هاوسەرەکەی کرد، هەروەك چۆن شێر پارێزگاری لە بەچکەکانی دەکات... وە بەردەوام خەباتی دەکرد و دەجەنگا بۆ پارێزگاری لە هاوسەرەکەی تا کوژرا... وە شوێن لێدانی شیرو سەر ڕم لەلەشیدا ژمارە نەدەکرا...

ئەوجا سەربازەکان کەللە سەرەکەیان لێکردەوەو، لەگەڵ (ئەمیرەی جوان و قەشەنگ)ە هەڵیان گرت و بردیانە خزمەتی (عەبدو ڕەحمانی غافیقی).

جا کاتێك ئەو (ئەمیرە) لەنێوان دوو دەستی ڕاوەستاوە، وە (غافیقی) جوانیە بێ وێنەکەی بینی، چاووی لەئاستیدا دانەواند، ڕووی لێ وەرگێراو...

پاشان بەخەڵات ڕەوانەکرد بۆ خانەی جێ نشینێتی (دار الخلافە)... ئیتر ژیانی (ئەمیرە فەرەنسی)ە شۆخ و شەنگە لەداوێنی خەلیفەی ئەمەویدا لە (دیمەشق) کۆتایی پێ هات.

# عەبدوڕەحمانی غافیقی

## بەشی دووەم

**پاڵەوانی جەنگ (بلاطِ الشُهداء) (کاخی شەهیدان)**

**(خۆئەگەر سەرکەوتنی سەرشێتانەی (شارلْ مارتن) نەبووایە بەسەر موسڵمانان و فەرماندەکەیاندا (غافیقی) (ئسپانیا) بەردەوام بەهرەمەند دەبوو بە لیْ بووردەیی ئیسلام، وە (ئەوروپا) بۆ ماوەی هەشت سەدە لە رەوڕەوەی شارستانیەت دوانەدەکەوت)** (یەکێک لە مێژوو نووسانی فەرەنجی)

شاعیری ئینگلیزی (سُوذِي)، ئەو سوپایانەی موسڵمانان کە (ئەوروپا)ی غەزاکرد لەپاش گرتنی (ئەندەلوس) ئاوا وەسف دەکات:

(کۆمەڵێك بوون کە ژمارە نەدەکران)...

(لەعەرەب و، بەربەر و، رۆمی خەواریج و)...

(فورس و، قیبتی و، تەتەر و، کە هەموویان لەژێر ئالآیەك دا، یەکیان گرتبوو... وە باوەڕێکی شۆڕشگێرانە و، جێگیر لە ناخیان دا کۆیکردبوونەوە. وە پارێزەرێکی گڕگرتو بوون، هەروەك پریشکی ئاگر، وە برایەتیەکی سەر سوڕهێنەری وەهابوو، کە جیایی نەدەخستە نێوان مرۆۊ...

وە فەرماندەکانیشیان لەوان کەمتر نەبوون، لە متمانەبوون دا بەسەرکەوتن، پاش ئەوە کە مەست بوو بوون بەعارەقی زاڵ بوون و سەرکەوتن...

وە شاناز کاربوون بەو هێزە، بەوهێزەوەی کە هیچ شتێك لەبەردەمی دا رانا دەوەستا... وە دڵنیا بوون لەوەی کە سوپاکانیان هەست بە هیلاکی و ماندوبوون ناکەن.

ئەویش ئەوەبوو، کە هەمیشە گیان لەسەر دەستی گڕگرتوبوون، هەروەك یەکەم جار و لەسەرەتادا ڕاپەڕیبوون...

وەبڕوایان بەوە هەبوو، کە بۆهەر کوێیەك، لەهەرکاتێك دا، هەنگاو بنێن وبڕۆن، لەبەر پێیان دا سەرکەوتن وزاڵبوونە... وەبێ گومان هەمیشە بەرەوپێش ڕاپەڕینە... تا ئەوکاتەی کە ڕۆژئاواش ملکەچ و ژێر دەستەدەبێت، هەروەك ڕۆژهەڵات... وەسەر بۆ ڕاگرتنی بەرزییەش ناوی (موحەمەد) نەوی دەبێت... وە هەتا حاجی لە کۆتایی بەستنگەی باکورەوە (المتَّجمد الشِّمالي) ڕێ بەرێ بکاتبۆ ئەوەی بەهەنگاوەکانی بڕوا، چەوولمی سوتێنەری، بلأولەسەر بیابانەکانی ڕۆژئاوا، لەپێ بدات و... (لەسەر بەردە ڕەقەکانی مەککە ڕابوەستێت).

*　　　　*　　　　*

بەڕاست و بێ گومان ئەی شاعیری دوور نەبوو لەڕاستەقینە و ڕۆنەچوو، یان لە گێژاوی دۆڵەکانی خەیاڵ دا لەزۆربەی ئەوەدا کە ووتووتە لەراستی دا ئەو سوپایانەی کە کۆششکاران (المجاهدون) فەرماندەییان کردن، بۆ ڕزگارکردنی باوو باپیرانت لەو نەفامیەی کە تیایدا نقوم بووبوون هەروەك وەسفت کردووە...

عەرەبی بڕوادار بەخودا، هێزدار بەهێزی خوداییان تیایە، کە وەك ڕەشە با هەڵیان کردۆتە سەرتان. لە شام و... حیجاز و... نەجد و... یەمەن و... هەموو شوێنێکی دیکە لە دوورگەی عەرەب دا... وە (بەربەریان) تیایە، کە شکۆمەندن بە ئیسلام، ڕاپەڕین بۆ سەرتان لەلوتکەی چیاکانی (ئەتڵەسەوە)[1]، هەروەك لافاوی ڕامالێنەر... وە (فارسەکان) تیا بوو،کە بتپەرستی پادشایانی ڕۆم مێشکی بەنج کردبوون و، بەڵام بەهاتنە ناو ئایینی یەکتاپەرستی و، ڕەویەکردن لەسەر ڕێگای خودای باڵادەست، مێشکیان کرایەوە و بەئاگاهاتنەوە.

بەڵام لە ڕاستیدا ئەوان لەستەم و تاریکی یەکان دەرچوون و، لایان دا بۆلای ڕووناکی ئاسمانەکان و زەوی و، هاتنە ناو ئەو ئایینە راستەی خودا، کە ناڕەوایی تێدا نی یە.

---

[1] جبال الأطلس: ئەو چیایانەن کە دەکەونە نێوان ڕۆژئاوای ووڵاتی عەرەبی و ئیسپانیا.

وە هەروەها (قیبتیەكان)ی تێدایە، كە كۆتی بەندایەتیان لەگەردن و پای خۆیان داماڵی بۆ پادشایانی رۆم، تا لە باوەشی ئیسلام دا بەسەربەستی بژین هەروەك، بەسەربەستی لەدایك بوون...

بەڵێ ئەو سوپایەی كە (عەبدو رەحمانی غافیقی) و پێشینەكانی ئەو فەرماندییان كرد، بۆ رزگاركردنی باوباپیرانت لە نەفامی... سپی پێس و، رەش پێس و، عەرەب و عەجەمی تێدابوو... بەڵام ئەوان هەموویان لە لێوانی ئسلام دا تواببوونەوە و... بە بەهرەداری خودا بوبونە برا.

وەهەموو هیوا و ئاواتیان ئەوەبو، وەك باست كردووە، كە خەڵكی رۆژئاوا بهێننە ناو ئاینی خودا، هەروەك لەمەو پێش خەڵكی رۆژهەڵاتیان هێنایە ناوی.

وەوا لەهەموو مرۆڤایەتی بكەن كەسەر نەوی بكەن بۆ خودای خەڵك، وە رووناكی ئیسلام دەشت و دۆڵەكانتان بگرێتەوە و خۆرەكەی لەهەمووماڵێك لە ماڵەكانتاندا هەڵبێت و، دادپەروەری ئیسلام هاوچوونی بكات لە نێوان پادشایان و رەشە خەڵكەكەتاندا.

وە ئەوان سوورن لەسەر ئەوەی، كە گیانیان ببەخشن لەرێگای رێنومایی ئێوەدا بۆلای خودای دلۆڤان و... رزگار كردنیان لە ئاگری دۆزەخ...

* * *

لە پاشدا... جا بفەرموون ئەوە ئێوەو چیرۆكی كۆتایی ئەو سوپایە و، دەنگوباسی پاڵەوانە ناوازەكەی (عەبدو رەحمانی غافیقی) دەنگوباسە دڵتەزێنەكان، دەربارەی كوشتنی زاواكەی (دُوق) (عوسمانی كوڕی ئەبی نوسعە)، گەیشتە (دُوق اُكتانیة) وە دەنگوباسەكانی ئەو كۆتاییە دڵتەزێنەی پێگەیشت، كە رووبەرووی كچە قەشەنگەكەی بوویەوە، جا هەستی كرد كە تەپلی جەنگ والێدرا...

وە دڵنیابوو كە شێری ئیسلام (عەبدو رەحمانی غافیقی) ئێوارە یان بەرەبەیان لە نیشگەكەیاندا دەبێ... جا بۆیە راپەڕی و ئامادەكاری كرد بۆ پارێزگاری لەهەموو بستێك، لەسەر زەمینی وولاتەكەی، پارێزگاری بەمەرگ. وە ئامادە بوو، بۆ خەبات كردن، بۆ پارێزگاری لەخۆی و وولاتەكەی، ئامادەیی نەپساو و، شێر ئاسا... چونكە لەوە دەترسا ئەویش هەروەك كچە قەشەنگەكەی (مینین)، بە بەندی رەوانەی خانەی جێنیشینی (دار الخلافة) بكرێت لەشام.

یاخود کەللەسەری لەسەر سینی یەك هەڵبگیرێت و، بگێڕرێت بە بازاڕەکانی (دیمەشق)دا، هەروەك لەوەوپێش سەری (لُذَریف) پادشای (ئیسپانیا) گێڕرا...
جا بە سوپا زۆر و پڕچەك و بەتواناکەیەوە لەباکوری (ئەندەلوس)ەوە، ڕاپەڕی و کشا، هەروەك باوبۆران. وە هەروەك لافاو لە لوتکەی چیاکانی (البِرنیة)وە، دایبەسەر باشوری (فەرەنسا)دا.
وە ژمارەی سوپاکەی سەد هەزار جەنگاوەری جەربەزە بوون... کە لە نێوان ناخی هەریەکێکیان دا دڵی شێرێك هەبوو... وەلە ڕەگوڕێکانیدا لێڕانی پاڵەوانێکی نەبەز هەبوو...

سوپای ئیسلام لەلای شاری (آرلَ)[1] (ئاریلە)وە، کە کەوتۆتە سەر رۆخی رووباری (الرَّونِ)، رووبەروویان بوویەوە. وە بۆ ئەوە هەموو حیسابێکیان کردبوو...
چونکە شاری (آرلَ) ئاشتەواییان لەگەڵ موسڵمانان کردبوو، لەسەر ئەوەی کە سەرانەبدەن و سەلامەت بن. جا کاتێك کە (سەمحی کوڕی مالیکی خەولانی)، لە جەنگی (تُولُون)[2]دا، شەهید کرا.وە موسڵمانان بەشەهیدبوونی ئەو وورەیان رووخا و تێکچوونیان پێوە دەرکەوت، خەڵکی (آرلَ) گوێڕایەڵیان وەلاخست و، پەیمانیان شکاند و، نکولیان کرد لەدانی سەرانە.

جا کاتێك (عەبدو ڕەحِمانی غافیقی) گەیشتە دەوروبەری شارەکە، بینی کەوا(أودَ) (دُوق أُکتانیة)، سوپایەکی زۆر و زەوەندی لەوێدا مۆڵداوە، وزە هێزەکانی لەهەموو سنوورەکانی ئەو شارەدا حەشارداوە... جا ڕووبەرووی هێرشی سوپای ئیسلامی بوویەوە بۆ سەر شارەکە...
پاشان زۆری نەخایاند، کە هەردوو سوپاکە رووبەرووی یەکبوونەوە، جەنگێکی هاڕینەری توندو تیژی لەنێوان هەردوولادا ڕوویدا...
فەرماندەی جەربەزە (عەبدو ڕەحمانی غافیقی)چەند کەتیبەیەکی لە سوپاکەی کە زیاتر و زیاتر ئارەزوومەندو تامەزرۆی مەرگ بوون، لەوە کە دوژمنانیان تامەزرۆی

---

[1] (آرلَ): شارێکە لە باشوری (فەرەنسا) لەسەر ڕووباری (الرون) باکووری مەرسیلیا.

[2] (تولون): شارێکە لەباشووری (فەرەنسا) لەسەر ڕووباری (الفارون) کە بنکەی پارێزگای غارونی باڵایە.

ژیان بوون، هاویشتە ناو ئەو جەنگەوە، کە توانیان زەوی لەژێرپای دوژمندا بهێننە لەرزە و، ریزەکانیان شڕو وڕبکەن...

وە ئەم جارە لەڕێگەی جەنگەوە بچنە ناو شارەکەو، دەستیان بەسەردا بگرن. وە شیریان ئاوێزانی گەردنی نەیاران کرد و، ئەوەندەی پێویست بوو لێیان کوشتن، وە ئەوەندەیان دەستکەوتی جەنگ بوو، کەلە ژمارە نەدەهات.

بەلأم (دُوق) (أود)، لەگەڵ ئەوانەی کە بەزیندوویی مابوون لەسەربازەکانی هەڵهات... وە دەستی کردەوە، بەخۆ ئامادەکردن، بۆ رووبەروو بونەوەیەکی تر لەگەڵ سوپای موسڵمانان دا. وە ئەوەی باش دەزانی کە جەنگی (آرلَ)، کۆتایی ڕێگا نی یە، بەڵکو سەرەتایەتی.

(عەبدو ڕەحمانی غافیقی) بە سوپا جەربەزەکەیەوە رووباری (الجارُونَ)[1]ی تێ پەڕاندو، کەتیبە (کۆمەڵە) سەرکەوتووەکانی لەکەرتی (أُکتانیة)دا، بەلای راست و چەپیدا دەهاتن و دەچوون.

وەشاروو گوندەکانی یەك لە دوای یەك، دەکەوتنە ژێر سمی ئەسپی سەربازەکان، هەرچۆن لەپایزدا گەلأی درەختەکان دادەکەوتن، کاتێك کە گژەبای بایی هەڵی دەکرد.

وە موسڵمانان دەستکەوتێکی بێ شوماری جەنگی تریان وە دەست هێنا، کەلەوەو پێش لەبەر چاوبینرابوو، وە نەبەگوێ بیسرابوو، جا خستیانە سەر ئەوەی کەلەوەو پێش بەدەستیان هێنابوو...

(دُوق) (أُکتانیة) جارێکی دی هەوڵی خستەگەڕ، تا رووبەرووی ئەو هێرشە گەورەیە ببێتەوە، ئەوە بوو لەجەنگێکی بێ ئەمان دا تێکبەربوو لەگەڵ موسڵمانان دا..

بەلأم موسڵمانان زۆری پێ نەچوو، کە تێکیان شکاندن تێکشکاندنێکی هاڕێنەر و، نەدامەتی یەکی بێ سنووریان بەسەر هێنان و، سوپاکەیانیان بەجێ هێشت، لە نێوان کوژرراو، دیل و، بەزیی و سەرگەردان دا.

پاشان موسڵمانان روویانکردە شاری (بُوردو)[1]، کە گەورەترین ی شارەکانی (فەرەنسا) بوو، لەو ڕۆژگارەدا و، پایتەختی کەرتی (أُکتانیەش) بوو. وە لەگەڵ

---

[1] (الجارون): رووبارێکە لە رۆژئاوای باشووری (فەرەنسا)، کە لە (ئیسپانیا) هەڵدەقوڵێ و (تولوز و،اجن و، بوردو)ئاوەدات و، دەرژێتە دەریا لوشی (ئەتڵەس)

ئەمیرەکەیدا، جەنگێکیان بەرپاکرد، کە لەجەنگەپێشوەکان کەوێنەی نەبوو لە توندوتیژی و کوشتاردا.

وە لەو جەنگەدا هێرشکاران و پارێزگاران هەڵوێستێکی وەهایان نواند، کە جێگەی تێ رامان و سەرسوڕمان بوو. بەڵام ئەو شارە گەورە مەترسی دارە، زۆری پێ نەچوو، کە کەوتە دەستی موسڵمانان، هەروەك دەستەخوشکەکانی لەوەو پێش زۆری

نەخایەند کە ئەمیرەکەی چووە ریزی کوژراوە کانەوە. وە موسڵمانان لە (بوردو) ئەوەندەیان دەسکەوتی جەنگ بەدەستهێنا، کە هەرچی دەستکەوتێك، کەلەوە وپێش بەدەستیان هێنابوو لەبەر چاویان کەوت وبێ بەهابوو.

وە تێکشکانی (بوردو) و کەوتنە دەستی موسڵمانان، دەرگایەك بووکرایەوە بەرووی تێکشکانی و، کەوتنە دەستی شارگەلێکی زۆری مەترسیدار... کە گرنکترینیان (لیون)[2] و (بیزاسون)[3] و(سانس)بوو. کە ئەوە دواییان لەسەد (١٠٠)میل زیاتر دوورنەبوو لە (باریس)ەوە

*                    *                    *

(ئەوروپا) سەرتاپای کەوتە شەکوشۆك، لەبەر ئەوەی، هەموو نیوەی فەرەنسای باشور، لەماوەی چەند مانگێکدا، کەوتە ژێر دەستی (عەبدو ڕەحمانی غافیقی)... وە فەرەنجەکان لەو ساتە وەختەدا چاویان بڕییە ئەو مەترسی یە کوتوپڕە و... دەنگیان بڵند کردو، لەهەموو شوێنێکەوە بانگهێشتی بە توانایان و هەتا پیرە پیاو، کەمتواناکانیشیان کرد، بۆ راوەستان و، هەڵوێست وەرگرتن، لەرووی ئەو مەترسی یەدا کەلە رۆژهەڵاتەوە هاتووە.

---

[1] بوردو: مینایەك بوو لە (فەرەنسا) لەسەر رووباری (الفارون) کە ئێستا بنکەی پارێزگای (جیروندە).

[2] لیون: شارێکە لە باشووری رۆژهەڵاتی (فەرەنسا) لەسەر پێگەی (الرون) و (اسون) وە ئێستا بنکەی پاریزگای (الرون)ە.

[3] بیزاسون: شارێکە لە رۆژهەڵاتی (فەرەنسا)لە سەر روباری (دو) بنکەی پارێزگاری (دو)ە.

وە هانیان دەدان، لەسەر ڕووبەڕووی بونەوەیان بەسینەکانیان ئەگەر شیرەکانیان کول بوون و بڕەیان نەما، وە بانگهێشتیان دەکردن تا بە لەشیان، ڕێگا لەبەردەمی ئەو سوپایەدا دابخەن، ئەگەر پێویستی یە جەنگی یە کانیش نەما.

ئەوەبوو (ئەوروپا) بەگشتی وەلاَمی ئەو بانگهێشتەی دایەوە. وە خەڵکی ڕوویانکردە گۆڕەپانی ئامادەبوونی جەنگ و، لە ژێر ئالاَی (شارل مارتیل) کۆبوونەوە، کە داروبەرد و درك چەکیان لەگەڵ بوو.

سوپای موسڵمانانیش لەوساتەوەختەدا، گەیشتبوە شاری (تورَ)ە کەپێشەنگی شارەکانی (فەرەنسا)بوو، لەزۆری دانیشتوان و قەشەنگی و بەهێزی و بیناکاری و، دێرینی و پلەوپایەی لە مێژوودا... وە شارەکە لەسەر و هەموو ئەوانەشەوە... شانازی دەکرد بەسەر زۆربەی شارەکانی (ئەوروپا)دا، بە کەنیسە قەشەنگ و گەورەکانی یەوە، کە ئاوەدان بوون، بەکەلەپوری دێرین و، شتی بەنرخەوە.

موسڵمانان هەروەك زنجیرچۆن دەوری گەردن دەدات ئاوەها دەوری ئەو شارەیان گرت... وە هەروەك چۆن کاتێك کە کۆتایی تەمەن هات، مەرگ دەستگیر دەکات و دەست بەرنادات، تا کار بەئەنجام دەگەیەنێت، ئاوەها سوپای موسڵمانان ڕژان بەسەر ئەو شارەدا... وەلە ڕێگای فەتح کردنیدا گیان و ماڵیان هەرزان فرۆش کرد... ئەوەبوو زۆری پێنەچوو، کەلە بەرچاوی (شارل مارتل)دا، ئەو شارە کەوتە دەستی موسڵمانان.

* * *

وە لە دەیەمی کۆتایی مانگی شەعبانی ساڵی سەدو چواری (١٠٤) کۆچیدا، (عەبدو ڕەحمانی غافیقی)، بە سوپا جەربەزەکەیەوە، هێرشی کردە سەر شاری (بُواتییە) (poiticrs) وە لە لەوێدا لەگەڵ سوپا جەربەزەکانی (ئەوروپا)دا بە فەرماندەیی (شارل مارتل)، ڕووبەڕووی یەکبوون و بەیەك گەیشتن. وەلە نێوان ئەو دوو سوپایەدا، جەنگێکی جیاکەرەوە، ڕووی دا، نەك تەنها لە مێژووی موسڵمانان و فەرەنجەکاندا، بەڵکو لە مێژووی هەموو مرۆڤایەتی دا.

وە ئەو جەنگە ناسرا بە جەنگی (بلاط الشُّهداء) (کاخی شەهیدان).

سوپای ئیسلامی لەو ڕۆژگارەدا لە لوتکەی سەرکەوتنە ناوازەکانیدا بوو. بەڵام پشتی بەو هەموو دەستکەوتانەی، کەوەك باران ڕژابوو بەسەریاندا قورس بووبوو... وەلە نێو دەستیان دا کەڵەك بووبوو، هەروەك چۆن هەور چڕ دەبێتەوە...

وە (عبدو ڕەحمانی غافیقی) بە دوودڵی و ترسەوە، سەرنجی ئەو سامانە زۆرو زەبەندەی دا. وە هەستی بە مەترسی کرد لەسەر موسڵمانان. وە لەوە دڵنیا نەبوو، کە دڵ و دەروونیان خەریك ئەبێت بەو دەسکەوتە ناوازانەوە لە کاتی ڕووبەڕوو بوونەوەدا لەگەڵ دوژمندا ..وە ناخ و هەستیان دابەش دەبێت لەکاتی ناڕەحەتی و تێك هەڵچوندا وە وایان لێدەکات چاوێکیان لەسەر دەستکەوتەکان بێت و، چاوەکەی تریشیان لەسەر دوژمن بێت کە دێتە سەریان...

جا بۆیە بڕیاری دا، فەرمانبدات بە سەربازەکانی بەخۆڕزگار کردن، لەو سامان و داراییە زۆرو، بێ شومارە... بەڵام لەولاشەوە، لەوە دەترسا، کە سەربازەکان، بەو بڕیارە مەترسیدارە دڵخۆش نەبن... وە ناخ و دەروونیان ڕێگا نەدات بەوەی کەواز لەو گەنجینە بەنرخ و بەبەهایە بێنن.

بۆیە هیچ ڕێگا و هۆکارێکی باشتر لەوەی نەدییەوە، کە ئەو دەستکەوتانە، لەچەند چادرگایەکی تایبەتیدا کۆبکاتەوە... وە لەدوایی پایەگا سەربازییەکەوە دایبنێ، پێش دەست پێکردنی جەنگ و کوشتار.

ئەوجا ئەو دوو سوپا گەورەیە، هەریەکەیان بۆ ماوەی چەند ڕۆژێك بەئارامی و بێدەنگی و چاودێریەکی تەواوەو بەرامبەر ئەوی دیکەیان راوەستاوە، هەروەك چۆن دوو زنجیرە چیا کە بەرامبەر یەکتر راوەستاون... وە هەریەکێك لەو دوو سوپایە، لەتوندوتیژی و دەست وەشاندنی دوژمنەکەی دەترسێت، وە بۆ تێکهەڵچوون لەگەڵیدا، هەزار حساب دەکات.

جا کاتێك، کە هەر بەو شێوەیە کاتەکە درێژەی کێشاو، لەولاشەوە (عەبدو ڕەحمانی غافیقی)، هەستی کرد بەگڕوکڵپەی بڕوا بەخۆبوون و ڕاپەرین لە دڵ و دەروونی سەربازەکانی دا، وای بەباش زانی، کە ئەو دەست پێشکەری هێرش بێت، متمانە بە تایبەتمەندی سەربازەکانی... وە دڵخۆش بەبەختی باشی لە سەرکەوتندا.

ئەوەبوو (عەبدو ڕەحمان غافیقی)، بەسوار چاکەکان هێرشی کردە سەر ریزبەندەکانی سوپای فەرەنجەکان، هەروەك پەلامار و هێرش شێرە تێکشکێنەرەکان. لەولاشەوە، سوپای فەرەنج هەروەك چیای جێگیر و لەبن نەهاتوو بەریان پێگرتن، پێیان داکووتا... بەو شێوەیە ڕۆژی یەکەمی جەنگ کۆتایی هات، بەبێ ئەوەی تای ترازوو بەهیچ لایەك دا بکەوێ... وە هیچ شتێك لەمەیدانی کوشتاردا ئەکەوتە نێوان کوشتارکاران جگە لەداهاتی تاریکی شەو...

پاشان لە ڕۆژی دا هاتوودا ڕووبەڕوو بوونەوە دەستی پێکردەوە، وە موسڵمانان چەند هەڵمەتێکی بێ ئەمانیان، هەڵکوتایەسەر فەرەنجەکان، بەڵام بێ هودە بوو.

بەوشێوەیە جەنگەکە حەوت ڕۆژی پڕ لەتوندو تیژی خولی خوارد کاتێك کە ڕۆژی هەشتەم هات، موسڵمانان، بەیەکجار پەلاماری دوژمنیان دا. وە توانیان کە نێوەندێکی گەورە لە ریزەکانیان دا دروست بکەن، کەسەرکەوتن لەو نێوەندەدا وەك ڕووناکی بەرەبەیان لە تاریکیدا، دەدرەوشایەوە.

ئالەو کاتەدا، کۆمەڵێك لەسەربازەکانی فەرەنج، هێرشی کردە سەرچادرگاکانی دەستکەوتەکانی، (مُخيمات الغنائم). ئەوە بوو کاتێك کە موسڵمانان، بینیان وا خەریکە دەستکەوتەکانیان دەکەوێتە دەستی دوژمنەکانیان. زۆربەیان پشتیان هەڵکرد و گەڕانەوە بۆ رزگارکردنی دەستکەوتەکانیان ، ئەوە درزیکردە ریزی بەندەکانیان و پەراگەندە بوون و، هێزو توانایان لەدەست چوو...

جا ئالەو کاتەدا فەرماندەی ڕاپەڕی و کاری دەکرد لەسەر گێڕانەوەی پشت هەڵکردووان... بەرگری لە هێرشکاران و... داخستنی ئەو کون و کەلەبەرانەی کە دوژمن دەیویست لێیانەوە درزە بکات... وە لەکاتێکدا کە پاڵەوانی ئیسلام (عەبدو ڕەحمانی غافیقی) بەسەر پشتی ئەسپە بەڵەکەکەیەوە، گۆڕەپانی جەنگی پێوانە دەکرد، بەهاتن و چوون و، هێرش کردن... تیرێك ناوێزانی بوو، وەلە سەر پشتی ئەسپەکەی هەڵی دایە خوارەوە هەروەك چۆن هەڵۆ لەسەر لوتکەی چیا دەکەوێتە خوارەوە.

ئەوجا بەشەهیدی لەسەر گۆڕەپانی جەنگ تەخت بوو. کاتێك، کە موسڵمانان ئەوەیان بینی، ترس و بیم دایگرتن و تێکچوون بوو بەمیوانیان و، هێرشی دوژمن لەسەریان تینی سەند و، جگە لەتاریکی شەو کەداهات، هیچ شتێك لەدەستیان قووتاری نەدەکردن.

کاتێك بەرەبەیان داهات و رۆژ بوویەوە، (مارشل مارتل)، بینی کە موسڵمانەکان لە (بواتیا) کشاونەتەوە. بەڵام ئەوەندە بوو نەیانوێرا شوێنیان بکەون...خۆ ئەگەر شوێنیان بکەوتنایەن و، راویان بنانایە، ئەوە لەناویان دەبردن. ئەوەش ئەوەبوو، کە (شارل مارتل) لەوە ترسابوو، کە کشانەوەکەیان فێڵێك بووبێت، لە فێڵەکانی جەنگ، لەوشەوەدا پیلانی بۆ رێکخرا بێت...

بۆیە وای بەباش زانی کەلە شوێنەکانی خۆیاندا بمێننەوەو، بەو سەرکەوتنە گەورەیە دەست هەڵگیربن. لەراستی دا رۆژی (بلاط الشُّهداء) (کاخی شەهیدان)، رۆژێکی یەکلاکەرەوە بوو لە مێژوودا.

موسڵمانان لەو رۆژەدا، ئاواتێك لەپیرۆزترین ئاوات و ئومێدەکانیان لەدەست دا... وەهەر لەو رۆژەدا پاڵەوانێك لە گەورەترینی پاڵەوانەکانیان لەدەست چوو... وەنەهامەتی یەکانی رۆژی (ئوحود)ی تیا دووبارە بوویەوە... ئەوەش (سُنَّةُ الله) رەویەی خودایە لەناو دروستکراوەکانیدا... وە گۆرانکاریش بۆ رەوییەی خودا نی یە ﴿ولَنْ تَجِدَ لِسُنَّةِ اللهِ تَبْدِيلاً﴾... الفتح.٢٣

* * *

دەنگوباسەکانی کارەساتی رۆژی (بلاط الشُّهداء) ناخ و دڵ و دەروونی موسڵمانانی لەهەموو شوێنێك، خستە شەك و شۆك، چۆن شەك و شۆکێك... وەبیم و ئێش و ئازاری ئەو رۆژە .دڵی موسڵمانانی هێنایە لەرزە، لەرزینێکی زۆر بەتین...وە غەم وپەژارەی ئەو رۆژە، هەموو شارو، گوند و، ماڵێکی گرتەوە... وەبەردەوام برینە پڕئازارەکەی، هەتا ئەمرۆکەش، لەدڵیانەوە خوێن دەتکێنێ.

وە بەردەوامیش هەتا موسڵمانێك لەسەر رووی زەوی بمێنێت ئەو خوێنە هەردەتکێت. وە ئەو برینە قوڵە بەئازارە، وا دامەنێ کە تەنها ئازاری بەدڵی موسڵمانان

گەیاندووە. بەڵکو لە ڕاستیدا کۆمەڵێك لەژێرمەندانی فەرەنج لەوەدا هاوبەشی موسڵمانان بوون.

وەلە سەرکەوتنی باوباپیرانان دا بەسەر موسڵماناندا لە (بُواتیە)دا، نەهامەتی و تووشبوونێکی گەورەیان بینی، کە بەهۆیەوە مرۆڤایەتی تووشی ئازار بوو. وەلە ناوەڕۆکیدا (ئەوروپا)ش، تووشی زەروزیانێکی هەرە گەورەبوو.

وە شارستانیەتیش بەهۆیەوە، تووشی نەهامەتیەکی روون و ئاشکرابوو. وە ئەگەر دەتەوێت کە هەڵوێستە بکەیت لەسەر ڕای هەندێك لەوانە، لەنێو کارەساتی (بِلاطُ الشُّهداء)دا، فەرموو گوێبیستی (هنری دی شامبون) بە بەڕێوەبەری گۆڤاری (ریڤی بارلمنتیر)ی فەرەنسیە کە ووتوویەتی:

(ئەگەر سەرکەوتنی سوپای (شارل مارتل)ی شێتگیرانە و برسی نەبوایە بەسەر عەرەبە موسڵمانەکان دا لە (فەرەنسا)دا، ووڵاتمان نەدەکەوتە نێو تاریکی شەوەزەنگەکانی (سەدەکانی ناوەڕاست)[1]... وە تووشی نەدەبوو بەتووشی کارو سیما ناشیرین و، قیزەوونەکانی ئەو سەدانەوە.

وە تووشی ئەو کوشتارگە لە خەڵکی یە نەدەچوو، کە بەهۆی شۆڤینی یەتی ئایینی و مەزهەبی یەوە، پێی تێنا..

بەڵێ، خۆئەگەر ئەو سەرکەوتنە دوڕەندەییە نەبوایە، بەسەر موسڵمانان دا لە (بُواتییە)، ئەوا (ئیسپانیا) بۆ هەمیشەیی بەهرەمەند دەبوو بە لێبوردەیی و کراوەیی ئیسلام، وە ڕزگاری دەبوو لە شورەیی (وصمة) دادگاکانی پشکنین (محاكم التفتيش)[2].

وە هەروەها هەشت سەدە ڕەوڕەوەی شارستانیەت دوانەدەکەوت. جا هەرچۆن بیروڕا و، هەستەکان جیاواز بێت دەربارەی ئەو سەرکەوتنەمان. جا ئێمە قەرزداری

---

[1] القرون الوسطى: ئەو سەدە تاریکانەبوو لە نێوان ساڵی ٤٧٦ تاساڵی ١٥٠٠زایینی

[2] محاكم التفتيش: ئەو دادگایانە بوو کە (فەرەنسا) وشاژن (إیزابیلا) لە (ئەندەلوس) دایاننات بۆ موسڵمانان، کە تیایدا تاوانی مرۆڤایەتی وەها روویدا، کە مێژوو لە ئاستیاندا تەوێڵ نەوی دەکات.

موسڵمانەکانین، بەهەموو ئەو شتە باشانەی کە دەبینرێت و هەیە، لە شارستانیەت و پێشکەوتنەکانمان دا، لە زانست و، هونەر و، پیشەسازی.

لەسەرمانە کە دان بەوەدا بنێین، کە ئەوان نموونەی مرۆڤایەتی تەواون. لەو کاتەدا کە ئێمە نموونەی نەفامی و شێتگیرین. وە ئەمڕۆکە ئەوەش دەست هەڵبەستە، کە ئێمە پڕوپاگەندە دەکەین و دەڵێین کە گوایا زەمانە خولی داوەتەوە. وە موسڵمانەکان لەم چاخەدا، گەشتونەتە ئەو ئاستەی، کە ئێمە لەسەری بووین لە چاخەکانی ناوەڕاست دا.

خودایە دڵسۆزی و هەڵوێستە ناوازەکانی (عەبدو ڕەحمانی غافیقی)مان پێ ببەخشە
﴿وەرگێڕ﴾

بۆ زیاتر شارەزا بوون لە ژیاننامەی (عەبدو ڕەحمانی غافیقی)و ڕووداوی (بُواتییە) بڕوانە:


١- إبنُ الأثيرك ٦٤/٥
٢- غزوات العرب:٨٧-٢٨
٣- البيان المغرب: ٢٦/٢-٢٨
٤- نفح الطيب: ٤٨/١
٥- جمهرة الأنساب: ٣٠٩
٦- علماء الأندلس لأبن الفَرَضي: ٢١٤
٧- جذوة المقتبس:٢٥٣-٢٥٥
٨-

# ٢٦) نەجاشی (ئەسحەمەی کوڕی ئەبجەرە)

**(کاتێك کە (نەجاشی) وەفاتی کرد، ئێمە هەموو باسمان دەکرد، کە بەردەوام لەسەر گۆڕەکەی ئەو رووناکی (النُور) دەبینرێت).** **(عائیشەی دایکی بڕواداران)**

ئەگەر یادی شوێنکەوتوان کرایەوە، ئەوە ئەو گەورەیەمان یەکێکە لەوان... وە ئەگەر هاوڕێیان هەڵژمار کران، ئەوە ئەو یەکێکە لە هاوڕێیان...

ئەو پیاوە ناوازە نامەی ڕوانەی خزمەتی (پێغەمبەر) کردووە درودی خوای لەسەر بێ، وە پێغەمبەریش نامەی ڕەوانەی ئەو کردووە... وە کاتێك کە وەفاتی کرد، (پێغەمبەر) درودی خوای لەسەر بێ، نوێژی نادیاری (صلاه الغائب) لەسەر کرد، کە جگە لەو نوێژی نادیاری لەسەر کەس نەکردووە. ئەو کەسە ناوازەیە (أصْحَمَةُ بنُ ابْجَرَ) (ئەسحەمەی کوڕی ئەبجەرە)، کە ناسراوە بە (نەجاشی)[1]، جا فەرمووی پێکەوە ئەم چرکە ساتە پیرۆزانە بەسەر بەرن لەگەڵ ئەو پیاوە ناوازەیە، لە پیاوە ناوازەکانی موسڵمانان.

* * *

باوکی (اصحمة) (ئەسحەمە)، پادشای (ئەحباش)بوو، وە جگە لەو کوڕی دی نەبوو. هەندێ لە گەورە پیاوانی (حەبەشە) بەهەندێکی دیکەیانیان ووت:

[1] (النجاشی): ناوەکەی (اصحمە)، (نەجاشی) نازناوە بۆ پادشاکانی حەبەشە، هەروەك (کیسری) بۆ پادشایانی فارس و، قەیسەر بۆ پادشایانی (ڕۆم).

بەڕاستی پادشامان جگە لەم لاوە تازەپێگەیشتووە، کوڕی دیکەی نی یە... وە ئەوەش هەر ئێستا کە خۆی زیندووە، دەستی شکاندووەو، لاوازی دەکات، وە ئەگەر خۆی مرد، ئەو دەست بەسەر وولاَت و دارایی و پادشایەتیدا دەگرێت و، بەرەو سەر ئەنجامێکی نەویستراوو خراپ بەڕێمان دەکات. خۆزگایە بمان کوشتایەو، براکەیمان بکردایەتە پادشا، چونکە ئەو دوانزە کوڕی هەیە، کەلە ژیاندا هاریکاری دەکەن و، لەدوای مردنیشی دەبنە میراتگری. ئیتر بەردەوام شەیتان ختوکەی دڵ و دەروونیانی دەداو، ترس و بیمی لە ناخیان دا پەرە پێ دەدا، هەتا پادشایان کوشتو، لەدوای ئەو پەیمانیان دایە براکەی و کردیانە پادشا.

(أصحمة) (ئەسحەمە) لە ژێر چاودێری مامی دا نەشونمای کرد، وە خونچەکانی دەستیان بە گەشانەوە کرد، لە ڕووی زیرەکییەکی درەوشاوەی و، ویستێکی جوان و، دەرکەوتەیەکی ڕووناك و، کەسایەتیەکی ناوازەوە. تا وای لێهات دڵی مامی پڕکرد لەڕامان پێ ی، وەلەبەر سیفەت و ڕەوشتە بەرزو دیارەکانی، فەزلی ئەویدا بەسەر کوڕەکانی خۆیدا.

پاشان جارێکی دی (شـــەیتان)، کەوتەوە ختوکە دانی دڵ و دەروونـــی گەورە پیاوانی (ئەحـــباش)، جا هەندێکیان بەهەندێکی تریانیان دەوت:

سوێند بەخودا ، ئێمە لەوە دەترسین، کە پادشایی بکەوێتە دەستی ئەو لاوە. خۆ ئەگەر وابێت و، ئەوە سەربگرێت، ئەوە بەخراپترین شێوە حەقمان لێدەکاتەوە و سزامان دەدات... وەهەموومان لە تۆڵەی باوکیدا دەکوژێت. پاشان بەرەو لای پادشا بەڕێکەوتن و ووتیان:

ئەی پادشا بەڕاستی ئێمە دڵنیاو دڵخۆش، دڵ ئارام نابین، ئەگەر (أصحمة) نەکوژیت، یان دەری نەکەیت و لەبەر چاومانی نەخەیت. چونکە ئەوەتا وا گەورە بووە، وەلە ڕاستی دا، ئێمەش لەوە دەترسین کە لە تۆڵەی ئەوەدا کە باوکیمان کوشتووە، تۆڵەمان لێ بکاتەوە. پادشاش پێ ی ووتن:

ئێوە خراپترین خەڵکن... دوێنێ باوکیتان کوشتوە، ئەمڕۆش داوا لەمن دەکەن کە خۆی بکوژم!!... سوێند بەخوا ئەوە ناکەم.

ئەوانیش ووتیان: دەی کەوابوو، ئێمە دەیگرین و، دەریدەکەینە دەرەوەی وولاَتەکان... پادشا بەناچاری و، پێناخۆش بوونەو، ملکەچی داواکەیان بوو.

جگە لە ڕۆژێك یان چەند ڕۆژێك، بەسەر دوورخستنەوەی (أصحمة)دا تێ نەپەڕی، کە ڕووداوێك ڕوویدا، بەبیری کەس دا نەهاتبوو وەبیرری لێ نەکرابووەوە. ئەویش ئەوەبوو، کە هەورێکی تاریکی چڕوپڕ، ڕووی ئاسمانی گرت و... وەهەورەگرمە و بروسکەی هەورە تریشقە، ئاسمانی ئاڵۆزکردبوو، کاتێك زانرا، یەکێك لەو هەورە بروسکانە، کەوتە سەرزەوی و، ئاوێزانی مامەی دڵتەنگی بوو، وە کوشتی...

لەدوای ئەو ڕووداوە چاوەڕوان نەکراوە، دەست بەجێ، (ئەحباشەکان) ڕوویانکردە کوڕانی پادشا، تا پەیمانی بە یەکێکیان بدەن، بۆ پادشایەتی، بەڵام کەسیان تیا بەدی نەکردن، کەباش و گونجاوبێت بۆ پادشایەتی وولاّت. ئەوجا غەم و پەژارە دەستی بەسەریان دا گرت و، کارەکە لەبەردەمیان دا، بوویە تەنگەژە.

وە ئەوەی کە زیاتر لایان بوو بووە غەم و پەژارە و تەنگەژە، ئەوەبوو، کە هەندێ لەگەلانی دراوسێیان، ویستیان وابوو، کە ئەو هەلە بقۆزنەوە، وولاّتیان داگیر بکەن...

ئەوجا هەندێکیان، بەهەندێکیان ووت: سوێند بەخودا، جگە لەو لاوەی کە دوێنێ دەرتان پەڕاندە دەرەوەی وولاّت، کەسێکی دی نی یە، کە کاروبارتان ڕاساڵ و سەقامگیر بکات و، پادشایەتی و وولاّتتان بپارێزێت. جا ئەگەر پێویستان بەرێکخستنەوەی کاروباری (حەبەشە) هەیە، ئەوا بەدوایدا بگەڕێن، بیدۆزنەوەو، بیگێڕنەوە... پاشان دەست و برد، دەرچوون بەدوایدا و دۆزیانەوەو، گێڕایانەوە بۆ وولاّتەکەی...

وە تاجیان لەسەرداناو، پەیمانی پادشاییان پێداو، نازناوی (نەجاشی)یان لێ نا. ئەویش بەداناو و شارەزایی خۆی کاروباری وولاّتی ڕێکخستەوەو... خەڵکەکەی لە ئاڵۆزاوی و سەرنجەنجاڵی و تێکچوون، دڵنیاکردەوە و ئاسوودەی کردن...

وە (حەبەشە)ی پڕ کرد لەخێرو خۆشی و دادپەروەری، پاش ئەوەی کە پڕ بوو لەخراپەو ستەم...

* * *

هێشتا (نەجاشی) لەسەر کورسی پادشاییەکەی جێگیر نەبوو بوو، کە خودای دلۆڤان، (موحەمەد)ی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ)، بە ئایینی ڕاست و ڕەوان و ڕێنماکارەوە ڕەوانکرد، وە کاروانی یەکەم و پێشەنگ، یەك لەدوای یەك، وەلاّمی بانگەوازی (موحەمەد)یان (دروودی خوای لەسەر بێ) دایەوەو هاتنە ناو ئایینی ئیسلام...

جاکە قورەیش ئەوەیان بینی، لێیان ڕاپەڕین و، دەستیانکرد بەئازاردان و، زیانپێگەیاندنیان. جا کاتێك، مەککەیان بەو فراوانی یە لیٚ بەتەنگ هێنان و، هاوبەش پەیداکاران (المشرکون) بەشێوەیەك ئەزیەت و ئازاریان دان کە چیای دامەزراوی دەخستە شۆکەشۆك، (پێغەمبەر) (دروودی خوای لەسەر بیٚ) پێی ووتن:

(بەڕاستی لەسەر زەوی (حەبەشەدا) پادشایەك هەیە، کە ستەم لەکەس ناکات، لەوانەی کەلای ئەون... جا ئێوەش بچنە وولاتەکەی ئەو و، ببنە پەنابەری ئەو، تا خودای بالادەست، کاروبارتان بەرەو خێر دەبات و، دەرگای خێرتان لێدەکاتەوە و، لەو تەنگەژەیەتان ڕزگار دەکات.

کاروانی یەکەمی کۆچکەران، ڕێیان بەرێکرد بۆ سەرزەمینی (حەبەشە) کە هەشت کەس بوون لەپیاوان ئافرەتان. ئەوجا بۆیەکەم تامی ئاسایش و دڵنیاییان چەشت....

وە لەزەتیان لەشیرینی خۆپارێزی و خوداپەرستی وەرگرت، بەبیٚ ئەوەی هیچ شتێك خاوێنی و بێگەردی خوداپەرستی و، بڕواداریيەکەیان بشێوێنیٚ وڵێڵ و لەخنی بکات.

بەڵام کاتێك کە (قورەیش)، ئاگاداری ئەوەبوو، کە ئەو کاروانە هەشت کەسی یە لە موسڵمانان، کۆچیان کردووەو، لەسەر زەمینی (حەبەشە) بە دڵنیاییەوە جێگیربوون... کەوتە پیلان دانان و جیٚ بەجیٚ کردنی، تا یان لەناویانبەرن، وەیان بیانگێڕنەوە بۆ مەککە.

(قورەیش) دوو پیاوی، لەناوزەترین پیاوانی لەرووی زیرەکی و داناییەوە ڕەوانەکرد بۆلای (نەجاشی)، کە (عەمری کوڕی عاص)و (عەبدولای کوڕی ئەبی ڕەبیعە) بوون. و پیایان دا، ئەندازەیەکی زۆر دیاری سەرزەمینی حیجاز، کەلەلای خەڵکی (حەبەشە) بەهادار بوو. ڕەوانەکرد بۆ (نەجاشی) و فەرماندە و خاوەن پلەو پایەکانی.

کاتێك هەردووکیان گەیشتنە (حەبەشە)، پێش ئەوەی بچنەلای (نەجاشی)، چوونەلای فەرماندەو خاوەن پلەکان، وە هەریەکە خەڵات و دیاری پیٚ دەدان، پێیان دەووت:

بیٚ گومان هەندێك لە لاوانی سەرلێشێواوانمان هاتونەتە سەرزەمینی ئێوە، وە لە دین و ئایینی باوباپیرانیان لایان داوە و، یەکریزی گەلەکەیان تێکداوە...

جا کاتێك کە دەربارەی ئەوان لەگەڵ پادشا گفتوگومان کرد، ئێوەش پشتیوانی لە داواکەی ئێمە بکەن، وە ئاماژە بە پادشا بدەن، تا ئەوانە ڕادەستی ئێمە بکاتەوە، بەبێ ئەوەی دەربارەی دینەکەیان پرسیاریان لێ بکات، چونکە بێ گومان پیاو ماقوڵانی گەلەکەیان زیاتر لەوان شارەزان و، وە زاناترن بەو دینەی پەیڕەوی دەکەن.

* * *

(عمری کوڕی عاصی) و (عەبدوڵای کوڕی ئەبی ڕەبیعە)، چوونەلای (نەجاشی) و هەروەك چۆن گەلەکەی کوڕنوشیان بۆ دەبرد، ئاوەها کوڕنوشیان بۆ برد.

ئەویش زۆر بەگەرم بەخێری هێنان، بەتایبەتی کەلە نێوان ئەوە (عەمری کوڕی عاص)دا دۆستایەتی پێشینەی هەبوو.

پاشان هەردووکیان دەستەملان لەگەڵ سلاّوریزی گەورە پیاوانی (مەککە)دا، لەسەرو هەموویانە وە (ئەبو سوفیان) گەورەی (قورەیش)، دیارییەکانیان پێشکەش کرد. (نەجاشی)ش دیارییەکانیان بەرز هەڵسەنگاند و، پێیان راما لەخراپترین لاوەکانمان بوونەتە پەنابەری وولاّتەکەی جەنابت، کە ئایینی ئێمەیان وەلا ناوە ، وە نەشهاتوونەتە ناو ئایینی ئێوە... بەڵکو شوێن ئاینێك کەوتوون، کەنە ئێمەو، نە ئێوەش دەیزانین چ ئاینێکە... جاوا پیاو ماقوڵانی گەلەکەمان، ئێمەیان ناردۆتە خزمەتی جەنابتان و، داوات لێدەکەن، کە ئەوانە ڕادەستی ئەوان بکەیتەوە...

چونکە شارەزاترن بەو ئایینە تازەیەی کە هێناویانە و، بەو ئاژاوەیەی کە هێناویانەتە گۆڕێ. (نەجاشی) سەرنجی فەرنادەو راوێژکارانی دا، ئەوانیش ووتیان:

ئەی پادشامان ئەوان راست دەکەن، چونکە بەڕاستی ئێمە هەڵوێستەمان لەسەر ئەو دینەی ئەوان نەکردووە کە تازە هێناویانەتە گۆڕێ...

وە بێ گومان گەلەکەی خۆیان لە ئێمە لەوە بە ئاگاترن، وە شارەزاترن لەوەی کە هێناویانە. (نەجاشی) ووتی: نەخێر سوێند بەخودا رادەستی هیچ کەسێکیان ناکەمەوە، هەتا خۆم گوێبیستیان نەبم و، هەڵویستە لەسەر بیر و باوەڕەکەیان نەکەم.

جا ئەگەر ئەوان لەسەر خراپە بوون، ئەوا ڕادەستی گەلەکەیان دەکەمەوە. خۆئەگەر ئەوان لەسەر چاکە و خێر بوون، ئەوە دەیانپارێزم، هاوسایی باشیان دەکەم، هەتا لە وولاّتەکەم دا بن... پاشان بەردەوام بوو دەیووت:

من سوێند بەخودا، فەزڵ و گەورەیی لاکردنەوەی خودا بەلامەوە لەیاد ناکەم... ئەوە بوو منی گێڕایەوە بۆ سەر زەمینی خۆم، وە پاراستمی لەستەمی ستەمکاران و، پەنای دام لە فرت و فێڵی فێڵبازان.

(نەجاشی)هاوڕێیانی بانگهێشت کرد، بۆ رووبەرووبوونەوەیان لەگەڵ هاونەتەوەکانی خۆیاندا لەلای خۆی... ئەوانیش لەو رووبەروو بوونەوەیان ترسان، وە هەندێکیان بە هەندێکیانیان ووت: چی دەڵێن ئەگەر پرسیاریان لێکردن لەبارەی دینەکەتانەوە؟.

ئەمیرەکەیان ووتی: ئەوە دەڵێین کە خودای بالادەست لە پەڕاوەکەیدا فەرموویەتی... وە ئەوەی کە (پێغەمبەر) دروودی خوای لەسەر بێ لەلای پەروەردگاریەوە هێناویەتی رایدەگەیەنین. ئەوجا رۆشتن بۆلای پادشا، وە لەوێ (عەمروی کوڕی عاص)و (عەبدوڵلای کوڕی ئەبی رەبیعە)یان بینی...

وە لەلای راست و چەپی پادشاوە، فەرماندە وپلەوپایەداران دانیشتبوون و دەورەیان یان دابوو...وە مێزەر و کڵاوە تایبەتیەکانیان لەسەر نابوو... وە پەڕاوەکانیان لەبەر دەستیان دا کردبوەو ، دایان نابوون ئەوجا ئەوانیش سلاویان لە پادشا کرد بەسلاوی ئیسلام، وە لە کۆتایی کۆڕەکەدا دانیشتن.

(عەمری کوڕی عاص)لایکرد بەلایانەوە و ووتی:

بۆچی کوڕنوش نابەن بۆ پادشا.

ئەوانیش ووتیان: بەڕاستی ئێمە جگە لە (الله) کوڕنوش بۆ کەسی دی نابەین. (نەجاشی)لەوەی کە ووتیان سەری سوڕما و، سەری ڕاوەشاند و، وە زۆر بەنەرم و نیانی یەوە سەرنجی دان و ووتی:

ئەو ئایینە تازەیە چی یە، کەبۆخۆتان هێناوتانەتە گۆڕێ و، بەهۆی ئەوەوە، ئایینی نەتەوەکەی خۆتان وەلاناوە و، وە ناشیەنە ناو ئایینی ئێمە؟.

ئەوجا (جەعفەری کوڕی ئەبی تالب)رووخسەتی خواست و گوتی:

ئەی پادشا، لە راستیدا ئێمە خۆمان ئاینمان بۆ خۆمان نەهێناوەتە گۆڕێ، بەڵکو (موحەمەدی کوڕی عەبدوڵا) لەلای پەروەردگاریەوە، ئایینی ڕاست و رەوانی بۆ هێناوین و،لە تاریکی و شەوە زەنگی بێ بڕوایی و هاوبەش پەیداکردنەوە، وەدەر هێناوین بۆ رووناکی ئیمان و یەکتاپەرستی.

لەراستیدا ئێمە گەلێك بووین لە نەفامیدا، بتمان دەپەرست، خزمایەتیمان وەلاوە دەنا، مرداروبووومان دەخوارد، داوێنپیسیمان ئەنجام دەدا، هاوسێیەتیمان لەبیر دەکرد، بەهێزەکانمان لاوازەکانیان ژێر چەپۆك دەکرد. جابەو شێوە ماینەوە، هەتا خودای بالأدەست لەخۆمان پێغەمبەرێکی بۆ ڕەوانەکردین، کە ریشەو چەڵەکی دەناسین، وە متمانەمان بە ڕاستگۆی و دەست پاکی و داوێن پاکی هەیە، جا بانگهێشتی کردین بۆلای خودای تاك و تەنیا و، فەرمانی پێکردین بەیەکتاڕاگرتن و یەکتاپەرستی...

وە هانی داین لەسەر ئەنجامی نوێژ و، زەکات دان و، گرتنی ڕۆژووی رەمەزان و، وە وازهێنان و یەخەهەڵتەکاندن لەوەی کە دەمانپەرست لەبەرد و بتەکان.

هەروەها فەرمانی پێکردوین بەراست گۆیی و، گەیانددنەوەی سپاردەو، گەیاندنی خزمایەتی و، هاوسەیەتی چاك و، وازهێنان لەقەدەغەکراوەکان و، خوێن نەڕشتن و، پاراستنی ماڵ وگیان...

وە قەدەغەی کردوین لە داوێن پیسی و، خواردن و بەفیڕۆدانی ماڵی هەتیو... ئێمەش بەراستمان زانی و، باوەڕمان بەپەیامەکەی هێناوە، شوێن ئەو کەوتین کە ئەو لەلای خواوە هێناویەتی و پێ ی ڕاگەیاندوین... وە سوپاس بۆخودا، وایلێکردین کە تەنها خودای تاك و تەنها بپەرستین، وە ئەوەی کە ئەو لێ ی قەدەغەکردین، لەسەر خۆمان قەدەغەمان کردو وازمان لێهێنا، وە ئەوەی ئەو بۆی حەلألّ ڕەواکردین ئێمەیش لەسەرخۆمان حەلاّڵمان کرد و، هەوڵمان بۆ داوەو، هەوڵی بۆ دەدەین.

ئیتر جگەلەوە هیچی کە نی یە، کە گەلەکەمان ستەمیان لێکردین، وە خراپترین سزایان داین، بۆ ئەوەی لە دینەکەمان پەشیمانمان بکەنەوەو، بمانگێڕنەوە بۆ پەرستنی بتەکان، پاش ئەوەی خودای تاك و تەنیا و سزادەرو پاداش دەرمان ناسی و پەرستمان و بەندایەتیمان کرد.

جا کاتێك چەوساندینیانەوەو، ستەمیان لێکردین و، تەنگەناویان کردین و، هەوڵیان دا لە ئاینەکەمان قەدەغەمان بکەن. لەبەر ئەوە ئارەزووی پەناهەندەییمان کرد بۆلای جەنابت و، نیشتەجێبوون لە وولأتەتەکەت دا. وە تۆمان جگە لەخەڵکانی دی هەڵبژارد، وە ئومێدمان وایە لەلای جەنابت ستەممان لێ نەکرێت.

ئینجا (نەجاشی)ش پێی ووت: ئایا لەوەی کە پێغەمبەرەکەتان (دروودی خوای لەسەر بێ) هێناویەتی و پێی راگەیاندون، هیچیت پێ یە؟ یان بڵێی هیچت لەبەرە؟

ووتی: بەڵێ.

(نەجاشی) ووتی: بۆم بخوێنەوە.

ئەویش سەرەتایەکی لەسورەتی (مَرْیَم) بۆ خوێندەوە، جالەوەی کە خوێندیەوە ئەم فەرمووودانەی خودای بالآدەست بوو:

وَٱذْكُرْ فِى ٱلْكِتَٰبِ مَرْيَمَ إِذِ ٱنتَبَذَتْ مِنْ أَهْلِهَا مَكَانًا شَرْقِيًّا ﴿١٦﴾

واتە: لەم پەڕاوەشدا باسی مەریەمیش بێنە گۆڕ، کاتێ دوور لەکەس و کاری، شوێنێکی خۆرهەلآتی بۆخۆی هەڵبژارد.

فَٱتَّخَذَتْ مِن دُونِهِمْ حِجَابًا فَأَرْسَلْنَآ إِلَيْهَا رُوحَنَا فَتَمَثَّلَ لَهَا بَشَرًا سَوِيًّا ﴿١٧﴾

واتە: لە نێوان خۆی و ئەواندا پەردەیەکی هەڵدا، ئێمە رۆحی خۆمان بۆ نارد، بنیادەمێکی تەواوی هاتە بەر چاو.

قَالَتْ إِنِّىٓ أَعُوذُ بِٱلرَّحْمَٰنِ مِنكَ إِن كُنتَ تَقِيًّا ﴿١٨﴾

واتە: (مەریەم) پیێ ی گوت: ئەمن پەنا دەبەمە بەر خودای دلۆڤان لەدەستی تۆ، جا ئەگەر تۆ خۆپارێزی، لێم مەیە پێش.

قَالَ إِنَّمَآ أَنَا۠ رَسُولُ رَبِّكِ لِأَهَبَ لَكِ غُلَٰمًا زَكِيًّا ﴿١٩﴾

واتە: ئەویش گوتی: ئەمن لەلایەن پەروەردگاری تۆوە راسپێراوم فرەزەندێکی پاك و خاوێنت پیێ ببەخشم.

قَالَتْ أَنَّىٰ يَكُونُ لِى غُلَٰمٌ وَلَمْ يَمْسَسْنِى بَشَرٌ وَلَمْ أَكُ بَغِيًّا ﴿٢٠﴾

واتە: (مەریەم) گوتی: چۆن من منداڵم دەبێ، کە هیچ مرۆیەك لەمەو پێش منی بەدەست نەگرتوە و، هەرگیز داوێن پیسیش نەبووم.

قَالَ كَذَٰلِكِ قَالَ رَبُّكِ هُوَ عَلَىَّ هَيِّنٌ ۖ وَلِنَجْعَلَهُۥٓ ءَايَةً لِّلنَّاسِ وَرَحْمَةً مِّنَّا ۚ وَكَانَ أَمْرًا مَّقْضِيًّا ﴿٢١﴾

واتە: ئەویش (الروح) ووتی: فەرمانی هەر ئەمەیەو، پەروەردگاری تۆ وتوویەتی، ئەوە لەلای من ئاسانە و، دەمانەوەێ چاکەیەك بێ لەئێمەوە و نیشانەیەك بێ بۆ مەردوم. ئەم فەرمانەش هەر دێتە جێ

﴿فَحَمَلَتْهُ فَٱنتَبَذَتْ بِهِۦ مَكَانًا قَصِيًّا ﴿٢٢﴾﴾

واتە: دوای ئەوەی (الروح) (جبرائیل) فوویەکی کرد بەسەر مەریەمداو، سکی پڕبوو، پاشان لەترسی ئەوە خەڵکی بەداوێن پیسی تاوانباری بکەن، چوویە پەنایەکی دوور.

﴿فَأَجَآءَهَا ٱلْمَخَاضُ إِلَىٰ جِذْعِ ٱلنَّخْلَةِ قَالَتْ يَٰلَيْتَنِى مِتُّ قَبْلَ هَٰذَا وَكُنتُ نَسْيًا مَّنسِيًّا ﴿٢٣﴾﴾

واتە: پاش ماوەیەك ژانی منداڵبوون زۆری بۆ هێناو بەرەو پەنای دارخورمایەك ڕۆیشت. لێرەدا بەدەم ئازارەوە وتی:ئای خۆزگایە پێش ئەمە بمردمایە و، شتێکی بێ کەڵك بوومایە و هەرلەبیر بچوومایەتەوە.

﴿فَنَادَىٰهَا مِن تَحْتِهَآ أَلَّا تَحْزَنِى قَدْ جَعَلَ رَبُّكِ تَحْتَكِ سَرِيًّا ﴿٢٤﴾﴾

واتە: بانگی کرد... بەڵام کێ بانگی کرد؟! هەندێك دەڵێن فریشتەیەك لەخوار دارخورماکەدا بانگی مەریەمی کرد و پێ ی ووت: خەمبار مەبە... پەروەردگارت لەلای خوارتەوە جۆگە ئاوێکی بۆ ڕەخساندوویت. هەندێکی دیش دەڵێن: کە عیسا لەدایك بوو، ئەم قسەی دایکی ووت، تابیێتە موعجیزە کانیو، مایەی دڵدانەوەی دایکی بێت.

جاکە (نەجاشی) گوێبیستی ئەوەبوو، دەستی بەگریان و فرمێسك ڕشتن کرد تاریشی تەڕبوو... وە قەشەکانیش دەستیان بەگریان و فرمێسك ڕشتن کرد کاتێك کە گوێبیستی ئەو ئایەتانە بوون کە بۆیان خوێنرانەوە، گریانێکی وەها، کە فرمێسك لاپەڕەکانیانی تەڕکرد...

ئالەوێدا (نەجاشی) لایکردەوە بەلای (عەمروی کوڕی عاص) و هاوڕیکەیەوە ووتی:

بەڕاستی و بەبێ هیچ گومانێك، ئەوەی کە بۆمان خوێنرانەوە، گوێبیستی بوون، وە ئەوەی کە (عیسی) (علیه السلام) هێناویەتی لەیەك سەرچاوە وە هاتوون.

پاشان پێی ووتن: سوێند بەخودا، هەرگیز ڕادەستی ئێوەیان ناکەمەو، هەتا زیندووبم ئەوە ئەنجام نادەم... لەپاش ئەوە هەستایە سەرپێ و، ئەوانەش لەگەڵیدا بوون هەستانە سەرپێ و، کۆڕەکە کۆتایی هات.

* * *

(عەمری كوڕی عاص) دەرچووە دەرەوە و لەڕقدا خەریك بوو دڵی دەتەقی... پاشان ووتی بەهاوڕێكەی: سوێند بەخودا، سبەینێ بە خزمەتی (نەجاشی) دەگەمەوە، وەدەربارەی ئەوان گفتوگۆیەكی لەگەڵ دەكەم كە لەڕەگ و ڕیشە لەبنیان بهێنێ و لەناویان ببات... هاوڕێكەی كە لەو دڵنەرمتر بوو پێی ووت:

ئەوە نەكەیت ئەی عەمرو... چونكە ئەوانە باپیچەوانەی ئێمەش هەڵس و كەوت بكەن، بێگومان خزمانیان لەناو ئێمەدان، خزمایەتیشیان لەگەڵ ئێمەدا هەیە. جا ئەویش ووتی: سوێند بەخودا پادشا ئاگادار دەكەم لەوەی كە ئەوان دەربارەی (عیسای كوڕی مەریەم) (علیه السلام) شتێكیان ووتووەو، شتێكیشیان ژێر پەردەناوە... وە ئەوان تۆمەتباری دەكەن و، دەڵێن كە گوایا ئەو بەندەیە.

كاتێك بۆ بەیانی كە (عەمرو) چووە خزمەتی (نەجاشی) ووتی:

ئەی پادشا، دوێنێ شتێكیان دا بەگوێی جەنابتاو، شتێكیان لێ شاردیتەوە...

جا ئەویش ئەوەیە، كە دەربارەی (عیسای كوڕی مەریەم) دەڵێن ئەو بەندەیە... (نەجاشی) كە گوێبیستی ئەوەبوو، بانگهێشتی كردن و ووتی: دەربارەی (عیسای كوڕی مەریەم) چی دەڵێن؟!.

(جەعفەری كوڕی ئەبی تالب) پێی ووت:

ئەوەی دەربارە دەڵێین كە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) هێناویەتی بۆمان. ئەویش ووتی: ئەوە چی یە بۆی هێناون؟. جا (جەعفەر) ووتی:

بێگومان ئەوەیە ئەو بەندەی خودایە و، ڕەوانەكراویەتی و، ووشەیەتی كە ڕەوانەی كردبۆ (مەریەم)ی داوێن پاكی گەورە كچ.

(نەجاشی) ووتی: سوێند بەخودا (عیسا) لەوەی كە ووتت نووكە پەنجەیەك تێ نەپەڕیوە. جا ئەو (قەشانە) كە لەدەوری بوون، كە گوێبیستی ئەوە بوون، لەناو خۆیاندا دەستیان بەبۆڵە بۆڵ كرد و، نەیاران دەربارەی ووتەكەی لە ژێرلچەوە دەربڕی.

(نەجاشی)ش بەتووڕەیی و گاڵتەپێ كردنەوە كلەی چاوی دانێ و ووتی: خۆ ئەگەر بۆڵە بۆڵیش بكەن و نەیاریش بن، بێ هوودەیە. پاشان بە (جەعفەر) و هاوڕێكانی ووت:

بڕۆن ئێوە لەسەر زەمینی من دا پارێزراوون لە هەموو زیانێك. هەر كەسێك زیانتان لێ بدات زەرەمەند دەبێت... هەركەسێك زیانتان لێ بدات زەرەرمەند دەبێت... وە بە

هەموو دڵنیاییەك من ئەوە دەڵێم، من پێم خۆش نی یە، چیایەك لەزێڕو زیوم بدرێتێ، بەڵام تەنها یەكێك لە ئێوە ئازار بدرێت. پاشان بەدەرگاوانەكەی ووت:

خەڵات و دەستە دیاریەكان بگێڕنەوە بۆ (عەمرو)و هاوڕێكەی، چونكە ئێمە پێویستمان بەوانە نی یە، وە بێ گومان خودا بەرتیلی لەمن وەرنەگرت كاتێك گێڕامی یەوە بۆ پادشایەتی وولاتەكەم، تا منیش بەرتیل وەربگرم لە پادشایەتیمدا... وە خەڵك گوێڕایەڵی فەرمانی منیان نەكرد، تا من گوێڕایەڵی فەرمانی خەڵك بكەم.

* * *

(قەشەكان) ڕاپەڕین و، لە نێو خەڵك دا ڕایانگەیاند كە (نەجاشی)دینەكەی وەلا خستووەو، گۆڕیویەتی بە دینێكی تر... بۆیە بانگهێشتی دانیشتوانی وولاتیان كرد بۆ وەلادانی... (حەبەشی)یەكان لیێ ی كۆبوونەوەو بڕیاران دا لەسەر وەلانان بۆیە (نەجاشی) ناردی بەدوای (جەعفەری كوڕی ئەبی تالب)و هاوڕكانیدا و لەو بارەوە ئاگاداری كردن و، كەشتی یەكی بۆ ئامادەكردن وە پیێ ی ووتن:

سواری ئەو كەشتی یە ببن و ئامادەكاری بكەن بۆ ئەوەی كە ڕوو دەدات... ئەگەر من تێكشكام، بۆ كویێ دەتانەوێت ڕیێ بەرێبكەن...خۆئەگەر سەریشكەوتم ،هەرچۆن بوون ئاوادامەزراوبن ...پاشان پارچەپێستێكی تەنكی لەپێستی ئاسك ئامادەكردو،تیایدا نووسی :

(اشْهَدُ انْ لاإلهَ إلاّ اللهُ، وَانَّ مُحَمَداً عَبْدُهُ، وَختَمُ رَسُلهِ وَاشْهَدُ انَّ عیسى عَبْدُهُ وَرَسولُهُ، وَرُحُهُ، وَكَلِمَتُهُ التَّي اْلقاها إلى مَرْيَمَ).

واتە: (گەواهی دەدەم كە هیچ خودایەك جگەلە(الله)نی یە،وە(موحەمەد)بەندەیەتی و،كۆتایی پەیامبەرانە .وەگەواهی دەدەم كە(عیسا)بەندەو،ڕەوانەكراوو،ڕوح و،ئەو ووشەیەتی كەهاوشێتویەتی یەمەریەم).

پاشان پارچەچەرمەكەی لەسەرسنگی بەست و،جبەكەكەی كردبەسەریدا و،ڕێی بەرێكرد بو ّلای ئەوانەی كەلیێ ی یاخی بوون .جاكاتێك لەبەردەمیاندا ئامادەبوو بانگی لێكردن و ووتی :ئەی كۆمەڵانی (حەبەشە)هەڵس وكەوت و ڕەوشتی منتان چۆن بینیوە لەناوخۆتاندا؟ئەوانیش ووتیان :باشترین هەڵس وكەوت وڕەوشت .(نەجاشی)ووتی:دەی كەوابو ئەوە چی یە كەئێوەی دەربارەی من ورووژاندووە؟ ئەوانیش ووتیان:ئەوەیەكە تۆ دینەكەی ئێمەت وەلاناوەو ،وادادەنێیت كە(عیسا)بەندەیە.(نەجاشی)ووتی:

ئێوە چی دەڵێن دەربارەی (عیسا)؟.ئەوانیش ووتیان :ئەو کوڕی خودایە .جا(نەجاشی)دەستی خستە سەرجبەکەی و،لەسەرپارچە چەرمەکە دایناو ووتی:گەواهی دەدەم کە (عیسا)لەسەرو ئەمەوە هیچ شتێکی دی نی یە (ئەو مەبەستی ئەوەبوو کەلەپارچە چەرمەکەدا نووسیبووی).ئەوجائەوان بەوەی کە (نەجاشی)ووتی زۆر دڵخۆش بوون و، بڵاوەیان کردو ڕازی ودڵنیاو دڵ ئارام بوون.

(پێغەمبەر) دروودی خوای لەسەربێ ،هەڵوێستی وەرگرت لەسەر ئەوەی کەهاتەگۆڕێ لەنێوان (نەجاشی)و گەلەکەیدا. وەگەورەترین چاودێری و هێوەداریکردنی بۆ ئەو موسڵمانانەی کە کۆچیان کردبوو بۆ وولاتەکەی، وە لەسایەو پەنای ئەوەدا لەگیانیان دڵنیا بوون.

وەهەروەها دڵشاد بوو بەلادانی بەلای ئیسلام داو، باوەڕبوونی بە دروستی ئەوەی کەلە قورئان دا هاتووە. پاشان پەیوەندیەکانی لەنێوان ئەوو پێغەمبەردا دروودی خوای لەسەر بێ دەستی کرد بەچڕبوونەوەو ریشەداکوتان و جێگە متمانە.

لە مانگی یەکەمی ساڵی حەوتەمی کۆچیدا، پێغەمبەر دروودی خوای لەسەر بێ بڕیاری دا لەسەر بانگهێشت کردنی شەش لەگەورە پادشایان و ئەمیرەکانی سەرزەوی، بۆ هاتنە ناو ئایینی خوداوە. جا بۆ هەر یەکەیان نامەیەکی نووسی و، تیایدا هانی دەدا لەسەر هاتنە ناو ئایینی پیرۆزی ئیسلام وە بروا هێنانی لەلا جوان و شیرین دەکرو، لە هاوبەشی پەیداکردن و بێ باوەڕی ئاگاداری دەکردەوە.

وە بۆ ئەو مەبەستە شەش کەسی لە باشترین هاوڕێکانی لەرووی دانایی و زیرەکی یەوە ئامادەکرد. ئەوجا هەریەکەیانی فێری زمانی ئەو گەلانە کرد کە دەچوون بۆلایان. پاشان لەیەك رۆژی دیاریکراودا، هەموویان بەرێکەوتن بۆ بە ئەنجام گەیاندنی ئەو گرنگی یەی پێی سپێررا بوو.

جا (عەمری کوڕی ئومەییە) ئەو کەسە بوو کە ڕەوانەکرابوو بۆ لای پادشای (حەبەشە)

(عەمری کوڕی ئومەییە) چووە خزمەتی (نەجاشی)و، بە سڵاوی ئیسلام سڵاوی لێکرد، ئەویش بەجوانتر و چاکتر وەڵامی سڵاوەکەی دایەوەو، بەجوانترین بەخێرهاتن، بەخێرهاتنی کرد. جا کاتێك کە لە کۆڕی پادشادا لە شوێنی دیاریکراودا دانیشت، ئەو نامەیەی کە لە لایەن (پێغەمبەرەوە) دروودی خوای لەسەر بێ هێنابووی، پێشکەش بە (نەجاشی) کرد. دەست و برد، دەستی دایە کردنەوەی نامەکە... بینی کە (پێغەمبەر) دروودی خوای لەسەر بێ بانگهێشتی دەکات بۆ لای ئیسلام و،

شتێکیشی لەقورئان بۆ تۆمار کردووە تا بیخوێنێتەوە و تێی بگات و کاری تێبکات بۆ ڕاگەیاندنی بڕوابوونی بە ئیسلام.

(نەجاشی) ڕێزی لە نامەکە گرت ونایە سەر هەردوو چاوی وە لەسەر تەختەکەی هاتە خوارەوە، وەك خۆ بەکەم زانینیٚ لە ئاستی ناوەڕۆکی نامەکە...پاشان لەڕووی ئەوانەی کە ئامادەی کۆڕەکەی بوون ئیسلام بوونی خۆی ڕاگەیاند... وە گەواهی ڕاستەقینەی داو ووتی:

ئەگەر من بمتوانیایە بچمە خزمەتی (موحەمەد) دروودی خوای لەسەر بیٚ، ئەوە دەچوومە خزمەتی و... لەنێوان دەستەکانیدا دا دەنیشتم و... سەرم لەسەر قاچەکانی دادەنا...

پاشان نامەیەکی نەرم ونیان پڕ لەڕێزی نووسی بۆ (پێغەمبەر) دروودی خوای لەسەر بیٚ، کە تیایدا وەڵامی داواکەی وابوویەوەو... دەربارەی باوەڕی پێشووی بە پێغەمبەریەتی ئەو دابوو.

ئالەو کاتەدا (عەمری کوڕی ئومەییە) نامەیەکی تری لە (پێغەمبەر)ەوە دایە (نەجاشی)، کە تیایدا داوای لیٚ کردبوو کەوەکیلی ئەو بێت بۆ مارەکردنی (ڕەملەی کچی ئەبی سوفیان ی کوڕی حەرب)لێی.

جا دایکی بڕواداران (ڕەملە) کە ناوزەدە بە (دایکی حەبیبە)، سەرەتای هاوسەرگەریەتی چیرۆکێکی دڵتەزێنە و کۆتاییە کەش دڵخۆشی یەکی مژدە بەخشە.

جا فەرموون باپێکەوە بەخێرایی بەسەرتاو کۆتایی هاوسەرگەیەتیەکەی ئاشنا ببین:

(ڕەملە کچی ئەبی سوفیان) بیٚ باوەڕ بوو بەخوداکانی بابی کە گەورەی قورەیش بوو... وە خۆی و هاوسەرەکەی (عوبەیدوڵای کوڕی جەحش) بڕوایان هێنابوو بەخودای تاك و تەنها وبیٚ هاوبەش... وە گەواهیان دا بوو لەسەر ڕاستی پەیامی پێغەمبەرەکەی (موحەمەد) دروودی خوای لەسەر بیٚ. (قورەیش) بەهۆی ئەوەوە تەنگەتاویان کردن و تەنگەژەیان بۆ دروست کردن و... بە خراپترین شێوە سزایان دان کەوایان لێهات، نەیانتوانی لە (مەککە)دا بمێننەوە.

لەبەر ئەوە چوونە ریزی ئەو کۆچکەرانەی، کە بەئاینەکەیانەوە کۆچیان کرد بۆلای خوداو، بە بیروباوەڕە تازەکەیانەوە (ئیسلام) بوونە پەناهیندەی (نەجاش).

جا هەر وەك و براوخوشکە کۆچکەرەکانی تریان، کەلە پێش ئەمان دا کۆچیان بۆ ئەویٚ کردبوو، ڕێزیان لێگیراو هاوکاری و هاوسایی چاك کران. بەشێوەك کە (دایکی

حەبیبە) وابە خەیاڵیدا هات کە ڕۆژگاری ڕەش و تەنگەژە تێ پەڕی و، خودا دەرووی لێکردونەتەوە.

چونکە ئەو نەیدەزانی مەزەندەو قەدرەکانی خودا چی لەژێر پەردەناوە. خودای باڵادەست ویستی وابوو کە بەدانایی خۆی (دایکی حەبیبە) تاقیبکاتەوە، تاقیکردنەوەیەکی قورس وەها، کە ژێریەکان لەئاستی دا سەراسیما بن.

ئەوەش ئەوەبوو کە مێردەکەی (عوبەیدوڵای کوڕی جەحش) لەئایینەکەی (ئیسلام) پەشیمان بوویەوە و بوویە گاور، وە وای لێهات، گاڵتە و لاقرتەی بە ئیسلام و موسڵمانان دەکرد.

پاشان بەدوای ئەوەدا، ڕوویکردە مەیخانەکان و، بەشێوەیەك دەستی کرد بەخواردنەوەی عارەق (مەی) (أُمُّ الخبائث)[1] کە تینویەتی لێ نەدەشکاو، تێری لێنەخواردنەوە...

جاکە (عوبەیدوڵا) ئاوای بەسەرهات، (دایکی حەبیبە)ی لە نێوان دووبڕیاردا بڕیار بەدەست کرد، کەشیرینەکەیان لەویان تاڵتر بوو. جا یان تەڵاق بدرێت...وە یان لە ئیسلام پەشیمان ببێتەوە ببێتە گاور... ئەوجا (دایکی حەبیبە) خۆی لە نێوان سێ هەڵبژاردە و بڕیار دابینیەوە... جا یان گوێبیستی هاوسەرەکەی بێت و ببێتە گاور، کە بەوەش تووشی ڕیسوایی دونیا سزای دوا ڕۆژ دەبێت... وەیان بگەڕێتەوە بۆ ماڵی باوکی لە (مەککە)، کە ئەویش بەردەوام بە ئێستاشەوە قەڵای هاوبەش پەیداکردن و، هاوبەش پەیداکارانە... یاخود، بە تەنها و ئاوارەیی لەگەڵ کچە بچکۆلەکەی دا (حەبیبە) لەووڵاتی (حەبەشە)دا بمێنێتەوە. جا بڕیاری دا ڕەزامەندی خودا لەسەروو هەموو شتێکەوە دابنێ و لە (حەبەشە)دا بمێنێتەوە، هەتا خودا خۆی دەروویەك دەکاتەوە.

* * *

کارەسات و دڵتەنگی (دایکی حەبیبە) زۆر درێژەی نەکێشا، چونکە مێردەکەی بەسەر خۆشی سەری نایەوەو مرد... پاشان هەر ئەوەندەی کە عیددەی شەرعیەکەی تەواو بوو، دەرووی لێ کرایەوەو، ئەویش ئەوەبوو، لەبەرە بەیانێکی زیوین دا کەتازە بەتازە خۆری بەرەبەیان دونیای ڕووناك کردبوەوە...

---

[1](ام الخبائث): (دایکی پیسەکان) ناوبراوە بەوناوە چونکە بخۆرەکەی واپێچ دەکات بۆ هەموو خراپەیەك.

لەدەرگا درا، کاتێك کردیەوە، کتوپڕ ڕووبەڕووی (ابرەهە)ی کارەکەری (نەجاشی) بوویەوە، کە سڵاوی لێکرد و پیٚ ی ووت:

پادشا سڵاوی دەگەیانیت و، وەپێت دەڵیٚ: کە (موحەمەد) دروودی خوای لەسەر بیٚ دەتخوازێت بۆ خۆی... وە پادشای کردوۆتە وەکیلی خۆی تا تۆی بۆ مارە ببڕێت... تۆش ئەگەر ڕازیت و دەتەوێت هاوسەرگیری لەگەڵ بکەیت، کێت دەوێت بیکە بەوەکیلی خۆت. جا (دایکی حەبیبە) لە خۆشیدا خەریك بوو باڵی دەگرتەوە... بۆیە هاواری کرت:

خودا بەخێر دڵخۆشت بکات... وەك منت دڵخۆش کرد

خودا بەخێر دڵخۆشت بکات... وەك منت دڵخۆش کرد.

پاشان ووتی: ئەوە (خالیدی کوڕی سەعیدی کوڕی عاص)م کردە وەکیلی خۆم. چونکە ئەو لەو وولاٚتەدا نزیکترین خەڵکە بەمن.

ئەوجا لە کاخی پادشایەتی (نەجاشی)دا کۆبوونەوە، تا مارەکردنی (دایکی حەبیبە) بۆ (پێغەمبەری خودا) درودی خودای لەسەر بیٚ. کاتێك ئامادەبووانی کۆڕەکە هەموو ئامادە بوون، (نەجاشی) سوپاس و ستایشی خودای کرد و فەرمووی:

لەڕاستیدا پێغەمبەری خودا دروودی خودای لەسەر بیٚ داوای لەمن کردووە، کە وکیلی بم بۆ مارەکردنی (ڕەملەی کچی ئەبو سوفیان)، پاش رازی بوونی (ڕەملە)، منیش لە خزمەتی داواکەیدام. وە وا لەجیاتی ئەو (چوار سەد دیناری ئاڵتونم) لەسەر سوننەتی خوداو پێغەمبەرەکەی، کردە مارەیی (ڕەملە) رادەستیم کرد بەرەزامەندی خۆی.

پاشان (خالیدی کوڕی سەعیدی کوڕی عاص) هەستایە سەرپیٚ، سوپاس و ستایشی خودای کردوو پەنای پیٚ گرت و داوای یامەتی لێکردوو، درودی نارد بۆ گیانی پاکی پیغەمبەرەکەی و، پاشان ووتی:

ئەوە داواکەی (پێغەمبەری خودام) درودی خوای لەسەر بیٚ پەسەند کرد... وە (ڕەملەی کچی ئەبو سوفیان)م کردە هاوسەری، لەسەر ئەو مارەییە، کەمنی کردۆتە وەکیلی خۆی و... جا لەخودا دەخوازین ئەو هاوسەرگیرێتی یەی پێغەمبەر پیرۆز بکات... وە پیرۆز باییشی ئاراستەی (ڕەملە) دەکەین بەو دەروەی کە خودا لیٚ ی کردۆتەوە.

پاشان (نەجاشی) دوو کەشتی لە کەشتیەکانی ئامادەکرد... وە پیایاندا دایکی بڕواداران (ڕەملەی کچی ئەبو سوفیان)ی ڕەوانەکرد لەگەڵ (حەبیبەی)کچی و، ئەوانەی کە مابوونەوە لەلای، لەهاوڕێیانی پێغەمبەر دروودی خوای لەسەر بێ، وە کۆمەڵێکیش لەو (حەبەشیانەی) کە بڕوایان هێنابوو بەخودا و پێغەمبەرەکەی... وە تامەزرۆی بە خزمەت گەیشتنی پێغەمبەر دروودی خوای لەسەر بێ ومانەوەیەکی دوورودرێژ لەخزمەتیا و گوێبیستی فەرموودەکانی و... نوێژکردن لەخزمەتیاو... وە (جەعفەری کوڕی ئەبی تالب) ڕەزای خوای لەسەر بێ و، کردە ئەمیری هەموویان.

پاشان لەوەی کە هەبوو لەلای خێزانەکانی و، لەبۆنی خۆشی نایاب و ناوازە وەك (وەرس و، عود و، عەنبەر) بەخشیە دایکی بڕواداران (ڕەملە) وە هەندێ دیاریشی پیادا ڕەوانەکرد بۆ پێغەمبەری خودا دروودی خودای لەسەر بێ.

جا لەنێو ئەو دیاریانەدا کە بۆی ڕەوانەکردبوو، سێ دار عەسای لەجوانترین دار عەسای (حەبەشە) تیابوو، کە پێغەمبەر دروودی خوای لەسەر بێ یەکێکیانی بۆ خۆی داناو، دووەم و سێ یەمیشی بەخشیە (عومەری کوڕی خەتتاب)و (عەلی کوڕی ئەبی تالب) ڕەزای خوایان لەسەر بێ.

وە (بیلال) ڕەزای خوای لەسەر بێ، بەو دار عەسایەوە کە پێغەمبەر دروودی خوای لەسەر بێ بۆ خۆی دانابوو، لەخزمەتیا ڕێ بەڕێ دەکرد، وە کە نوێژی دادەبەست، لەبەردەمی دا عەساکەی دادەچەقاند... ئەوەش لەوشوێنانەدا کە نەمزگەوت و وەنە دیوار و شتی دیکە هەبوو کە سنووربەندی رووگەی پێبکرێت. وە هەروەها لە سەفەرەکانی پێغەمبەردا دروودی خوای لەسەر بێ لەهەردوو جەژنەکاندا، لەنوێژە بەبارانەدا. هەروەها (بیلال) ڕەزای خوای لەسەر بێ بەو عەسایەوە، لەخزمەتی (ئەبو بەکر)دا ڕەزای خوای لەسەر بێ و ڕێی بەڕێ دەکرد.

وەکاتێك جێ نشینێتی کەوتە دەستی (عومەری کوڕی خەتتاب)و ڕەزای خوای لەسەر بێ و (عوسمانی کوڕی عەففان) ڕەزای خوای لەسەر بێ، (سەعدی قەرەزی) (سعدٌ القرضيٌّ)، هەر بەو (عەسایەوە) لەخزمەتیاندا ڕێی بەڕێ دەکرد.

پاشان خەلیفەکانی دوای ئەوانیش، تاماوەیەکی دوورودرێژ، یەك بەدوای یەکدا ئەو (عەسایەیان) بەکار دەهێنا. هەروەها زیاد لەو (عەسایانە)، (نەجاشی)

ئەموستیلەیەکی ئاڵتونیشی بەدیاری بۆ پێغەمبەر دروودی خوای لەسەر بێ ڕەوانەکرد.

ئەویش ئەو دیارییەی وەرگرت، لەگەڵ ئەوەشدا کە جەنابی ئە موستیلەی ئاڵتونی لەدەست نەدەکرد. پاشان ناردی بۆ (ئومامە) کچی زەینەبە، کە کچەزای بوو، وە پێ ی ووت:

ئەی کیژەکەم بەو موسەویلەیە خۆت برازێنەوە.

پێش گرتنەوەی (مەککە) بەماوەیەکی کەم، (نەجاشی) وەفاتی کردو گەڕایەوە بۆلای پەروەردگاری و. جا پێغەمبەر دروودی خوای لەسەر بێ بانگ هێشتی هاوڕێکانی کرد بۆ نوێژکردن لەسەری، وە فەرمووی:

(بێ گومان براتان (أصْحمة) (نەجاشی) وەفاتی کردووە جا نوێژی لەسەر بکەن. ئینجا پێشەوایی کردن نوێژی نادیاریان (صلاة الغائب) لەسەر کرد. لەگەڵ ئەوەدا کە پێغەمبەر دروودی خوای لەسەر بێ پێش (نەجاشی)و پاشیشی نوێژی نادیاری (صلاة الغائب)، لەسەر کەس نەکردووە.

خودای پەروەردگار لە (أصْحمة) (نەجاشی) ڕازی بێت، وە بەهەشتی ڕازاوەی بەناز و نیعمەتەکانی بکاتە کۆتا ئارامگای. بەڕاستی لەلاوازییەوە هێزی کردەوە بە گیانی موسڵماناندا... وە لەترس و بیم ڕزگاری کردن و دڵئارامی کردنەوە... وەلەوشدا تەنها ڕەزامەندی خودا و پێغەمبەرەکەی دروودی خوای لەسەر بێ مەبەست بوو.

* * *

خودایە هەمان هەڵوێستی (نەجاسی)مان پێ ببەخشە بەرامبەر موسڵمانان و تەنها کاریشمان بۆ ڕەزامەندی تۆ بێت.

﴿وەرگێڕ﴾

بۆ زیاتر گوزارشت لە ژیاننامەی (نەجاشی) بڕوانە:

١- السيرة النبويً لأبن هشام: ٣٥٦/١، ٣٥٧، ٢٥٨، ٣٥٩، ٣٦٠، ٣٦٣، ٣٦٩، ٣٣/٢، ٣٠٠-١٠، ٢٩٥



٢- اعلام النُبَلاء للذهبي: ٨١، ١٢٣، ٢٥١
٣- اسد الغاية: ١/١١٩
٤- جمع الزوائد: ٩/٤١٩
٥- تأريخ الخليفة: ٩٩١
٦- تهذيب الأسماء واللغات: ٩/٢٨٧
٧- الأصابة: ١/١٠٩، او الترجمة ٤٧٣

# ٢٧) روفەیعی کوڕی میهران (ئەبولعالیە)

**(لە دوای هاوڕێیان یەك کەس نەبووە، لە (ئەبی عالیە) لەو سەردەمەدا شارەزاتر بووبێت لە قورئان، پاشان بەدوای ئەودا (سەعیدی کوڕی جوبەیر).**

**(ئەبو بەکری کوڕی داود)**

(روفەیعی کوڕی میهران)، کە ناسراوە بە (ئەبی عالیە)، ئالأیەك بووە لە ئالأکانی موسڵمانان... وە ناوازەیەك بووە لە ناوازەکانی (قورئان خوێنان)و، (فەرموودە زانان)...

وەلە شارەزاترین شوێنکەوتووان بوو بە قورئانی پیرۆز... وە لەهەمووان ئاگادارتر و زانابوو، بە فەرموودەکانی (پێغەمبەری خودا) دروودی خوای لەسەر بێ.

وە بەتوانا ترینیان بووە، لە تێگەیشتنی قورئان پیرۆز و، رۆچوو لە ناو ناخ و قولأییەکانی... وە لە رۆچوو ترینیان بوو، لە تێگەیشتنی مەبەست و نهێنی یەکانی.

جا بفەرموون لەسەرتایەوە دەست بە ژیاننامەی بکەین. ژیاننامەی دەوڵەمەندە بە ناوەزەترین هەڵوێست و هەڵس و کەوت... کەپڕە لەپەند و ئامۆژگاریە بەنرخ و بەهادارەکان...

* * *

(روفەیعی کوڕی میهران) لە وولأتی (فارس) لە دایك بووە، وە لەسەر ئەو سەرزەمینە گەشەو نەشونمای کردووە، کاتێك کە موسڵمانان، دەستیان دایە غەزاکردنی وولأتی

(فارس) بۆ وەدەرهێنانی خەڵکەکەی لەشەوە زەنگی بێ باوەڕی و نەفامییەوە بۆ ڕووناکی ئیسلامەتی...

(روفەیع) یەکێك بوو لەو لاوە بەندانەی کە کەوتنە دەستی سۆزداری موسڵمان و، چوونە نێو باوەشی خێر و بنیادنەریانەوە. پاشان زۆری پێ نەچوو کە ئەو وئەوانەی کە لەگەڵ ئەو دا بوون، هەڵویستی دیاریان نواند لەسەر بەرزیەتی ئیسلام...

وە رابەریان کرد لە نێوان ئیسلام و، ئەوەی کەئەوان لەسەری بوون لەپەرستنی بتەکان... بۆیە کۆمەڵ کۆمەڵ ئەچوونە ناو ئاینی خوداوە... پاشان بەدوایدا، ڕوویانکردە سەر خوانی (قورئانی پیرۆز)... وە فەرموودەی پێغەمبەری خودایان دروودی خوای لەسەر بێ دەکردە پێ خۆری گیانیان...

* * *

(روفەیع) دەربارەی ئەوەی کەلەوەو پێش لەسەری بوو، وەئەوەی کە ڕێی تێکەوت دواو ووتی:

من و کۆمەڵێك لەنەوەکانی نەتەوەکەم بەدەست بەسەری کەوتینە دەستی کۆششکارانەوە (المجاهدین)، پاشان زۆری پێ نەچوو، کەلە (بەصر)ە بووینە کۆیلەی کۆمەڵێك لە موسڵمانان. جا زۆری نەخایاند، کە بڕوامان هێنا بەخودای تاك و تەنها، وە وابەست بووین بە قورئانی پیرۆزەوە...

هەمان بوو کە مزەی دەدا بەخاوەنەکەی وە هەشمان بوو کە هەڵدەستا بەخزمەتکردنی خاوەنەکەی... وە منیش یەکێك بووم لەوانە. جا ئێمە هەموو شەوێك جارێك قورئانمان خەتم دەکرد، ئەوەش زۆر نارەحەت بوو لەسەرمان... بۆیە هاتین گۆڕیمان بۆ هەردوو شەوێك، کە ئەویش هەر نارەحەت بوو... بۆیە گۆڕیمان بۆ خەتم کردنی هەر سێ شەو جارێك کەئەویش هەر نارەحەت بوو بۆمان، بە هۆی ئەو کێشمەکێش و هیلاکییەی کە لەڕۆژدا تووشمان دەبوو...

وە شەونخوی لەشەودا... جا ئەوەبوو بەخزمەتی هەنێك لە هاوڕێیانی پێغەمبەری خودا درودی خوای لەسەر بێ گەیشتین، وە سکاڵای خۆمان کرد لە خزمەتیانە دەربارەی ئەو شەو نخونییەی کە ڕووبەڕوومان دەبێتەوە لە خوێندنەوەی قورئانی پیرۆزدا.

ئەوانیش فەرموویان: هەموو هەفتەیەك یەکجار قورئان خەتم بکەن، ئێمەیش کە گوێبیستی ئەوە بوون، ئیتر پەیڕەوی ڕێمناییکەی ئەوانمان کرد... وە شەومان

دەکردە دوو بەشەوە لەبەشێکیان دا قورئانمان دەخوێند، وە لەبەشەکەی تریدا دەنووستین و پشوومان دەدا، ئیتر بەو شێوەیە نارەحەت نەدەبووین.

قەدەر وای هێنا (رِوفەیەی کوڕی میهران) بوویە بەندەی ئافرەتێك لە هۆزی (بەنی تەمیم). کە ئافرەتێکی دامەزراوی ژیری بەرێزو... زۆر زۆر خۆپارێز و خودا ناس و بڕوادار بوو...

ئەویش لە بەشێکی رۆژدا لە خزمەتی دا بوو، خزمەتی دەکرد و، لەبەشەکەی تریدا پشووی دەدا. لە کاتی دەست بەتاڵی دا، خەریك دەبوو بەباش فێربوونی خوێندنەوەو نووسینەوە، فێربوونی بەشێك لەزانستە ئایینی یە کان، بەبێ ئەوەی هیچ شتێك لە ماف ئافرەتەکەی خاوەن زەوت بکات.

لە رۆژێك لە رۆژەکانی هەینیدا (رِوفەیع)، بەجوانترین شێوە دەستنوێژی گرت. پاشان رووخسەتی لە خانمەکەی خاوەنی تا بڕوات. ئەویش پێ ی ووت:

بۆ کوێ ئەی (رِوفەیع)؟.

(رِوفەیع) ووتی: بۆ مزگەوت ،(خانم) ووتی: چ مزگەوتێکت مەبەستە؟.ئەویش ووتی: ئەو مزگەوتەی کە نوێژی هەینی تێدا دەکرێت.

(خانم) ووتی: وەرە پێکەوە بڕۆین.

پاشان پێکەوە رێیان بەرێ کردو لەگەڵ ئەو خەڵکەی کە دەچوونە ژوورەوە، چوونە ژوورەوە، جا (رِوفەیع) نەیدەزانی (خانم) مەبەستی چی یە. کە مزگەوت لێوان رێژ بوو لەنوێژ خوێنان و، (ئیمام) (ووتاربێژ) چووە سەر مینبەر، (خانم) دەستی (رِوفەیعی) گرد ووتی:

ئەی موسڵمانینە ئێوە گەواهی دەر بن (بەشاهید بن) وا من بەتەنها لەبەر بەدەست خستنی پاداشتی خودا و، بەتەمای رەزامەندی و لێبوردەیی ئەو، ئەم بەندەیەم ئازاد کرد. وە ئیتر کەس بۆی نی یە هیچ رێگرییەکی لێ بکات، مەگەر لە رێگەی چاکەوە.

پاشان چاوی تێبڕی و ووتی: خودایە من دەیکەمە زەخیرە لەلای جەنابت، بۆ ئەو رۆژەی، کە نەماڵ و نە منداڵ سوود نابەخشێ... کاتێك نوێژ تەواو بوو، (رِوفەیع) رێی خۆی بەرێکرد و، (خانمیش) رێی خۆی.

*　　　*　　　*

(روفەیعی کوڕی میهران) ئیتر لەو رۆژەوە بەردەوام بوو لەسەر هاتوچۆکردن بۆ شاری (مەدینە)ی پیرۆز. کە خۆشبەختانە تیایدا بەخزمەتی (ئەبو بەکری صدیق) رەزای خوای لەسەر بێ گەیشت، ئەوەش بە کەمێك پێش وەفاتی.

هەروەها خۆش بەخت بوو بەخزمەت گەیشتنی ئەمیری بڕواداران (عومەری کوڕی خەتتاب)، وە قورئانی لەخزمەتی دا دەخوێند و، نوێژی لە پشتیەوە دەکرد. وە (روفەیع) کە ناسراوە بە (ئەبی عالیە) هەرچۆن خۆی یەکلایکردبوەوە لەسەر خوێندنەوەی (قورئانی پیرۆز)و تێبینی کردنی و تێگەیشتنی، ئاوهاش وابەست بوو بە فەرموودەی پێغەمبەری خوداوە درووودی خوای لەسەر بێ...

جا ئەوەش وای لێکرد، کە گوێبیستی گێرانەوەی بوو لەو شوێنکەوتووانەی کە لە (بەصر)ە بەخزمەتیان گەیشت. بەڵام زۆری نەخایاند کەلەناخی خۆیدا تەمای کردە ئەوەی کە لەوە زیاتر جێگەی متمانەیەو، جێگیرترە بۆیە بەیناو بەین رێی بەرێ دەکرد بۆ شاری (مەدینە)، تا لەوێ لە زمانی خودی هاورێیانی پێغەمبەری خوداوە درووودی خوای لەسەر بێ گوێبیستی ببێ، تا لەنێوانی ئەو و پێغەمبەردا درووودی خودای لەسەر بێ جگە لەیەك کەس کە ئەویش (هاوڕێیە) کەسێکی دی نەبێ.

خۆشبەختانە فەرموودەی وەرگرتوە لە (عەبدوڵلای کوڕی مەسعود)و، (ئوبەی کوڕی کەعب)و، (ئەبی ئەیوبی ئەنساری)و، (ئەبی هورەیرە)و، (عەبدوڵلای کوڕی عەبباس)و، هی تر و، هی تریش...

*　　　　*　　　　*

(ئەبو عالیە) وە نەبێ تەنها بە گوێبیستی گێرەرەوانی فەرموودە، لەشاری (مەدینە) مونەوەرە دا دەست کۆتا بێت. بەڵکو هەوڵی ئەوەی داوە لەهەموو شوێنێك گوێبیستی گێرەرەوان بووبێت.

جاکە وەسفی پیاوێکی بۆکرابێت بەشارەزایی لە فەرموودە، ریگای دووری دەبڕی بۆ خزمەتی، هەرچەند ماڵ وشوێنی نیشتەجێ بوونی دووربووبێ. کە دەگەیشتە خزمەتی، دەست وبرد لەپشتی یەوە نوێژی دەکرد. جا ئەگەر وای بەدی بکردایە کە پوختەیەکی تەواو نوێژەکەی ئەنجام نەداوە. ئەوە مافی تەواوی ئەوەی پێ نەدەبەخشی، کە گوێبیستی فەرموودە بێت لێ ی، بۆیە پشتی لێ هەڵدەکر و، لەناخی خۆی دا دەیووت:

بەڕاستی ئەو کەسەی کە کەمتەرخەمی بکات لەنوێژەکەیدا، بێ گومان لەشتانی دیکەیدا زیاتر و زیاتر کەمتەرخەم بێت. پاشان داردەستەکەی دەگرت بەدەستی یەوە، دەگەڕایەوە بۆ ئەو شوێنەی کە لێوەی هاتبوو.

وە (ئەبو عالیە) لەزانست و زانیاری دا گەشتبوە پلەو پایەیەك، کەلە سەر و هەموو هاوڕێیانی یەوە بوو... لەو بارەیەوە یەکێك لە هاورێکانی ووتی:

(ئەبا عالیە)م بینی دەستنوێژی دەگرت و، ئاو لەڕووەو دەستەکانی دەتکا. وە خاوێنی لەسەر هەر ئەندامێك لە ئەندامەکانی دەدرەوشایەوە...منیش سلاوم لێکرد و ووتم: بێ گومان خودای بالادەست گەڕاوەران و (التَّوابين) خاوێنکارانی (المتطهرين)ی خۆشەویست...

ئەویش ووتی: ئەی برا:

خۆ خاوێنکاران ئەوانە نین کە بەئاو خۆیان لە پیس و چەپەڵی خاوێن دەکەنەوە... بەڵکو لە راستی دا ئەوانەن کە بەخۆ پارێزی لە گوناهەکان خۆیان خاوێن دەکەن. جا منیش لەووتەکەی وورد بوومەوەو، هەستم بەوە کرد و زانیم، کە بەڕاستی ئەو ڕاستی پێکاوەو، منیش بەهەڵەدا چووم، ئیتر ووتم:

خودایە بەچاکترین چاکە پاداشت بداتەوە، وە زانست و تێگەیشتنت زێدە بکات.

*      *      *

(ئەبو عالیە) بەردەوام بوو لەسەر هاندانی خەڵکی بۆ بەدواچوون و فێربوونی زانست و زانیاری، وە نەخشەکێشانی بۆ دەرکردن و شارەزای دەکردن بەو ڕێگایانەی کە دەیگەیاندنە ئەو مەبەستە و، دەیفەرموو: ناخی خۆتان گوشاد بکەن لەسەر فێربوونی زانست و زانیاری، وە زۆر پرسیار بکەن لە بارەیەوە. وە باش بزانن کە زانست باڵی راناخات بۆ کەسی (شەرمن)و (لووت بەرز).

ئەویش لەبەر ئەوەی (شەرمن) لەبەر شەرمەکەی پرسیار ناکات. وە (لووت بەرزیش) لەبەر لووت بەرزیەکەی پرسیار ناکات. وە هانی قوتابیەکان دەدات لەسەر فێربوونی (قورئان)و، چاودێری کردنی، وابەست بوون بەوفەرمان و قەدەغە کراوانەی کە تیایدا هاتووە، وە پشت کردنە ئەوەی کە داهێنەران دای دەهێنن.

جا دەیفەرموو: قورئان فێر بن... وە کە فێری بوون وازی لێ مەهێنن...

وە پێویستە لەسەرتان پەیڕەوی کردنی ڕێگەی ڕاست (الصِّراط المُستَقیم) چونکە بێ گومان ئەوە (ئیسلام)ە... وە دووریگرتن و خۆلادان لەو ئارەزوو کاری و داهێنراوانە، چونگە بێ گومان ئەوە نەیاری و خەشم و کین دەخاتە نێوانتانەوە.

وە لامەدەن لەوەی کە هاوڕێیانی (پێغەمبەری خودا) دروودی خودای لەسەر بێ لەسەری بوون، پێش ئەوەی کە لێك بترازێن کە ئەوەیان گێڕایەوە بۆ (حەسەنی بەصری) ئەویش فەرمووی:

بەڕاستی (ئەبو عالیە) ئامۆژگاری کردن _ وە سوێند بەخودا _ ڕاستی لەگەڵ کردوون و، ڕاستی ووتووە.

هەروەها نەخشەی دەکێشا بۆ فێرخوازانی زانست و، نموونەترین ڕێگای بۆ دیاری کردن بۆ لەبەر کردنی قورئانی پیرۆز، جا دەیفەرموو: (قورئان) پێنج ئایەت، پێنج ئایەت فێر بن، چونکە ئەو ئاسانترە بۆ لەبەر کردن و فێربوونی و، تێگەیشتنی...

چونکە (جبریل) سەلامی خودای لەسەربێ قورئانی پێنج ئایەت، پێنج ئایەت دادەبەزاند بۆسەر (پێغەمبەر) دروودی خوای لەسەر بێ.

*　　　　*　　　　*

(ئەبو عالیە) بەس مامۆستا و فێرکار نەبووە، بەڵکو هەروەها ڕێنوماکاریش بووە... ئەوەش کە هۆش و ژیری قوتابیەکانی لێوان ڕێژ کردووە لە زانستی بەسوود... وە دڵەکانی تێر کردووە لە ئامۆژگاری چاك و سوود بەخش... وە لە زۆر کاتدا کۆکاری کردووە لە نێوان دوو شتدا. لەوانە کە پێی فەرموون:

بەڕاستی خودای بالادەست پێویستی کردووە لەسەر خۆی: کە هەرکەس بەراستی بڕوای پێ ی هەبێ ڕێنوَمایی دەکات... پشت ڕاست کەرەوەی ئەوەش ئەم فەرموودەیەتی (جلَّ جلالُهُ):

مَّن ذَا ٱلَّذِى يُقْرِضُ ٱللَّهَ قَرْضًا حَسَنًا فَيُضَٰعِفَهُۥ لَهُۥٓ أَضْعَافًا كَثِيرَةً ﴿٢٤٥﴾

سورة (البقرة) ئایەتی (٢٤٥). واتە:

کێ ماڵ و سامانی خۆی بەقەرز دەداتە خودا، یان تەنها لەبەر خودا دەیبەخشێتە هەژاران، هەتا ئەویش (جَلَّ جَلالُهُ) چەند ئەوەندە و، ئەوەندەی زیاتری بداتەوە.

وە هەرکەسێك هانای بۆ بەرێ و هاواری لێ بکات، وەڵامی دەداتەوە... پشت ڕاستکەرەوەی ئەوەش ئەم فەرموودەیەتی (جَلَّ جَلالُهُ):

(وَإِذَا سَأَلَكَ عِبَادِي عَنِّي فَإِنِّي قَرِيبٌ ۖ أُجِيبُ دَعْوَةَ الدَّاعِ إِذَا دَعَانِ) سورة (البقرة) ئایەتی (١٨٦).

واتە: هەر کاتێك بەندەکانم، لەبارەی منەوە، ئەی (موحەمەد) دروودی خوای لەسەر بێ، پرسیاریان لێ کردی، بێ گومان من نزیکم، هەر کەس هانا و هاوارم بۆ بێنێ، وەلامی دەدەمەوە و، بێ وەلام نایهێلێمەوە.

وە ئەو بە قوتابیەکانی ووت:

کار بەگوێڕایەلی بکەن، و ڕوو لە گوێڕایەلیان بکەن و سەردانیان بکەن لەبەر گوێڕایەلیان و خوداپەرستیان... و دوور کەونەوە لەگوناهو یاخی بوون، وە نەیاری یاخی بووان و گوناهباران بکەن لەبەر یاخی بوون و گوناهەکانیان...

پاشان یاخی بووان ڕەوانەی لای خودا بکەن، جا ئەو وویستی سزایان دەدات وەئەگەر ویستیشی لێیان ببورێ، ئەوا لێیان دەبوورێت. وە ئەگەر گوێبیستی کەسێك بوون بەشان و شکۆی خۆی دا هەلیدەدا و دەیووت:

بەراستی من خۆشەویستیم تەنها لەبەر خودایە، وە خەشم و کینم هەر لەبەر ئەوە... وە ئەو شتە بەباش دەزانم تەنها لەبەر خودایە و ئەنجامی دەدەم، وە پشت لەو شتە هەلدەکەم تەنها لەترسی خودا... ئەو گوێ بوو ووتەکانی مەگرن و گرنگی پێ مەدەن.

وە (ئەبوعالیە) وە نەبووبێ تەنها زانایەکی کاراو، ئامۆژگاری کارو ڕێنوکارێك بووبێ و بەس، بەلکو ئەو هەروەها کە ڕاستیدا کۆششکار و جەنگاوەرێکیش بووە...

بەشێکی لەساتەوەختەکانی لە گۆڕەپانەکانی جەنگ دا لەگەل جەنگاوەراندا (المجاهدین) بەسەر دەبرد. یا لەسەر سنوور بەرامبەر دووژمنان لەگەل سنووورە وانان دا... وە ئەوەی بەباش دەزانی کەلە جیهادی دا ڕۆژهەلات و ڕۆژئاوا بکات...

جا جەنگی (ڕۆم)ی کردوە لە وولاتی (شام)دا، هەروەك جەنگی (فورسی) کردووە لە وولاتی (ما وَراءَ النَّهْر)[1]... وە یەکەم کەس بوو کە دەنگی بانگی بلند کرد لەو وولاتەدا.

---

[1] بلاد ما وراء النهر:ئەو وولاتەیە کە کەوتۆتە پشتی رووباری (جەیحون) کەلە بەپیترین وولاتانی دونیایە.

وە کاتێك کوشتار لە نێوانی (عەلی) و (موعاویە) خوایان لێ ڕازی بێت ڕوویدا... (ئەبی عالیە) هەڵوێستی تایبەتی خۆی هەبوو لەو بارەوە بۆمان دوواوە، ووتوویەتی:

کاتێك ئەوەی ڕوویدا لە نێوان (عەلی) و (معاویە)دا، لێوانرێژبووم لە گورج و گۆڵی دا... وە کوشتار و جەنگین لەلام خۆشتر بوو لەئاوی سارد لەرۆژی گەرم و ئاگرین دا. خۆم بە پێویستی جەنگ و کوشتار ئامادەکرد و، ئەوجا هاتم بۆ لایان، جاکە ئامادەی بەردەمیان بووم، دووریزم بینی بەرامبەر بەیەك، تەنها مەگەر خودا بزانێت ژمارەی هەر ریزێکیان چەند جەنگاوەر بوو... ئەجا سەرنجم دا، کاتێك ئەوانە (الله اکبر) دەکەن، ئەوانیکەش (اللهُ أکْبَر) دەکەن... وە کاتێك ئەوانە (لاإلهَ إلاَّ الله) دەکەن، ئەوانیکەش (لا إلهَ إلاَّ الله) دەکەن. جا کە ئەوەم بینی بەخۆم دا چوومەوەو ووتم:

کام تیپیان بە (کافر) بێ باوەڕ دابنێم و هێرش بکەمە سەری؟... وە کامیان بە بڕوادار دابنێم و لەگەڵیدا جیهاد بکەم؟ ئیتر وازم لێهێنان و بەجێم هێشتن...

وە (ئەبو عالیە) بەدرێژایی ژیانی دڵتەنگ و خەمۆك بوو، لەبەر ئەوەی خۆشبەخت نەبوو بوو، بەبە خزمەت گەیشتنی (پێغەمبەر ی خودا) دروودی خوای لەسەر بێ... جا ئەو هەوڵی ئەوەی دا کە جوبرانی ئەوە بکاتەوە، بەنزیك بوونەوە لەو هاوڕێ پایەبەرز و بەرێزانەی کە پەیوەندی تایبەتیان هەبووە بە (پێغەمبەر)ی خودا دروودی خوای لەسەر بێ.

ئەو ئەوانی لەخۆی بەرێزتر سەیردەکردن و خۆشەویستن، وە ئەوانیش رێزیان دەگرت و خۆشیان دەویست. وە لەبەڵگە لەسەر ئەوە، (ئەنەس) ڕەزای خوای لەسەر بێ کە خزمەتکاری (پێغەمبەر)ی خودا دروودی خوای لەسەر بێ بوو.

جارێکیان سێوێك لەدەستی دابوو، بەخشی یە (ئەبو عالیە). ئەویش لێ ی وەرگرت، وە هەیتا هەیتا ماچی دەکرد و دەیووت:

سێوێکە دەستێکی بەرکەوتووە، کە بەردەستی (پێغەمبەر)ی خودا کەوتووە. سێوێکە دەستێکی بەر کەوتووە، کە خۆش بەخت بووە، بەبەرکەوتنی دەستی (پێغەمبەر)ی خودا دروودی خودای لەسەر بێ...

وە بەڵگەیەکی دیکە هەروەها، ئەوەیە کە ئەو جارێکیان چووە خزمەتی (عەبدوڵلای کوڕی عەبباس) ڕەزای خوای لەسەر بێ، کەلەو ڕۆژگارەدا، لەلایەن (عەلی کوڕی ئەبی تالبەوە) ڕەزای خوای لەسەر بێ کرابووە ئەمیری (بەصرە)، جا (عەبدوڵا) بەگەرمترین و جوانترین شێوە بەخێر هێناو، لەلای ڕاستی یەوە لەسەر تەختەکەی داینا. کەلەو کاتەدا کۆمەڵێك لەگەورە پیاوانی قوڕەیش لە کۆڕەکەیدا بوون، جا کە ئەوەیان بینی دەستیان کردە کلەچاو پێدانی (ئەبو عالیە)و، لاقرتێکردن لە نێوان خۆیان دا...

وە هەندێکیان بە هەندێکیانیان ووت:

ئایا بینیتان چۆن (کوڕی عەبباس) ئەو بەندەیەی بەرز ڕاگرت و لەسەر تەختەکەی خۆی داینا؟!. (کوڕی عەبباس)، هەستی بە چاوکەلاکردن و لاقرتێکردنی کردن، بۆیە لایکرد بەلایانەوە و ووتی: بێ گومان زانست شکۆی شکۆمەند زێدەتر دەکات و، پلەو پایەی خاوەنەکەی لەنێو خەڵکی دا بڵند دەکات، وە کۆیلەکان لەسەر تەخت دەنێ.

*		*		*

ساڵێکیان (ئەبو عالیە)بڕیاری جیهادی دا لەرێگای خوادا، وە بۆ ئەو مەبەستە، پێویستی ئامادەکرد و، پشتی بەخودا بەست لەسەر ڕێبەرێکردن لەگەڵ جەنگاوەرەکان دا (المجاهیدین).

کاتێك ڕۆژێکردەوە، کوتوپڕ ڕووبەڕووی ئازارێکی بێ سنوور بوو لە یەکێك لە قاچەکانیدا. پاشان بەردەوام سات لە دوای سات ئازارەکە بەهێز تر دەبوو. کاتێك کە پزیشك سەردانی کرد و پێی ووت: بەڕاستی ئەو قاچەت تووشی (خۆرە) (سەرەتانی ئێسك) (گانگرین) بووە.

ئەویش ووتی: خۆرە چی یە؟

پزیشکەکە ووتی: دەردێکە ئەو ئەندامە دەخوات کە تووشی بووە، پاشان بەرەو ژوور دەست بەگواستنەوە دەکات تا هەموو لەشی لەناو دەبات. پاشان داوای مۆڵەتی لێکرد تا قاچی ببڕێتەوە... تا هەموو لەشی نەگرتۆتەوە. ئەویش لەگەڵ پێناخۆش بوون دا مۆڵەتی دا...پزیشکەکە (تێغی) (گوێزان) (چەقۆی تیژ) ئامادەکرد بۆ کردنەوەیگۆشتەکەو... (مشاریش) بۆ بڕینەوەی (ئێسکەکە)...

پاشان پێی ووت: ئەتەوێت کە خۆراکێك (مادەی بێهۆشکەرت) بدەینێ بۆ ئەوەی هەست بە ئێش و ئازاری لەتکردنی گۆشتەکە وبڕینەوەی ئێسکەکە نەکەیت؟.

ئەویش ووتی: بەڵکو بۆ ئەوە لەوە باشتر هەیە.

پزیشکەکە ووتی: ئەوە چی یە؟.

ئەویش ووتی: قورئان خوێنێکی شارەزای تەواوم لە قورئان خوێندن بۆ ئامادە بکەن، با قورئان بەسەرمدا بخوێنێت. جا سەرنجم بدەن، کە دەم و چاوم سوورهەڵگەڕا و، هەردوو چاوم کرانەوەو، چاوم بڕییە ئاسمان... ئەو جا چیتان دەوێ لەگەڵما ئەنجامی بدەن...

ئەوانیش داواکەیان جێ بەجێکردو، ئێسکەکەیان بڕیەوە... جا کاتێك هاتەوە هۆشی خۆی، پزیشکەکە پێی ووت:

تۆ وا دیاربوو، کە هەستت بە ئێش و ئازاری لەتکردنی گۆشت و بڕینەوەی ئێسکەکەت نەکردبێ. ئەویش ووتی: بەڕاستی فێنکی خۆشەویستی خوداو... شیرینی ئەوەی کە گوێبیستی بووم لە قورئانی پیرۆز، بێ ئاگایکردم لە گەرما و ئێش و ئازاری (مشار) و، (تێفەکە).

پاشان (قاچەکە)ی گرت بەدەستی یەوە، چاوی تێبڕی و ووتی:

کاتێك لە ڕۆژی ڕەستاخێزدا کە بەخزمەتی پەروەردگارم گەشتم و پرسیاری لێکردم: ئایا بە تۆ ماوەی (چل) ساڵە ڕێم بەرێ کردووە بۆ قەدەغەکراوێك؟... یان بە تۆ پێم خشاندووە لە شتێکی ڕێگەپێنەدراو؟... بەدڵنیاییەوە دەڵێم: نەخێر

وە بەویستی خودا من لەوەدا کە دەیڵێم ڕاستگۆم.

* * *

(ئەبو عالیە) لە خۆپارێزی و، چاوەڕێکردنیدا بۆ ڕۆژی ڕەستاخێزو، ئامادەکاریدا بۆ خزمەت گەیشتنی پەروەردگاری، گەیشتبووە ئاستێك کە (کفنێکی) بۆ خۆی ئامادەکردبوو.

وە هەموو مانگێك جارێك ئەو (کفنە)ی لەبەر دەکردو، پاشان دەیخستەوە شوێنەکەی خۆی... وە وەك لە دروستی (موسلیم)دا (صحیح المسلم) هاتووە

(حەڤدە)جا وەسیەتی کردووە... وەبۆ هەر وەسیەتێك ماوەیەکی دەستنیشان دەکرد، جاکە دەگەشتە کاتی تەواوبوونی سەرنجی دەدا.. جا یان چاکسازی تیا دەکرد...وە یان دەیگۆڕی... وە یاخود وازی لێدەهێنا هەروەك خۆی...

ئیتر ئەوە بوو لە مانگی (شەووالی) ساڵی (نەوە دوسیٚ ی) کۆچیدا... (ئەبو عالیە) رێی بەرێکرد بۆ بە خزمەتگەیشتنی پەروردگاری،

داوێن پاك...ناخ و دڵ دەروون خاوێن...

متمانەدار بە سۆزوو بەزەیی پەروەردگاری...

تامەزرۆ بۆ بە خزمەتگەیشتنی پێغەمبەرەکەی.

* * *

خودایە لەگەڵ (ئەبو عالیە)و نموونەی ئەودا حەشرمان بکە.

(وەرگێڕ)

بۆ زیاتر شارەزابوون لە ژیاننامەی (روفەیعی کوڕی میهران) کە ناسراوە بە (ئەبی عالیە) بڕوانە:


١- سير أعلام النبلاء للذهبي: ٢٠٧/٤ وَما بعدها.

٢- حلية الأولياء لأبي نعيم الأصبهاني: ٢١٧/٢ -٢٢٤

٣- الطبقات الكبرى لأبن سعد: ١١٢/٧

٤- تهذب التهذيب لأبن حجر: ٢٨٤/٣

٥- المعارف لأبن قتيبة: ٤٥٤

٦- الأصابة في تمييز الصحابة: ٥٢٨/١ الترجمة ٢٧٤

٧- التهذيب لأبن عساكر.

٨- تذكرة الحفاظ للذهبي: ٥٨/١

# ٢٨ )ئەحنەفی کوڕی قەیس

## بەشی یەکەم

( سەرۆکایەتی ( بەنی تەمیم ) دەکات )

**(بەبێ گومان (ئەحنەفی کوڕی قەیس) لە ڕێز و شکۆمەندی و پایەبەرزیدا گەشتبووە ئاستێك، کەنە فەرمانڕوایەتی سوودی پێ دەگەیاند و نەلابردنیشی زیانی پێدەگەیاند)                    (زیادی کوڕی ئەبیھی)**

(دیمەشق)بە باخچە ڕازاوە و چڕوپڕ و، باخ و سابات وگوڵ و گوڵزارە جوان و بۆنخۆشەکانی یەوە، بۆ بەھاری دڵڕفێن پێ دەکەنی.

وە کاخی ئەمیری بڕوادارانیش (موعاویەیە کوڕی ئەبی سوفیان)یش، خۆی ئامادەکربوو بۆ پێشوازیکردنی میوانان و ئەو وەفدانەی کە سەردانی دەکەن. هێشتا مۆڵەت بەیەکەم میوان نەداربوو کە بێتە خزمەتی (خەلیفە)

کە خوشکەکەی (ئومو حەکەم ی کچی ئەبو سوفیان)، لەپشتی پەردەی ژوورەکەی (خەلیفە)وە شوێنێکی بۆ خۆی دەستنیشان کرد و، تێیدا دانیشت، تاگوێبیستی ئەوە ببێت کەلە کۆڕی (جێ نشینیەتیدا) دەگێڕێتەوە لە فەرموودەکانی (پێغەمبەر)ی خودا دروودی خوای لەسەر بێ.

بۆ ئەوەی کۆیبکاتەوە و تۆماریبکات، ئەوەی کە گوێبیستی دەبێت لەزاری ئامادەبووانی کۆڕی (ئەمیر) لە (گوزارەی بێ وێنە)و، هەڵبەستی ناوازەو، (پەندی سوود بەخش).

(ئومو حەکەم) ئافرەتێکی شکۆمەندی بیرتیژ و، ژیری پێك و، دەروون بەرز و، هەمیشە هەوڵی دەدا بۆ ئاگابوون لە بەها بەرز و پیرۆزەکان.

وە ئەو شارەزای ئەوە بوو کە براکەی مۆڵەت دەدا بەو خەڵکەی کە دەچنە خزمەتی بەپێی پلەوپایەیان. بۆنموونە هاوڕێیانی (پێغەمبەری خودا) دروودی خودای لەسەر بێ پێش هەمووان دەخا، پاشان بەدوای ئەوان دا گەورە شوێنکەوتووان، وە زانایان و، خاوەن کەسایەتیەکان.

(ئومو حەکەم)ئەم جارە ئەوەی بەدیکرد، (براکەی) لە پێشوازیکردنی میوانی یەکەمی دا، پێشوازیەکەی کەمتەرخەمی پێوە دیار بوو، وە گوێبیستی بوو پێی دەووت:

ئەی (ئەحنەف) ووتی :سوێند بەخودا، هەر جارێك کە ڕۆژی (صفین)[1] دێتە بەرچاوم، ئەوەم بیر دەکەوێتەوە، کە تۆ چۆن پشتت لە ئێمە هەڵکرد و، هەڵوێستت بەرامبەرمان وەرگرت و چوویتە لای (عەلی کوڕی ئەبی تالب) ڕەزای خوای لێ بێ، جا ئەو کینێکی لەناخی مندا دروست کردووە، بەرامبەرت کە مەگەر مەرگ لەناخمی دەربکات. پیاوەش (ئەحنەف) سوێند بەخودا، ئەو دڵانەی تۆمان پێ خەشم گیر کرد بەردەوام لەناخماندایە.... وە ئەو شیرانەی کە کوشتاری تۆمان پێ دەکرد بەردەوام ئێستاش لە نێو دەستەکانمان دایە...

خۆئەگەر لەجەنگ ئەنگوستێك نزیك بیتەوە، ئێمە یەك بست لێی نزیك دەبینەوە... خۆئەگەر بەڕۆشتنی مادەو لەسەرخۆ بۆی بچیت، ئەوە ئێمە بەگورگە لۆقە بۆی دەچین. وە سوێند بەخودا بۆ ئەوە نەهاتووین بۆلات بەئومێدی بەخشندەی و بەخشندەکانت، یان لەترسی و بیمی دوژمنایەتی و ستەم دژایەتیت... بەڵکو تەنها بۆ جاکسازی نێوان و، گەڕانەوەی برایەتی ویەك ڕیزی و، کۆکردنەوەی ووتەی

---

[1] یوم صفین: ئەو ڕۆژە بوو کە تیایدا (عەلی) سەرکەوت بەسەر (موعاوی)ەدا، (صفین) شوێنێکە نزیك ڕۆخی لای ڕاستی (فورات).

موسڵمانان، هاتووین بۆلات... پاشان رووی وەرگێڕاو لە کوێوە هاتبوو بەرەو ئەوێ ڕێی بەرێ کردەوە. جا (ئوممو حەکەم) خۆی پێڕانەگیراو، لایەکی پەردەکەی لادا، تا ئەوکەسە ببینێ کە بەردەداتەوە بەناوچاوی (خەلیفە)دا و، (مەنێکی) بە دوو (مەن)[1] بۆ پێوانە دەکاتەوە.. بینی پیاوێك بوو، کورتە بالاّ و، لاواز و، کەچەڵ و سەرڕووتاوەو، دان تێکەلاّو و، چەناگە لار و، چاوزەق و، قاچ لار، هیچ ناتەواو ویەك نەبوو لە مرۆڤ دا، کە بەشێکی لەودا نەبێ.

ئەوجا لایکرد بەلای براکەیەوە ووتی: ئەی (ئەمیری بڕواداران) ئەمە کێ یە کە هەڕەشە لە (خەلیفە) دەکات و چاوی لێسوور دەکاتەوە لەناو ماڵەکەی خۆی دا..

(موعاویە) هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا و ووتی:

ئەوە ئەو کەسەیە کە تووڕەبوو، سەد هەزار کەسی لە هۆزی (بەنی تەمیم) بەدوایدا تووڕە دەبن، وە گوێ بەوە نادەن لەسەرچی تووڕە بووە... بێ گومان ئەوە (ئەحنەف کوڕی قەیسە) گەورەی هۆزی (بەنی تەمیم) و، یەکێکە لە ناوازەکانی عەرەب و پاڵەوانە جەنگاوەرەکانی.

جا فەرموون لە سەرەتایەوە چیرۆکی ژیانی (ئەحنەف کوڕی قەیس) بخەینە بەرچاو.

* * *

لە ساڵی سێ یەمی پێش کۆچیدا، (قەیسی کوڕی موعاویەی سەعدی) کوڕێکی بوو، ناوینا (الضَّحَّاك) (دەم بە پێکەنین).

بەلاّم زۆری پێ نەچوو کە خەڵکی نازناوی (ئەحنەف) یان دایە پاڵی لەبەر ئەولار لوێرییە کەلە قاچەکانی دا هەبوو، ئیتر ئەو نازناوە زاڵ بوو بەسەر ناوەکەی دا.

(قەیس) باوکی (ئەحنەف) نە لەخانەوادە خاوەن پلەوپایەی هۆزەکەی بوو وە نەلەخانەوادە هەڕەمەکی یەکان بەڵکو لە خانەوادە مام ناوەندییەکان بوو لە دایك بوونی (ئەحنەف) لەو ماڵانەی هۆزەکەدا بوو کەلە رۆژئاوای (یەمامە)دا جێگیر بوون لەسەر زەمینی (نەجد).

ئەو لاوە بەبێ باوکی (بەهەتیوی) نەشونمای کرد، چونکە ئەو پێش ئەوەی پێبگرێت باوکی کوژرا بوو. پاشان پێش ئەوەی سمێڵەکانی، دەربێن، رووناکیەکانی

---

[1] (مەن):

ئیسلام هەموو دڵی داپۆشی. (پێغەمبەری خودا) دروودی خوای لەسەر بێ بەچەن ساڵێکی کەم پێش وەفاتی (بانگەوازکارێکی) (داعية)، ڕەوانەکرد بۆلای هۆزەکەی (ئەحنەف کوڕی قەیس) تا بانگهێشتیان بکات بۆسەر ئایینی (ئیسلام).

(بانگەوازکارەکە) لەگەڵ کۆمەڵێك لە کەسایەتیەکانی هۆزەکە کۆبوویەوەو، دەستی کرد بەهاندانیان بۆ بڕوا هێنان، وە (ئیسلامی) بۆ ڕوونکردنەوەو، بانگهێشت کردن بۆموسڵمانان بوون...

هۆزەکە بێدەنگی دایگرتن، وە هەندێکیان سەرنجی هەندێکیان دەدا، (ئەحنەف) کەلەوێدا ئامادەبوو، ڕاپەڕی و ووتی:

ئەی هۆزەکەم بۆچی لەدڵەڕاوکێ دا دەتانبینم، قاچێك بەرەو پێش بەڕێ دەکەن و قاچەکەی دی بەرەوداوە؟!... سوێند بەخودا ئەو (بانگەوازکارەی) هاتووەتە لاتان بانگەوازکاری خێر و چاکەیە... وە لەڕاستی دا ئەو بانگهێشتتان دەکات بۆلای ڕەوشتە بەرز و بەهادارەکان، وە لە ڕەوشتە نزمەکان قەدەغەتان دەکا... وە سوێند بەخودا جگە لەچاکە هیچمان لێ نەبیست...

جا کە وابوو وەڵامی بانگەوازکاری و ڕێنمایی و چاکەکار بدەنەوەو، خێر و چاکەی دونیاو دواڕۆژ وەدەستدەخەن. ئەوەبوو زۆری پێنەچوو کە هۆزەکە موسڵمان بوون و، لاوەکەش لەگەڵیاندا موسڵمان بوو.

پاشان کۆمەڵێك لەگەورە پیاوانی هۆزەکە چوون بۆ بەخزمەت گەیشتنی (پێغەمبەری خودا) دروودی خوای لەسەر بێ. بەڵام (ئەحنەف) لەبەر تەمەنی کەمی لەگەڵیان نەبوو... بۆیە بێ بەش بوو لەشکۆمەندی هاوڕێیەتی (پێغەمبەر) دروودی خوای لەسەر بێ، بەڵام بێ بەش نەبوو لە ڕازی بوونی (پێغەمبەر) دروودی خوای لەسەر بێ، لێ ی و... دوعای خێری بۆی...

*　　　　*　　　　*

(ئەحنەف) دووا و ووتی:

لەڕۆژگاری جێ نشینێتی (عومەر کوڕی خەتتاب) ڕەزای خوای لەسەر بێ خەریك بوو بەدەوری (کەعبە)دا (البيت الحرام) دەسووڕامەوەو، کەسێکم پێگەیشت کە دەمناسی، هەردوو دەستی گرتم و ووتی: ئایا دەتەوێت مژدەت بدەمێ؟.

منیش ووتم: بەڵێ

پیاوەکە ووتی: ئەو ڕۆژە دێتەوە یادت کە (پێغەمبەری) دروودی خوای لەسەر بێ، منی ڕەوانەکرد بۆلای هۆزەکەی تۆ، بانگهێشتیان بکەم بۆسەر ئاییني پیرۆزی ئیسلام، ئەوجا منیش بانگهێشم کردن، وە داوام لێکردن کەبێنە ناو ئاییني خودای بالادەستەوە، تۆش ئەو ڕۆژە ئەوەت ووت کە ووتت؟

منیش ووتم: بەڵێ باش لەیادمە.

پیاوەکە ووتی: بێ گومان کاتێك من گەڕامەوە بۆ خزمەتی (پێغەمبەری خودا) دروودی خوای لەسەر بێ، وە ووتەکەی تۆم بۆ گێڕایەوە و، فەرمووی: (خودایە لە (ئەحنەف) خۆش ببە).

بۆیە (ئەحنەف) دەیفەرموو: هیچ شتێك نی یە لە کردارمدا، کەبۆ من ئومێد بەخشتربێت لە ڕۆژی ڕەستاخێزدا لە نزاکەی (پێغەمبەری خودا) (ﷺ)

* * *

کاتێك (پێغەمبەری خودا) دروودی خودای لەسەر بێ وەفاتی کرد و گەڕایەوە بۆ خزمەتی پەروەردگاری، وە (موسەیلەمەی درۆزن)، بەدرۆ هەڵبەسراوەکەیەوە، وە لە (ئیسلام) هەڵگەڕایەوە، وە بەهۆی ئەوەوە، ئەوەی هەڵگەڕایەوە، هەڵگەڕایەوە، (ئەحنەف) لەگەڵ مامیدا (موتەشەممەس) ڕێی بەرێ کرد بۆلای، تا چاوی پێ بکەوێت و گوێبیستی ببێت (ئەحنەف) لەو ڕۆژگارەدا لەسەرتای لاوێتیدا بوو جا کە بەجێیان هێشت، (موتەشەممەس) (المُتَشَمِّس) بەبرازاکەی ووت:

ئەی (ئەحنەف) ئەو پیاوەت چۆن کەوتە بەرچاو؟

ئەویش ووتی: وام بینی کەسێکی دەست بەتاڵەو لە ناڕەوایەتیدا دەژیی و، درۆ هەڵدەبەستی بەدەم خودا و خەڵکەوە. جا مامی بە سوعبەتەوە پێی ووت:

ئایا خۆت ناترسیت کەمن ئاگاداریبکەم لەوە کە تۆ بەدرۆیدەخەیتەوە؟!.

(ئەحنەف)یش ووتی:

ئەوسا منیش لەلای ئەو سوێندت دەدەم، جا ئایا جەنابت سوێند دەخوێت کە وەك من بە درۆت نەخستۆتەوە؟ وەبە درۆزنی نازانی؟.

ئیتر (ئەحنەف) و (مامی) پێکەنین ئامێزبوون و پێگیربوون لەسەر موسڵمانەتیان.

* * *

وە نامۆیی لەوە دا نی یە کە سەرسوڕمان و تیارامان داتبگرێت لەو هەڵویستە، یەکلاکەرەوانەی کە (ئەحنەف) نواندویەتی لەو کاروبارە گەورانەدا، لەگەڵ ئەوەدا کە

هێشتا تەمەنی لەسەرەتادایە. بەڵام بە دڵنیاییەوە سەر سوڕمان و، تیارامانەکەت، کۆتایی دێت و لەبەین دەچێت، کاتێك کە شارەزابوویت، بەراستی ئەو لاوەی (بەنی تەمیم) ناوازەیەکە لە ناوازەکانی زەمانە لە تیژی بیر و هۆش و، کڵپەداری زیرەکی و، راستی و راستگۆی لە بۆچوون داو، بنەما خاوێنی دا.

وە (ئەحنەف) هەر لەمنداڵیەوە ئامادەی کۆڕی دەم راستان و پیاو ماقوڵانی هۆزەکەی دەبوو، وە هاوبەشی کۆبوونەوە و کۆڕ بەستەکانیانی دەکرد، وە لەسەر دەستی داناو زانا و، ئەوانەی کە بەدان خۆداگرتن و لێ بوردندا ناویان دەرکردبوو هەوڵ فێربوونی دەدا. لە بارەی خۆیەوە دوا و ووتی:

ئێمە هاتوچۆی کۆڕەکانی (قەیسی کوڕی عاسمی مونەقەری)مان دەکرد، تا دان بەخۆداگرتن و لێبوردنی لێوە فێر ببین، هەروەك هاتوچۆی کۆڕی زانایانمان دەکرد تالێیانەوە زانست فێر ببین.

جا پێی ووترا: (قەیس)[1] لەدان بەخۆداگرتن دا گەشتبووە چ ئاستێك؟ ئەویش ووتی: جارێکیان چووم بۆ خزمەتی، بینیم لە حەوشەی ماڵەکەی دا، جبەکەی بەسەرشانیدا داوەو، دانیشتووەو، شیرەکەی لەسەر ڕانی یەتی. بۆ هۆزەکەی دەدوێت... منیش سڵاوم کرد و دانیشتم.

جا زۆری پێ نەچوو، کەگوێبیستی هەرایەك بووین، ئێمەش سەرنجمان داو روانیمان...لاوێکی باڵ بەسراو، لاوێکی کوژراویان هێنا و، پێیان ووت:

ئەمە برازاکەتە فلان کوڕتی کوشتووە... سوێند بەخودا، دانیشتنەکەی تێك نەداو، ووتەو قسەکانی نەبڕی تا تەواوی کرد... پاشان لایکردەوە بەلای برازاکەی دا ووتی:

ئەی برازای خۆم، ئامۆزاکەتت کوشت، وە بەدەستی خۆت سیلەی رەحمی خۆتت بچڕاند... وە بەتیرەکەت خۆتت پێکا... پاشان بە کوڕێکی تریانی ووت:

ئەی کوڕم هەستە باڵی ئامۆزاکەت بکەوەو... براکەشت بنێژە. پاشان (صەد) حوشتر بەرە بۆدایکی لە خوێنی کوڕەکەیدا، چونکە ئەو لە هۆزی ئێمە نی یە.

*　　　　*　　　　*

---

[1] (قيس بن عاصم المنقري): یەکێك بوو لە ئەمیر و ژیرمەندانی عەرەب، کەلە خولی نەفامی دا سەرۆکایەتی هۆزەکەی کردووە، وەمەی خواردنەوەی لەخۆی قەدەغەکردووە، وە جووتەخزمەتی (پێغەمەری خودا) دروودی خودای لەسەر بێ، لەسەر دەستی موسڵمان بووە.

وە (ئەحنەف) کاتی بۆ رەخساوە، کەلەسەر دەستی کۆمەڵێکی باش لە هاوڕێیانی بەرێز و پایەداردا فێرببێت، لەسەروو هەموویانەوە (عومەری کوڕی خەتتاب) رەزای خوای لەسەر بێ.

ئامادەی کۆڕەکانی بووە و، گوێبیستی ئامۆژگاریی یەکانی، وە بەباشی ئاگاداری دادوەریەکانی بووە و لە بڕیارەکانی تێ گەیشتووە، (ئەحنەف) لە درەوشاوەترینی ئەو قوتابیانەیە کە قوتابخانەی (عومەری)، بەرهەمی هێنان، وە لە هەموویان زیاتر رۆچوو بوو، لەوەرگرتنی زانستە ناوازەکانی ئەو قوتابخانەدا.

جارێکیان پێی ووترا: بەچی ئەودان بەخۆداگرتن و دانایی و کەسایەتی یە نەرم ونیان و رێزدارەت بە دەستهێناوە؟.

ئەویش ووتی: بەهۆی چەند ووتەیەکەوە لە (عومەری کوی خەتتاب) رەزای خوای لەسەر بێ گوێبیستی بووم، کە فەرمووی:

هەرکەس جنگە پەڵماس و قسەی هەڵەوپەڵەوسوعبەت بکات پێی کەم بەها دەبێت...

وە هەرکەس لە شتێکدا زۆر رۆبچێت و پێوەی وابەست بێت بەوە دەناسرێ...

وە هەرکەس هەڵەی زۆر بوو ئابڕوی کەم دەبێتەوە...

وە هەرکەس ئابڕووی کەم بوویەوە، خۆ پارێزی کەم دەبێتەوە...

وەهەرکەس خۆپارێزی (ورعە) کەم بوویەوە، دڵی دەمرێت...

* * *

(ئەحنەف) سەرۆکایەتی هۆزەکەی کردووە، لەگەڵ ئەوەشدا کەلە خانەوادە خاوەن کەسایەتی یە پلەوپایە بەرزەکان نەبووەو... لە دایك و باوکێکی پایە بەرز نەبووە...

وەلە زۆر کەس پرسیار کراوە دەربارەی ئەو نهێنی یە، جا یەکێکیان لەو پرسیارکارانە پرسیاری کرد لە (ئەبا بەحر)و ووتی:

ئەی (ئەبا بەحر) ئەوە چی وایکردووە کە (ئەحنەف) سەرکردایەتی هۆزەکەی بکات؟. ئەویش ووتی: هەر کەسێ چوار سیفەتی تێدابێت سەرۆکایەتی هۆزەکەی دەکات بەبێ رکابەر. پێی ووترا: ئەو سیفەتانە کامانەن؟

ئەویش ووتی: هەرکەس ئاینێکی هەبێت قەدەغەی بکات لەخراپە... وە شەرەف مەندی و کەسایەتییەکی هەبێت بیپارێزێت... وە ژیریەکی هەبێت رێنومایی بکات... وە ئابڕوویەکی هەبێت لەکاری زفت و ناشیرین قەدەغەی بکات.

وە (ئەحنەف) لەپاش ئەوە بوویە یەکێك لەو عەرەبانەی کە بەنموونە دەهێنرانەوە لەدان بەخۆگرتن دا. وە لە دان بەخۆداگرتن دا (ئەحنەف) گەشتبووە ئاستێك کە (عەمروی کوڕی ئەهتەم) پیاوێکی لەخشتەبرد کەبە جنێوی زۆر ناشیرین و قیزەوون بەشێوەیەك جنێوبارانی بکات، کە هەرچی خۆڕاگرانە بهەژێنێت وکاریان تێبکات.

بەڵام (ئەحنەف) بەردەوام سەری دانەواند و بێدەنگ مایەوە... جا کاتێك کە پیاوە بینی وا (ئەحنەف) وەڵامی ناداتەوە و، هەتا بەکەمترین ووشەش لۆمەی ناکات، پەنجەگەورەی خستە دەمی و، دەیگەست و لەبەرخۆیەوە دەیووت: ئەی هاوار هەی، سوێند بەخودا تەنها بیّ بەهایی و ریسوایی من بوو لەلای وا وەڵامی نەدامەوە.

وارێکەوت (ئەحنەف) لە دەوروبەری (بەصر)ەدا، بەتەنها ڕێی بەریّ دەکرد، پیاوێك رووبەرووی بوویەوە و، دەستی بەجنێودانی کرد و، شوورەیی دەدایە پاڵی و، هەموو ووشەیەکی ئێش پێگەیەنەری دەدا بەگوێی دا، بەڵام ئەو هەربێدەنگ بوو، وە بەردەوام بوو لەسەر ڕێبەڕێکردنەکەیدا. کاتێك کەلە خەڵك نزیك بوویەوە، لایکردەوە بەلای پیاوەکەداو ووتی:

ئەی برازای خۆم ئەگەر قسەی زیاترت ماوە ئێستا بیڵیّ... چونکە بیّ گومان ئەگەر هۆزەکەم گوێبیستی ئەوە بن کەتۆ دەیڵێیت ئازارت دەدەن.. وە (ئەحنەف) لەسەروو هەموو ئەوانەوە، خودا پەرستێکی بیّ سنوور و، رۆژووگر و، زیندوکەرەوەی شەوان بووە بەخوداپەرستی و، بیّ باك بووە لەوەی لەدەستی خەڵکی دا بووە.

وەکاتێك کە تاریکی شەوی لیّ دادەهات، چراکەی دادەگیرسان و، لەنزیك خۆیەوە دایدەناو، لە میحرابەکەیدا ڕادەوستاو بەردەوام نوێژی دەکرد. وە دەلاڵایەوە، لالانەوەی نەخۆش و دەردەدار، وە دەگریا گریانی کەسێك کە جگەرگۆشەی لەدەست دابیّ، لەترسی خەشمی خوداو، لەوەی کە خەشمی لێگرێت...

وە هەرکاتێك کە گوناهێك لە گوناهەکانی بهاتایەتەوە یاد، یان شوورەییەك لە شوورەییەکانی لیّ وەدەرکەوتایە، پەنجەی لە چراکە نزیك دەخستەوەو دەیووت:

ئەی (ئەحنەف) ئازار بچێژە...

چی وای لێکردیت کە فلاّن رۆژ ئەوەت ئەنجام دا؟

هاوار بەحاڵت ئەی (ئەحنەف) لەکاتێکدا ئەمڕۆ کەلەبەردەم گڕی چرایەکدا خۆی بۆڕاناگیریّ و خۆراگرنیت لەبەردەم ئازارەکەیدا... ئەی چۆن سبەینیّ لەبەردەم گڕو کڵپەی دۆزەخ دا خۆت پێڕادەگیریّ و، لەسەر ئازارەکەی ئارام دەگریت؟!...

دەی خودایە ئەگەر لێم ببوری تۆ شایەنی ئەوەیت... خۆئەگەر سزاشم بدەیت ئەوە من شایانی ئەوەم.

*                    *                    *

خودا لە (ئەحنەفی کوڕی قەیس) خۆشبێت. بەڕاستی درەوشاوەیەك بوو لە درەوشاوەکانی زەمانە وە نموونەیەك لەخەڵکی.

(خودایە دان بەخۆداگرتنی (ئەحنەف)مان پیّ ببەخشە)

# ئەحنەف کوڕی قەیس

## بەشی دووەم

(لەسەر دوودەستی (فاروق)دا فێر دەبێت)

(بەڕاستی ئەم لاوە، سوێند بەخودا گەورەیە، بێ گومان ئەم گەورەی خەڵکی (بەصرە)یە.) (عومەری کوڕی خەتتاب)

ئێمە ئێستا واین لە سەرەتاکانی جێنیشینیەتی (فاروق) خودای باڵادەست رووی گەش و پرشنگدار بکات. ئا ئەوانە کۆمەڵە پیاوێکی ئازا و بەجەرگ و ناوازەن لە هۆزەکەی (ئەحنەف کوڕی قەیس) لە (بەنی تەمیم)، کە سواری ئەسپە کەحیلەکانیان بوون و، شیرەتیژ و بریسکەدارەکانیان لەشان کردووە و... ماڵەکانیان بەجێدەهێڵن لە (ئەحصا)و، (نەجدە)وە، رووەو (بەصرە).

دەیانویست بچنە پاڵ کۆی ئەو موسڵمانانەی کە کۆبوبوونەوە، لەژێر فەرماندەیی (عوتبەی کوڕی غەزوان) بۆ کوشتارکردنی (فورس) لەڕێگای خودادا... وە بەئومێدی بەدەستهێنانی ئەوەی لەلای خودایە لە پاداشتی شایستەی و باش... وە لای تازەپێگەیشتووی هۆزەکەیان (ئەحنەف کوڕی قەیس)یان لەگەڵ دا بوو.

* * *

رۆژێکیان (عوتبەی کوڕی غەزوان) نامەیەکی لە ئەمیری بڕوادارانەوە (عومەری کوڕی خەتتاب) بەدەست گەیشت، کە تیایدا فەرمانی فەرمووبوو کە دەکەس لەسەربازەچاکەکانی بۆ ڕەوانە بکات، ئەوانەی کە هەڵوێستی مەردانە و ناوازەیانە

هەیە لە کوشتاردا، بۆئەوەی لێیانەوە هەڵوێستە بکات لەسەر کاروبارو ئەحواڵی سوپاکە، وە تاسوودمەندبێت لەڕاو ڕاوێژیان.

(عوتبە) دەستبەجێ دەستی دایە جێ بەجێکردنی فەرمانەکەی ئەمیر، وە دەکەسی لە ناوازەکانی پیاوەکانی ئامادەکرد، کە (ئەحنەف کوڕی قەیس) لەنێوانیان دابوو وە ڕەوانەی کردن بەرەوشاری (مەدینە).

*            *            *

پیاوانی ڕەوانەکراو ئامادەبوون لەخزمەتی (ئەمیری بڕواداران)دا، جەنابی ئەویش زۆر بەگەرم بەخێرهێنان و لەنزیك خۆیەوە داینان، وە پرسیاری لێکردن دەربارەی پێویستی خۆیان و، پێویستی خەڵکی بە گشتی.

یەك لەدوای یەك هەستانە سەرپێ و ووتیان:

دەربارەی خەڵکی بەگشتی ئەوە جەنابت خۆت سەرپەرشتکاریانی و، خاوەنی کاروباریانی، بەڵام ئێمە دەربارەی تایبەتمەندیەکانی خۆمان لەخزمەتتا دەدوێین.

پاشان هەریەکەیان داوای ئەو پێویستی یەکرد کە پەیوەندی بە خۆیەوە بوو. وە (ئەحنەف کوڕی قەیس) لەبەر ئەوەی کەمترین تەمەنی هەبوولە وەفدەکەدا ، کۆتا کەسی قسەکەران بوو. جا سوپاس و ستایشی خودای باڵادەست کرد و، پاشان ووتی:

ئەی (ئەمیری بڕواداران) لەڕاستی دا ئەو سەربازە موسڵمانانەی کە لە (میسر) جێگیربوون، جێ نیشینی ناوچەیەکی سەوز و پڕ لە بەروبووم و خێر و بەرەکەت بوون، لەناو ماڵی (فەراعیەنەکان)دا. وە ئەوانەی کەلە (شام)دا جێگیربوون، لەڕاستیدا جێنشینی ناوچەیەکی پڕ لە بەروبووم وباخ وباخات و پیت و بەرەکەت و ژیانی خۆش بوون لەناو ماڵی (قەیسەرەکان)دا.

وە ئەوانەی کە جێگیری ناوچەکانی (قودس) بون، لەڕاستیدا جێنیشینی ڕۆخی ڕووبارە سازگار و، باخ و باخاتە ڕازاوەکانی پڕ لەبەروبوومی هەمە جۆرە بوون لە ماڵەکانی (کیسراکان)دا.

بەڵام لەڕاستیدا ئەوانەی هۆزەکەی ئێمە کە جێگیری (بەصر)ە بوون، ئێستا جێنیشینی سەرزەوی یەکن کە شێدار و سوێرە، زەویەکەی ووشك نابێتەوە و، ڕووەك وەبەرهەم ناهێنێ و، بێ لەوەڕگایە... لایەکی ئەو سەرزەویە دەریایەکی سوێرە و، لایەکی تریشی سەرزەویەکی بێ ڕووەك و بێ پیت و بەرەکەتە.

جا ئەی (ئەمیری بڕواداران) بەردەوام ئەوان لە زەرەروزیان و بیٚ بژێویدان، کەوابوو جەنابت فەرمان بدە بە (والی یەکەت) لە (بەصر)ە کە رووبارێکیان لەئاوی شیرین بۆ هەڵبکەنیٚ تاخۆیان لیٚ ی بخۆنەوە و، ئاژەڵەکانیانی لیٚ ئاوبدەن و، کشت وکاڵی پیٚ بەرهەم بهێنن...

ئەوجا کاروباریان باش دەبێت، بژێوی خاووخێزانیان بەرەو باشی دەچێت، وە هەرزانی دامێنگیریان دەبێت. ئیتر بەهۆی ئەوەوە بەتواناتردەبن لەسەر جیهاد کردن لەراهی خوادا. (عومەر) رەزای خوای لەسەر بیٚ بەسەر سوڕمانەوە سەرنجی داو، بەپیاوەکانی وەفدەکەی فەرموو:

خۆزگە ئێوەش ئەو کارەی ئەوتان ئەنجام بدایە... سوێند بەخودا _ بیٚ گومان ئەو گەورەیە_... پاشان خەلاٌتی بەسەردا دابەشکردن، وە خەلاٌتی تایبەتیشی بەخشی یە (ئەحنەف)، ئەحنەفیش ووتی:

سوێند بەخودا ئەی (ئەمیری بڕواداران) ئێمە بۆ ئەوە، بیابان و چاڵ چۆڵمان نەبڕیوەو، لەسەرپشتی حوشترەکەمان تاریکی شەومان بەرووناکی بەرەبەیان تێکەڵ نەکردووە، کە خەلاٌت بەدەست خەین...جا لە بەرئەوە من هیچ پێویستی یەکی تایبەتی خۆم نی یە لەلای جەنابت، جگە لە پێویستی هۆزەکەم کە خستمە بەردەمت و عەرزم کردیت... جا ئەگەر بۆیان جیٚ بەجیٚ بکەیت، ئەوە بەسە، وەبەجێبەجێکردنی پێزانینت ئەنجام داوە بەرامبەریان...

(عومەر) رەزای خوای لەسەر بیٚ زیاتر سەری سووڕما بە (ئەحنەف)و ووتی: ئەم کوڕە لاوە گەورەی خەڵکی (بەصر)ەیە.

جا کەدانیشتنەکە تەواو بوو، وە کۆڕەکە بەتاڵ بوو، پیاوەکان رۆشتن بۆلای بارگەوبنەکانیان تالەویٚ شەوخەویٚ بکەن و بحەوێنەوە، (عومەر)یش رەزای خوای لەسەر بیٚ چاوی دەگێڕا بە بارگەوبنەکانیان دا، بەرگێکی (تُوب) بینی کەلایەکی لە لایەکی دیکەی زیاترە، ئەویش دەستی لێداو ووتی:

ئەمە هی کیٚ یە؟

(ئەحنەف) ووتی: هی منە ئەی (ئەمیری بڕواداران). (ئەحنەف) وایزانی کە (ئەمیر) لەبەر گرانبەهاییەکەی پرسیار دەکات. (عومەر)رەزای خوای لەسەر بیٚ فەرمووی: بەچەند کڕیووتە؟

(ئەحنەف) ووتی: بە هەشت درهەم. وە ئەوەندەی زانیبێتی و ئاگای لەخۆی بووبێت، ئەوە تاكە درۆیەك بووە لەژیانیدا كردبووی. ئەوەش ئەوەبوو كە بە (دوانزە) درهەم ئەو بەرگەی كڕیبوو، نەك بە هەشت درهەم .

(عومەر) ڕەزای خوای لەسەر بێ زۆر بەنەرم ونیانەوە سەرنجی داو فەرمووی:

ئایا لایەكی ئەو بەرگەت بەس نەبوو، وە زیادەی ئەو پارەیەی كەبەو قوماشە زیادەیەت دابوو، لە شوێنێكت دابنایە كە یارمەتی موسڵمانێكت پێ بدایە؟

پاشان فەرمووی: ئەوەندە ماڵ و دارایتان خەرج بكەن كە پێویست بێت بۆ بەردەوامی ژیانتان... وە زیادەكەی لەشوێنی شایستەی دا دابنێن، خۆتان دڵشاد بكەن و، سوودمەند بن... (ئەحنەف) ئەوجا شەرم دایگرت و سەری نەوی كرد و، هیچ شتێكی نەووت.

(ئەمیری بڕواداران) مۆڵەتی دا بە پیاوەكان بەگەڕانەوە بۆ (بەصرە)، بەڵام مۆڵەتی نەدا بە (ئەحنەف) بەگەڕانەوە لەگەڵیان دا، بەڵكو یەك ساڵ لای خۆی هێشتی یەوە.

(عومەر) ڕەزای خوای لەسەر بێ بەسەرنجە دانایییەكەی لەوە تێگەیشت كە ئەم (لاوە تەمیمییە) چەندی تیایە لە زیرەكی یەكی بێ سنوور و... جوان دەربڕین و... ئاخ بەرزی و... هیمەت بڵندی و... بەتوانایی لەهەموو ڕوویەكەوە...

بۆیە وویستی كەلە نزیك خۆیەوە بیهێڵێتەوە، تارێنمایی و پەروەردەی بكات. وە بەخزمەتی گەورە هاوڕێیان بگات، تا شوێن پێیان هەڵبگرێت و، لەڕێنماییەكانیان سوودمەند ببێت... ولەسەر دەستی ئەوان دا بەتەواوی شارەزای دینی خودا ببێت...

لەپاش ئەوەش دەیوویست كەلە نزیكەوە تاقیبكاتەوە، وە بچێتە ناخی یەوە، پێش ئەوەی كە هەندێ كاروباری موسڵمانان بخاتە ئەستۆی.

لەبەر ئەوەی (عومەر) ڕەزای خوای لەسەر بێ زۆر لەو زیرەك و قسەرەوانانە دەترسا. لەبەر ئەوەی ئەو جۆرە كەسانە چاك و خوداناس بن، هەموو دونیا پڕدەكەن لەخێر و بێرو خۆشبەختی... خۆنەگەر خوانەخواستە خراپ و دوور لەخودا بن، ئەوە زیرەكی و قسەڕەوانیان دەبێتە بەلا و نەهامەت بەسەر خەڵكی یەوە.

جاكاتێك ساڵەكە تەواو بوو، (عومەر) ڕەزای خوای لەسەر بێ فەرمووی بە (ئەحنەف): ئەی (ئەحنەف) بەراستی من تۆم تاقیكردەوە و، هەڵسەنگاندی جگە لەچاكە هیچی دیم لێ نەدیت.

وە بەڕاستی ئەوەت کە ئاشکرایە، وەبە دەرەوەیە هەمووی چاکە، ئومێدم وایە بەوویستی خودا نهێنی و نادیارەکانیشت وەك ئاشکراودیارەکانت وابێت. پاشان ڕەوانەی کرد بۆجەنگی (فارسەکان)، وە نامەیەکی نووسی بۆ فەرماندەکانی (ئەبو موسای ئەشعەری): تیایدا فەرمووبووی، لە (ئەحنەف کوڕی قەیس) نزیك بەوەوە راوێژی پێبکە و، گوێی لێ رابگرەوە، گوێبیستی رایەکانی بە.

(ئەحنەف) چووە ژێر ئالآی جەنگاوەرانی ئیسلامەوە، بۆ جیهاد کردن لە رۆژهەلآت و رۆژئاوای وولآتی (فارس)دا. وە ناوازەترین و نموونە ترین هەڵوێستی پاڵەوانانەی نواند، کەوای لێکرد، تیری بڵند بێت و، ئەستێرەی درەوشاوە بێت.

وە ئەو هۆزەکەی (بەنو تەمیم)، لە کوشتارکردنی دوژمندا، باشترین هێزیان پیشاندا و، زۆرترین گیان و خوێنیان بەخشی. تا خودای بالآدەست لەسەر دەستی ئەواندا، شاری (توستەرە) کە رووناك بەخشی تاجی کوسرەوییەکان بوو، فەتح کرد و، (هورموزانیش) بەدیلی کەوتە دەستیان.

(هورموزان) لەبەهێزترین فەرماندەکانی (فارس) بوو لەئازایەتی و، دەست وەشاندن دا، لەبەهێزترین ئەمیرەکانی بوو لە لووت بەرزی دا، وە لەهەمووانیان زیاتر خاوەن هەڵوێستی نەپساو بوو، وە لە هەمووان زیاتر شارەزای فرتوفێڵی جەنگەکان بوو.

بێ گومان سەرکەوتنە یەك لەدوای یەکەکانی موسڵمانان (هورموزان)ی ناچار کردبوو، کە زیاتر لەجارێك ئاشتەواوی و رێکەوتن لەگەڵ موسڵمانان بکات، بەلآم هەرکە فرسەتێکی بۆ رێدەکەوت وە وای دەزانی کە سەرکەوتن بەدەست دەهێنێ، رێکەوتنەکەی هەڵوەشاندەوەو هێرشی دەکردەوە سەر موسڵمانان. کاتێك کەلە (توستەرە) دەوریان گرت، لەیەکێك لەقەلآکانی دا کە زۆر یاخی بوو، خۆی قایم کرد و پێی ووتن:

دڵنیابن (صەد) تیرم لایە. جا سوێند بەخودا مادام یەك تیرم پێ بمێنێ ئێوە دەستان ناگاتە من، وە خۆشتان باش دەزانن کە من تیر هاوێژێکم، تیرم بەهەڵە ناچێ... جا هەوڵی بەدیل گرتنم دڵنیابن بێ سوودە، پاش ئەوەی کە بینیتان (صەد) کەسم لێ پێکاون لە نێوان کوژراو بریندار دا.

ئەوانیش ووتیان: ئەی چیت دەوێت؟

ئەویش ووتی: ئەمەوێت کە دابەزم بەمەرجێك ئامادەی بەردەمی خەلیفەکەتان (عومەر) ڕەزای خوای لەسەر بێ بکرێم، ئەوجا رازیم بەوەی ئەو چی دەوێت لەگەڵم بیکات.

ئەوانیش ووتیان: رازین بەوە بۆت. ئەوجا ئیتر کەوانەکەی فڕێدایە سەرزەوی و، لەقەڵاکە دابەزی و خۆی رادەستی ئەوان کرد، ئەوانیش باڵبەستیان کردو، لەگەڵ کۆمەڵێك لەپاڵەوانان ڕەوانەی شاری (مەدینە)یان کرد.

بەسەرکردایەتی (ئەنەسی کوڕی مالیك) خزمەتکاری (پێغەمبەری خودا) دروودی خودای لەسەر بێ (ئەحنەفی کوڕی قەیس) قوتابی قوتابخانەی (عومەری). لەوەفدەکە (هورموزانەوە) ڕێیان بەرێ کرد بەرەو شاری (مەدینە)، تا مزگێنی گرتن و فەتحی (توستەر) بە (ئەمیری بڕواداران) رابگەیەنن. وە پێنج یەکی (خُمس) دەستکەوتەکان بگەیەننە ماڵی دارایی موسڵمانان و (بَیْتُ المالِ المُسْلمین)، پەیمان شکێنی پەیمانەکان و ناپاکترین ئەهلی (ذِمّة) رادەستی (خەلیفەی موسڵمانان) بکەن، تا بڕیاری خۆی لەسەری بدات. کاتێك کە گەیشتنە دەوروبەر و دەروازەی شار، (هورموزان)یان ئامادەکرد، تا بە شێوەی خۆی لەبەردەمی موسڵماناندا بینوێنن..

ئەوجا ئەو بەرگەیان لەبەر کرد کە لەحەریری سروشتی دروست کرابوو، وە بەتاڵی زێر رازابووەوە. وە ئەو تاجەیان لەسەرنا کەبە (درو جەوهەر)ی رازابووەوە و چنرابوو. وە داردەستەکەیان دا بەدەستیەوە کەلە (ئیبریس) دروست کرابوو، وە بە (یاقوت) رازابوو بووەوە. جا هەر ئەوەندەی کە چوونە ناو شاری (مەدینە) کاتێك زانرا خەڵکی بە لاو و پیرەوە کۆبوونەوە... وە دەیانڕوانیە دیلەکەیان و، سەریان سووڕدەما، چۆن سەرسووڕمانێك، لەشێوەو جل وبەرگەکەی.

وەفدەکە بە (هورموزان)ەوە ڕوویان کردە ماڵی (عومەر) ڕەزای خوای لەسەر بێ، بەڵام لەوێ نەبوو، جا پرسیاریان دەربارەی کرد... پێیان ووترا:

کە ڕۆشتووە بۆ مزگەوت بۆ پێشوازی کردنی وەفدێك کە هاتوونەتە خزمەتی. ئەوجا ئەوانیش رۆشتن بۆ مزگەوت، بەڵام لەوێش نەیان بینی، لە کاتی گەڕانیان بەدوای (خەلیفە)دا، تادەهات بەردەوام خەڵکی زیاتر لێیان کۆدەبوونەوە و، قەرەباڵغی لەسەریان زیاترو زیاتر دەبوو... ئەوان کە لەو دڵەڕاوکییەیان دا بوون، لە گەڕانیان بەدوای (خەلیفە)دا، هەندێك منداڵیان بینی کەیاریان دەکرد، ، پێیان ووتن:

ج خێرتانە لە هەوڵی چی دان؟!... دەتان بینین دێن و دەچن، لەوە دەچێت (ئەمیری بڕواداران)تان مەبەست بێت. ئەوانیش ووتیان: بەڵێ بەدووی ئەودا دەگەڕێین.

ئەوانیش ووتیان: لەڕاستی دا ئەو لەلای ڕاستی مزگەوتەوە نووستوەو، ریداکەی[1] کردۆتە سەرینی. (عومەر) ڕەزای خوای لەسەر بێ چووبوو بۆ چاو پێکەوتنی وەفدێك لەلایەن خەڵکی (کوفە)وە هاتبوون، جا بەو هۆیە (ریدا) (بورنوس)ی لەبەر کردبوو، کاتێك کە وەفدەکە ڕۆشتن، ریداکەی (بُرنُس) داکەند و نایە ژێر سەری و، سەری لەسەر داناو چاوی چووە خەو.

ئەوجا وەفدەکە بە (هورموزان)ەوە ڕوویان کردە لای ڕاستی مزگەوت، جا کاتێك کە بینیان وە (خەلیفە) نوستووە لە نزیکیەوە دانیشتن... وە دیلەکەشیان لەگەڵ خۆیان دانا...

(هورموزان)هیچ شتێك لەزمانی عەرەبی حاڵی نەدەبوو. وە هەرگیز ئەوە بەبیریدا نەدەهات کە ئەوەی نووستووە لەلای مزگەوتەکەدا ئەمیری بڕواداران (عومەری کوڕی خەتتاب) بێت. بەڵێ لە ڕاستی دا ئەو ئەوەی بیستبوو دەربارەی (عومەر) ڕەزای خوای لەسەر بێ، کە تا چەندێ لەتەنگەژەی ژیان دایەو، دونیا نەوویستە و، بێ باکە لە نازو نیعمەت و جوانیەکانی دونیا.

بەڵام هەرگیز ئەوەی بەخەیاڵدا نەدەهات کە بەزێنەری (ڕۆم) و تێکشکێنەری (کیسراکان) لەلایەکی مزگەوتەوە بنوێت بە بێ داپۆشەرو... سەرین و... پاسەوان و.... دەرگاوان ... جا کاتێك کە (هورموزان) سەرنجی ئەو کۆمەڵەی دا کە بێدەنگ

[1](رداء): بەسەر دیزداشەدا لەبەر دەکرێت یەخەی کراوەیە وەك جبە.

دانیشتوون، وا بەبیری داهات کە ئامادەباشی دەکەن بۆ نوێژ و، چاوەڕێی هاتنی (خەلیفە) دەکەن.

بەلاّم (ئەحنەفی کوڕی قەیس) ئاماژەی بەخەڵکەکە دەدا کە قسە نەکەن و واز لە دەنگەدەنگ بهێنن بۆ ئەوەی (خەلیفە) خەبەر نەکەنەوە. و بەڕاستی زانراوە لە هاوڕێیەتی یەوەی کەم ڕووی داوە لەشەودا (عومەر) ڕەزای خوای لەسەر بێ چاوەکانی چووبێتە خەو.

جا یان لەمیحرابەکەی دا شەوی زیندوو کردۆتەوە خەریکی خوداپەرستی بووە... وەیان بەرگی گۆڕیوەو، لە گەڕەکەکانی (مەدینە)دا هاتووچۆی کردووە تا ئاگاداری کاروباری خەڵکەکە بێت... وەیان پاسەوانی ماڵی موسڵمانانی کردووە، تا پارێزراو بن لە چەتە و تالاّنچیان.

جا ئاماژەکانی (ئەحنەف) کاری کردە سەر سەنجی (هورموزان)، بۆیە لایکرد بەلای (موغیرەی کوڕی شوعبە)[1] وە کە فارسی دەزانی و ووتی:

ئەو نوستووە کێ یە؟!.

(موغیرە)ش پێ ی ووت:

ئەوە ئەمیری بڕواداران (عومەری کوڕی خەتتاب)ە... (هورموزان) لەسەر سوڕماندا دەمی کرایەوەو ووتی: (عومەر)؟!! ئەی پاسەوان و دەرگاوانەکەی لەکوێ یە؟!!.

(موغیرە) پێ ی ووت: نەپاسەوان و نەدەرگاوانی نیە.

جا (هورموزان) ووتی: ئەبێت ئەو پێغەمبەر بێت.

(موغیرە)ش ووتی: بەڵێ کرداری پێغەمبەران ئەنجام دەدات، بەلاّم بێ گومان لەدوای (موحەمەد) دروودی خوای لەسەر بێ، پێغەمبەری دی نی یە...

---

[1] المُغيرة بن الشُعْبة):ساڵی ٥٠ی کۆچی وەفاتی کردووە، هاوڕێیەکی سەقەنی بوو، لە ناوازەکانی عەرەب و والیەکانیان، (عومەر)ڕەزای خوای لەسەر بێ کردیە والی (کوفە) و (بەصرە)ە، (عوسمان) ڕەزای خوای لەسەر بێ لایبرد، ئینجا لەدوای ئەوە (موعاویە) کردیەوە بە والی (بەصرە)ە وە هەر لەوێ وەفاتی کرد.

پاشان خەڵکی زیاتر و زیاتر بوون و، دەنگ و هەڕاو هوریا بڵند بوو. بەهۆی ئەوەوە (عومەر) ڕەزای خوای لەسەر بێ بەخەبەر هات، وە بە پێوە راوستاو، بەسەر سووڕمانەوە بۆ خەڵکەکەی ڕوانی...

جا (ئەمیرە فارسیەکە)ی بینی، کە تاجەکەی لەسەر سەریەوە، لەژێر تیشکی خۆردا دەدرەوشایەوە... وە ئەو داردەستەی بەدەستەوە بوو، کەبریسکەی ئاوی چاوی دەبرد، ئەوجا چاوی تێبری و فەرمووی: (هورموزان)ە؟

(ئەحنەف) پێ ی ووت: بەڵێ ئەی (ئەمیری بڕواداران).

ئەوجا (عومەر) ڕەزای خوای لەسەر بێ سەرنجی ئەو زێر و، لوئلوئو، یاقوت و، حەریرەی دا کە پێوەیەتی. پاشان ڕووی لێوەرگێڕاو فەرمووی:

پەنا دەگرم لەخودا لە ئاگر... وە پەنای پێ دەبەم لەسەر دونیا... سوپاس و ستایش بۆئەو خودایەی ئەوە و وە هۆزەکەی ملکەچ کرد بۆ ئیسلام.

پاشان فەرمووی:

ئەی کۆمەڵی موسڵمانان دەست بەم ئاینەوە بگرن... وە شوێن ڕێنومایەکانی (پێغەمبەرە بەرزو پایەدارەکەتان) بکەون... وە ئاگاداربن دونیا لەخشتەتان نەبات چونکە بەڕاستی دونیا هەڵخەڵەتێنەرە...

جا کاتێك لە ووتە پیرۆزەکانی دەست کۆتابوو، (ئەحنەف کوڕی قەیس) مژدەی سەرکەوتن و فەتحی پێ ڕاگەیاند... وە ئاگاداری کرد لەو هەموو دەستکەوتانەی کە خودای بالادەست بەخشیە موسڵمانان. ئەوجا پێ ی ووت:

ئەی (ئەمیری بڕواداران) بەراستی (هورموزان) بووە دیل لەلای ئێمە، وە داوایکرد ئامادەی بەردەمی جەنابت بکرێت، وەڕازیە بەبڕیاری جەنابت، جا فەرموو ئەگەر دەتەوێت قسەی لەگەڵ بکە.

ئەویش فەرمووی: گفتوگۆی لەگەڵ ناکەم هەتا ئەو زێرو زیوو جوانی یە دونیاییەی لەبەر دانەکەنن. ئەوجا زێرو زیوو تاجەکەی لێ وەلانا، وە داردەستەکەیان لەدەست وەرگرت، وە بەرگێکی زبر و چرچیان لەبەرکرد، ئەوەندەی لەشی داپۆشی. ئالەو کاتەدا (عومەر) ڕەزای خوای لەسەر بێ لایکرد بەلایەوەو ووتی:

ئێ ئەی (هورموزان) سەرئەنجامی پەیمانشکێنی خۆت و فەرمانی خودا چۆن دەبینی، وە چۆنی لێکدەدەیتەوە؟. (هورموزان) سەری نەوی کرد و پاشان بەوپەڕی ملکەچی یەوە ووتی:

ئەی (عومەر)، بەراستی لە رۆژگاری نەفامی دا ئێمەش و ئێوەش، خودامان لەگەڵ نەبوو، لەبەر ئەوە ئێمە زاڵبووین بەسەتانا...

جا کاتێك کە ئێوە موسڵمان بوون، خودا بوویە یارتان، لەبەر ئەوە ئەمڕۆ ئێوە زاڵبوون بەسەر ئێمەدا... (عومەریش) رەزای خوای لەسەر بێ پێی ووت: بەڕاستی بەهۆی ئەوەوە کەتۆ باست کرد زاڵبوون بەسەر ئێمەدا، وە شتێکی دیکەش کەئەویش یەکڕیزی ئێوەو ناکۆکی ئێمەبوو... پاشان بەتوندی سەرنجی داو ووتی:

ئەی پۆزشت چی یە ئەی (هورموزان) بۆ شکاندنی پەیمانەکان و ناپاکیەکانت یەك لەدوای یەك؟!. ئەویش ووتی: ئەترسم کە بمکوژیت.

(عومەر) رەزای خوای لەسەر بێ فەرمووی: مەترسیت لەسەر نیە تائاگادارم دەکەیت . کاتێك (هورموزان) گوێبیستی ئەوە بوو لە (عومەر) رەزای خوای لەسەر بێ ترس و بیمی هەندێك ڕەوی و ووتی: بەراستی من تینووم، (عومەر) فەرمانی دا کە ئاوی بدەنێ...

جا ئاویان لە قاپێکی قیزەوندا بۆ هێنا، ئەویش سەرنجی داو ووتی: ئەگەر لە تینوا مردووم ناتوانم، کەلەو جۆرە قاپەدا ئاو بخۆمەوە.

(عومەر) رەزای خوای لەسەر بێ فەرمانی فەرموو کە ئاوی لەقاپێك دا بۆ بهێنن کە پێی رازییە... جا کاتێك (هورموزان) ئاوەکەی وەرگرت، دەستیکرد بەلەرزین..

(عومەر) رەزای خوای لەسەر بێ پێی ووت: چی تە؟.

ئەویش ووتی: بەراستی من دەترسم کە بکوژرێم لە کاتێکدا کە ئەو قومە ئاوە بخۆمەوە... (عومەر) رەزای خوای لەسەر بێ پێی ووت: مەترسە تادەیخۆیتەوە تەواوی دەکەیت. (هورموزان) کە گوێبیستی ئەوە بوو لە (عومەر) رەزای خوای لەسەر بێ قاپەکەی لەدەستی خستە خوارەوە و، ئاوەکەی رژاند.

(عومەر) ڕەزای خوای لەسەر بێ فەرمووی: ئاویتری بۆ ئامادەبکەن، وە کوشتن و تینوویەتی بۆ کۆمەکەنەوە. جا (هورموزان) ووتی: پێویستم بەئاو نی یە...بەڵکو ئەوە کە وویستم بوو، ئەوە بوو کە بەهۆی ئەوەوە خۆم پەنابدەم لە کوشتن.

جا (عومەر) ڕەزای خوای لەسەر بێ فەرمووی: بەراستی من بکوژتم، واتە دەتکوژم.

(هورموزان) ووتی: لەراستیدا پەنات داوم.

(عومەر) ڕەزای خوای لەسەر بێ فەرمووی: درۆت کرد.

(ئەنەسی کوڕی مالیك) ووتی: راستی ووت ئەی (ئەمیری بڕواداران) پەنات داوە.

(عومەر) ڕەزای خوای لەسەر بێ فەرمووی:

ئەی هاوار چی دەڵێیت ئەی ئەنەس، ئایا من پەنای بکوژی براکەت (بەرائی کوڕی مالیك) و (مەجزەئەی کوڕی شەور) دەدەم؟!... ئەوە زۆر دوورە...

جا (ئەنەس) ووتی: لەڕاستیدا تۆپێت ووت: مەترسە هیچت لێناکرێ تا ئاگادارام نەکەیت، وە هەروەها پێت ووت: هیچ مەترسی یەکت لەسەر نی یە تا ئاو دەخۆیتەوە.

(ئەحنەف)یش ووتەکەی (ئەنەسی) پشت ڕاستکردەوە، وە ئامادەبووان هەموو دانیانننا بەوەدا کە (ئەمیری بڕواداران) لەراستیدا پەنای (هورموزان)ی داوە.

ئەوجا (عومەر) بەتووڕەییەوە ڕوانی بۆ (هورموزان)و ووتی: بەراستی هەڵتخەڵەتاندم، چونکە بەپێچەوانەی ئەوەی کەلە ناختابوو خۆت پیشانی من دا، وەمنیش _سوێند بەخودا_ جگە بۆ موسڵمان بۆکەس دیکە هەڵناخەڵەتێم.

(هورموزان) گوێبیستی ئەوە بوو موسڵمان بوو، وە (عومەر) ڕەزای خوای لەسەر بێ (دووهەزار) درهەمی بۆ دابین کرد.

* * *

وە بەڕاستی زۆری هەڵوەشاندنەوە و تێکشاندنی پەیمانەکان لەلایەن (فارسەکان)ەوە لەگەڵ موسڵمانان داو هەڵگەڕانەوە لێیان، بیرو هۆشی (عومەر) ڕەزای خوای لەسەر بێ داگیردبوو، وە تووشی دڵەڕاوکێی کردبوو. جا بۆیە پیاوانی ئەو وەفدەی کەلە گەڵ (هورموزان) هاتبوون، کۆیکردنەوە و پێی وتن:

ئایا موسڵمانان ئەزیەت و ئازاری (خەڵکی زیممە) دەدەن و، هەڵس و کەوتی خراپەیان لەگەڵ دەکەن و، پەیمانشکێنیان لەگەڵ ئەنجام دەدەن؟

پیاوانی وەفدەکە ووتیان: سوێند بەخودا ئەی (ئەمیری بڕواداران) نازانین و ئاگادارنین کە هیچ کەسێك هەڵس و کەوتی خراپی ئەنجام دابێ لەگەڵیان. وەیان پەیمانی لەگەڵیان شکاندبێت.... وە یان لەپەیمانێکدا ناپاکی لەگەڵیان دا کردبێت...

ئەوجا (عومەر) رەزای خوای لەسەر بێ فەرموی: دەی کەوابوو چی وای لەوان کردووە هەرکاتێك فرسەتێکیان بۆ بڕەخسێت، لەرووتانا هەڵدەگەڕێنەوەو ، پەلامارتان دەدەن، لەگەڵ بوونی پەیمانی مۆرکراوی زۆر و زەوەندە لە نێوان ئێوەو ئەوان دا؟.

(وەفدەکە) بە ووتەیەك وەڵامی دایەوە، کە (عومەر) رەزای خوای لەسەر بێ قەناعەتی پێی نەبوو، وە پێی رازی نەبوو.

ئالەو کاتەدا (ئەحنەف کوڕی قەیس) هەستایە سەر پێ و ووتی: ئەی (ئەمیری بڕواداران) من لەو بارەوە ئاگادارت دەکەم.

(عومەر)یش رەزای خوای لەسەر بێ فەرمووی: دەی ئەوەی لەلاتە دەریبڕە. ئەویش ووتی: لەراستیدا ئەی (ئەمیری بڕواداران) تۆ قەدەغەتکردین لەوەی کە پەلهاوێژی بکەین لە وڵاتی (فورس)دا. وە فەرمانت پێداوین کەدەست کۆتابین لەسەر ئەو سەرزەمین و شارانەیان کەلە ژێر دەستمان دایە و، پەلاماریدیکە نەدەین.

وە (فارس)یش مادام تا ئێستا پادشایەکی زیندوویان هەیە، وە سەرزەمین و داراییان هەیە... بەراستی جار لەدوای جار جەنگمان لەگەڵ دەکەن، بۆ دەست بەسەراگرتنەوەو، گەڕانەوەی ئەوەی کەلەسەرزەمین و شارەکانیان لەژێردەستی ئێمەدایە.

وە بێ گومان هەرکاتێك کە فەرماندەیەکیان فرسەتێکی سەرکەوتنی لێوە دەردەکەوێت، بانگەواز رادەگەیەنێ بۆ جەنگ لەگەڵ ئێمەدا، کۆمەڵێك لەوانەی کە پەیمانی لەگەڵ ئێمەدا هەیە، دەچنە پاڵیان بە ئومێدی سەرکەوتن. وە دڵنیابە _ئەی

(ئەمیری بڕواداران)_ ناگونجێ دوو پادشا لەیەك سەرزەمین دا کۆببنەوە و بەیەکەوەبن.

جالەبەر ئەوە پێویستە یەکێکیان ئەویدیکەیان وەدەرنێ. تاکۆتایی بە پادشاکەیان و پادشانشینی یەکەیان بهێنێت، ئەوا ئیتر ئومێدیان دەبچڕێ و، جموجوڵیان نامێنێ و، کاروبار بۆخۆمان سەقامگیر دەبێت.

(عومەر) رەزای خوای لەسەر بێ کەگوێبیستی ئەوە بوو چرکەساتێك سەری نەوەی کردو پاشان ووتی: بەراستی (ئەحنەف) راستی پێ ووتم رەوان تێی گەیاندم، وە ئەوە نادیار بوو لێم دەربارەی ئەو گەلە خستی یە روو بۆم. وە بەراستی بۆ ئەو هەڵویستەی (ئەحنەف) پاشکۆ هەیە ... جا ئەوە بوو لە ئەنجام و کاریگەری ئەورایەدا، رێرەوی مێژوو گۆرا...

خودایە خۆ یەکلاکردنەوەی (عومەر)مان رەزای خوای لەسەر بێ لەگەڵ خۆتا پێ ببەخشە، لەگەڵ خۆنەویستی (ئەحنەف)و داناییەکەیدا. (وەرگێر)

*   *   *

بۆزیاتر شارەزابوون لە ژیاننامەی (ئەحنەفی کوڕی قەیس) بڕوانە:


١- طبقات إبن سعد: ٩٣/٧
٢- طبقات خليفة بن خياط: ٤٢٣
٣- المعارف لأبن قتيبة: ٤٢٣
٤- أحبار أصْبهان: ٢٢٤/١
٥- تهذيب ابن عساكر: ١٠/٧
٦- البداية والنهاية: ٣٢٦/٨
٧- تأريخ الإسلام للذهبي: ١٢٤/٣
٨- اسدُ الغابة: ٥٥/١
٩- شذرات الذّهب: ٧٨/١

# ٢٩ )ئەبو حەنیفەی نوعمان

## بەشی یەكەم

( چەند تابلۆیەكی ناوازەو تیشك بەخش لە ژیانی )

(كەسم نەدیوە ژیرتر و، پایەدارتر و، پارێزگارتر بووبێت لە (ئەبی حەنیفە))

(یەزیدی كوڕی هارون)

(ئەبو حەنیفە) كەسێكی دەم روو جوان و، رووالەت گەش و خۆشی بەخش و، ژیرمەند و، گفت شیرین بوو. نەزۆر بالآبەرز و، نەزۆر كەرتە بالآ بوو كە سەرنج راكێش بێت. ئەو لەگەلْ ئەوەشدا كەسێكی جوان پۆش و، رووالەت گەش و، زۆر بۆنخۆش بوو، بەجۆرێك كە بهاتایەتە ناو خەلْكی، بەهۆی بۆنە خۆشیەكەیەوە دەیانزانی ئەوە پێش ئەوەی ببینن.

فەرموون ئێوەو (نوعمانی كوڕی سابیت كوڕی مەرزوبان) كە ناسراوە بە (ئەبی حەنیفە). یەكەم كەسێك بوو كە (فیقهی ئیسلامی) دەلْەمەندكرد و، زۆرێكی لەلایەنە ناوازەكان و باشەكانی خستۆتە ڕوو.

*			*			*

(ئەبو حەنیفە) بەشێكی لەژیانی لە كۆتایی سەردەمی (بەنی ئومەمەیە)و، بەشێكی دیكەشی لەسەردەمی (عەباس)دا بەسەر بردووە.

وەلە ساتە وەختێكدا ژیاوە كە (خەلیفە و والی یەكان)، بەوپەڕی دەستكراوەیی ماڵ و سامان و پارە و پولیان دەبەخشی یە خاوەن تواناكان (أصحاب المواهب)، بەشێوەیەك كەلە هەموو شوێن و لایەكەو پارەو و پوول دەڕژا بەسەریان دا، خۆشیان هەستیان پیێ نەدەكرد لەكوێوە و چۆن دێت.

بەڵام (ئەبا حەنەفیە) ناخی بەرزو پاك و زانستەكەی، لەوە بەرزتر رایانگرتبوو كە دەستی بۆ وەرگرتن لەوان پانبكاتەوە، بەڵكو سووربوو لەسەر ئەوەی كەتەنها و تەنها لەبەرهەمی دەستەكانی خۆی سوودمەند ببێت وبژێوی دابین بكات. وە دەستەكانی هەمیشە بالاّ بن...

(مەنسوور)[1] جارێكیان بانگهێشتی دەكات بۆ سەردانی، جا كاتێك گەشتەلای، زیاد لە پێویست بە گەورەی ڕاگرت و، ڕێزی لێگرت و، بەخێری هێناو، لەنزیك خۆیەوە دایناو، زۆرێك پرسیاری لێكرد دەربارەی كاروباری دین و دونیاوە.

جاكاتێك وویستی خواحافیزی بكات و بڕوات، (مەنسوور) لەگەڵ ئەوەدا كە ناسراو بوو بەدەست قونجاو، كیسەیەك كە (سیی هەزار درهەمی تێدابوو بەخشی یە (ئەبو حەنەفیە).

ئەویش فەرمووی بە (مەنصور):

ئەی (ئەمیری بڕواداران) بەڕاستی من پیاوێكی غەریبم لە (بەغداد)[2]دا... وە من شوێنێكی وەهام نی یە كە ئەو پارەوپوولەی تیابپارێزم، بەراستی ترسم لیێ ی هەیە كەلە دەست بچێت... جا جەنابت لوتف بفەرموو لە (ماڵی دارایی موسڵمانان)دا بۆم بپارێزە، تا پێوویستم پیێ ی دەبێت و داوای دەكەمەوە لێت.

(مەنصور) داواكەی پەسەندكرد..

لە دوای ئەوە ئیتر ژیانی (ئەبی حەنیفە) درێژەی نەكێشا. جا كاتێك وەفاتی كرد، لەماڵەكەیدا ئەوەندە (سپاردەی) خەڵكی لەماڵەكەی دا بوو، كە زۆر زیاتر بوو لەو

---

[1](منصور) یەكێك بوو لە (خەلیفەكانی عەبباس).

[2](البغداد): پایتەختی (عێراقە)و دەكەوێتە ناوەراستی یەوە.

ئەندازە پارەی کە لەلای (مەنصور) بوو، جا کاتێك (مەنصور) گوێبیستی ئەوەبوو ووتی:

خودا سۆز و بەزەیی خۆی بڕێژێ بەسەر (ئەبو حەنیفە)دا، بەراستی ئێمەی بە شێوەیەکی جوان لە خشتەبرد، وە نەیووست هیچ شتێك لە ئێمە وەربگرێت.

وە ئەوە جێگەی سەرسووڕمان نی یە، چونکە بەراستی (ئەبو حەنیفە) بڕوای تەواوی بەوە بوو، کە هیچ پاروویەك لەو پارووە خاوێنتر و بە بەهاتر نی یە کە مرۆڤ بیخوات و لەبەرهەمی دوو دەستی خۆی بێت. هەر لەبەر ئەوە بەشێك لەکاتی خۆی تەرخانکردبوو بۆ بازرگانی جا بازرگانی یەکەی تایبەتمەند بوو بەجل و بەرگ و قوماشی خوری و هەریرەوە، وە بازرگانی یەکەشی هێنان بردن بوو لەنێوان شارەکانی (عێراق)دا.

وە دووکانێکی بەناوبانگ و ناسراوی هەبوو، کە خەڵکی روویان تێدەکرد، لەبەر ئەوەی لەویْ راستی و راستگۆییان لە کڕین و فرۆشتندا بەدیدەکرد، هەروەها دەست پاکی لەوەرگرتن و بەخشیندا...

وەگومان لەوەشدا نی یە کەئەوان لەسەروو ئەوەشەوە لەو دووکانەدا، ئەوەی کە ئارەزوومەندی بوون وە حەزیان لیْ ی بوو، دەستیان دەکەوت.

وە بیْ گومان بازرگانیەکەی خودا بەرەکەتی تیْ خستبوو، وە ماڵ و سامانێکی زۆری بەوویستی خودا لێی دەستدەکەوت. وە ئەو لەرێگای ڕەواوە (طریق الحلال) ماڵ و سامانی دەست دەخست و لە شوێنی رەوادا دایدەنا و خەرجی دەکرد.

لەراستیدا ئەوەی کە لێوە زانراوە، ئەوەبوو، هەر کە ساڵ بەسەر بازرگانیەکەی دا هاتۆتەوە، قازانجی بازرگانی یەکەی ژمارە کردووەو، ئەوەندەی کەپێویست بوو بێت بۆ بژێوی خۆی وماڵ و منداڵی لێی وەلا دەخست، پاشان بەماوەکەی پێوویستی قورئان خوێنان و، ووتەوانان و، زانایانی شەریعەت و، قوتابیانی زانستی، لە خۆراك و جل وبەرگیانی پێدابین دەکرد بۆیان...

وە بۆ هەریەکەیان ئەندازەیەك لەپارەی دەستنیشان دەکردو، پێی دەدان و دەیفەرموو:

ئەوە قازانجی شتوومەکەکەتانە لەسەر دەستی من دا بۆی بەئەنجام گەیاندوون... وە سوێند بەخودا هیچ شتێکم لە سامانی تایبەتی خۆم پێنەداون. بەڵکو بەدڵنیاییەوە ئەوە فەزڵی خودایە بەهۆی ئێوەوە بەسەرمنەوە. جا لەرۆژی خودادا لەلای خۆی گورانکاری بۆ هیچ کەس نی یە.

* * *

وە دەنگۆی بەخشندەی و لێبودەیی (ئەبی حەنیفە) رۆژهەلاَت و رۆژئاوای گرتەوە، بەتایبەتی لەگەڵ هادەم و هاورێیانی دا. لەنموونەی ئەوە رۆژێکیان یەکێك لە هاودەمانی هات بۆ دووکانەکەی و ووتی:

بەراستی من پێویستم بە بەرگێکی حەریر هەیە ئەی (ئەبا حەنیفە). (ئەبو حەنیفە)ش پێی ووت: چ رەنگێك؟. ئەویش ووتی: ئاواو ئاوا.

(ئەبو حەنیفە)ش ووتی: دانبەخۆتا بگرە وبخایەنە تا دەیبیمەوە بۆت. جا هەفتەی بەسەردا تیَ نەپەری، کە بەرگی داواکراوی بۆی بینیەوە. جا کاتێك کە هاورێکەی بەلایدا تیَ پەری، (ئەبو حەنیفە) پێی ووت: فەرموو داواکەتم دیەوە... ئەوجا بەرگەکەی بۆ دەرگرتَ، ئەویش سەرنجی داو بەدڵی بوو، وە ووتی:

نرخەکەی چەندە تا بیدەمە کارمەندەکەت؟.

ئەویش ووتی: درهەمێك[1].

پیاوەکەش بەسەرسوورمانەوە ووتی: تەنها یەك درهەم؟!.

(ئەبو حەنیفە)ش ووتی: بەڵیَ.

پیاوەکەش پێی ووت: ئەی (ئەبا حەنیفە) من گومانم بەتۆ نەدەبرد کە گاڵتەم پیَ بکەیت.

(ئەبو حەنیفە)ش ووتی: دڵنیابە گاڵتەم پیَ نەکردویت... بەڵکو ئەوەیە کە ئەو بەرگەم لەگەڵ یەکێکی دی دا بە (بیست) دیناری زێر و، درهەمێکی زیوو کریوە...وە یەکێکیانم فرۆشتۆتەوە بە (بیست) دیناری ئاڵتون و، ئەوەشیان بەیەك درهەم ماوەتەوە لەسەرم. وە منیش پێم خۆشە نی یە کە قازانج لەهاودەمەکەم وەربگرم.

---

[1] درهەم: لە زیووبوو، دیناریش لەزێر.

وە هەر لەو نموونانە، پیرەژنێك هاتە خزمەتی داوای بەرگێكی حەریری لێكرد... ئەویش بەرگە داواكراوەكەی بۆ دەركرد و دایەدەستی، پیرەژنەكەش پێی ووت:

بێگومان من ئافرەتێكی بەسالآچووم... وە هیچ ئاگاداریەكەم دەربارەی نرخەكان نی یە... جا ئەویش سپاردەیە لە ئەستۆی تۆ دا...ئەو بەرگەم بەو نرخە پێ بفرۆشە كە وەك مایە لەسەرتە، لەگەڵ كەمێك قازانج، چونكە من كەسێكی لاواز و بێ دەسەلآتم.

(ئەبو حەنیفە)ش پێی ووت: بێگومان من ئەو بەرگەم لەگەڵ یەكێكی دی دا بەیەكەوە كڕیوە، پاشان یەكەمیانم فرۆشتۆتەوە بەسەرمایەكەیان جگە لە چوار درهەم، كە لەسەر ئەم یەكەیان ماوەتەوە، جاتۆش فەرموو، ئەوە بەچوار درهەمەكە ببەو، قازانجم لەتۆ ناوێت.

*                    *                    *

رۆژێكیان (ئەبو حەنیفە) یەكێك لەهاودەمانی بینی بەرگێكی شڕو ووڕی لەبەردابوو، جا كاتێك كە خەڵكەكە رۆشتن وە كەس لە كۆڕەكەدا نەما جگە لەخۆی و ئەو پیاوە پێی ووت:

ئەو بەرماڵە بەرز بكەوە و ئەوەی لەژێری دا هەڵیبگرە. جا (ئەبو حەنیفە) پێی ووت: ئەو پارەیە هەڵبگرە و خۆتی پێ پۆشتە بكەوە.

پیاوەكەش ووتی: بەراستی دەوڵەمەندم، وە خودا بەهرەی بەسەرم دا ڕشتوە، وە پێویستم بەوە نی یە. (ئەبو حەنیفە)ش پێی ووت:

جا كەخودا بەهرەی بەسەردا ڕشتوویت، ئەی كوا هێماو رەنگدانەوەی بەهرەكانی؟!... ئایا ئەوەت پێ نەگەشتوە و گوێبیستی نەبوویت، كە (پێغەمبەری خودا) دروودی خوای لەسەر بێ دەفەرمووێت:

(بەڕاستی خودا بەوە خۆشنوو دەبێت كە هێماو رەنگدانەوەی ناز و نیعمەتەكانی بەدی بكات بەسەر بەندەكەیەوە)...

جا كەوابوو پێویستە ڕووالەتی خۆت جوان و باش بكەیت و، خۆت پۆشتە بكەیتەوە، تا هاوڕێكەت غەمبار نەكەیت.

دەست گوشادی و بەخشندەیی (ئەبو حەنیفە) و چاکەکاری و لاکردنەوەی لە خەڵکی، گەشتبوە ئاستێك، کە هەر کاتێك خەرجێکی بۆ ماڵ و منداڵی بکردایە، هەمان خەرجیشی دەکردە خێر و دەیبەخشی یە ئاتاجەکان. وە هەر کاتێك بەرگێکی تازەی بپۆشیایە، بەقەدەر نرخەکەی قوماشی پێ دەکڕی و هەژارانی پێ پۆشتە دەکردەوە، وە هەر کاتێك کە خواردەمەنیەك لەبەر دەستی دا دابنرایە، دووبەرابەری ئەوەی کە خۆی لێی دەخوارد، لێی جیادەکردەوە و دەیبەخشی یە هەژاران.

* * *

وە لەوەی لێی گێڕاوەتەوە، ئەوەیە کە پەیمانی داوە کەلە کاتی گفتوگۆدا سوێند بەخودا نەخوات، خۆ ئەگەر خواردی، یەك درهەمی زیو بکاتە سەدەقەو بیبەخشێت.

پاشان لەو بارەوە زیاتر هەنگاوی ناو، پەیمانی داو لەسەرخۆی پێویستی کرد کە ئەگەر سوێندی بەخودا خوارد دینارێك لەزێڕ ببەخشێت... تاوای لێهات ئەگەر ڕاستیشی سوێندی بخواردایە، یەك دیناری لەزێڕ دەبەخشی.

* * *

(حفصی کوڕی الرحمن) شەریکی (ئەبی حەنیفە) بوو لەهەندێ کاروباری بازرگانیە کەیدا. جا (ئەبو حەنیفە) بەکۆ (جوملە) جل و بەرگی و قوماشی حەریری بۆ دەنارد تا ڕەوانەی هەندێ لەشارەکانی(عێراق)ی بکات.

جارێکیان کەلەوپەلێکی زۆری بۆ ڕەوانەکرد، وە ئاگاداری دایە کەلە فلأن بەرگ دا ناتەواوی هەیە، واتە(عەیبی) تیایە. جا پێی ووت:

ئەگەر ویستت بیفرۆشیت، ئەو ناتەواویە بۆ کڕیارەکە دەستنیشان بکە، تاکڕیارەکە لێی بەئاگابێت... (حەفص) هەموو کەل وپەلەکەی فرۆشت و، ئەوەی لەبیرچوو کە کڕیارەکان لەو ناتەواویە ئاگادار بکات، کە لەو جل و بەرگەدا هەبوو کە (ئەبو حەنیفە) بۆی دیاری کردبوو.

جا زۆر هەوڵی دا کە ئەو کڕیارانە بێنێتەوە یادی خۆی، کە ئەو جل وبەرگانەی پێفرۆشتبوون، کە ناتەواویەکان تێدا بوون، بەلأم سەرکەوتوو نەبوو، وەنەیزانی کێن...

جا کاتێك (ئەبو حەنیفە) بەوەی زانی، وەنەیتوانی ئەوانە بدۆزێتەوە کەزەرەرمەندبوون، خولیا کەوتەسەری و، دڵ ودەروونی ئارام نەبوو، تا هەموو نرخەکەی بەمایەوە و قازانجەوە کردە سەدەقە و بەخشی بە هەژاران.

(ئەبو حەنیفە) لەسەر هەموو ئەوانەوە، کەسێکی رووخۆش و دەم بەزەردەخەنە و ئێسك سووك بوو، هاو دەمی یەتی زۆر شیرین بوون... وە هەرگیز ئەوانەی نەدە بوغزان و زەمی نەدەکردن کەلێی نادیار بوون ئەگەر نەیاریشی بووبێتن.

یەکێك لە هاورێیانی دووا و ووتی:

گوێبیستی (عەبدوڵڵای کوڕی موبارەك)[1] بووم دیفەرموو بە (سوفیان سەووری)[2]:

ئەی (ئەبا عبد الله) (ئەبا حەنیفە) چەندە دووره پەرێزه لەزەمکردنەوە (غەیبەت)... جا بەڕاستی من هەرگیز گوێبیستی نەبووم کە لەپاشملە باسی کەسێکی کردبیّ کەنەیاریش بووبێت.

جا (سوفیان) پێی ووت:

بەڕاستی (ئەبا حەنیفە) لەوە ژیرترە کە شتێك بسەپێنی بەسەر چاکەکانی دا کەلە ناوی بەرێت.

(ئەبو حەنیفە) هەمیشە هەوڵدەری ئەوە بوو، دۆستایەتی خەڵك بەدەست بهێنیّ، وە سووربووە لەسەر بەردەوامی دۆستایەتیان...

جا ئەوەی کە لێوەی زانراوە، ئەوەیە جاری وا هەبووە کەسێك، بەرێکەوت ئامادەی کۆڕی دانیشتنی بووە، بەبیّ هیچ مەبەستێك، یان هاودەمییەك...

جاکە هەستایە بڕۆشتایە، پرسیاری ریّ وشوێنی لیّ دەکرد، جا ئەوجا ئەگەر نەبوونی و ئاتاجی یەکی هەبووایە بۆی جیّ بەجیّ دەکرد. وەیان نەخۆش بکەوتایە سەردانی دەکرد...

---

[1](عبد الله بن مبارك)ك یەکێك بووە لەزانایانی موسڵمانان، وە لە شوێنکەوتووی شوێنکەوتووان بووە، بازرگانێکی ناوازە بوو، وە کۆششکارێکی ناسراو بوو.

[2](سفيان الثوري): یەکێك بوو لەزانایانی فەرموودە، وە لەساتەوەختی خۆی دا لەو زاناتر نەبووە بە (حەڵاڵ) و (حەرام).

وەیان پێویستی یەکی هەبووایە بۆی ڕادەپەڕاند... هەتا سەرنجی بەتەواوی ڕادەکێشا بەلای خۆی دا، بەشێوەیەك کە بەردەوام بوایە لە دۆستایەتیدا لەگەڵی دا...

* * *

وە (ئەبو حەنیفە) لە پێشەنگی هەموو ئەوانەوە و، لەسەروو هەموویەوە، زۆربەی ڕۆژ بەڕۆژوو بوو... وە بە خودا پەرستی زیندووکەرەوەی شەوان بوو... وە هاوڕێیەکی دەستەمۆی قورئان بوو... هەروەها لەداواکارنی لێخۆشبوونی بەرەبەیان بوو... وە لە هۆکارەکانی ڕۆچوونی لەخودا پەرستی دا، بەتایبەتی تر بە ڕۆژوو بوونی زۆربەی ڕۆژەکان و، زیندوو کەرەوەی شەوان...

لەراستی دا ئەوەبوو، کە ڕۆژێك رووبەری کۆمەڵێك لەخەڵکی بوویەوە، کە گوێبیستیان بوو کە دەیان ووت: ئەو پیاوەی کە دەیبینن بەشەو ناخەوێت. جا کە گوێبیستی ئەو ووتەیەیان بوو ووتی:

بەڕاستی من لەلای خەڵکی پێچەوانەی ئەوەم، کەلەسەریم لەلای خودا... سوێند بێت بەخودا لەم چرکەساتەوە ڕێگەنادەم بەوەی خەڵکی لەشتێك بدوێت دەربارەم کە نەیکەم... وە لەمرۆ بەدواوە سەر لەسەر سەرین دانانێم و، لەسەر ڕاخەر ڕاناکشێم لەشەودا تا بە خزمەتی خودا دەگەم.

ئینجا لەو ڕۆژەوە بەردەوام بوو لەسەر زیندوو کردنەوە سەرانسەری شەوان، جا کە تاریکی باڵی بەسەر بوونەوەردا دەکێشا و، خەڵکیش نوقمی خەو دەبوون... ئەو هەڵدەستا و، جوانترن جل و بەرگی لەبەردەکر و، ریشەکەی دادەهێناو، بۆنی خۆشی لەخۆی دەدا و، خۆی دەرازاندەوە...

ئینجا دەچوویە میحرابەکەیەوە، وە شەوی بەخودا پەرستی رادەپەران، یان بەهەموو گیان و هەست و نەستییەوە بەسەر قورئان دا خۆی نەی دەکرد، وە یان بەوپەڕی ملکەچی یەوە دەستەکانی لەگەڵ پارانەوەدا بڵند دەکرد... جاری واهەبوو هەموو قورئانی لەیەك رکات نوێژدا دەخوێند...

یا وادەبوو هەموو شەوی بەیەك (ئایەت) زیندوو دەکردەوە... لێوەی گێڕراوەتەوە کە هەموو شەویٚ بەدووپات کردنەوەی ئەم فەرموودەیەی خودای بالآدەست زیندوو کردۆتەوە:

بَلِ ٱلسَّاعَةُ مَوْعِدُهُمْ وَٱلسَّاعَةُ أَدْهَىٰ وَأَمَرُّ ﴿٤٦﴾ [1].

واتە: بەڵکو ئەوەی لێیان بەسەردا هات لە دونیادا، سزادانی تەواویان نی یە، بەڵکو کاتی سزادانی راستەقینەیان رۆژی دواییە (رەستاخێز)، سزای رۆژی دواییش ئێجگار ناخۆش ترو سەختترە لەو سزایەی کە لە دونیادا تووشی دەبن. (وەرگێڕ)

وە ئەو لەترس و بیمی خودای بالآدەست گریانێك دەگریا کە ژێی دلأنی دەپچڕاند. و بەشێوەیەك لە گریانەکەیدا دەهاتەوە یەك کە خەریك بوو دڵی لەت وپەت دەکرد.

* * *

وە لێوەی زانراوە کە بەدەست نوێژی نوێژی خەوتنان نزیکەی چل ساڵ نوێژی بەیانی کردووە، بەبیٚ ئەوەی لەو ماوەیەدا وە یەکجاریش ئەوەی وازلێهێنابێت. وە لەو شوێنەدا کە وەفاتی تیاکردووە (حەوت هەزار) جار قورئانی خەتم کردووە.

وە کە سورەتی (الزَّلزلة) دەخوێندەوە پێستەکەی دەهاتەوە یەك بەشێوەیەك خەریك بوو لەیەك دەپچڕا... وە دڵەکەی دەهاتە لەرزەو دڵە تەپیٚ... وەبەدەستی ریشی خۆی دەگرت و دەیفەرموو:

ئەی ئەو کەسەی کە پاداشتی گەردیلەیەك چاکە بەچاکە دەداتەوە...

وە یان ئەو کەسەی کە پاداشتی گەردیلەیەك خراپە بە خراپە دەداتەوە... (نوعمان)ی بەندەت لەئاگر بپارێزە......وە دووری بکە لەنێوان ئەو و ئەوەی کە دەبێتە هۆی نزیك بوونەوە لەئاگر....... وە بیخەرە نێوان میهرەبانی فراوانت ئەی لەهەموو میهرەبانان میهرەبان تر.......

---

[1] سورة القمر: آیة ٤٦.

خودایە بەخشندەی و خۆ پارێزی و قورئان دۆستی و شەوان زیندوو کردنەوەی (ئەبو حەنیفە)ش بەئێمە ببەخشەو توانامان بدە لەسەر ئەنجامدانی.

﴿وەرگێڕ﴾

# ئەبو حەنیفەی نوعمان

## بەشی دووەم

### (چەند تیشکێکی بێ وێنە لەناوازەی و زیرەکی ئەو زاتە)

**((ئەبو حەنیفەی نوعمان) زۆر داکۆکیکاربووە لە قەدەغەکراوەکانی خوداو... زۆر لە بێدەنگی دا درێژەخایەن بووە و، هەمیشە لە بیرکردنەوەدا بووە)**

**(پێشەوا ئەبو یوسف)**

(ئەبو حەنیفەی نوعمان) چووە خزمەتی (پێشەوا مالیك)، کە کۆمەڵێکی زۆر لەهاوڕێکانی لەخزمەتیابوون، جا کاتێك کە (ئەبوحەنیفە) رووخسەتی خواست و ڕۆشت، (پێشەوا مالیك) لایکرد بەلای هاودەمەکانیەوە و، ووتی:

ئایا دەزانن ئەوە کێ بوو؟

ئەوانیش ووتیان: نەخێر.

ئەویش فەرمووی: ئەوە (نوعمانی کوڕی ثابت) بوو..ئەو ئەوکەسەیە ئەگەر بیوتایە ئەو ستوونە (عەمودە) ئاڵتوونە، بەڵگەی پێبوو بۆ ئەوەی کە ووتوویەتی، وە ئەوە وادەردەچوو.

*　　　　*　　　　*

(پێشەوا مالیك) لەو وەسفەی (ئەبا حەنیفە)دا زیادە ڕەوی نەکردووە لەبەهێزی بەڵگە هێنانەوە و، بیرتیژی و، بۆچوونی خێرا و، باش پێکان و ئاگایی.

جا پەڕاوەکانی مێژوو و ژیاننامەکان پڕو ڕازاوەن بە دەنگەڕۆ و گوزارش دان لەهەڵوێستەکانی لەگەڵ نەیارەکانیدا لە ڕاوبۆچوون و، دژەکانی لەبیروباوەڕدا (العقیدە)...

وە هەموو ئەو هەڵوێستانە گەواهی حاشا هەڵنەگرن لەسەر دروستی ئەوەی کە (پێشەوا مالیك) وەسفی (ئەبا حەنیفە)ی پێکردووە، تا ئەو ئاستەش ئەگەر داندابگرێت لەسەر ئەوەی کە ئەو گڵەی کەلەبەردەستی تۆدا بە (زێڕە)، تۆ هیچت پێناکرێت و هیچت لە توانادا نابێت جگە لە ملکەچی بوون بۆ بەڵگەکەی و، ڕادەستبوونی ئەوەی کە دەیڵێت.

جا ئەبێت چۆن بێت لە کاتێکدا کە داکۆکی لە (حەق) بکات، وە دەمەقاڵی بۆسەلماندی بکات.

لە نموونەی ئەوە پیاوێك لەخەڵکی (کوفە) کە خودا گومڕای کردبوو. وە کابراش خاوەنی پلەوپایەو ڕێزێك بوو لەبەر چاوی هەندێك لەخەڵکی دا، وە ووتە بیسراوبوو لەلایان.

وە ئەو پیاوە وای لەو خەڵکە گەیاندبوو کە (عوسمانی کوڕی عەففان) لەبنەچەدا (یەهودی) بووە... وە هەروەها یەهودیەتیەکەی (جوولەکەیی) ماوەتەوە لە پاش موسڵمان بوونی... جا کاتێك کە (ئەبو حەنیفە) گوێبیستی ئەو ووتەو ڕاگەیاندنە بوو ڕۆشت بۆلای و ووتی:

لەڕاستی دا هاتوومەتە لات بۆ خواستنی فلاّن کچت بۆ یەکێك لە هاوڕێیانم.. ئەویش ووتی: یاخوا بەخێر بێیت... بەڕاستی نموونەی تۆ ئەی (ئەبا حەنیفە) داوای ناگەڕێتەوە...

بەلاّم داواکاری کێ یە؟

(ئەبو حەنیفە) فەرمووی: پیاوێکی ناسراوە لەنێو گەلەکەی دا بەشکۆمەندی و دەوڵەمەندی و، دەستگوشادی و، بەخشندەیی... وە هەموو قورئانی خودای بالاّدەستی لەبەرە... هەموو شەو لەیەك ڕکات نوێژدا زیندوو ڕادەگرێت... لەترس و بیمی خودا زۆردەگری... پیاوەکە ووتی: بەخ، بەخ... بەسە ئەی (ئەبا حەنیفە) بەڕاستی هەندێ لەوەی کەباست کرد لە سیفەتەکانی ئەوا داواکارە، وای لێدەکات، کە گونجاو بێت بۆ کچی ئەمیری بڕواداران.

جا (ئەبو حەنیفە) فەرمووی: بەڵام یەك سیفەتی هەیە کە پێویستە هەڵوەستەی لەسەر بکەیت. پیاوە ووتی: ئەوە چی یەو کامەیە؟!.

(ئەبو حەنیفە) فەرمووی: بەڕاستی ئەو (یەهودیە).

پیاوە راچەڵەکی و ووتی: یەهودیە؟!... ئەی (ئەبا حەنیفە) ئایا تۆ دەتەوێت کە من کچەکەم مارەبڕم لە یەهودیەك؟!... سوێند بەخودا نایدەمێ ئەگەر هەموو سیفاتی چاکانی یەکەم و کۆتایی ئەم ئیسلامەی لەخۆ گرتبێ...

ئەوجا (ئەبو حەنیفە) فەرمووی: حاشا دەکەیت لەوەی کە کچەکەت مارەبڕی لە (یەهودی یەك)، وە زۆریش لەسەر ئەوە پێ دادەگریت... کەچی لەولاوە بە خەڵکی رادەگەیەنیت کە (پێغەمبەری خودا) دروودی خودای لەسەر بێ، دوو کچی لە یەهودییەك مارەبڕیوە!!.

ئەوجا کابرا ڕاچەڵکی و لەشی کەوتە لەرزە و ووتی:

داوای لێخۆش بوون لەخودا دەکەم لەسەر ئەو ووتە خراپەی کە ووتوومە... وە پەشیمانی دەردەبڕم لە خزمەتیا لەسەر ئەو تۆمەتە ناڕەوایەی کە هەڵم بەستووە.

* * *

وە هەر لە نموونەی ئەو هەڵوێستانەی، (الضُّحاك الشاري) (زوحاکی شاری) کە یەکێك بووە لە (خەواریجەکان)[1]، رۆژێکیان هات بۆلای (ئەبو حەنیفە)و ووتی:

ئەی (ئەبا حەنیفە) پەشیمان بەرەوە.

ئەویش ووتی: لەچی پەشیمان ببمەوە؟!.

پیاوەی (خارجیش) ووتی: لەو ووتەیەت، کە تیایدا دانت ناوە بەڕەوای ئەو (تەحکیمە)دا (ناوبژی) کە ڕووی دا لەنێوان (عەلی) و (موعاوی)ەدا.

جا (ئەبو حەنیفە) پێی ووت: ئایا رازی دەبیت کە ڕووبەڕووم ببیتەوە لەو بارەوە؟.

پیاوەی (خارجی) ووتی: بەڵی ئامادەم و رازیم.

ئەوجا (ئەبو حەنیفە) ووتی: ئەگەر لە ڕووبەڕووبونەوەکەدا جیاوازی ڕا کەوتە نێوانمان، کێ دادوەری و ناوبژیوانی بکات لە نێوانماندا؟.

پیاوەی (خارجی) ووتی: تۆ کێت دەوێت بیکەرە ناوبژی کار (حەکەم).

---

[1] (الخوارج): ئەوانەبوون کە دانیان نەدا بە خیلافەتی (عەلی) و (معاوی)ەدا و رازی نەبوون بە تەحکیم.

جا (ئەبو حەنیفە) لای کرد بەلای پیاوێکەوە لە هاوڕێیانی (خارجێکە) کەلەگەڵیدا بوو ووتی: دادوەری بکە لە نێوانمان دا لەو شتانەدا کەلەسەری جیاواز دەبین...
پاشان ووتی بە پیاوە خارجیەکە: من رازیم بە دادوەری (ناوبژی) هاوڕێکەت، جا ئایە تۆش ڕازیت پێی؟
پیاوەکەش بەوە دڵشاد بوو وە ووتی: بەڵێ.
ئەوجا (ئەبو حەنیفە)ووتی: ئەی هاوار بۆتۆ ڕێگە دەدەیت بە ناوبژی کردن لەنێوان من و خۆت دا لەسەر ئەوەی کە لەنێوانماندا ڕوودەدات، بەڵام رازی نابیت بەو ناوبژی کردنە لەنێوان دووان لە هاوڕێیانی (پێغەمبەری خودا) دروودی خوای لەسەر بێ؟!.
جا پیاوەی خارجی کە گوێبیستی ئەوە بوو، ڕەنگی زەرد هەڵگەڕاو، بێ دەنگ بوو، وە هیچ وەڵامێکی نەدایەوە..

*　　　　*　　　　*

وە هەر لەنموونەی ئەو هەلوێستانەی ئەوەیە کە (جەهەمی کوڕی صەفوان)(جَهَمْ بنُ صَفْوان) کە سەری تیمی (الجَهْمِيَّة) گومڕای داهێنەر و، چێنەری خراپەکاری بوو لەسەر زەوی ئیسلام دا جارێکیان هاتەلای (ئەبو حەنیفە)و ووتی:
بەڕاستی هاتوومەتە لات بۆ ئەوەی لەگەڵت بدوێم دەربارەی چەند شتێك کە بۆم ئامادەکردوویت...
(ئەبوحەنیفە)ش فەرمووی: گفتوگۆ لەگەڵ تۆ شوورەییە... وە ڕۆچوون لەوەدا کە تۆ بۆی دەچیت، ئاگروگڕو کڵپەیە کە بریسك دەهاوێت.
جا (جَهْم) ووتی: چۆن ئەو بڕیارەت لەسەر من دا، کەتۆ لەمەوپێش منت نەدیوە، وە گوێبیستی ووتەی من نەبوویت؟!.
(ئەبوحەنیفە) فەرمووی: لەڕاستیدا کۆمەڵێك قسەو قسەڵۆك لەتۆوە بەمن گەشتووە، کە هەرگیز لەزمانی کەسێکەوە دەرناچێت کە موسڵمان بێت و ڕوو لەڕووگە بکات.
(جَهْم) ووتی: ئایا لە ڕووی نادیاریەوە بڕیار لەسەرم دەدەیت؟.
(ئەبوحەنیفە) فەرمووی: بەڕاستی لەو بارەوە ناوبانگت ڕۆشتوەو، ووتەکانت لەنێو خەڵکی دا بڵاوەیان کردووە وە خەڵکی تایبەتمەند وڕەشۆکی ئاگادارین و گوێبیستی بوون و زانیویانە، جا ئەوە رووخسەت و مۆڵەتی بەمن داوە تا لەسەرتی بسەلمێنم،

بەهۆی ئەوەوە کەلە ڕێگای دروستەوە و لەزاری کەسانی متمانە پێکراوەوە لێتەوە گێڕاوەتەوە.
(جَهْم) ووتی: من جگە لە (بڕوا) (الأيمان) دەربارەی هیچ شتێکی دی نامەوێت پرسیارت لیّ بکەم. (ئەبو حەنیفە) فەرمووی: ئایا تا ئەم چرکەساتە (ئیمان) (باوەڕ) نازانی چی یەو شارەزای نەبووی وا دەربارەی پرسیارم لیّ دەکەیت؟!.
(جَهْم) ووتی: بەڵیّ (ئیمان) شارەزام چی یە، بەڵام بەڕاستی لە جۆرێکدا لە گوماندام. (ئەبوحەنیفە) فەرمووی: گومان لە (ئیمان)دا کوفرە (بیّ باوەڕی یە).
(جَهْم) ووتی: بۆتۆ ڕەوانی یە کەمن بە (کوفر) ناوزەدە بکەیت، تا گوێبیستی شتێك نەبی لەمن کە بەهۆیەوە ناوزەدەم بکەیت بە (کوفر).
ئەوجا (ئەبوحەنیفە) فەرمووی: ئەوەی دەتەوێت دەربارەی پرسیار بکە.

(جَهْم) ووتی: ئاگادارم بکە رات چی یە دەربارەی پیاوێك کە بەدڵی خودای ناسیوە، وە زانیویەتی کەبیّ گومان ئەو تاك و تەنهایە، وە هاوبەشی نی یەو، هاوشێوەشی نی یە... وە بە سیفاتە بەرزەکانی ناسیویەتی و، دڵنیابووە لەوەی کەئەو هیچ شتێك هاوشێوەی نی یە...
پاشان لەدوای ئەوە دەمرێت، وە بەزووبانی باوەڕەکەی ڕاگەیاندوە. ئەوجا ئایا ئەو بە باوەڕداری دەمرێت یان بە کافری (بیّ باوەڕی)؟.
(ئەبوحەنیفە) فەرمووی: بەکافری (بیّ باوەڕی) دەمرێت، وە دەبێتە یەکێك لە دۆزەخیان، ئەگەر ئەوەی بەدڵ زانیویەتی بەزووبان ڕاینەگەیاندبیّ، مادام بەرگرێك نەبوبیّ لە ڕاگەیاندنی وەك لاڵی.

(جَهْم) کە گوێبیستی ئەوە بوو ووتی: چۆن بەبڕوادار دانانرێت لەگەڵ ئەوەدا کە بەبیّ هیچ گومانێك خودای بەناسینێکی تەواو ناسیوە؟!.
(ئەبو حەنیفە) لەوەڵامیدا فەرمووی:
ئەگەر تۆ بڕوات بە قورئان هەیە بەبەڵگە وەریدەگریت و پەسەندی دەکەیت، ئەوا بە قورئان لەگەڵت دەدوێم... خۆ ئەگەر بڕواشت بە قورئان نی یەو بە بەڵگەی پەسەند ناکەیت، ئەوا بەوە لەگەڵت دەدوێم کەپێی دەدوێنم لەگەڵ ئەو کەسەدا کە پێچەوانەی ئیسلامەو دژایەتی دەکات.

(جَهْم) کە گوێبیستی ئەوە بوو ووتی: بەڵێ من بڕوام بەقورئان هەیە وە بە بەڵگە پەسەندی دەکەم و وەریدەگرم. ئەوجا (ئەبو حەنیفە) فەرمووی: بێ گومان خودای باڵادەست ڕاگەیاندنی باوەڕی خستۆتە ئەستۆی دوو ئەندامی لەش کە (دڵی) و (زوبانە) نەك یەکێکیان...

وە پەڕاوەکەی (قورئان)ەکەی خودا و فەرموودەی (پێغەمبەری خودا) دروودی خوای لەسەر بێ پڕاوپڕن بە دەربڕینی ئەوە.

خودای باڵادەست دەفەرمووێت: وَإِذَا سَمِعُوا۟ مَآ أُنزِلَ إِلَى ٱلرَّسُولِ تَرَىٰٓ أَعْيُنَهُمْ تَفِيضُ مِنَ ٱلدَّمْعِ مِمَّا عَرَفُوا۟ مِنَ ٱلْحَقِّ ۖ يَقُولُونَ رَبَّنَآ ءَامَنَّا فَٱكْتُبْنَا مَعَ ٱلشَّـٰهِدِينَ ﴿٨٣﴾ وَمَا لَنَا لَا نُؤْمِنُ بِٱللَّهِ وَمَا جَآءَنَا مِنَ ٱلْحَقِّ وَنَطْمَعُ أَن يُدْخِلَنَا رَبُّنَا مَعَ ٱلْقَوْمِ ٱلصَّـٰلِحِينَ ﴿٨٤﴾ فَأَثَـٰبَهُمُ ٱللَّهُ بِمَا قَالُوا۟ جَنَّـٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَـٰرُ خَـٰلِدِينَ فِيهَا ۚ وَذَٰلِكَ جَزَآءُ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿٨٥﴾ سورەتی: المائدة: ٨٣ - ٨٥

واتە: ئەگەر ئەوانە گوێیان لەو قورئانە نەبێت کەبۆ پێغەمبەر هاتوەتە خوارەوە، دەیانبینیت فرمێسك بەچاوەکانیاندا بەخوڕ دێتە خوار، چونکە چاك دەزانن ئەوە هەقە و لەلایەن خوداوە نێرراوە، جالەبەر ئەوە دەڵێن: خودایە ! وائێمە ئیمانمان هێنا، تۆیش بەشایەت بماننوسە لەگەڵ ئەو کەسانەدا کەشایەتن لەسەر ڕاستێتی ئایینی ئیسلام و، ڕاستێتی ئەوەی کە قورئانی پیرۆز لەلایەن تۆوەیە. (٨٣)

ئاخر چۆن دەبێت باوەڕ بەخودا نەهێنین و باوەڕمان نەبێت بەوەی کە لەلایەن خوداوە ڕەوانەکراوە بۆمان، کە ئایینی پیرۆزی ئیسلامە، لە حاڵێکدا ئومێدمان وایە پەروەردگارمان لەگەڵ پیاوچاکاندا ریزمان بکات. (٨٤)

لە پاداشتی ئەو قسانەدا کە ووتویانە، خودا پاداشتی دانەوە بەباخ و باخاتی بەهەشت، کە چەندین رووبار بەژێریاندا دەڕوات وهەتا هەتایە تیایاندا دەمێننەوە، ئەوەش پاداشتی چاکە کارانە. (٨٥)

جا دیارە ئەوان حەق و راستیان بەدڵ و دەروونیان ناسیوە و زانیوە، وە بەزوبانیشیان ئەوەیان دەربڕیوە، جا خودای بالادەستیش بەهۆی ئەو دەربڕین و ووتنەوە دەیان خاتە ئەو بەهەشتانەی کە رووبارەکان بە ژێریاندا دەڕوات.

هەروەها خودای بالادەست فەرموویەتی:﴿قُولُوٓا۟ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيْنَا وَمَآ أُنزِلَ إِلَىٰٓ إِبْرَٰهِـۧمَ وَإِسْمَـٰعِيلَ وَإِسْحَـٰقَ وَيَعْقُوبَ وَٱلْأَسْبَاطِ وَمَآ أُوتِىَ مُوسَىٰ وَعِيسَىٰ وَمَآ أُوتِىَ ٱلنَّبِيُّونَ مِن رَّبِّهِمْ لَا نُفَرِّقُ بَيْنَ أَحَدٍ مِّنْهُمْ وَنَحْنُ لَهُۥ مُسْلِمُونَ ﴿١٣٦﴾﴾ سورة: البقرة: آية: ١٣٦

واتە:خودا بە موسڵمانەکان دەفەرموێت بڵێن: ئێمە باوەڕمان بەتاك و تەنهایی خودا هەیە، هەروەها باوەڕمان بەوە هەیە کە بۆمان هاتۆتە خوارەوە کە قورئانە، وە باوەریشمان هەیە بەوەی کەبۆ ئیبراهیم و ئیسماعیل و ئیسحاق و یەعقوب و نەوەکانی لەپێغەمبەران نێرراوەتە خوارەوە، وە باوەڕیشمان بەوە هەیە کە بۆ موسا و عیسا و پێغەمبەرەکانی تر هاتووە......١٣٦

جا خودای بالادەست فەرمان دەدات بە ووتە، واتە دەربڕین بەزوبان، نەك تەنها بەزانینی دەروونی و زانین بەدڵ. وە (پێغەمبەری ئیسلام) درودی خوای لەسەر بێت فەرمووی:

(قُولوا: لاإلَهَ إلاَّ اللهُ تُفْلِحوا)...

واتە: بڵێن جگە لە (الله) هیچ خودایەك نی یە سەرکەوتوو دەبن، واتە رەزامەندی خودا مسۆگەر دەکەن و، بەهەشت بەدەست دەهێنن.

جا دیارە (پێغەمبەر) دروودی خوای لەسەر بێت فەرموویەتی:

(يَخْرُجُ مِنَ النَّارِ مَنْ قالَ: لا إلهَ إلاَّ الله)...

واتە: لەئاگری دۆزەخ دەردەچێت هەرکەس ووتبێتی: جگە لە (الله) هیچ خودایەکی دی نی یە.

جا دیارە لەو فەرموودەیەدا (درووودی خوای لەسەر بێ) نەیفەرمووە، لە دۆزەخ دەردەچێت ئەوەی کە خودای بەدڵ ناسیوە.

ئەگەر بۆ بڕوا دەربڕین بەزوبان پێویست نەبوایە، وە تەنها ناسی بەبێ دەربڕین بووایە، ئەوە (ئیبلیس) بڕوادار دەبوو... چونکە ئەو بەڕاستی ئەو پەروەردگاری خۆی ناسیبوو، وەئەو دەیزانی کەئەو بەدیهێناوە، وە هەر ئەو دەیمرێنێ، وە هەر ئەوەکە دەیبوژێنێتەو، وە ئەوەکە گومڕای کرد.

خودای بالآدەست لەسەر زوبانی (ئیبلیس) فەرموویەتی:

خَلَقْتَنِي مِن نَّارٍ وَخَلَقْتَهُۥ مِن طِينٍ ﴿١٢﴾ (الأعراف: آية: ١٢).

واتە: (ئیبلیس) ووتی: ئەی خودایە تۆ منت لەئاگر دروستکردووە، بەلآم ئادەمت لەخاك و خۆڵ دروستکردووە.

وەفەرموویەتی: قَالَ رَبِّ فَأَنظِرْنِيٓ إِلَىٰ يَوْمِ يُبْعَثُونَ ﴿٣٦﴾ (الحجر: آية:٣٦).

واتە: (ئیبلیس) دەڵێت: ئەی پەروەردگارم مۆڵەتم بدەو مەمخەرە بەر سزا تائەو رۆژەی ئادەمیزادەکان زیندوو دەکەیتەوە و، دەیانخەیتە ژێر لێپرسینەوەوە.

وە فەرموویەتی: قَالَ فَبِمَآ أَغْوَيْتَنِي لَأَقْعُدَنَّ لَهُمْ صِرَٰطَكَ ٱلْمُسْتَقِيمَ ﴿١٦﴾ (الأعراف: آية: ١٦) .

واتە: (ئیبلیس _ شەیتان) ووتی: خودایە بەهۆی ئەوەی کەسەرلێشێواوت کردم و لەرەحمەتی خۆت دوورت خستمەوە، سوێند بەخۆت منیش لەسەر ڕێگا راستەکەت دادەنیشم بۆیان و هەموو رێگایەکی راستی دینداریيان لێ دەگرم و دەیانخەڵەتێنم.١٦

پاشان ئەبوو حەنیفە بە (جهم)ی ووت:

جا ئەگەر ئەوەی تۆ ئەی (جَهْم) دەیڵێیت و ڕایدەگەیەنیت دروست بێت، ئەوە زۆرێك لە بێ باوەڕان، بڕوادارن تەنها بەناسینی پەروەردگاریان بە دڵ و نکولی لێکردنی بەزوبانیان.

خودای بالآدەست فەرموویەتی: وَجَحَدُوا۟ بِهَا وَٱسْتَيْقَنَتْهَآ أَنفُسُهُمْ ظُلْمًا وَعُلُوًّا ۚ فَٱنظُرْ كَيْفَ كَانَ عَـٰقِبَةُ ٱلْمُفْسِدِينَ ﴿١٤﴾ (سورة: النمل:آية:١٤) .

واتە: ئەوانە نکولی ئەو موعجیزانەیان کرد و بەدرۆیان دانا، وە لەبەر لووتبەرزی وستەمکاری خۆیان، نکولی پێغەمبەرێتیەکەی موسایان کرد، بەڵام لەدڵەوە باوەڕیان هەبوو کەراستەو موعجیزەیە. جا لەو قەدەوە بەدەردەکەوێت کە خودای باڵادەست ئەوانەی کەتەنها بەدڵ باوەڕیان هەبووە، بەبڕوادەری دانەناون، بەڵکو لەریزی بێ باوەڕان دا دەستنیشانی کردوون لەبەر ئەوەی کە بەزمانیان نکولیان لەدەربڕینی باوەڕەکەیان کردووە.

بەو شێوەیە (ئەبو حەنیفە) بەردەوام بوو لەسەر هێنانەوە و داباریینی بەڵگە لە قورئان و هێرش لە فەرموودەکانی (پێغەمبەر) دروودی خوای لەسەر بێ، تا لاوازی و رسوایی و بێ بەڵگەیی تەواو لەسەر رووی (جَهْم) دەرکەوت...

وە دەستەوسان بوو لە نێوان دوو دەستی (ئەبی حەنیفە)دا و دەیووت: بەڕاستی شتێکت بیرخستمەوە کەمن لەیادم کردبوو، وە لەداهاتوودا دەگەڕێمەوە لات.

پاشان لێ یداو رۆشت و ئیدی نەگەڕایەوە.

* * *

وە هەر لەنموونەی ئەوە (ئەبا حەنیفە) رووبەڕووی کۆمەڵێك لە بێ باوەڕان بوویەوە لەوانەی کە نکولیان لەبوونی خودای باڵادەست دەکرد، وە پێی ووتن:

چی دەڵێن دەربارەی کەشتی یەکی پڕ لەشمەك وباری قورس... وە لە قوڵایی دەریایەك دا بەشەپۆلە تێکشکێنەرەکان دەوردراوەو، رەشەبای توندوتیژ دەیهێنێت و دەیبات، بەڵام ئەو بەردەوام زۆر بەهێمنی ئەو رێگایە بەرێ دەکات کەبۆی دیاریکراوە، وە زۆر بەئارامی بەرەو ئامانجە دیاریکراوەکەی دەڕوات، بەبێ هیچ جۆرە ئاڵۆزی وتێکچوون و لادانێك، بەبێ ئەوەی کەی دەریاوانێکی لەسەر بێت کەرێکی بخات و سنووری بۆدیاری بکات، یان رێنماکارێك کە رووگەی بۆ دیاری بکات...

جا ئایا ئەوە لەبیر و ژیریدا شتێکی درووستە وە مرۆڤی خاوەن هۆش و ژیری دروست باوەڕ بەوە دەکات و دەیسەلمەنێ و...

ئەوانیش ووتیان: نەخێر، بەراستی ئەوە شتێکە کە هەرگیز ژیری پەسەند ناکات، وە هیچ بیرو بۆچوونێك رێگا بەوە نادات، ئەی شێخ...

ئەویش فەرمووی: (یا سُبْحانَ الله) !! خاوێنی و بێ کەم وکوڕی هەر شایستەی خودایە!!... ئێوە نکوڵی لەوە دەکەن کە کەشتی یەك بەبێ دەریاوانێك کەرێکی بخات و لێی بخورێت، بەدەریایەکدا بەشێوەیەکی گونجاو بڕوات. بەڵام بڕیاری ئەوە دەدەن کەئەم بوونەوەرە رازاوە، بەدەریاکانی یەوەو، کەشکەشان و، خۆر و هەسارەکانی دەوروبەری و، سەرجەم باڵندەو ئاژەڵەکان و، رووەکەکان و، کانەکان، لەسەروو هەموو ئەوانەوە، ئاوەدان کردنەوەی بە ئێمەی مرۆڤ، بەبێ دروست کارێك بەوشێوە ناوازەو قەشەنگ و بێ ناتەواویە دروست کرابێت، وەبێ ڕێکخەرێك ڕێکخرابێت!!. دەك لەناو بچن بۆئەو بۆچوون و قسە هەڵبەستنەتان...

*　　　*　　　*

لە کۆتاییدا، بەڕاستی (ئەبو حەنیفە) هەموو کاروانی ژیانی و قۆناغەکانی بەسەر برد، بە پارێزگاری و بەرگری لە ئایینی خودای باڵادەست بەو بەڵگە دانپیانەرانەی کە خودای باڵادەست پێی بەخشی بوو... وە دەدواو، دەمە قاڵەی دەکرد دەربارەی شەرعەکەی بەوەی کە خودای باڵادەست پێی ڕەوا بینی بوو لە ژیری و هزرێکی ناوازە. وە کاتێك گەڕایەوە بەرەو پەروەردگاری (وەفاتی) کرد، لە وەسییەتەکەی دا ئەوەیان دییەوە، کەداوای لە خانەوادەکەی کردووە کەلە زەویەکی ڕەوادا بینێژن، وە دووری بگرن لە زەویەك کە گومانی داگیرکردنی تیابێت. جا کاتێك وەسیەتەکە گەشتە دەستی (المنصور) فەرمووی:

کێ یە جگە لە (ئەبی حەنیفە) کە ڕەخنەو شورەییمان لێ بەلاوە بنێ بەزیندووی و مردووی؟.

وە (ئەبو حەنیفە) وەسیەتی کردبوو کە (حەسەنی کوڕی عەممارە)، سەرپەرشتی شۆردنەکەی بکات، جا کاتێك کە شۆردی فەرمووی:

ئەی (ئەبا حەنیفە) خودا بەزەیی بێتەوە پیاتاو، لێت خۆش ببێت لەپاداشتی ئەوەدا کە ئەنجامت داو گەیاندت. بەڕاستی تۆ بوویت ماوەی سیساڵ ڕۆژووت نەشکاند... وە ماوەی چل ساڵ بەشەو سەرت لەسەر سەرین دانەنا... وە زانایانت لەدوای خۆت شەکەت کرد...

خودایە ئەوەندەی تەمەنمان ماوە ئەو هەڵوێستانەی (ئەبو حەنیفە)مان پێ ببەخشە.

﴿وەرگێڕ﴾

بۆ زیاتر شارەزابوون لە ژیاننامەی (ئەبو حەنیفە) بڕوانە:

١- البداية والنهاية: ١٠٧/١٠
٢- وفيات الأعيان: ٤١٥/٥ _٤٢٣
٣- النجوم الزاهرة: ١٢/٢
٤- شذرات الذهب:٢٢٧/١ _٢٢٩
٥- مرآة الجنان: ٣٠٩/١
٦- العبر: ٣١٤/١
٧- تأريخ بغداد: ٣٢٣/١٣ _٣٢٤
٨- تأريخ البخاري: ٨١/٨
٩- الجرح والتعديل: ٤٤٩/٨ _٤٥٠
١٠-ميزان الأعتدال: ٢٦٥/٤

سوپاس بۆ خودای بالأدەست لە وەرگێڕانی ژیاننامەی ئەم كۆمەڵەلە شوێنكەوتووان لە زمانی عەرەبی یەوە بۆ كوردی تەواو بووم كە لە نووسینی: د.عبدالرحمن رافت الباشا بوو.

پێنج شەممە ٢٠١٠/٢/٢٥

سلێمانی/ گەرمكی زمناكۆ (باڵەكەی خەبات)

# ناوەڕۆك

# التابعين

حەسەنی بەصری
موحەممەدی کوڕی سیرین
عومەری کوڕی عەبدولعەزیز
سەلەمەی کوڕی دینار
عەتای کوڕی ئەبی ڕەبباح
عامیری کوڕی عەبدوڵڵای تەمیمی
عوروەی کوڕی زوبێر
ئیاسی کوڕی موعاویەی موزنی
شورەیحی قازی
ڕەبیعەی رئیی
ڕەجائی کوڕی حەیوە
عامیری کوڕی شوڕەحبیل
سەعیدی کوڕی جوبەیر
النجاشی
ئەبو موسلیمی خەولانی
ئەبو حەنیفەی نوعمان
ئەحنەفی کوڕی قەیس
موحەممەدی کوڕی واسیعی ئەزدیی
موحەممەدی کوڕی حەنەفییە
تاوسی کوڕی کەیسان
قاسمی کوڕی موحەممەدی کوڕی ئەبی بەکر
سیلەی کوڕی ئەشیەمی عەدەوی
عەلی کوڕی حوسەینی کوڕی عەلی
سالمی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی عومەر
عەبدوڕەحمانی غافیقی
ڕوفەیعی کوڕی میهران




